کرستين ژاك و هوارد فاست




# گەڕانەوەی خودای ئاتون

ابو علي الكردي
تايبەت- منتدي اقرأالثقافي

وەرگێڕانی: عیمران هاواری

بەرگی سێیەم

چاپی یەکەم
2011

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە: (٣٤٨)

## ناسنامەی کتێب

**پاش سینوهە/ گەڕانەوەی خودای ئاتون**

- نوسینی: کرستین ژاك و هوارد فاست
- بابەت: ڕۆمانی مێژویی
- وەرگێڕانی: عیمران هاواری
- بابەت: ڕۆمانی مێژوویی
- نەخشەسازی و بەرگ : فواد کەوڵۆسی
- بەرگ: بەرگی سێیەم
- نۆبەت و ساڵی چاپ: یەکەم ، ٢٠١١
- شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە سپاردنی: ١٣٨٧ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێڕست

# ڕونکردنەوەیەك لەبارەی فیرعەونەکانەوە:

فیرعەون نازناوی پادشایانی کۆنی میسرە کە زنجیرەی یەکەمی لەڕێی "رامسیس"ە وە بنیاتنرا تا ڕوخانی دواین فیرعەونی زنجیرەی سییەم لەسەردەم ی"بتاسە"دا.

میسریە کۆنەکان ناوی پادشاکانیان بە فیرعەون بانگ دەکرد و دەشیان پەرستن، لەم جۆرە پادشایانە سی زنجیرە فەرمارەوایی خۆیان بەڕێو برد وەك ئەمەی لای خوارەوە:

زنجیرە ۱ و ۲ : ۳۲۰۰ –۲۹۸۰ی پ . ز، زنجیرەی سێیەم: ۲۹۸۰ –۲۹۰۰پ. ز، زنجیرەی چوارەم: ۲۹۰۰–۲۷۵۰ پ. ز، زنجیرەی پێنجەم: ۲۷۵۰–۲٦۲۵پ. ز، زنجیرەی شەشەم: ۲٦۲۵–۲٤۷۵پ. ز، زنجیرەی حەوتەم تا زنجیرەی دەیەم: ۲٤۷۵–۲۱٦۰پ. ز، زنجیرەی یانزەیەم ۲۱٦۰–۲۰۰۰ پ. ز، زنجیرەی دوانزەیەم: ۲۰۰۰–۱۷۸۸ پ. ز، زنجیرەی سیانزەیەم تا زنجیرەی هەفدەیەم: ۱۷۸۸–۱۵۸۰ پ. ز، زنجیرەی هەژدەیەم: ۱۵۸۰–۱۳۵۰ پ. ز، زنجیرەی نۆزدەیەم(ئەو سەردەمەی کە سینۆهەی تێدا ژیاوە): ۱۳۵۰–۱۲۰۵ پ. ز. { هەروەها سەردەمی دوای سینۆهەش پەیگیری دەکەین}.

زنجیرەی بیستەم: ۱۲۰۵–۱۰۹۰پ. ز، زنجیرەی بیست و یەکەم: ۱۰۹۰–۹٤۵پ. ز، زنجیرەی بیست و دووەم: ۹۵۵–۷٤۵پ. ز ، زنجیرەی بیست و سێیەم، و چوارەم و پێنجەم۷٤۵–٦٦۳پ. ز، زنجیرەی بیست و نۆیەم: ۳۹۸–۳۷۹پ. ز، و زنجیرەی سییەم: ۳۷۹–۳٤۲پ. ز .

# ڕوداوێکی مێژوویی:

ناوم"موتی"یە، هاوڕێی"ست"ی هاوسەری"ست هوس"[1]م کە بەفیرعەون بانگ دەکرێت، "ست"ە لەمیسردا بەو کەسانە دەوترێت کە پیس و نەفرەت لێکراون بەواتا ئەو کەسەی کوڕ یان نەوەی ئەهریمەنە، بەڵام بۆچی فیرعەونەکان کە هەمیشە ناوی خوداکانیان لەخۆیان ناوە و هەڵگری ناوی خوداکان بون ناوی"ست هوس"یان لێ ناوە؟ چونکە شێوازی ئەم ناو لێنانە لەگەڵ ئەو ڕوداوانەی کە من دەمەوێت لێرەدا باسیان بکەم، هەروەها لەگەڵ پاڵنەر و هۆکاری نوسینی ئەم یادگاریانەدا پەیوەندیەکی زۆر بەهێزیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە کە ناچارم لێرەدا ئاماژەی پێبدەم. بۆ پەیبردن بەڕەگ و ڕیشەی ئەم ڕوداوانە پێویست بەوە دەکات کەمێك بگەڕێمەوە بۆ دواوە و ئەوەی لەزڕ دایکەکەم"موتی"ەوە بیستومە لێرەدا باسی بکەم. سەرەتا ئاماژە بەوە بدەم کە ناوی من لەناوی زڕدایکەکەمەوە سەرچاوە دەگرێت، لەڕاستیدا ئەو منی"بەکیپا"بانگ دەکرد، چونکە لەخۆشی خاوەنەکەیەوە ئەم ناوەی لێ ناوم، هەڵبەت بۆئەوەی بەهەڵەدا نەچن و وا نەزانن کە دایکم کەنیزەك بووە، دەبێت بڵێم ئەو-بەواتا موتی- خزمەتکار و یار و هاوڕێی پزیشکێکی پایەبەرز بووە کە چەندین قۆناخ و سەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکانی بینیوە و ڕۆڵێکی گرنگیشی لە ژیانیاندا گێڕاوە. ئەو کەسەش"سینۆهە"ی زڕباوکی منە. ئەو ناوە بەواتا"سینۆهە" ئەویش زڕ دایکەکەی ئەو ناوەی لێناوە: "کیپا" ناوی دایکی هەمان ئەم"سینۆهە"یە بووە. "سینۆهە" بە"موتی"خزمەتکاری دەڵێت:

---

[1] بەواژە و زاراوەوە و چەمکی ئەم سەردەمە"ست هوس" واتای "ئەهریمەن زادە" دەگەیەنێت.

حەزدەکـەم نـاوی خـۆت لـەم کـچە بنێیـت، چـونکە تـۆش وەك"کیپـا"بەسـۆز و میهرەبان و هەستیاریت و ئەوەش مافی خۆتە کە ناوی تۆ لەم کچە بنرێت و ناوت بۆ هەمیشە لەسەر زمانم بمێنێتەوە، بۆئەوەی کاتێك"موتیە"ی کچم بانگ بکەم تۆم بخاتەوە بیر.

"موتی"زڕدایکیشم هەرگیز سەرپێچی فەرمانەکانی"سینۆهە"ی نەکردووە بۆیە بێ ئەملاولا فەرمانەکەی جێبەجێ دەکات و ناوی"موتی"م لێ دەنێن! بەڵام من بەچ شێوەیەك "موتی"و"سینۆهە"م بەجێ هێشت، ئەوەش بۆ خۆی ڕوداوێکە لەدواییدا باسی دەکەم.

بابـەتێکی تـر پەیوەسـتە بـەناوی"سـت هـوس"ی{ئەهریمـەن زادە}ەوە کـە مـن بەناونیـشانی هـاوڕێی و هـاودەم لەخزمـەتی هاوسـەرەکەیدا بـوم و لەمبارەیەشـەوە دەبێـت ئامـاژە بـدەم بـە گوتـەکانی"مـوتی"زڕ دایکـم: زڕ دایکەکەشـم لەشـەوە درێژەکانی وەرزی زستاندا داستانگەلێکی زۆری بۆ دەگێڕامەوە بۆئـەوەی خـەوم لـێ بکەوێت. بەکورتیەکەی ئەو چیرۆکانەی کە بۆی دەگێڕامەوە هەموویان ڕاستەقینە بون و ئەوانـەی ڕۆڵیـان لـەم داسـتانانەدا دەبینـی بەلایـەنی کـەم هـەموویان لەژیانـدا بـون. زڕ باوکەکەشـم گـوێی لـەم داسـتانانە دەگـرت و لـەکۆتایی داستانەکەشـدا هەندێکیانی بۆ ڕاست دەکردمەوە و دەیوت: بۆئەوەی نەوەك هزری ئەم کچە پڕ بێت لەبابەتگەلی نادروست و هەندێکاتیش لەدوای ئەم قسانەی قاقا پێدەکەنی.

"مـوتی" زڕدایکیـشم وا لێکـی دەدایـەوە کـە"سـینۆهە"بـەجۆری گێڕانـەوەی داستانەکانی ئەو پێدەکەنێت و دەویت: مەگەر خۆت ئەم بابەتەت بۆ نەگێڕامەوە؟ خۆ من هیچم تێهەڵکێش نەکردووە.

"سینۆهە"ی زڕ باوکیـشم لەوەڵامـدا پێـی وت: نـەخێر وانیـە مـوتی! تـۆ ژنێکـی بێوێنـە و هۆشـیاریت و تـەواوی ئـەو بابەتانـەی مـن لەپـەرتوکی یادگاریەکانمـدا یاداشـتم کـردوون زۆر بەباشـی دەیانهێنیتـەوە یـاد خـۆت، هـیچ گومانێکیـشت لـەمن نەبێت چونکە من بـەڕۆژگار پێدەکەم، لەبیرمـە کاتێك زڕدایکەکەم"کیپـا" -کە هـیچ کەسـێك لەگێڕانـەوەی چیرۆك و داسـتانەکاندا ناگاتـە ئاسـتی ئـەو- هەنـدێك جـار چیرۆکگەلێکی بۆ دەگێڕامەوە کە وا دەهاتـە بەرچاو ئەفسانەیی و زیادەڕۆیی زۆری

تێدا کرابێت و باوکیشم کە پزیشکی هەژاران بوو ڕەخنەی زۆری لێدەگرت و دەیوت ئەم جۆرە چیرۆکانە بۆ ئەم کوڕە مەگێڕەرەوە!نەوەکو هزری پڕ بێت لە بابەتگەلی نادروست.

زڕ باوکەکەم دەیویست ئاماژە بەو بابەتە بدات کە ئەکرێت بابەتگەلی زۆر دەگمەنیش ئەگەری دوبارە بونەوەیان هەیە، نمونەی ئەو جۆرە ڕوداوە بەرجەستانەش شێوازی دۆزینەوەی"سینۆهە"و منە لەسەر ڕوباری"نیل"ە کە دوای شیکردنەوە و باسکردنی ناوی"ست هوس"و هۆکاری ناولێنانی بۆتانی باس دەکەم.

ناوی"ست هوس" شازادە"باکتامون" لەکوڕەکەی خۆی ناوە، "ست هوس"یش کاتێك بوو بە فیرعەون، خۆشی بەدوای هۆکاری ئەم ناولێنانەدا گەڕا و پەیگیری کرد و دوای ئەوەی زانی چ ڕوداوێکی سەیر و شەرمهێنەر لەژێر پەردەی ئەم ڕوداوەوە شاردراوەتەوە ناوی خۆی گۆڕی بە"ورزای داگیرەکەر".

"ورزای کێوی"جۆرێك گایە کە بۆ نمایشی زۆرانبازی گا پەروەردەیان دەکەن. گیانەوەرێکی زۆر بەهێز و شەڕەنگێزە. "ست هوس"ناوی خۆی گۆڕی بە"ورزا" بۆئەوەی خەڵکی"تبس"ناوە ڕاستەقینەکەی فەرامۆش بکەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش خەڵکی"تبس"هەرگیز کۆشکی بەردینی"باکتامون"یان فەرامۆش نەکرد، "باکتامون" بەهۆی ئەو ڕقەی لەبەرامبەر باوکی"ست هوس" بەواتا"هورم هب"دا هەیبوو، ئامادە نەبوو لەگەڵیدا بخەوێت و هەمان ئەم ڕێگریەی"باکتامون"یش، "هورم هب"ی-فیرعەونی ئەو سەردەمە-کە بەهێزترین فەرمانڕەوای میسر بوو تامەزرۆتر دەکرد و گەشتە ئەو ڕادەیەی لەبەرئەوەی لەبێداریدا نەیدەتوانی لەگەڵیدا هاوخەو بێت، ناچار بەدەرخواردانی جۆرێك دەرمانی خەوهێنەر لەکاتێکدا کە خەوی لێکەوتووە لەگەڵیدا ڕایدەبوارد و هەمان ئەم"ست"ەش بەواتا"ورزای داگیرکەر"بەرهەمی ئەم جۆرە پەیوەندیەیە. "باکتامون" کە هەڕەشەی ئابڕوبردنی لەباوکی"ست هوس"بەواتا هورم هب کردبوو، قسەی خۆی هێنایە جێ و بەئەندازەی ڕێژەی ئەو بەردانەی کە لەکۆشکێکدا بەکار دەهێنرێت پیاوانی پەلکێشی جێگە خەوەکەی خۆی دەکات و لەگەڵیاندا دەخەوێت و ڕوداوی

بنیاتنـانی کۆشـك و هۆکـاری بـەرپابونی ئـەو کۆشـکەی دوبـارە بـۆ "هـورم هـب" دەگێڕێتەوە.

"هورم هب"یش لەدووڕیانی نێوان ئیرەیی و فەرمانڕەواییـدا گیر دەخوات و بەو کێردەی کە لەکەمەریەوە هەڵیدەکێشێت دەیەوێت "باکتامون"بکوژێت، کاتێك"هورم هـب" بـەدوو دڵیەکـەوە دەڕواتـە پێـشەوە بۆئـەوەی بیکوژێـت، "باکتـامون" ئـەوەی دەهێنێتەوە بیر: لێیدە، بەڵام دەبێت دەستەڵات و فـەرمانڕەوایی لـەهزری خـۆت پـاك بکەیتـەوە و فەرامۆشـی بکـەیت! چـونکە بـەهۆی ئـەوەی ژیـانی هاوسـەریت لەگـەڵ "باکتـامون"ی شـازادە و فیرعـەون زادەدا پێـك هێنـاوە دەتوانێـت لـەڕوی یاسـاییەوە ببێت بە فەرمانڕەوا و فیرعەونی میسر.

زڕ دایکەکـەم هەندێك وردەکـاری تـری لەمبارەیـەوە بـۆ گێڕامـەوە و وتـی: "هـورم هـب"دوای دوو سـاڵ جـەنگ لـە دەور و بـەری باشـوری میـسردا بەدەسـتکەوتێکی فراوانـەوە گەڕایـەوە بـۆ"تـبس"و لـەو دەسـتکەوتانەی کـە بەدەسـتی هێنـابوو دیـاری پێشکەشی خەڵکەکەی خۆی دەکات کە ڕەشپێست بون و بەبۆنەی گەڕانەوەی"هورم هب"بۆ"تبس" بەناونیشانی سەرکردەیەکی سەرکەوتوو و داگیرکەری مەزن دە شەو و ڕۆژ ئاهەنگیان بۆ گێڕا و لەوماوەیەدا"تبس"نـوقمی عـەیش و نـۆش و خۆشـیەکان بوو، سەربازە مەستەکان لەبەیانیەوە تـا ئێـوارە و لەشـەوەوە تـا سپێدەی بەرەبەیـان لەگەڵ ژنانی"تبس"دا لەعەیش و خۆشی و بێئاگاییدا تێپەڕاند. لەئەنجامدا لەساڵی دواییــدا ژمارەیــەکی زۆر لەمنــداڵی دوو ڕەگ لــەو شــارەدا بــەدی کــرا. "هــورم هب"دیاریگەلێکی گرانبەهای بۆ"باکتامون"ی هاوسەری هێنابوو کە باسکردنی ئەو دیاریانە کاتێکی زۆرمان لێ دەگرێت-لەپەڕی "نەعامە"وە بگرە تـا بـەردی بـەنرخ و گرانبەها و دەگمەن-بەڵام شازادە خانم بگرە سەیری دیاریەکانی نەکرد و وتی:

ئەگەر من ئەم دیاریانەت لێ وەرگرم خەڵکی وا دەزانن من هاوسەری تۆم! من هەر ئـەوەی کـە کـوڕێکم بـۆ وێنـاویـت بەلامـەوە بەسـە، چیتر لەمـەودوا جـارێکی تـر لـەم ژورەی منـدا چـاوم پێـت نەکـەوێت، چ بگـات بـەوەی بتـەوێت لـێم نزیـك ببیتـەوە و بەخەیاڵی خاوت لەگەڵمدا هاوخەو بیت، ئەوەشـت لـەبیر بێـت ئـەوەی پێشتر لەگەڵ تۆدا کـردم نـەفرەتبازی بـوو نـەك عیشقبازی. ئەگـەر جـارێکی تـر وەك ئـەو شـەوەی

لەپەرستگا بتەوێت بەزۆر لەگەڵمدا ڕابوێری، بەشێوەیەك تۆڵەی خۆمت لێ دەکەمەوە کە نەتوانرێت لەمێژودا هاوشێوەی تۆمار بکرێت، لەبەرئەوەی زۆر ڕقم لێتە و بینینت هەستی هێڵنجدانم پێدەبەخشێت.

بەرنگاربونەوەی شازادەخانم"هورم هب"ی تامەزرۆتر دەکرد، ئەوکات داوای لە"سینۆهە"ی زڕباوکم کرد دەرمانێکی خەو هێنەری پێبدات زڕباوکەکەشم ئەو داوایەی ڕەت کردەوە، بەڵام"هورم هب"دەرمانی خەوهێنەر لەپزیشکەکانی تر وەردەگرێت و بێئەوەی"باکتامون"بزانێت بەشێوەیەك دەرخواردی دەدات! دوای ئەوە باکتامون خەوی لێدەکەوێت و"هورم هب"یش لەوکاتەی کە خەوی لێکەوتووە لەگەڵ جەستەی بێهەست و بێئاگای"باکتامون"دا ڕادەبوێرێت. کاتێك شازادە لەخەو هەڵدەستێت پەی بەوە دەبات کە"هورم هب" پەنای بۆ فێڵێك بردووە بۆیە لەجاران زیاتر ڕقی لە"هورم هب"دەبێتەوە و لەوەش خراپتر شازادە خانم "باکتامون" دوای چەند هەفتەیەك پەی بەوە دەبات سکی پڕە. دوای ئەوەی ئەو منداڵەی بوو ناو"ست هوس"لێ نا! و دوای ئەوەش ئەهریمەن زادە یان "ست هوس"یش ناوی خۆی گۆڕی بە"وەرزای داگیرکەر"، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە لەبارەی نهێنیەکەوە بەواتا لەبارەی خۆمەوە هەندێك شت بنوسم:

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێدا من"موتی"م و هەڵگری ناوی زڕدایکەکەی خۆمم. زڕدایکی من"موتی"بەگەواهی زڕباوکەکەم یەکێکە لەهەستیارترین و وەفادارترین مرۆڤ کە باوکم تا ئەو کاتە ناسیویەتی. ئەویش بەڕاستی خاوەنەکەی خۆی بەواتا"سینۆهە"ی بەهەموو بونایەتیەکیەوە خۆش دەویست، ئەم خۆشەویستیەشی گەشتە ڕادەیەك کە ئامادە بوو ژیانی خۆی لەدورخراوەدا لەپێناو"سینۆهە"دا بکاتە قوربانی بۆئەوەی ئەو تەنها نەبێت. شاینی باسە پزباوکەکەشم بەسزای مهرەبانی و خزمەت و وەفاداری دورخرایەوە، ئەوەیش لەڕێی پیاوێکەوە کە هیچ ڕەسەنایەتیەکی خێزانی نیە، لەباتی قەرەبوی وەفا و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی"سینۆهە" کە هەر لەسەرەتای چونە ناو ژیانی و بگرە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی، بێ هیچ گومانێك ئەو کاتانەش کە لەسەرتەختی فەرمانڕەواییدا دانیشتبوو پشتی بەهاوڕێیەتی بێخەوشی ئەو دەبەست، بەڵام"هورم

هەب" پیسیەتی و ناڕەسەنی خۆی لەبەرامبەر پشتکردنە هاوڕێیەتی"سینۆهە"وە نیشان دا.

زڕباوکەکەشم دەیوت: "هورم هەب"بگرە لەگایەکی کێویش درەندەتر و بێسۆزترە.

"هورم هەب" دوای ئەوەی دەسەڵاتی فیرعەونی بەدەست هێنا زڕباوکەکەمی بۆ شوێنێکی دور دورخستەوە، بۆئەوەی بەگوتەی خۆی بەتەواوی فەرامۆشی بکات، بەڵام بێئاگا لەو ڕاستیەی کە ڕەوتی ڕوداوەکان سەیرترین شت لەخۆ دەگرن، چەنێك باش دەبوو گەر تەنها بۆ ساتێکیش بێت ئەوە بهێنێتەوە یاد خۆی کە تەنها یەك شەهێن بەلاسەریەوە لەحاڵی فڕیندا بوو کاتێك خۆی کرد بەناو شاری"تبس"دا و ئەم زڕباوکەشم نەیهێڵا بیکوژن. "هورم هەب" کە بینەری نەخۆشی پەرکەمی فیرعەون بوو بەپێی یاسای فەرمانڕەوایان دەبێت یەکسەر بڕیاری مەرگی بەسەردا بدرێت، بەڵام بەهۆی دەست تێوەردانی زڕباوکەکەمەوە لەمەرگێکی ڕاستەقینە ڕزگاری دەبێت. لەدواییشدا بەهۆی هەندێك کارەسات و ڕوداوەوە زێڕ و زیو و گەنمی لەباوکم و نۆکەرە پێشوەکەی بەقەرز وەرگرت. من لەوباوەڕەدام بەو شێوەی ڕزباوکەکەم دەیگێڕێتەوە"کاپتا"ڕاستی دەکرد چونکە ئەو ئەم کابرا کێوی و ناڕەسەنەی باش دەناسی و ڕێی لەسینۆهە دەگرت هاوکاری ئەم پیاوە بکات.

هەڵبەت"کاپتا"لە دواییدا لە"تبس"دا ژیانێکی فیرعەونی و شکۆمەندی بۆخۆی پێکهێنا و کۆشکەکەی لەپاڵ کۆشکی"هورم هەب"دا بوو و لە"تبس"یشدا لایەنگرانێکی هەبوو کە بەیەك هێمای پەنجەی ئاژاوەیەکی لەناو شاردا دەنایەوە، "هورم هەب"لەم کاریگەریانەی زۆر دەترسا. بەڵام"کاپتا" بەو هەموو دەسەڵاتەوە بۆچی ڕێی لەدورخستنەوەی"سینۆهە"نەگرت؟ ئەم بابەتەش بەسەردەمانێکەوە پەیوەست دەکرێت کە "کاپتا" لە"تبس"دا ئەو دەسەڵاتەی ئێستای نەبوو، لەلایەکی تریشەوە"هورم هەب"خۆی بۆ دەسەڵاتی فیرعەون ئامادە دەکرد و ناوبانگی داگیرکەری سەرکەوتووی لەخۆی نابوو. لەدواییدا کەمێك گۆڕانکاری بەسەر ئەم هاوسەنگیانەدا هات، هەروەها هەندێك گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخی "تبس"یشدا هات و کەمێك لەجاران باشتر و گونجاوتر بوو، بۆیە "کاپتا"هەوڵی ئازاد کردنی خاوەنەکەی دەدا و هەر بەوشێوەی خۆی باسی دەکرد، بگرە بۆ

ساتێکیش"سنیۆهە"ی فەرامۆش نەکردووە، بگرە شەوانەش ئەوکاتانەی دەیوست بخەوێت بەبەرجەستەکردنی ڕوخساری "سینۆهە"وە خەوی لێدەکەوت، بگرە زۆرجاریش ڕۆژانە دەڕۆشتە هەمان ئەو شوێنەی کە"سینۆهە"یان لەئاودا-لەبەشی "نیل"ی خوارو -گرتبوەوە.

نۆکەری پێشووی زڕباوکەکەم بەمشێوەیە بۆ زڕدایکەکەمی باسدەکرد:

-کاتێك بەسەر بەرزاییەك کە زاڵ بوو بەسەر ڕوباری"نیل"دا دروست لەبەرامبەر هەمان ئەو شوێنەی کە"سینۆهە"دەیوت-لەناو سەبەتەیەك کە گرێی پەڕەسێلکە بازەکانی پێوە بووە گرتویانەتەوە-دادەنیشتم و تەماشای خێرایی و توانای ڕەوتی ڕوباری"نیل"م دەکرد، لەوکاتەدا سەرم لەوە سوڕمابوو کە ئەو منداڵە بەچ شێوەیەك توانیویەتی لەم ئاوە ڕزگاری ببێت و نەبووەتە ژەمە خۆراکی تیمساحە چڵێسەکانی ئەو ڕوبارە! بەڵام ڕۆژێکیان سەرەڕای ئەوەی دەمزانی گریان زیانم پێدەگەیەنێت، لەبەرئەوەی تەنها یەك چاوم هەبوو، بەئارەزوی دڵی خۆم گریام، لەوکاتەدا شەرابێکی زۆرم خواردبویەوە و بەنۆکەرەکانم وت: هەر ئێستا کەژاوەکەم بۆ ئامادە بکەن.

ئەوانیش وتیان: گەورەم بۆ کوێ بڕۆین؟

وتم: بۆ بەشی خواروی ڕوباری"نیل" هەندێجار چیتر نەمدەتوانی بەرگەی خەمی دوری کە - لە نەبینینی گەورەم"سینۆهە"ەوە سەرچاوەی دەگرت - بگرم، بۆیە پێویستم بەکەسێك یان شوێنێك بوو کە بەگێڕانەوەی یادگاری سەردەمی ڕابردوو یان سەردانی شوێنێك کە یادگاری سەردەمی ڕابردوم بهێنێتەوە یاد، بۆیە سەردانی گەڕەکی هەژارانی ڕزباوکەکەم"سینۆهە"و دوای ئەوە سەردانی شوێنی نیشتەجێ بونی"سینۆهە و موتی"ی خزمەتکارە بەوەفاکەی بکەم هەروەها بەبینینی ڕوباری"نیل" ئەو شوێنەی کە"سینۆهە"وتبوی ئەویان لەهەمان ئەو شوێنەدا گرتووەتەوە، پەیوەندیەکی ڕۆحی و سۆزداریم لەگەڵدا بەرقەرار کردبوو، کەمێك لەخەمەکانم لەوێدا بڕەوێنمەوە. من زۆر بەم خەیاڵ و بەرجەستەکردن و ڕەهاییە ڕاهاتبوم و تا ئەوکاتەی ڕۆژێکیان لەکاتی خۆرئاوابوندا، کاتێك سەبەتەیەك کە بەهەمان شێوەی ئەو سەبەتەیەی کە"سینۆهە"بۆی باسکردبوم-سەبەتەیەکی

حەسیری کە گرێی پەرەسێلکەبازەکانی پێوە بوو- لەکەنار نەیجەلانی ڕوباری "نیل"دا چاوم پێی کەوت و وامزانی ئەو دیمەنە لەخەیاڵمدا دەبینم یان لەبەرئەوەی من لەیەك چاو زیاترم نیە ئەو شتەی کە لەناو نەیجەلانەکەدا گیری خواردوە وەك سەبەتیەك دێتەبەرچاوم، چاوم نوقاند-هەڵبەت یەك چاویانم چونکە چاوەکەی ترم پێویستی بەداخستن نەدەکرد و هەر لەسەردەمی منداڵیمەوە نوقابوو- دوای ئەوە چاوم کردەوە و بینیم سەبەتەیەك بەنەیجەلانەکەوە گیری خواردووە و ئاویش بەردەوام فشاری بۆ دەهێنێت. ئەوکات زانیم کە بەڕاستی ئەوە سەبەتەیەکی ڕاستەقینەیە بۆیە یەکسەر بەرەوڕووی ڕۆشتم گرتمەوە و تەماشای ناویم کرد کچێکی ڕوتم تێدا بینی بەئارامی لەناویدا خەوتبوو و نەدەگریا. لەدڵی خۆمدا وتم بەدڵنیاییەوە مردووە و لاشەکەیان فڕێداوەتەوە ناو ڕوبارەوە، بەلام لەبەرئەوەی ساڵها لەپاڵ"سنیۆهە"دا بەناونیشانی هاوکار دەیانجار لەکۆنکردنی سەری کەسە دۆڵەمەند و هەژارەکاندا هاوکاریم کردووە، بۆیە دەمتوانی جیاوازی نێوان منداڵێکی مردو و منداڵێکی زیندوو بەئاسانی دەستنیشان بکەم. کچە-فریشتەئاساکە-زیندوو بوو! سەیر لەوەدا بوو ئەم سەبەتەیەم لەهەمان ئەو شوێنەی"سینۆهە"چەند جارێك منی بردبووە ئەوێ و ئەو شوێنەی پێنیشانداوم دۆزیەوە. ئێستا دەبێت چی لەم کچە بکەم؟ من تا ئەو کاتە خاوەنی منداڵی خۆم نەبوم و نەمبووە، بەلام شتێکی نادیار ڕویدا! سۆز و پەیوەست بونم بەو کچەوە هەر لەیەکەم تەماشاکردنمەوە لەناو دڵمدا چرۆی کرد. یەکسەر بەرەو ڕوی کەژاوەکەم ڕامکرد و وتم: زۆر بەخێرایی بگەڕێینەوەی بۆ کۆشکەکەم و بەیەکێك لەو کەنیزانەی کە دەمزانی توانای چاودێریکردنی ئەو منداڵی هەیە هەروەها کەسێکی زۆر پاك و خاوێن بوو وت: ئەو منداڵە جوان بشۆرە، بۆئەوەی لەدواییدا بڕیارێکی لەسەر بدەین.

# میوانی ناوەخت

دوای ئەوەی"کاپتا"منداڵەکەی بەو ژنە"دایەنە" سپارد، یەکێك لەنۆکەرەکانی کە ناوی"ئاتوم"بوو بانگکرد و پێی وت: دەمەوێت کارێکی گرنگت پێ بسپێرم، هەرچەنێك ئەو کارە گرفت ئامێز دێتەبەرچاو، بەڵام تا ئێستا ئەوە ڕوینەداوە کارێك بەتۆ بسپێرم و تۆ بۆم ئەنجام نەدەیت، تۆ توانایەکت هەیە کە چەندجارێك نوقمی هزری خۆمم دەکەیت و لەدڵی خۆمدا دەڵێم"ئاتوم"بەچ شێوەیەك توانی چارەسەری گرفتێکی ئاوا بکات.

"ئاتوم"یش وتی: نۆکەرەکەت تۆی خۆش دەوێت، هەموو کارێك ڕێگەچارەیەکی هەیە و منیش دەگەڕێم بۆئەوەی ڕێگەچارەیەك بدۆزمەوە.

"کاپتا"وتی: پێشتر پزیشکێکم دەناسی نۆکەرێکی وەك تۆی هەبوو کە هیچ کاتێك خۆی لەهیچ کارێك نەدەدزیەوە و لەکۆتاییدا لەئەنجامدانی ئەو کارەشدا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. -"کاپتا"ناسنامەی نۆکەرایەتی خۆی لەکەنیز و نۆکەرانی خۆی شاردبویەوە و بە بەرپاکردنی پەیکەرەکەی ناسنامەیەکی تازەی بۆ خۆی دارشتبوو- بۆیە باسی ئەمانەم بۆ کردی بۆئەوەی لەکاتی ڕودانی هەر گرفتێکدا باسی هیچ شتێك نەکەیت.

"ئاتوم"سەری ڕاتەکاند و چاوەڕێی کرد. دوای ئەوە"کاپتا"بۆی ڕونکردەوە: ساڵهایە"سینۆهە"م نەبینیوە، بەڵام ئێستا پێویست بەوە دەکات چاوم پێی بکەوێت، لەبەرئەوەی"هورم هەب"مەحاڵە ڕێم پێبدات سەردانی ئەو دورخراوەیە بکەم، بگرە ئەگەر بیشڕۆم ئەوا ڕێی گەڕانەوەم لەو چوارچێوەیە لێ دەگرێت، دەمەوێت بەشێوەیەك کەسێك بنێرمە ئەو دورخراوەیە کە بچوکترین جێ پێ لەدوای

خۆی بۆ سەربازەکانی"هورم هب" بەجێ نەهێڵێت. تۆ دەتوانی بە بەدەست هێنانی مۆڵەتی چونە دەرەوە لە"تبس"و چونە ناو دورخراوەکەوە ئەم خواستەم بەدی بهێنیت، لەبارەی زێڕ و زیویشەوە بەهیچ شێوەیەك نیگەران مەبە، سەرمایەکەی هەرچەنێك بێت من لەئەستۆی دەگرم و بۆتی دابین دەکەم. ئێستاش بەو کەسایەتی و هاوڕێیانەی کە هەتە دەتوانی ئەو داوایەم بەدی بهێنیت.

"ئاتوم"هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و سەری بۆی دانەواند و وتی: لەئێستادا ناتوانم هیچ قسەیەك بکەم، بەڵام ئومێدی بەدی هێنانی هەیە، ئەگەر لەبیرت بێت ئەو کاتەی"هورم هب"لەسەردەمی"ئەخناتون"دا پێش شۆڕشەکان لەپلەوپایەکەی لایان برد و لەباتیدا"پیپیت"ئەو پیاوە قەڵەوەیان لەجێگاکەیدا دانا کلیلی ئەم گرفتەیە.

"کاپتا"پرسی: مەگەر تۆ ئاشنایەتیت لەگەڵ ئەو پیاوە کۆتر باز و باڵندەبازەدا هەیە، ئەو لەپلەوپایەیەکدا نیە کە تۆ بتوانی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەیت.

"ئاتوم"وتی: گەورەم تۆ ڕاست دەکەیت، "پیپیت"فەرماندەی دورخراوە لەکارەکانی بەو تالانیەی کە لەپەرستگاکانی"ئامون"دا کردی باخچەیەکی ئاژەڵانی خۆشی لەتەنیشت ماڵەکەی خۆیەوە دروست کردووە، منیش هەر لەسەردەمی منداڵیەوە سەروکارم لەگەڵ ئاژەڵدا هەبووە و بەو هۆیەوە بومەتە هاوڕێی نۆکەرەکەی و چەندجارێکیش پێی شکاوی چەند ئاسکێکم بۆ گرتووەتەوە و چەند باڵندەیەکیشی کە دانیان نەدەخوارد پشکنینی چیلەدانیانم بۆکردن و بەدەرخوارد دانی کەمێك ڕۆنی تایبەت بەو جۆرە نەخۆشیانە چارەسەرم کردن، بۆیە "پیپیت"لەڕێی نۆکەرەکەیەوە جارناجارێك بۆ ئەم جۆرە گرفتانە بانگم دەکات، لەوانەیە لەڕێی ئەم فەرماندە کۆتربازو باڵندەباز و دورخراوە لەپلەوپایە و کارەکەیەوە بتوانین کارێك ئەنجام بدەین.

ئەم پێشەکیەی"ئاتوم"بو بە مایەی دەستخۆشی"کاپتا"و دوبارە لێی پرسیەوە: ئەمە نیوەی ڕێگاکەی ئێمەیە، لەبەرئەوەی تا ئەو شوێنەی ئاگادارم ئەویش خراوەتە ژێر چاودێریەوە، بەڵام بەهۆی دژایەتی کردنی لەگەڵ"هورم هب"دا هاوکاری ئێمە دەکات.

"ئـاتوم"وتـی: دەبێـت ئـەوەش بـە خاوەنـە مەزنەکـەم ڕاگەیـەنم کـە"پیپیـت" لـە"تبس"دا خـاوەنی مـەزنترین سـۆزانیخانەیە و خـەڵکانێکی جۆراوجـۆر سـەردانی ئـەم مەیخانەیـە دەکـەن و سـۆزانیەکانیش لـەپێناو دوو یـان سـێ ئەنگوسـتیلەدا دەتوانن مەزنترین و گرفتنامێزترین گرێمان بۆ بکەنەوە.

لەوکاتـەدا"کاپتـا"هەناسـەیەکی ئاسـودەیی هەڵکێـشا و وتـی: ئێـستا خـەیاڵم بەتەواوی لەوە ئاسودە بوو کە بەدڵنیاییەوە تۆ لەدورخراوە لەتەنیشت"سینۆهە"دا دەبینـم کـە پـەیامی منـی پـێ دەگەیـەنیت، بەشـەکانی تـری ئـەم کـارە دوای ئـەوەی مۆڵەتەکەت بەدەست هێنا پێت ڕادەگەیەنم.

بـەیانی ئـەو ڕۆژە"ئـاتوم"ڕۆشـت بـۆلای"کاپتـا"ی خـاوەنی و وتـی: مـژدە مـژدە دەسـتم کـەوت، هـەر بەوشـێوەی پـێم ڕاگەیانـدی ئـەو سـۆزانیخانەیە نێوەنـدی کۆبونـەوەی پیاوگـەلێکی جیـاوازە، بەتایبـەت جێگـای کۆبونـەوەی دەریـاوان و ئەفسەرانی لەنگەرگایە، یەکێك لەو ئەفسەرانە چاودێری هات و چۆی کەنارەکانە کە خۆشـی هەنـدێجار لەشـوێنی دورخراوەکـەی"سـینۆهە"وە تێدەپـەڕێت، دیـل و شـەیدای یـەکێك لەژنـە سـۆزانیەکانی ئـەو سـۆزانیخانەی"پیپـت"ە، ئـەم زانیاریـە نۆکەرەکەی"پیپیت" پێ ڕاگەیاندم.

"کاپتـا"وتـی: لـەوە باشـتر نابێـت، هـەم دەتـوانی مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو ئەفسەرەدا بکەیت، هەم مامەڵە لەگەڵ ژنی سۆزانی ئەو سۆزانیخانەیەدا.

"ئـاتوم"وتـی: لـەڕێی ئـەو ژنـە سـۆزانیەوە باشـتر دەتـوانین بەمەبەسـتی خۆمـان بگەین، خۆم ئەم کارە ڕێك دەخەم، بۆئەوەی خاوەنی مەزن و بەڕێزم لێم ڕازی بێت.

"ئـاتوم"چـەند ڕۆژێـك دیـار نـەما، دوای چـەند ڕۆژێـك بـە"پـاپیرۆس[2]"ێکـی لولکراوەوە بەورووژانێکەوە هـات بـۆ لای"کاپتا": سڵاو لـەخاوەنی گـەورە و بـەڕێزم، هـەم مۆڵەتەکـەم بەدەسـت هێنـا و هـەم نەخشەی شـوێنی ڕاگـرتن یـان هـەمان ئـەو دورخراوەیە.

[2] بەکاغەزی ئەو سەردەمەی میسر وتراوە"پاپیرۆس".

دوای ئەوەی"پاپیرۆس"ەکەی کردەوە و ئامارژەی بەمۆڵەتی سەردانی ئەو شوێنە کرد، وتی: نۆکەرێکی بچوك و هیچی وەك من خوێندەواری نیە بۆیە وەك کوێر وام، بەڵام دەزانم تۆ دەتوانیت بخوێنیتەوە و بزانیت چی لەو لاپەڕەیەدا نوسراوە!!

دەنگی قاقای پێکەنینی"کاپتا"ئاتومی نۆکەری نیگەران کرد و وای زانی لێی بەگومانە بووە، بەڵام کاتێك"کاپتا" بەسەختی هەوڵی ئەوەی دەدا خۆی لەپێکەنین بپارێزێت وتی: ئەگەر تۆ بەهەردوو چاوی تەواوی خۆت دەڵێیت نابینا، من کە لەچاوێك زیاترم نیە چی بڵێم!

"ئاتوم"بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەی ئەو هەموو پەیکەرە زۆرەی لەکۆشکەکەتدا کە تۆ لەحاڵی نوسین و خوێندنەوە و ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانەدا نیشان دەدات هەموو ساختەیە؟

"کاپتا"وتی: پەیکەرەکان نەخێر، تەنها ئەم پەیکەرانە خوێندن و نوسین دەزانن نەك من! ئێستا دەبێت کەسێك بەدەست بهێنین بۆئەوەی لەخوێندنی ئەم لاپەڕەیەدا هاوکاریمان بکات.

"ئاتوم" وتی: گەورە و بەڕێزم: تۆ چەند نوسەرێکت هەیە...

"کاپتا"وتی: بەشێوەیەك چوبومە ژێرکاریگەری گوتەکانتەوە، ئەوەم لەبیرچوبوو چەند نوسەرێکی لێهاتوم هەیە کە بگرە ئاشنای بوار و ژینگەی جوگرافیاییشن، دوای ئەوە بانگی کرد: ڕافسا! ڕافسا! ڕوداونوسی تایبەتی"کاپتا"بوو، لەو ڕۆژەوەی"سینۆهە"نێردراوەتە ئەو دورخراوەیەوە، بەفەرمانی"کاپتا"ڕوداوەکانی یاداشت دەکرد.

"کاپتا" بە"ڕافسا"ی وت: چاوێك بەم مۆڵەتنامە و نەخشەیەدا بخشێنە و ڕاست و دروستی نامە و نەخشە و شوێنەواری دورخراوەکەمان بۆ بخرە ڕوو.

"ڕافسا"وتی: ئەو کەسەی ئەم بەڵگەنامەیەی پێداون بەرپرس بووە، چونکە "مۆر"ەکەی مۆری فەرماندەییە، هەروەها نەخشەکەش زۆر بەباشی کێشراوە و زۆر بەئاسانی ڕێنمایی ئەو کەسە دەکات کە پێی دەڕوات.

"کاپتا"ڕویکردە"ئاتوم"و وتی: ئێستا نۆرەی تۆیە، هەرکاتێك ویستت بڕۆیت ئاگادارم بکە بۆئەوەی ئەمانەتێکی تایبەتت پێ ڕاسپێرم، بۆئەوەی لەوێ بیدەیت

بە"موتی"خزمەتکار"سینۆهە"، هەروەها پەیامێکی ژیانبەخشیش بگەیەنیت بە"سینۆهە"

ئەوەی بەشاراوەیی مایەوە جۆری ڕێکەوتنی نێوان ئەفسەری بەرپرسی مۆڵەتنامە و "ئاتوم"ی نۆکەری کاپتا بوو. "ئاتوم"لێهاتوانە نەیهێلا"کاپتا"بەو هەموو زیرەکیەوە سەر لەم ڕێکەوتنە دەربهێنێت، تەنها ئەوەی بە"کاپتا"وت: ئامادەی ڕۆشتن و جێبەجێکردنی فەرمانەکەی تۆم.

"کاپتا"بڕێك زێڕ و پێویستیەکانی تری دا بە"ئاتوم" و وتی: لەڕێدا پێویستت بەم بڕە زێڕە دەبێت، ئەم پێویستیانەش پێشتر"سینۆهە" لێی داوا کردبوم، لەبەرئەوەی کەسێکم بەدەست نەهێنا کە لەڕێیەوە ئەم پێویستیانەی بۆ بنێرم تائێستا لەلای خۆم هەڵمگرتووە، تۆ ئەمانە بدە بە"سینۆهە"منداڵەکەش بسپێرە بە"موتی" و پێی بڵێ جگە لەناردنی ئەو منداڵە بۆ لای تۆ هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم بەدەستەوە نەبووە.

"ئاتوم"پرسی: ئایا تەواوی ئەو هەوڵانە تەنها لەپێناو گەیاندنی ئەم منالە بەدەستی"موتی"خزمەتکاری "سینۆهە"لەدورخراوەدا ئەنجام درا؟ ئەگەر تەنها گرفتی تۆ ئەم منداڵەیە، زۆر بەئاسانی دەمانتوانی لەڕێی یاساوە ئەم کارە ئەنجام بدەین.

"کاپتا"وتی: ئەم منداڵە تەنها بیانویەکە، تۆ دەڕۆیت بۆ ئەوێ بۆئەوەی "سینۆهە" بهێنیتە سەر ئەو باوەڕەی کە لەو دورخراوەیە هەڵبێت.

"ئاتوم"لەجێی خۆی ڕاوەشا و وتی: ئەم بابەتەیان لەڕیزی فەرمانەکانی تۆدا نەبوو، لەوباوەڕەدا نیم ئەفسەری لەنگەرگا بەوە ڕازیبێت.

"کاپتا"لەوکاتەدا بەدەنگێکی بەرز پێکەنی و وتی: چارەسەرکردنی گرفتی ئەم پێشنیارەش بسپێرە بەم ئەنگوستیلە زێڕانە، تا ئێستا چەندجارێك پێم وتویت کە لەم وڵاتەدا زێڕ هەموو گرفتێك چارەسەر دەکات.

# سینۆهە بەچ شێوەیەك ڕازی بوو بەوەی دورخراوەکەی بەجێ بهێڵێت؟

دوو هۆکار بوو بەهۆی ئەوەی"سینۆهە"ی سەرسەخت بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی دورخراوەکەی بەجێ بهێڵێت، یەکەم: ئەو منداڵەی کە لەڕوباری"نیل"گیراوەتەوە کەسەردەمی منداڵی دەهێنێتەوە بیری"سینۆهە"، دووەم: ئەوەی"ئاتوم"لەبارەی شوێنی نیشتەجێبونی سینۆهە باسی"کلیکی تیمساح"ی بۆکرد و پێی ڕاگەیاند کە باشترین شوێنە تێیدا نیشتەجێ ببێت: مەیخانەی"کلکی تیمساح" لە"تبس"دا هێمنترین و ئارامترین شوێنی نیشتەجێبونە، چونکە ئەم مەیخانەیە نەك تەنها مەیخانەیە، بەڵکو لەهەمانکاتدا میوانخانەشە!"سینۆهە" بەبیستنی ئەم هەواڵە بەسرسوڕمان و لەرزەوە "مریت"ی هاوسەری هێنایەوە یاد کە پێی وتبوو، شێوازی دروستکردنی مەیی"کلکی تیمساح"وەك میراتێك لەباوکیەوە بۆی ماوەتەوە!

"سینۆهە" لەدڵی خۆیدا وتی: تۆ بڵێی"مریت" کەس و کار و خۆشك و برای هەبێت کە ئەوانیش بەهەمان شێوەی خۆی شێوازی دروستکردنی مەیی"کلکی تیمساح"یان لەباوکیانەوە بۆ مابێتەوە، ئەگەر بەڕێوبەری مەیخانەی"کلکی تیمساح"یش بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە خوشکی"مریت"ە.

"سینۆهە"پرسی: کێ بەڕێوبەری مەیخانەی"کلکی تیمساح"ە؟

"ئاتوم"وتی: ڕاستیەکەی ئەوەیە ماوەیەکی زۆر بەسەر کردنەوەی مەیخانەی "کلکی تیمساح"دا تێدەپەڕێت، چونکە خۆم یەکێکم لە کڕیارە سەرسەختەکانی مەیخانە و زۆر سەردانی ئەم جۆرە مەیخانانە دەکەم، ئەم مەیخانەیە لەسەرەتادا ناوی"ستە هوس"بوو، بەڵام لەدواییدا بەهەڵواسینی تیمساحێکی وشك کە

چاوێکی سوری هەیە بەدوو ناو ناوبانگی دەرکرد، "کلکی تیمساح" کە شەرابێکی زۆر قورس و مرۆڤ وەك مردوو لێدەکات و بووەتە هۆی ئەوەی ئەو مەیخانەیە هەموو شەوێك پڕ بێت لەکڕیاران کە خاوەنەکەی بانگەوازی ئەوە دەکات هەرکەسێك بیەوێت بێت بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح" دەبێت سەرەتا پێشوەخت شوێن بۆخۆی بگرێت.

"سینۆهە" بەسەختی کەوتە گومانەوە و چیتر دڵنیابوو لەوەی خاوەنی ئەو مەیخانەیە خوشکی"مریت"ە کە بەزانینی شێوازی ئامادەکردنی ئەو شەرابە تایبەتە مەیخانەی"کلکی تیمساح"ی دوبارە زیندوو کردووەتەوە.

ئەوەی بوو بەهۆی ئەوەی مەیخانەی"ستە هوس"-کە لەبنەچەدا بەواتای ئەهریمەن زادە دێت- ناوێکی تری لەپاڵ ئەم ناوەدا هەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلانەی -خاوەنی مەیخانەکە ئاگادار چالاکی هەڵهاتنی "سینۆهە"بوو- داڕشت و بەهۆی ئەو ئاشنایەتیەی کە لەگەڵ"ئاتوم"دا هەیبوو پێی وتبوو: تۆ تەنها بەیەك ڕێگا دەتوانیت"سینۆهە"لەدورخراوەکەی بجولێنیت و وای لێ بکەیت ئەوێ بەجێ بهێڵێت.

"ئاتوم"وتی: ئەگەر بتوانم کارێکی ئاوا ئەنجام بدەم ئەوا خاوەنەکەم نوقمی زێڕ و زیوم دەکات.

خاوەنی مەیخانەش وتی: بۆیە ئەگەر دەتەوێت ئازادی و زێڕ و زیو بەدەست بهێنیت، ئەوا هەموو ئەو مەیەی کە لەگەنجینەکەیدا کۆیکردووەتەوە بەهەر نرخێك بێت بۆم بکڕیت. "کاپتا"دوای داخستنی مەیخانەی"کلکی تیمساح"بڕێکی ناکۆتا مەیی"کلکی تیمساح" لەناو گۆزەی تایبەتدا گواستوەتەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی.

"ئاتوم"پێکەنی و وتی: بەڕێکەوت هەر لەم ماوەیەدا خاوەنەکەم پێی وتم، کاتێك شەوانە سەردانی مەیخانەکان دەکەیت ئەگەر خوازیاری"کلکی تیمساح"ن پێیان بڵێ بڕێکی زۆرمان هەیە. ئێستاش"کاپتا"ی خاوەنم بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ دەبێت و تۆش بەمەبەستی خۆت دەگەیت، کاتێك خاوەنی مەیخانە مەیی"کلکی تیمساح"ی بەدەست هێنا تیمساحێکی وشك کە چاوەکانی سور و بریسکەدار بوو بەسەر مەیخانەکەیەوە هەڵواسی، دوای ئەوە وردە وردە

مەیخانەی"کلکی تیمساح"بەهۆی ئەو پێشینە ڕاوشێنەی لەڕابردوودا هەیبوو زۆر بەزوویی لەنێو مەیخۆراندا ناوبانگی دەکرد، بەڵام کەسانێکی زۆر کەم چاویان بەخاوەنی مەیخانەکە دەکەوت، ئەو مەیخانەیە کچێکی لاو بەناوی"ستە هوس"بەهاوکاری چەند پیاوێکی کەتە و بەهێز بەڕێوە دەبرا. وردە کاریەکانی مەیخانەی"کلکی تیمساح"و ناردنی ئەو منداڵە تازە لەدایك بووە بۆ دورخراوەکەی"سینۆهە" بەتایبەت"موتی"خزمەتکاری بەتەواوی سەرسوڕماند و وای لێکرد ڕۆبچێتە بیر و هزری خۆیەوە، "سینۆهە و موتی" بەلایەنی کەم لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا ڕاهاتبون و جۆرێك ژیانی ئارام و دور لە دەنگە دەنگیان تێدەپەڕاند. ئەو هێزە سەربازیەی کە لەو دورخراوەیەدا بەناونیشانی پاسەوانی خزمەتیان دەکرد بەڕادەیەکی زۆر بە"سینۆهە و موتی"خزمەتکارەکەیەوە پەیوەست بوون هەروەها ژیانێکی زۆر خۆشیان هەبوو، بۆیە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد"سینۆهە"و خزمەتکارەکەی هەر لەو ناوچەیەدا بمێننەوە. ئەوانە بەڕادەیەك هەستیان بەهێمنی و ئارامی و خۆشگوزەرانی کردبوو کە بووە هۆی ئەوەی خێزانەکانیشان بگوازنەوە بۆ ئەو شوێنەی خزمەتی تێدا دەکەن.

چیتر ئێستا نۆرەی ئەوەیە باسی"موتی"بکەین کە بە ئەزمون و هونەرەکانی کاریگەرەیەکی تەواوی خستبووە سەر بارودۆخی ناوەکی کەسانی دەورووبەری: نانی شیرین و جۆرەکانی تری شیرینیەکان، بێ لە شێوازی لێنانی جۆرەکانی خواردن بەرنامەی ڕۆژانەی فێرکردنی ژنانی پاسەوانەکان بوو کە وەك کەنیزەك بێ ئەملاولا فەرمان و ڕێنماییەکانی"موتی"ان جێ بەجێ دەکرد. خودی"موتی"مەشقی لەسەر نوسین و خوێندن دەکرد. بەکورتیەکەی ئەو کۆمەڵە خەڵکە لەشێوەی کۆمەڵگایەکی بچوکدا هەموو هیوایەکیان"سینۆهە و موتی"بوو، کە بەبیستنی ئەو هەواڵەی ئێمە ناچارین ئەو دور خراوەیە بەجێ بهێڵین هەمویان لەنێوان دوڕیانێکدا گیریان خواردبوو. پیاوەکانی"هورم هب" کە بەلایەنی کەم لەو ناوچەیەدا بەفەرامۆشی سپێدرابوون، لەبەرئەوەی پێویستیان بەموچەی بەردەوامی دەوڵەت نەبوو، بگرە خۆیان چەند نۆکەرێکیان بۆ کاروباری کشتوکاڵ کڕیبوو بۆیە لەو ڕووەوە هیچ نیگەرانیەکیان نەبوو، لەلایەکی ترەوە حەزیان نەدەکرد"سینۆهە"و

خزمەتکارەکەی"موتی" ئەو دورخراوەیە بەجێ بهێڵن، هۆکارێکی تریش هەندێکیانی ئازار دەدا و ئەو هۆکارەش ئەوەیە کە ڕۆژێك دێت ڕۆشتنی"سینۆهە"لەدور خراوە ئاشکرا دەبێت و دەبێت لەلایەن دەوڵەتەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت.

بەڵام"سینۆهە"زۆر بەباشی پەیی بەم حاڵەتە بردبوو بۆیە وتی: نامەوێت ڕۆشتن و ئازادی من بەبەهای گرفتاری هیچ یەك لەئێوە کۆتایی بێت، بۆیە سەرەڕای ئەوەی دەتوانم بڕۆم، بەڵام کارێکی وام نەکرد، چونکە ڕێگەچارەیەکی باش بەهزرمدا هاتووە کە هەم ئەم منداڵە تازە لەدایك بووە بەئاستێك بگەیەنم کە بەشێوەیەکی باش پەروەردە بکرێت و هەڵگری هەلومەرجگەلێکی باشتر بێت و هەم ئێوەش بەهۆی ئێمەوە لێپرسینەوەتان لەگەڵدا نەکرێت، هەواڵێکی ترمان پێیە کە"هورم هب"دەیەوێت ئێمە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، لەوانەیە چەند کەسێك بۆ لەناوبردنمان بنێرێت بۆ ئێرە. هەر لەبەرئەوەش باشترین ڕێگا ئەوەیە بیانخەیتە نێوان ترس و ئومێدەوە: پێیان بڵێن خۆ ئێمە کۆت و زنجیرمان لەدەست و پێی دورخراوەکان نەبەستووە، هەر ئەمڕۆ بەیانیەکەی دیار نەمان. بۆیە بەهۆی ئەو دانپیانانەتانەوە بەهیوای دۆزینەوەمان لەئێوە دەبورن.

# ناوچەی کپ: فێرگای کەسە دۆڵەمەندەکان و دەمی تیمساح مەیخانەی کەسە پایە بەرزەکان....

فێرگای کپKAP لەو سەردەمانەی من لەخزمەتی هاوسەری فیرعەوندا بوم لەڕیزی ڕێکخراوە زانستیە دیارەکانی وەك"ماڵی ژیان"دا بوو، بەڵام خوێندکارانی ماڵی ژیان بەئەنقەست وانەی پزیشکیان دەخوێند، بەڵام لە فێرگای"کەپ" وانەی جۆراوجۆریشیان دەوتەوە. واژەی"کەپ"واتای شوێنێکی داخراو دەگەیەنێت، لەو ناوچەیەدا کۆمەڵێك فێرگای پسپۆڕی جیاواز هەبوو کە تەنها کوڕانی کەسایەتیە سیاسی و بڵند پایەکانی دەوڵەت ڕێیان پێدەدرا لەو شوێنەدا بخوێنن، بەتایبەت منداڵی کەسە خانەدانەکانی فیرعەون هەروەها خزم و وابەستەکانیان. ئەم شوێنە یاسا و بڕیارگەلی تایبەت بەخۆی هەبوو، بگرە کاری کردبووە سەر ژینگەی دەوروبەریشی، کاریگەریەکەشی گەشتبووە ڕادەیەك کە چەند ساڵێك لەوەوپێش تاکە مەیخانەی ئەو ناوچەیەیان بەهۆی ئەوەی دراوسێی فێرگای"کەپ"بوو داخست. ئەو مەیخانەیە لەناوچەیەکی چڕ و پڕ لەدرەخت و لەدیدگایەکی دڵڕفێندا لەسەر تەپۆڵکەیەك کە دەیڕوانیە ڕوباری نیل بنیات نرابوو و شەوانی خەون ئاسا و فەرامۆشنەکراوی لەهزری مەیخۆراندا دروست دەکرد. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی "ئامی" خەسوی "ئەخناتون"دا "تبس"دوچاری ئاژاوەیەکی زۆر مەزن بوبو، بۆنمونە مەیخانەکان هەر لەیەکەمین هێرشدا کەوتنە بەر پلاری هێرشبەران، مەیخانەی"کەپ"بەهۆی دوری و دور لە پلار و پەلامارەکان بەپارێزراوی مایەوە، سەرەڕای ئەوەی مەیخانەیەکی ناچالاك و بەوشێوەیەش بازاڕی نەبوو، دوای ئەوەی"هورم هب"بەناونیشانی فیرعەون هاتە سەرکار لەناکاو ئەو مەیخانەیە

دوباره زیندوو بۆیەوه و بازاڕی گەرم بوو. سەرلەبەیانی ڕۆژێکیان دەرگای مەزنی ئەو مەیخانەیە لەگەڵ دەنگی جیڕەیەکی وشکدا کرایەوه، چەندین کرێکار و ئەندازیار خۆیان کرد بەژوردا. چیتر دوای ئەوه دراوسێ پەنجەژمێرەکانی ئەو مەیخانەیە بینەری چالاکی و هەوڵی بەرچاوی کرێکار و وەستادیوار و کرێکارەکانی تر بون کە بەشێوەیەکی شکۆمەندانە سەرقاڵی نۆژەنکردنەوەی ئەو مەیخانەیە بون، تا ئەوەی چاویان بەتابلۆیەکی مەزن کەوت کە وێنەی ئەهریمەنێکی لەسەر کێشرابوو بەناوی"ستە هوس"-بەواتا ئەهریمە زادە- کە بەسەر دەرگای مەیخانەکەوه هەڵواسرابوو. ئەم مەیخانەیە هەم مەیخانە و هەم میوانخانە بوو هەروەها بە مەزنترین و جوانترین مەیخانەی تبس ناوبانگی دەکردبوو، بەڵام خۆشەویستی و ناوبانگی خێرا و برق ئاسای مەیخانە سەردەمانێك بریسکەی دایەوه کە لاشەی تیمساحێکی وشکراویان لەتەنیشت تابلۆی ئەهریمەن زادە"ستەهوس"دا هەڵواسی و ئەو بادە نایابەی ناو"کلکی تیمساح"ە مەیخانەی پڕکرد لەکڕیاران، بەڵام"ستە"ی کچی خاوەن مەیخانە بەفەرمانی دایکی تەنها پێشوازی لەڕێژیەکی کەم دەکرد کە پێشوەخت جێگایان بۆخۆیان گرتبوو، "ستە"جوانیەکی بێوێنەی هەبوو کە شەوانە لەژێر ڕوناکی چرای مەیخانەدا ئەوەندەی تر کڕیارەکانی شەیدای خۆی دەکرد. شێوە سەرنجڕاکێشەکانی مەیخانە کە لەتختەدارێکی تایبەت تاشرابوو لەگەڵ ئەو دارانەی لەبنیاتنانی ئەو تەلارەدا بەکار هاتبوو تێهەڵکێش و هونەرێکی تایبەت بەخۆی لەخۆ گرتبوو، تەختەدارەکانیان لەپاشماوەی کەشتیە نوقمبووەکان کە دواتر هەڵیانوەشاندبون ئامادەکردبوو کە هەم زۆر توندوتۆڵبون هەم زۆر گران و بەرگەیەکی زیاتر دەگرێت. ڕوناکیە ئاوێزانەکان"سورەیا"و پەردەی ڕەنگاوڕەنگ و کاسەی مەیخانە کە هەریەکێکیان لەجۆرایەتی خۆیدا تەنها هاوشێوەی لەکۆشکی فیرعەوندا بەدی دەکرا، بگرە هەندێك بەشی ئەو مەیخانەیە لە کۆشکی فیرعەونیشدا بەدی نەدەکرا.

شێوازی ناولێنانی"مەیخانە"هەربەوشێوەی ئاماژەی پێدرا، لەناوی"ستە هوس"ی کچی خاوەنی مەیخانەکەوه وەرگیراوە، ئەم کچەش سەرەڕای تەمەنی لاویەتی زۆر هۆشیار و چالاکبوو و دایکیشی تەواوی کارەکانی بەو سپاردبوو،

سەرەڕای ئەوەی لەدورەوە چاودێری کاروباری ناو مەیخانەکەی دەکرد و لەڕاستیشدا بڕیاری کۆتایی هەرکارێك خودی خاوەن مەیخانە دەیدا، بەتایبەت دەربارەی ئەو میوانانەی کە دەیانویست لەمیوانخانەی "ستەهوس"دا بمێننەوە وردبینیەکی زۆریان لەسەر دەکردن، تەنها ئەو کەسانەی بەناونیشان دەهاتن بۆ ئەوێ دەیانتوانی شەوی تێدا بەسەر بەرن. هەرلەبەرئەوەش نێردراوەکانی "کاپتا"کە سواری کەژاوەیەك بوبون و لەبەردەم "ستە هوس"دا دابەزین نائومێد لەوەی نەیانتوانی جێگایەکی تایبەت بۆ"کاپتا"بگرن ڕێگای کۆشکیان گرتەوە بەر و گەڕانەوە.

"کاپتا"پرسی: پیان نەوتن بۆچی شوێنێکیان بۆ مێوانەکانم بەئێوە نەدا؟

نۆکەرەکان وتیان: پێیان وتین دەبێت خودی سەرگەورەکەتان بێت و شوێنێك بۆخۆی بگرێت، بۆیە پێویست بەبونی ئێوە ناکات. "کاپتا"لەدواییدا شێوازی مامەڵەکردنی خۆی و خاوەن مەیخانەکە و چۆنایەتی هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی شوێنێکی باش و ئارام بەم شێوەیە بۆی باسکردم:

کاتێك نۆکەرەکان بە"کاپتا"دەڵێن پێیان ڕاگەیاندین دەبێت خودی خاوەنەکەتان بێت، سەرەتا ویستی پشتگوێی بخات، بەڵام کاتێك ئەوەی هاتەوە یاد یەکێك لەو هۆکارانەی کە بووە هۆی ئەوەی"سینۆهە"دورخراوەکەی بەجێ بهێڵت ناوی هەمان ئەم"کلکی تیمساحە"بووە، هەر لەبەرئەوە فەرمان دەدات بەکەژاوەیەك بیبەن بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح" هەر ئەوکاتەی خۆی دەکات بەمەیخانەدا"کاپتا"وەك ئەو کەسانەی هەورە بروسکە لێیداون لەجێی خۆیدا وشك ڕادەوەستێت، بۆ ساتێك سەری بۆ دواوە وەردەگەڕێنێت و تەماشایەکی چواردەوری خۆی دەکات بۆئەوەی بزانێت ئایا لەناوچەی"کەپ"ئەو شوێنە دورەدایە یان لە لەنگەرگا و مەیخانەکەی خۆیدایەتی، هەمان بۆن، هەمان ڕوناکی، هەمان تەختەدار و هەمان مەیی"کلکی تیمساح"! تەنها جیاوازی مەزنی نێوان ڕابردوو و ئێستای"کاپتا"دا ئەوەبوو کە نەیدەتوانی ئەو جۆرە مەیە بخواتەوە! "کاپتا"ڕوبەڕوی ژنێك بویەوە کە ناوی چەند"نفر"ێکی لەخۆی نابوو! سەرەتا وای دەزانی خزمەتکاری مەیخانەکە دەڵێت: دەتەوێت چاوت بەچەند کەس بکەوێت.

"کاپتا"ش لەوەڵامدا وتی: من کارم بەتەنها کەسێکە و ئەویش خاوەنی ئەم مەیخانەیە.

بیستی کەسێك وتی: فەرموو گەورەم جەنابی"کاپتا"!!من هەمان ئەو چەند"نفر"م.

کاپتا بەهۆی ئەوەی خاوەنی مەیخانەکە دەیناسی سەری سوڕما، بەڵام"چەند نفر"ئەوی لەو گومانە ڕزگار کرد و وتی: سەرت سوڕ نەمێنێ گەورەم! لەشاری"تبس"دا کەسێك بەدی ناکرێت"کاپتا"کە خاوەنی کۆشکێکە کەسەری دەدات لە کەشکەلانی فەلەك نەناسێت. بۆچی بەنۆکەرەکانت نەوت کە تۆ پێویستت بەشوێنێکە؟

"کاپتا"ش وتی: من پێویستم بەشوێن نیە، تۆ خۆت دەزانی خاوەنی کۆشکێکی مەزنم، چەند میوانێکم هەیە کە دەیانەوێت بۆماوەیەك، لەوانەشە بۆماوەیەکی درێژخایەن، لەم میوانخانەیەدا نیشتەجێ بن.

"چەند نفر" یەکسەر وتی: بەخێر بێن هیچ ڕێگریەکم لەهاتنیان نیە.

"کاپتا" کونجکاوانە پرسی: بۆچی چواردەوری ئەم مەیخانەیە ئەوەندە پاسەوانی چەکدار و کاربەدەستی دەوڵەتی لێیە، بونی ئەم جۆرە کەسانە زیان بەجوانی ئەم مەیخانەیە دەگەیەنێت.

"چەند نفر"وتی: نەخێر بەڵکو بەهۆی بونی هەمان ئەم کەسانەوەیە کە کڕیارەکانم بێ هیچ ختوکە و ئاسودەخەیاڵ هەرچی خۆیان حەزی لێ بکەن لەم شوێنە دور خراوەدا ئەنجامی دەدەن، ئەم جۆرە کەسانە ئاسایشی ئەم ناوچەیە دابین دەکەن، مەگەر خۆت تێبینی ئەوە ناکەیت کە"کەپ"شوێنێکی دورخراوەیە؟

"کاپتا"یەکسەر لایەنگری ئەو قسەیەی کرد و وتی: تۆ ڕاست دەکەیت منیش سەردەمانێك لە لەنگەرگایەکدا مەیخانەیەکم هەبوو کە بادە و خواردنەوەی خۆڕام دەدا بەپاسەوانی مەیخانەکەم، تەنها بۆئەوەی پارێزگاری لەمەیخانەکەم بکەن.

# "چەند نفر"دەردەکەوێت!!

"کاپتـا"خۆشـحاڵ بـوو بـەوەی سـەرکەوتنی لـەڕزگارکردنی خاوەنـە کۆنەکەیـدا بەدەست هێناوە و بەبینینی لەشوێنێکی نامۆ و دورخراوەدا ئەوی هێنایە گریان.

"موتی"وتی: "کاپتا"مەگری نهێنیەك لەپشت ئەم کارەوەیە.

"ئاتوم"وتی: ئەگەر گەورەم ڕێگام پێبدات من ئەم نهێنیە ئاشکرا دەکەم، چونکە لـەم مەیخانـەدا ئـەوەم بـەرگوێ کـەوتووە کـە هەرکەسـێك بـەدوای ئاشـکراکردنی نهێنی"ستە"دا بگەڕێت توشی بەڵایەك دەبێت.

"مـوتی"وتـی: لەوانەیـە لەبەرئـەوەی"سـتە"واتـای ئەهریمـەن دەگەیـەنێت، نـاوی کوڕەکەی هورم هب"ست"ە -ئەهریمەن زادە-یە.

"ئاتوم"وتی: بەڕێکـەوت نـاوی"ستە"ش هـەمان ستە هوسـی"ئەهریمـە زادەیـە" شەوی پێشوو بیستم کە کەسێك ئەوی بە"هوس"بانگکرد!! دوای ئـەوەی بەگاڵتـەوە وتـی: لەوانەیـە دایکـی"سـتە هـوس"یـش لەگـەڵ پیاوگـەلێکی زۆردا خـەوتبێت و دایکیـــشی لـــەباوکی منداڵەکـــەی زۆر بێـــزار بوبێـــت، هەرلەبەرئـــەوەش ناوی"ستەهوس"ی لێنابێت!

بێدەنگیەکی قوڵ دوای ئەو قسە گاڵتەئامێزە باڵی بەسەردا کێشان.

"ئاتون"وتی: خۆم ئەو نهێنیە بەبڕێك زێر ئاشکرا دەکـەم، مەگـەر"کاپتا"نـەیوت لە"تبس"دا هەموو گرفتێك بەزێر چارەسەر دەکرێت.

"کاپتـا"وتـی: لـە"ممفـیس"دا زیـو بەئەنـدازەی زێـر دەسـتەڵاتی هەیـە، بـەڵام لەبەرئەوەی ئەم بابەتە پڕ بەهایە، هیچ زیانێك نـابینی گەر لەپێناویـدا زێـر بـەفیڕۆ بدەیت.

"ئاتوم"لەشەوێکی تردا بەداواکردنی گۆزەیەکی بچوك"کلکی تیمساح"-کە لەچەند پیاڵەیەك زیاتر ناگرێت-لەنزیك پێشخوانی مەیخانەکەوە دانیشت و زێڕێکی گەورەی خستە ناومشتی"ستە"وە. "ستە"ش سەرسوڕماو لەو بەخشندەییە بەدەم ڕاکردنەوە خۆی کرد بەژورێکی ئەو مەیخانەیەدا، بەلاَم بەڕوخسارێکی گومانـاوی و دڵگرانەوە هاتەوە پشت پێشخوانەکەی بێئەوەی تەماشای ڕوخساری"ئاتوم"بکات. "ئاتوم"یش سەرسوڕماو لەگۆڕانی حاڵەتی دەرونی"ستە"ویستی هۆکارەکەی لێ بپرسێت. "ستە"ش دوای ماوەیەك لە"ئاتوم"نزیك بویەوە بەگەرمیەکەوە کە لێی چاوەڕێ نەدەکرا پرسی: تۆ لە"تبس"ەوە دێیت؟

"ئاتوم"وتی: بەڵێ، بۆچی؟

دوای ئەوە لێی پرسی: تۆش لەگەڵ ئەو ژنەدا هاتویت کە منداڵێکی بچوکی لەباوەشدایە؟

"ئاتوم"وتی: من نۆکەری نۆکەری خاوەنی ئەو ژنەم!

"ستە" لەوکاتەدا بەدەم بزەیەکەوە وتی: لەباتی نهێنیەك بوبە چەند نهێنیەك.

"ئاتوم"وتی: دەتوانم بپرسم ئەم مەیخانەیە هی کێیە؟

"ستە"وتی: ئەم مەیخانە و میوانخانەیە هی"چەند نفر"- بەاتا هی نفر نفر نفر-ە!

"ئاتوم"سەرێکی ڕاوەشاند و وتی: ئاوا، وام لێکدەدایەوە کە... دوای ئەوەی بەرتیلێکی تری دا بە"ستە" گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکانی و وتی: ئەم مەیخانە و میوانخانەیە هی"چەند نفر"ە.

"سینۆهە"پرسی: لەکوێوە زانیت؟

"ئاتوم"وتی: ئەو کچەی کە بەڕێوەبەری ئەم مەیخانەیە پێی وتم.

"کاپتا"وتی: من قسەم لەگەڵدا کرد بەلاَم لەوکاتەدا ڕوخساری داپۆشیبوو، بەڕاستی سەرم لەوکارەی زۆر سوڕمابوو.

لەوشـەوە پـڕ ڕووداوەدا"سـتە"بـەوەرگرتنی چـەند ئەنگوسـتیلەیەکی زێـر کـە لە"تبس"دا خەرجی مانگانەی چەند خێزانێکە، داوای لە"ئاتوم"کرد سبەی شەو لەمیوانخانەدا میوانی ئەو بێت.

کاتێك"ئاتوم"گوێ لەم میوانداریە بوو ڕاوەشا و وتی: ئایا من و تۆ.....

"ستە"پێکەنی و وتی: هاوڕێکانت و من و "چەند نفر"ی خاوەنی مەیخانە!

شـەوی دوایـی"کاپتـا و مـوتی و سـینۆهە" بـەڕێنمایی"ئـاتوم"لەباشـترین و ڕازاوەترین ژوری مەیخانەدا دانیشتن. ڕازانەوەی تەلار بەلای"سینۆهە"وە زۆر سەیر دەهاتــە بەرچــاو، سەرســتونەکانی"ئــامون"ی و لەهــەمووی گــرنگتر بەســەر تەلارەکەشـەوە پەیکـەری ڕەشـی"خـودای بـەدی هێنـەری ئارەزووەکـان"کـە سـەری لەشێوەی پشیلە هەڵکۆڵرابوو.

لەوکاتەدا"موتی"بە "کاپتا"ی وت: تۆ ئەمڕۆ دەبێت خۆشحاڵ بیت کە توانیوتە خـاوەنی پێـشوت ڕزگـار بکـەیت و منـداڵێکی تـازە لـەدایك بوشـت وەك ئـەو لـەئاو گرتووەتەوە و تێکەڵی ژیانی ئێمەت کردووە.

لەوکاتەدا"سینۆهە"هیچ قسەیەکی نەدەکرد و بێدەنگ ڕۆچوبوە هزری خۆیەوە.

"موتی"زڕدایکیشم پرسی: مەگەر خاوەنی مەزنم خۆشحاڵ نیە، هیچ نەبێت لەپێناو ئایندەی ئەم منداڵە خۆشحاڵ بە.

"سینۆهە"وتی: لەڕاستیدا دڵگرانی ئایندەی ئەم منداڵەم، من کە لەلای کەسانی وەك فیرعەون زادە، پزیشکی تایبەتی فیرعەون، هەروەها کەسێکی دۆڵەمەند ولەگەڵ چـەند هاوڕێیـەکی وەك"کاپتـا و مـۆتی و مریـت"دا بـوم، بـەلام ئێـستا تەماشـا کـە توشـی چ ڕۆژێکـی ڕەش بـووم، لەبەرئـەوەی خۆشـم وەك ئـەم منداڵـە نۆزادێکـی سـەر ڕێ بوم، هەروەها کوڕ بوم، بەلام ئێستا قوڕ بەسەری ئەم کچە بێدەرەتانە.

"کاپتــا"وتــی: مــن تــادواین ئەنگوســتیلەی زێــڕ و مــسم خــەرجی خۆشبەختی"موتیە" دەکەم.

"سـینۆهە"لـەناکاو سـەری هـەڵبڕی و وتـی: مـن نیگـەرانی ئـەم گواسـتنەوە و هەڵهاتنەم، چونکە لەوانەیـە پاسـەوانەکانی کـەنار دەریـای ڕۆژهـەلات بەبۆنـەی ئێمـە توشی سزا بین.

"کاپتا"وتی: گەورەی بەڕێزم لەبارەی نیگەرانی پاسەوانەکانیەوە خەیاڵی ئاسودە بێت، چونکە دوای ئەوەی ئێوە ئەوێتا بەجێهێشت، بۆئەوەی نەوەکو "هورم هب" ئازاریان بدات بۆئەوەی ڕاستیەکانیان بۆ بگرێنەوە، من شوێنێکی پڕ لەرامەتم لەسوریادا بۆ دیاری کردون و بەناونیشانی کارگوزار و خزمەتکار ناردونم بۆ ئەویێ، چونکە دەمزانی لەوانەیە خاوەنە بەڕێزەکەم نیگەرانیان بێت.

"سینۆهە"وتی: ئێستا کەمێك خەیاڵم ئاسودەم، ئێستا با بڕۆین لەو مەیخانە بخۆینەوە کە دەڵێن مەیی"کلکی تیمساح"دەدەن بەکڕیارەکانیان، سەرەڕای ئەوەی پیر بوم بەڵام بەباشی دەتوانم تامی"کلکی تیمساح"جیابکەمەوە و دەستنیشانی بکەم، هەروەها دەمەوێت بزانم چ کەسێك ئەم مەیەی هێناوە بۆ ئێرە و زۆریش حەز دەکەم خاوەنی ئەم مەیخانەیە کە دەڵێن ژنە ببینم.

"موتی"وتی: دەتوانم بپرسم پێداگری خاوەنی بەڕێزم بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ خاوەنی مەیخانەدا کەناوی"ستە"یە چیە؟

"سینۆهە" دەڵێت: یەکێیان لەبەرئەوەی بپرسم بۆچی ناوی"ستە"یان لەم مەیخانەیە ناوە، دووەمیان ئەم مەیی"کلکی تیمساح"ەی لەکوێ ئاشکرا کردووە.

"کاپتا"کە بینی"سینۆهە"سورە لەسەر کارەکەی خۆی، وتی: ئەگەر نۆکەر لەیەك کاتدا وەڵامی هەردوکیان بداتەوە، سەرەڕای ئەو وەڵامەش هەر سور دەبیت لەسەر ئەوەی چاوپێکەوتن لەگەڵ خاوەنی مەیخانەدا بکەیت؟

"سینۆهە"وتی: تەنها کاتێك کە بزانم خوشکی"مریت"نیە، چونکە تەنها خوشکی"مریت"دەتوانێت مەیی"کلکی تیمساح"ئامادە بکات.

"کاپتا"وتی: کاتێك نۆکەر وەڵامی ئەو دوو پرسیارەی دایەوە، خۆی لەخۆیدا ئەم نهێنیە ئاشکرا دەبێت.

"سینۆهە"ش کە ئەم بابەتە بەلایەوە سەرنج ڕاکێش بوو، وتی: هیچ کاتێك وەك ئێستا بەوشێوەیە نهێنی پارێز نەبویت دە زوو پێم بڵێ، بۆئەوەی بزانم بەچ شێوەیەك ئەو هەموو بابەتە ئاڵۆزانەم بۆ چارەسەر دەکەی.

"کاپتا"وتی: لەبارەی مەیی"کلکی تیمساح"ەوە دەبێت خەیاڵی خاوەنی بەڕێزم ئاسودە بکەم کاتێك دروستکەرەکەی ئاگری گرت و بوبە خۆڵەمێش، شێوازی

دروستکردنی ئەم جۆرە مەیەشی لەگەڵ خۆیدا بردە گۆڕەوە. ئەم مەیی"کلکی تیمساح"ە من لەناو خەزێنەکەمدا هەڵمگرتبوو و بۆ پەلکێشکردنی تۆ بۆ ئێرە پێشکەشی خاوەنی مەیخانەکەم کرد بۆئەوەی ناوی"کلکی تیمساح"بەسەر مەیخانەکەوە هەڵواسن بۆئەوەی وا لەتۆ بکات جارێکی تر سەرنجت بەلای"ئامون"دا پەلکێش بکرێتەوە!

"سینۆهە"وتی: بەڕاستی پیشەکیەکی کاریگەر بوو. کەواتە هیچ دروستکەرێك بونی نیە کە خوشکی"مریت" بێت! بەڵام لەبارەی ناوی"ستە"، ئەم ناوە بۆچی لەکچی خاوەنی مەیخانە نراوە و ناوبانگی جوانی لەناوشاردا بڵاو بووەتەوە و دەڵێن لەجوانیدا وێنەی نیە.

هەروەها"سینۆهە"وتی: هەر لەبەرئەوەش زیاتر خوازیاری ئەوە بوم چاوم بە"ستە"و مەیخانەکە بکەوێت، دەبێت نهێنیەك لەپشت ئەم ناوەوە شاردرابێتەوە...

سەرەڕای ئەوەی ناوی"ست"هزری"سینۆهە"ی سەرقاڵکردبوو، وتی: ئەم سەری پشیلەیەم لەشوێنێکدا بینیوە، بەڵام لەبەرئەوەی نەیتوانی بیهێنێتەوە یاد لە"ستە"ی پرسی: سەری پشیلەی"خودای بەدی هێنەری ئارەزوەکان"م لەشوێنێکدا بینیوە.

"ستە"وتی: نازانم تۆ سەری ئەم پشیلەیەت لەکوێدا بینیوە، دوای ماوەیەکی تر"چەند نفر"بۆتی ڕوندەکاتەوە.

"سینۆهە"وتی: مەبەستت خاوەنی مەیخانە و میوانخانەکەیە.

"ست"وتی: ئەگەر بۆماوەیەك دان بەخۆتاندا بگرن پەی بەهەموو ئەو نهێنیانە دەبەن، ئێستاش ڕێم پێبدەن بۆ زیاتر کردنی سەرسوڕمانتان چراکان خامۆش بکەم، هەرکاتێکیش وتم چاوتان بکەنەوە، چراکانیشتان بۆ دادەگیرسێنم، دوای ئەوە دەتوانن چاوتان بکەنەوە.

ئەو بێدەنگیە کە لەو ماوە کورتەدا بەلای"سینۆهە و موتی"کە منداڵەکەی بەباوەشەوە بوو هەروەها"کاپتا" کە بەدڵەڕاوکێوە چاوەڕێی بینینی"چەند نفر" و "ئاتوم" کەوای دەزانی"ستە"ی شۆخ و شەنگ حەزی لێکردووە، بەدەنگی ترپەی پێی ژنانە شڵەقا، دوای ئەوە بیستیان کە کەسێك وتی: چراکان داگیرسێننەوە و

"نفر نفر نفر"یش وتی: داستانی دور و درێژی پیاوێکە کە عاشقی ژنێك دەبێت و ژنیش لەوکاتەدا چەند مەرجێکی بۆ دانا و پیاویش یەکسەر هەمووی جێبەجێکرد.

"سینۆهە"وتی: تاوانی ئەم ژنە بوو کە ئەو پیاوەی هانی ئەو جۆرە کارانە دا.

"نفر نفر نفر"وتی: پیاوانی بەهێز و توانا ژنان ورد و هان دەکەن، مەگەر هەر"هورم هب"نەبوو لەیەکەمین مەرجدا دەرگایماڵەکەمی بەلەقە کردەوە و بەدەم جنێودانەوە بێئەوەی هیچ گرنگیەکم پێبدات بەجێی هێشتم، بگرە ئەنگوستیلەیەك میسشی پێنەدام، چ بگات بەگۆڕی دایك و باوکی. من لەهەموو مامەڵەیەکدا مەرجم لەگەڵدا دەبەستی، تۆم لەخۆم دور دەخستەوە، بەڵام بگرە تۆ ئەم نۆکەرەشت پێ فرۆشتم، ئێستاش لەڕوی یاساییەوە دەتوانم هەر ئێستا بانگەشەی ملکداری"کاپتا"بکەم و بیکەمەوە بەنۆکەری خۆم بۆئەوەی پاك و خاوێنی مەیخانەکەم لەئەستۆ بگرێت و بەردەوام گسکی بدات! لەئێستادا ئەو بەنۆکەرێکی هەڵهاتو لەقەڵەم دەدرێت و منیش بەهای ئەوم بەخاوەنەکەی داوە.

"کاپتا"ش کە خاوەنی کۆشکێکی مەزن بوو، بەم قسانە زۆر دڵگران بوو و وتی: لە"تبس"دا "هورم هب"یش ناتوانێت بێ مۆڵەت خۆی بکات بەناو کۆشکەکەمدا، چ بگات بەوەی تۆ بتەوێت من بکەیت بەهی خۆت.

"نفر نفر نفر"وتی: لە"تبس"دا بەڵی تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئێستا تۆ لەماڵ و مەیخانەی من و لەنێو پاسەوانەکانی مندایت، بێهودە بەپرسیارگەلی بێبنەما خۆت لەم ڕاستیانە مەدزەرەوە، چونکە دەزانم"سینۆهە"زۆر تامەزرۆی ئەوەیە بزانێت لە"مردوخانە"دا چی ڕویداوە و بەچ شێوەیەك لەئێستادا لێرەم!چونکە ئاگاداری ئەوەبوم کاتێك کچەکەم"ستە"منی بادایکی خۆی بانگکرد، لەوکاتەدا کونجکاوانە تەماشایەکی ئەوی کرد و هەر لەوساتەدا بێندەنگی باڵی بەسەر ئەو ژورەدا کێشابوو، دوای ئەوە "نفر نفر نفر"بێپەردە هەموو بەسەرهاتەکانی لەبەردەم کچەکەی خۆی"ستە هوس"دا باسکرد:

ئەو شەوەی تۆ منت بە"مردووخانە"سپارد، بەپێی خواستی تۆ، ئەوەی تۆ پێت پێوتن لەوە خراپتریان بەسەر مندا هێنا و چەندین مانگ هەموو ڕۆژ و شەوێك

تەواوی کرێکارەکانی مردووخانە وەك کەرەستەی یاریکردن لەگەڵ خۆیاندا دیانبردمە جێگەخەوەکەیان یان بەسەر بەردێکی مۆمیایی یان هەرشوێنێك کە خۆیان حەزیان لێبێت لەگەڵمدا ڕایاندەبوارد، بەکورتیەکەی..... ئەم حاڵە بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی سکم پڕبوو، کاتێکیش سکم پڕبوو، ویستم خۆم بکوژم، بەڵام کاتێك ئەوەم بەهزردا هات گەر ئەم کۆرپەیە لەسکمدا بپارێزم دەتوانم خۆم لەم نەهامەتیە ڕزگار بکەم، بۆیە لەهەمان ئەو شوێنەدا بڕیارمدا هەم خۆم لە مردووخانە ڕزگار بکەم و هەم تۆڵەی خۆم لەتۆ بکەمەوە، لەوکاتەدا هەستی تۆڵەکردنەوەم زۆر بەهێزبوو، ئالێرەدا بووکە چیتر فێڵ و تەڵەکەی ژنانە و هۆکاری سەرنجڕاکێشی پیاوانم بەدەستەوە نەمابوو بۆیە پەنام بۆ زێڕ و زیو برد. سەرنجی سەرپەرشتی مردووخانەکەم بەلای خۆمدا ڕاکێشا و پێم وت: بەدوو مەرج بڕێك کانزای زەرد، هەروەها یەکێك لەکەنیزەکانی خۆمت پێدەدەم بۆئەوەی بەئارەزوی خۆت لەگەڵیدا ڕابوێریت، یەکەم ئەوەی من لەم مردووخانەیە ببیەتە دەرەوە، دووەم بەڵگەنامەی مەرگم کە مۆری پزیشکی پێوەیە بدەیتەوە بەخۆم، بۆئەوەی سکاڵا دژی بەرز بکەمەوە. سەرەپەرشتی کرێکارەکانی مردووخانە کە تۆی باش دەناسی و زۆریش خۆشی لەتۆ نەدەهات، منیش لەهەمان ئەوکاتەدا چاویم بە زێڕ و زیو بەست و بەڵگەنامەی مەرگەکەمی دایەوە بەخۆم، منیش یەکسەر ڕۆشتم بۆ لای"هورم هب" و وتم: ئامادەم هاوکاری دارایی بکەم بەمەرجێك تۆ بۆ شوێنێك دور بخاتەوە کە نەتوانی هەناسەش بدەیت!

"هورم هب"یش وتی: من قەرزاری"سینۆهە"م، چونکە ئەو پیاوێکی میهرەبانە و سودێکی زۆریشی بەمن گەیاندووە.

منیش پێم وت: منیش دەتوانم سودت پێ بگەیەنم و زێڕت پێدەدەم، هەروەها بۆئەوە هاتوم بۆلات کە سکاڵای خۆمت لا بکەم، تۆ دەبێت لەدیدی دەستەی پزیشکان و دادوەرانی دادگاوە"سینۆهە" لەپزیشکی بێبەش بکەیت، دوای ئەوەی بەڵگەیەکی مۆرکراوی کەسێکی مردوم خستە بەردەستی وتم: بەناوی ژنێك سکاڵام لەپزیشکی تایبەت هەیە!... بەبۆچونی من سوکترین سزای بەسەرتۆدا سەپاندووە و سزایەکی ئاسانی وەك ئەو دورخستنەوەیە لەبەرامبەر کارێك لەبەرامبەر مندا

ئەنجامت دا بەسەر تۆدا سەپێنراوە. بۆچی؟ چونکە تۆ لەئاستی ڕەقەبەرایەتی و لاوازیدا بەزۆری دەستەڵاتت تۆڵەت لێکردومەتەوە، ئەو خاڵەی زۆر دوپاتم کردەوە و وام لە"هورم هب"کرد بڕیاری کۆتایی لەسەر ئەم کێشە بدات، ئەوەبوو پاسەوانانی ئەو شەوەشم دۆزیەوە کە تۆ بەناوی"هورم هب" و بەفەرمانێکی ساختە هانت دابون ئەو تاوانە لەبەرامبەر مندا ئەنجام بدەن. "هورم هب"یش بەبیستنی ئەم قسەیە زۆر توڕە بوو و وتی: چیتر ئەم بابەتەیان بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت چاوپۆشی لێبکرێت، بەلایەنی کەم لەبەرئەوەی سینۆهە هەلومەرجی هاوڕێیەتی منی قۆستووەتەوە بۆ کاری تایبەتی خۆی، دەبێت بەسزای خۆی بگات.

نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەیت دوای دورخستنەوەشت پیاوەکانم چاودێریان دەکردی، تەواوی گواستنەو و ئەو کەسانەی هاوکاریان کردن هەروەها ئەم"ئاتوم"ەی لەتەنیشتەوە دانیشتووە، بۆ "چەند نفر"کاریان کردووە، بەواتا"یەك نفر"بەواتا"نفر نفر نفر" من"کاپتا"دەبەخشم و ئازادی دەکەم! ئێستا دەبێت بەپەلە دورباره هەڵبێیتەوە، جاری پێشوو لە"تبس"هەڵهات، ئێستا بەپێچەوانەوە دەبێت بەرەو"تبس" هەڵبێیت. "سینۆهە"ش دوای چەند ساتێکی تر بەکەژاوەکەی ڕوانەی لای پیاوەکانی"هورم هب"ی دەکەم بۆئەوەی بەپێی یاسا مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، بەڵام"موتی"و ئەم منداڵە تازە لەدایك بووە دەتوانن لەهەمان ئەو ژورەی کە بەکرێتان گرتووە و کرێکەیتان ڕاستەخۆ داوە بژین، چونکە دیار نیە چارەنوسی"سینۆهە"ی هەڵهاتوو چی دەبێت، تۆ لەئێستادا بحەوێرەوە و چاودێری لەو منداڵە بکە، بەچاوی خۆت دەبینی"نفر نفر نفر"بەزۆر هیچ شتێك بەسەر هیچ کەسێکدا ناسەپێنێت! ئەگەر ویستت بمێنیتەوە ئەوا هەموو پێویستیەك بۆئەم منداڵەش دابین دەکەم، ئەگەر حەزیشت نەکرد بمێنیتەوە، ئەوا دوای ئەوەی"هورم هب"بڕیاری دا بەچ شێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ"سینۆهە"دا بکرێت و شوێنی دور خستنەوەی دەستنیشان کرا دەتوانی پەیوەندی پێوە بکەیت، خۆزگە"سینۆهە"کتێبەکەی تەواو نەکردایە و ئەم بەسەرهاتەشی بۆ زیاد بکردایە...

## موتیە لەباتی سینۆهە

ناوم"موتیە"یە، من نە دایك و نە باوكی ڕاستەقینەم خۆم بینیوە، بەلاّم لەسەردەمی مندالّیمدا زڕدایكەكەم كە ئەم ناوەی من -ناوی ئەو بووە-و بەداوای زڕباوكەكەم ئەو ناوەی لێناوم، من ڕوداوەكانی سەردەمی مندالّی تا دەگات قۆناخەكانی سەردەمی لاویەتیم زانیاریەكی بڕواپێكراوم هەیە، دەزانم لەسەردەمی مندالّیمدا لەگەلّ زڕدایكەكەمدا گواسترامەوە بۆ مەیخانەیەك، لەو شوێنەدا كچی خاوەنی مەیخانەكە گرنگیەكی زۆری پێدەدام، و من و ئەو پەیوەست بونێكی زۆر بەهێز لەنێوانماندا دروست بوو، هەروەها منیش بومە هۆی ئەوەی ئەو ببێتە هاوسەری جێنشینی فیرعەون كەلەدواییدا بوو بەفیرعەون. "ستە" كە نەیدەتوانی بەرگەی دوریم بگرێت، هەفتەیەك دوای ئەوەی ژیانی هاوسەری پێك هێنا منی لەگەلّ خۆیدا برد بۆ بارەگای فیرعەون و لەپێویستیەكانی بارگا بۆنمونە مامۆستایانی پلە یەك وانەیان پێدەوتمەوە، هەروەها"ستە"حەزی دەكرد یادگار ڕاستەقینەی ئەو بارەگایە بەیاداشتكراوی بمێنێتەوە و منیش بەپێی خواستی ئەو دەستم كرد بەنوسینی بابەتەكانی ڕۆژانە...

كەسایەتیە سەیرەكانی مێژوو[3]

---

[3] ناوی"ژان فرانسرالیون"لەمێژوودا بەجاویدانی بمێنێتەوە، چونكە ئەو بەوەرگێڕانی شێوازی نوسینی"هیروگلیفی" ڕۆشنبیرانی بە نوسراوە هەلّكۆلّراوەكانی میسری دێرین ئاشناكرد.

پەیوەندی هاوسەری "ست هوس" و "ستەهوس" ئەمریمەن زادە لەگەلّ ئەمریمەن زادە"دا لەوشوێنەی كە ڕەوتی ڕوداوی دور و درێژی ئەم بەسەرهاتە كە لەگەلّ ئەم پێك هێنانی ژیانی هاوسەریە سەیرەدا دەگێڕدرێتەوە، بەكورتی دەبێت بزانن كە "ست" لە تبسدا لە"كەپ"دا كەنێوەندی زانستە دەیخوێند و شەوانە بەدزیەوە دەڕۆشت بۆ"كەپ" و عاشقی"ستە هوس"دەبێت و ژیانی هاوسەری لەگەلّ یەكدا پێك دەهێنن، لەو قۆناخەدا"موتیە"ش كچێكی لاو بوو و "ستە هوس" زۆر پێیەوە پەیوەست بوو، بۆیە ئەویش لەگەلّیدا دەڕوات بۆ بارەگای فیرعەون، "ستە هوس"ی شاژن "موتیە" دەبێت بە هاودەم و هاوڕێی... "ستە هوس" سێ مندالّی لە"ست هوس"بوو كچێك بەناوی"دولانت"دوو كوڕیش بەناوی"شنار و ڕامسیس"

# "شنار و ڕامسیس" کوڕەکانی"ست هوس" لەگۆڕەپانی تاقیگادا

گـای کێـوی"وەرزای" چـاوی لـە"ڕامـسیس" هەلنـەدەبڕی، گیانـەوەرێکی ئەنـدام کەتە و زل و بەهێز و هێرشبـەر کە لاقێکی وەك پایەی هـەبوو، گوێکانیـشی درێـژ و پان و بەلایەکدا شۆڕ بوبون، لەلایەکەوە چاوانێکی گـەورە و ڕامـاو، شاخەکانیـشی هێنابووە خوار و لەجێی خۆیدا نەدەجولا، تـەنها تەماشـای دەکرد. نەژادی"وەرزای کێوی" لەلای تەواوی ڕاوچییەکان ئاشکراو و تۆقێنـەر بـوو. "گـای کێـوی"ترسـناك و شەڕەنگێز و زۆر هەستیار لەگەڵ لەشێکی بزوێنەر کە لـەپلار و تـەکانێکی شـێتانەدا خۆی بۆ هێرشکردن ئامـادە دەکـرد، کلکی زۆر لەسـەرخۆ ئەمبەرەوبـەری پێدەکرد. لەمەودایەکی زۆر کورتـدا لـەنێوان بـاوك و کـوڕی نیگـەرانیدا، نیگـەران لەچاوەڕوانی بــەرگری تاقیکردنــەوەدا چــاویان لــە گــا کێویەکــە هەڵنــەدەبڕی: فیرعــەون لەســەردەمی"ســت هــوس"و کوڕەکــەی "ڕامــسیس" بۆماوەیــەك لەهەلومــەرجی بەرگریکاریدا ساتژمێریان دەکرد. "ست هوس"کە لەسەر بنەمای چـەند بەڵگەیـەکی نـەخوازراو و شـومدا نـاوی"سـت هـوس"یـان لێنـابوو، بـەڵام ئـەو نـاوی"وەرزای داگیرکەر"لەخۆی نابوو، فیرعـەون کوڕەکـەی لـەگۆڕاپانێکی ڕاسـتەقینەدا لەبەرامیـەر ڕکابـەرێکی بـەهێز و پێـداگردا ڕاگرتبـوو. "ڕامـسیس" کـە گایـەك لەبەرامبەریـدا ڕاوەسـتابوو و باوکیـشی لەپـشتیەوە بـوو، بـەبارودۆخێکی دەرونـی و جەسـتەیی سـەختدا تێدەپـەڕی. کـوڕە نەیـدەتوانی لـەجێگای خـۆی تـەکان بخـوات، چـونکە "گا"کێویەکە سـەد مـەتر لێیـەوە دور بـوو، لـەناکاو بەپەلـە هێرشـی بۆ بـرد. "ست هوس" — وەرزای داگیرکەری–میسر کە هەمان ڕوکار و بونایەتی ئامادەی بەس بوو بۆئەوەی دژمنەکەی بهێنێتە لەرزین، لەپشتی "ڕامسیس"ەوە ڕاوەستا و تەماشای

دەکرد. دەیزانی جوڵەیەکی هەڵە ئەکرێت بگۆڕدرێت بەکارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو. "ست هوس"گۆڕا بوو بە ئەندامێکی باریك، ڕوخسارێکی جدی، نێوچەوانێکی درێژ و کەسایەتیکەی شکۆمەند، بەشێوەیەك کە کەسانی چواردەوری زیاد لەگا کێویەکە لێی دەترسان. لەو ساتەدا ئەم پرسیارە هات بەهزری"ڕامسیس"دا کە ئایا "ست هوس" زیاتر دڵی مرۆڤ دەهێنێتە لەرزین یان ئەم گا کێویە؟ چونکە "ست هوس"یش وەك ئەو گا کێویە هەمان ئەم دڵەڕاوکێیەی لەدڵی مرۆڤدا دروست دەکرد. "ڕامسیس"ی لاو بەدودڵیەکەوە بیری لێکردەوە کە نابێت بترسێت، لەوکاتەدا ئەوەی هاتەوە یاد کە"ساری" ڕاهێنەرەکەی پێی وتبوو گای کێوی گیانەوەرێکی ئاسانە، ئاگری ئەو جیهانەکەی تر لەجەستەیدا لەحاڵی خرۆشاندایە و هاوڕێی خودایانە! زیان بە فیرعەون و فیرعەون زادەکان ناگەیەنێت! بەڵام ئەمانە تەنها گوتەگەلێك بون کە ڕاهێنەرەکان بۆ بەرزکردنەوەی وورەی نەوجەوانان بەگوێیاندا دەیانچرپاند. گای کێوی لەپڕەوی خۆیدا فیرعەون و کەسوکار و خوداکانی نەدەناسی، "ڕامسیس" لەڕوی ئەزمونەوە پەیی بەم ڕاستیە برد و زۆر ئاگای لەخۆی بوو و چاوەروانی هێرشی خێرا و لەناکاوی گا کێویەکەی دەکرد بۆئەوەی هەلی بێئاگایی نەقۆزێتەوە. "ڕامسیس"دەربڕینێکی بەگوێدا چرپاند: ئەوە چ گایەکی کێو و "وەرزای"مەزنە! و دەنگێکیش پرسی: ئەی تۆ چۆنیت؟"ڕامسیس"مات و خافڵگیر و بێدەنگ مایەوە، لەوکاتەدا گا کێویەکە بەدەستی چەپی دەستی کرد بە سمکۆڵان و زەوی بەردەمی کێڵا و تەپ و تۆزی بەئاسماندا بڵاوکردەوە شکۆمەندی و دەنگی خرۆشانی گای کێوی باڵندە ماسیخۆرەکانی چواردەوری ترساند و بەخێرایی دەستیان کرد بەفڕین و سەکۆی نمایشیان چۆڵکرد. دەنگی "ست هوس" دوبارە پرسیارێکی تری کرد: تۆ ترسنۆکتری یان کوڕی فیرعەون ؟. دوای ئەوەی"ست هوس"لەهزری خۆیدا لەو پرسیارە ڕاما، نیگاکانی وەك نیگای مار کوڕی لاوی ئەفسوناوی کرد.

"ڕامسیس"وتی: دەمەوێت لەگەڵیدا بجەنگێم.

"ست"وتی: لەم جۆرە گۆڕەپانانەدا پیاوی ئازا و بەتوانا لە ترسنۆك و لاوازەکان جیادەکرێنەوە، بەڵام فیرعەونەکان ڕەهەندی ئەم هێزانەن، ئەگەر توانا و دەستەڵات

ڕوبەڕوی یەکتر ببنەوە، لەم جۆرە حاڵەتانەدا نابێت پێشبینی بابەتی چاوەڕواننەکراو بکەیت، نابێت بیر لەدەستەڵاتت بکەیتەوە، سەرەتا دەبێت پاڵ بەم هێرشە زووتێپەڕەوە بنێیت. لەسەردەمی فەرمانڕەواییدا ئالەم جۆرە هێرشە لەناکاوانە زۆرن، هیچ تاقیکردنەوەیەك نابێت تۆ بترسێنێت، ئێستا دوو ڕێگات لەبەردەستادایە، یان دەبێت لەگەڵ ئەم گا کێویەدا بجەنگێیت یان پاشەکشە بکەیت، دەستەڵاتی هەڵبژاردن لەدەستی خۆتدایە.

ڕامسیس هەوڵی دا بەسەر خۆیدا زاڵ بێت. لەوکاتەدا هەموو توانایەکی بەپێکانی بەخشی و خۆی ئامادەی ڕۆشتن کرد و هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە نا و وتی: دەڕۆم بەڵام تۆ ڕەوانەی مەرگم دەکەیت، چونکە دەزانی هێرشی ئەم گا کێویە، گابازە بەهێزەکانیان ڕەوانەی مەرگ و نابوتی کردووە، چ بگات بەمن کە لەباتی مەشق تەنها فێری جۆرێك دەربڕینیان کردوم کە گای کێوی دۆستی فیرعەون و خوداکانە.

"ست هوس"وتی: ڕۆژێکیان"هورم هب"ی باوکم پێی وتم، کوڕەکەم وەك گای کێوی بەهێز و شاخێکی تیژ و دڵێکی ئازای هەیە، چاونەترس بە تا ئەوکاتەی چۆك بەهەموو دژمنەکانت دادەنەوێنیت، ئێستاش من ئەوەت بۆ دوپات دەکەمەوە: تۆ"ڕامسیس"کوڕی"ست هوس"کوڕی"وەرزای داگیرکەر" خۆت وەك"وەرزا[4]"یەك لەدایك بویت، دەزانی ئایندەی میسر لەدەستی تۆدایە، بۆیە دەبێت وەك خۆر لەپێناو خەڵکیدا هەڵبێیت و ڕوناکیان پێ ببەخشیت بۆئەوەی لەتیشکی ڕوناکیەکانت بەهرەمەند بن. تۆ تا دوێنێ ئەستێرەیەك بویت لەپشت هەورەکانەوە شاردرابویتەوە، بەڵام ئەمڕۆ لەم ئاسمان و بارەگای تاقیکردنەوەیەدا یان دەدرەوشێیتەوە یان خامۆش دەبیت....بەڵام لەوکاتەدا دەنگی بۆڕەی گای کێوی ئاگاداریەك بوو کە ئاڕاستەی"ست هوس و ڕامسیس" کرا، وەك بڵێی"گا"لەتێکەڵ بونی فیرعەون و فیرعەون زادە توڕە و دڵگران بوبێت، بۆیە بەخێرایی دەستی کرد

[4]ڕامسیس لەبەر نالەباری ناوەکەی و هۆکار ناونانی ناو خۆی گوڕی بە "وەرزای داگیرکەر"، "وەرزا"جۆرێك گایە کە زیاتر بۆ زۆرانبازی گا پەروەردە و ئامادە دەکرێت، کاتێك دەڵێت تۆ وەك"وەرزا"یەك لەدایك بویت مەبەستی ئەوەیە تۆش وەك ئەو گایە بەهێز و دڕەندە و چاونەترسی... ,وەرگێڕ

بەراوەشاندنی کلکی و بانگەوازی جەنگی دەست پێکرد. "ڕامسیس"یش بڕیاری دا بەپێی گوتەکانی باوکی"ست هوس"یان بدرەوشێتەوە یان خامۆش بێت. هەڵبەت"ساری" ڕاهێنەری"ڕامسیس" بەشێوەیەکی سەرزارەکی یان هەندێجار خۆی ڕۆڵی گای کێوی دەبینی و هونەری زۆرانبازی گای فێری"ڕامسیس" کردبوو، بەڵام ئەو لاوە لەهەڕەتی لاویەتیدا بەهیچ شێوەیەك ڕووبەڕووی دیمەنێکی ئاوا جدی لەبەرامبەر گایەکی کێوی توڕەدا نەبووەتەوە.

"ستە هوس" گوریسێکی دا بە"ڕامسیس" و تی: ئاگات لەخۆت بێت هەموو هێز و توانای ئەو گا کێویە لەسەر و شاخەکانیدا چڕدەبێتەوە، دەتوانی ئەم هێزە بەگرتنی شاخەکانی پوچەڵی بکەیتەوە. دەبێت هەوڵی بدەیت دەستت بگاتە شاخەکانی.

"ڕامسیس"سەرەڕای ئەوەی تەمەنێکی کەمی هەبوو بەڵام بەهەڵدانی گوریس نامۆ نەبوو هەروەها باڵایەکی کەمێك کورت بەڵام جەستەیەکی وەرزشەوان و ماسولکەداری بەهۆی چەند وەرزش و مەشقێکی زۆر قورسەوە لاوێکی شایستەی و خێرای لێدەرچوبوو، بەتایبەت لەکاتی لێخوڕینی گەمی"بەلەم" لەدەریاچەی کۆشکدا، ڕۆژی دەیان جار مەشقی لەسەر چۆنایەتی جۆری بەکارهێنانی گوریس کردبوو.

"ست هوس"بەگوێی"ڕامسیس"دا چرپاند و وتی: هەر ئەوکاتەی گوریسەکە بەدەستەوە بسوڕێت، دەنگی ئەو گوریسە گای کێوی دەبزوێنێت، چیتر چاوەڕێی هیچ شتێکی تر ناکات، بۆیە دەبێت ئاگات لەهێرشکردنی بێت. تۆ دەبێت تەنها و تەنها یەکجار ئەو چەند ساتە ماوەت هەیە خۆت بەشاخەکانیەوە هەڵواسی و هەمان ئەو هێزەی کە پێم وتی لەسەریدا کۆبووەتەوە گیرۆدە بکەیت، ئەگەر یەکەمین هەلت لەدەست بدەیت، چیتر دوای ئەوەی هیچ هەلێکی ترت بۆ ناڕەخسێت، ئەوکات نۆرەی گا کێویەکەیە بۆئەوەی بەو شاخە تیژ و هێزە وێرانکەرەیەوە بەیەك قۆچ لەناوت ببات. "ڕامسیس"زۆر بەوردی گوێی لەڕێنماییەکانی باوکی"ست هوس"دەگرت، سەرەڕای ئەوەی گا کێویەکەی لەبارەگای هێرش بردندا بینی. لەوکاتەدا"ڕامسیس"توند گوریسەکەی لەدەستیدا گوشی بۆئەوەی ئەگەر گا

کێویەکەی دیلی دەستی کرد گوریسەکە لەناو دەستیدا توند بگرێت و لەدەستی دەرنەپەڕێت و بەهەموو هێز و توانایەکی ڕووبەڕووی گای غولپەیکەر ببێتەوە. "ڕامسیس"دەیزانی لەکاتی گرتنی ئەو گا کێویەدا توانای گیرۆدەکردن و ڕووبەڕووبونەوەی ئەو گایەی نیە بەڵام هیچ ڕێگەچارەیەکی تری لەبەردەستدا نەبوو، بەگوتەی"ست هوس"یان دەبێت بدەرەوشێتەوە یان خامۆش بێت، "ڕامسیس"یش لێی ورد بویەوە دوای ئەوە هێرشی بۆبرد. "ڕامسیس"هیچ کاتێك بەچاوی خۆی ئەوەی نەبینیبوو کە گای کێوی چ خێراییەکی هەیە، لەچاو تروکانێکدا گاکەی لەدوری یەك دوو هەنگاوێکدا لەبەرامبەر خۆیدا بینی، "ڕامسیس"بەسەختی واقی لەم خێرایی و خافڵگیریە وڕما و بەخێرایی ئەو گوریسەی کە بەدەستیەوە دەیسوڕاندەوە یەکسەر بۆی هەڵدا، گوریسەکە لەپشتی گا کێویەکەوە هاتە خوار، لەکۆتایی ئەم جوڵانەشیدا پێی خلیسکا و کەوت. هەمان ئەم کەوتنەی بوبەهۆی ئەوەی شاخی ئەو گایە لەباتی ئەوەی بچەقێتە جەستەیەوە تەنها بەڕوشانی بەشێك لە سینەی کۆتایی بێت، بەڵام"ڕامسیس"بەچاو کراوەیی تەماشای گاکەی دەکرد. ئەو گا کێویەش بۆ دواین هێرشی و قۆچی بەجوڵەیەکی سەربازانە کەمێك گەڕایە دواوە بۆئەوەی بتوانێت خێراییەکی زیاتر بەپێکانی ببەخشێت، لەم ماوەیەدا"ڕامسیس"بەخێراییەکی چاوەڕواننەکراو هەستایە سەرپێ و تەماشای نێوچەوانی گا کێویەکەی دەکرد، بەتیژبینی چاوەکانی ئاگاداری ئەوەبوو کە گوریسەکە لەشاخەکانی پێچراوە و گیری کردووە و گاکەش هەموو هەست و ئاگاییەکی خۆی تەرخانی لێکردنەوەی ئەو گوریسە لەشاخی کردبوو، بۆیە سەری بەخێرا بەلای ڕاست و چەپدا دەسوڕاند. بۆ ماوەیەك گۆڕەپانی زۆرانبازی و ڕکابەرەکەی لەبەرچاو نەگرت، هەمان ئەم چەند ساتەش بۆ "ڕامسیس" بەس بوو کە بەخێراییەکی چاوەڕواننەکراو خۆی بگەیەنێتە لای سەرێکی ئەو گوریسەی لەسەر زەوی کەوتبوو بۆئەوەی بەتوندی ڕایکێشێت. "ست هوس"لەم کاتەدا بۆ شڵەژاندنی گا کێویەکە ڕۆشتە ناو گۆڕەپانی زۆرانبازیەکەوە و بەشێوەیەك ڕاوەستا کە گا کێویەکە ڕوو لەو بکات. "ست هوس" لەوکاتەدا هاواری کرد: کلکی گاکە بگرە! پەروەردەکاری گاکان بەشێوەیەك کلکی گاکانیان دەتاشی کە تەنها لەکۆتایی

کلکیاندا کەمێك توکیان دەهێڵایەوە بۆئەوەی لەکاتی گرتنیدا لەدەست نەخلیسکێت و بتوانێت ئەو گیانەوەرە گیرۆدە بکات، "ڕامسیس"یش زۆر باش ئاگادار ئەو حاڵەتە بوو و کلکی گاکەی گرت. "ست هوس"بە گرتنی گوریسەکە و گرفتارکردنی گا لەسریەوە، ئەو گیانەوەرەی لەناوچەی سەر و کلکەوە گرفتار بینی، گای کێوی شکستی بۆخۆی پەسەند کرد و دەستی لەهەوڵدان بۆ خۆ ڕزگار کردن هەڵگرت و لەدوا ساتەکانیدا هێور بویەوە و دەستی بەهەناسە بڕکێ کرد.

"ست هوس"بە "ڕامسیس"ی وت: دروست لەپشت ئەو ئاژەڵەوە ڕاوەستێت! چونکە گای کێوی هەرگیز بەو ئاسانیە هێور نابێتەوە، هەرئەوەی هەلێکی بۆ بڕەخسێت بەهەموو توانایەکی هەوڵی لێدانی دەدات، دوای ئەوەش ست هوس بەردەوام بوو و وتی: خۆم بەچاوی خۆم بینیومە گا کێویەکان بۆ هێرش و قۆچ لێدان وەك دز و چەتەکان لەپشت دار و درەختەوە خۆیان حەشار دەدەن بۆئەوەی بەباشی بتوانن دژمنکانیان خافڵگیر بکەن. گیانەوەر کەمێك سەری ڕاوەشاند و بتەوی گوریس و هێزی ڕکابەری تاقیکردەوە، بەڵام پەیی بەوە برد توانای ڕوبەروبونەوەی ڕکابەری نیە، بۆیە دوای ئەوە ئارام و لەسەرخۆ سەری گەڕاندەوە بۆ شوێنی سەرەتای خۆی! فیرعەون چەقۆکەی خۆی دەرهێنا و گوارە بچوکەکەی گوێی"ڕامسیس"بەیەك تەکان بڕی!"ڕامسیس"بەسەرسوڕمانەوە ڕاوەستا و تەماشای"ست هوس"ی کرد.

"ست هوس" کە واتای ئەم تەماشاکردنەی دەزانی، وتی: ڕامسیس!لەم ساتە بەدەواوە قۆناخی منداڵی و هەرزەکاریت تێپەڕاندووە و لەمەودوا بویت بەپیاو.

ڕامسیس وتی: بەڵام ئەوە من نەبووم ئەم شکستەم بەم گا کێویە هێنا.

ست هوس وتی: بەڵام تۆ بوێری و ئازایەتی ئەوەت هەبوو ڕوبەڕوی ئەم گیانەوەرە بیتەوە و لەمەرگ نەترسی، تۆ مەزنترین دژمنی خۆت کەوەك ترس وایە شکست پێهێنا و بەسەریدا زاڵ بویت، چونکە ترس لە گاکێوی بەهێزتر و هەڕەشئامێزترە.

کوڕەکانی ست هوس بە"شنار و ڕامسیس"بانگ دەکران، خۆی ئەو ناوانەی لەکوڕەکانی خۆی ناوە، خۆشی کە"وەرزای داگیرکەر"بوو کە لەوەوپێش

بە"ست"ئەهریمەن زادە لەلایەن دایکیەوە ئەو ناوەی لێنرابوو، بەڵام ناوی"ست"ی گۆڕی بە"وەرزا" بۆئەوەی هەم توانای خۆی پیشانی هاوسەرەکەی بدات، هەم ئەو ناوە پۆخڵە و پیسەی خۆی بگۆڕێت[5].

"ساری"ڕاهێنەری"ڕامسیس" بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژە نەبوو، چونکە لەڕاستیدا بەپێی بەرنامەی ئەو ڕۆژە"ڕامسیس"لەوساتەدا دەبوو لەپۆلدا لەوانەی بیرکاریدا ئامادە بووایە، بەڵام"ساری" ئاگاداری ئەوەیە کە"ڕامسیس" نە لە پۆل و نەقوتابخانەدایە، نیگەرانی تەواوی ئەو شوێنانە بوو کە ئەگەری ئەوەی هەیە"ڕامسیس"لەوێدا ببینێت، سەردانی ئەو شوێنانەی کرد بەڵام "ڕامسیس"ی لەوێدا نەبینی. "ساری"لەدوو ڕووەوە لەبارەگای کۆشکی فیرعەوندا بونایەتیەکی تەواوی خۆی دەسەلماند، یەکێکیان ئەوەی ڕاهێنەری"ڕامسیس"بوو دووەمیان هاوسەری خوشکە گەورەکەی "ڕامسیس"بەناوی "دولانت"بوو، لەبەرئەوەش هەوڵی دەدا ئەو تایبەتمەندیانەی کە لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بەدەستی هێناوە بەئەنجامدانی هەڵەیەك لێی زەوت نەکرێتەوە. هەڵبەت"ساری لە"دولانت"زۆر گەنجتر بوو، "ست هوس"بەناونیشانی فیرعەون لەبارەگادا دەست تێوەردانی لەشێوازی نەریتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا نەدەکرد، بەڵکو ئەو تەنها چاوەڕێی ڕۆژێکی دەکرد کە"ڕامسیس"لە هەرزەکاریەوە ببێت بەپیاوێك، بۆئەوەی تاقی بکاتەوە و بیباتە گۆڕەپانی تاقیکردنەوەوە و بزانێت ئایا"ڕامسیس" توانای بەڕێوبردنی کاروباری وڵات یان بەلایەنی کەم سەرکردایەتی لەشکری هەیە! لەو کاتەدا براگەورەکەی"ڕامسیس" بەواتا"شنار"جێنشینی فیرعەون بوو. سەرەڕای ئەوەش فیرعەون حەزی دەکرد منداڵەکانی بەشێوەیەك پەروەردە بکات کە هەردوکیان توانای بەردەوامی و بەڕێوبردنی دەوڵەتیان هەبێت. لەدیدی ڕاهێنەری بارەگای فیرعەون بەواتا ساری"ڕامسیس" بونەوەرێکی ماندونەناس و بەتوانا و شایستەی جێنشینی فیرعەونە، چونکە"ڕامسیس"لەڕوی گەشەی هزریەوە گەشتبووە ئاستی گەشەی جەستەیی و"ساری"ڕاهێنەریش لەخۆی دەپرسی: ئایا

[5] هەڵبەت خوێنەرانی ڕۆشنبیر ئاگاداری ئەم بابەتەن، ئەوەی لە برگەی ئەم کتێبە و کتێبەکەی"سینۆهە"دا نوسراوە، واژە و ناوی ئەهریمەن نەهاتووە و بونی نیە و واتا ئەهریمەن نزیکترین واتایە لە واژەی"ست"ەوە.

تۆ بڵێیت ڕۆژێك بێت"ڕامسیس"ی سەرکێش و نائارام دێیی و ماڵی بکرێت؟ چونکە"ڕامسیس"زۆر بزێوو و پرسیارکەر و سەرکێش بوو. شاژنی میسر"ستە هوس"زیاد لە"شنار"گرنگی دەدا بە"ڕامسیس" "ستە هوس"شاژنێکی هۆشیار و قوڵبین و زانابوو و ئاشنایەتیەکی تەواوی لەگەڵ فەرمانڕەویانی خوڕەوشت باشدا هەبوو، "ست هوس"ی شاژن هێز و دەستەڵاتێکی زۆر بەرفراوانی بۆ خۆی دەستەبەرکردبوو، بەتایبەت بەسەر کەسانی خانەدانی دەوڵتدا دەستەڵاتێکی نکوڵی لێنەکراوی هەبوو.

لەو ڕۆژەدا تەنها گومانی ساری لەبارەی ونبونی"ڕامسیس" لە"ستەهوس"ی شاژن دەترسا، بۆیە بەهاوڕێکەی وت: لەدەستدانی کارەکەم بەلامەوە وەك کارەساتێك وایە، چونکە من لەبارەگای فەرمانڕەوایی دەردەکەن دوای ئەوەی بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانم دەبێت لەماڵاندا جل بۆ خەڵکی بشۆرم. هاوسەرەکەم "دولانت"یش لێم جیادەبێتەوە، بۆیە دەبێت بەهەر شێوەیەك بووە "ڕامسیس"بدۆزمەوە.

بەڵام دوای تێپەڕبونی دوو ڕۆژی تریش"ڕامسیس"نەدۆزرایەوە. ترس سەرتاپای"ساری"ڕاهێنەری"ڕامسیس"داگرت و بۆ دوایین جار ڕۆشت بۆ شوێنی هەمیشەیی خۆی-بەواتا فێرگەکەی- و چاوەکانی داخست و لەدڵیدا خۆزگەی ئەوەی دەخواست جارێکی تر"ڕامسیس" لەهەمان شوێندا ببینێت! "ساری" دەستەپاچە و داماو چاوەکانی داخست و ئارەزوی دوو شتی کرد یان دۆزینەوەی "ڕامسیس"یان مەرگی خۆی، دوای ئەوە بەدەنگێکی بەرز بەخۆیی وت: یان مەرگ یان ڕامسیس، لەوکاتەدا گوێ لەدەنگێك بوو وەڵامی دایەوە: ساری، نەخۆشی؟

ساری وتی: ئای خوایە گیان شازادە ئەوە تۆی؟ نەخۆشم نیم وابزانم شێت بوم. لەکوێ بویت؟

"ڕامسیس"یش وتی: تاقیگای جێنشینی. باوکم بۆ پلەی جێنشینی تاقیکردمەوە. ئەو منی لەگەڵ گایەکی کێویدا بەشەڕ دا ، نەمتوانی بەتەواوی ئەو گا نێرە گیرۆدە بکەم بەڵام لەگەڵیدا جەنگام. بۆیە باوکم وتی: تۆ چیتر بویت بەپیاو،

لەفەرمانڕەواییـدا ئـەم جـۆرە هێرشـە لەناکاوانـە زۆرن، دەبینـی ئـەو ئامـاژەیی بـۆ دەستەڵاتی من کرد.

"ساری" کە هێور بوبویەوە وتـی: بەڵام ئەوەی هـەمووان بەباشـی لێـی ئاگـادارن ئەوەیە کە"شنار"ی برات جێنشینە!

"ڕامسیس"پرسی: تۆ کە فێرکاری و ئاگاداری هەموو کاروبارێکی ئێمەیت، ئایا تائێستا"شنار"لەگەڵ گای کێویدا تاقیکراوەتەوە؟

ساری وتی: تا ئەو شوێنەی ئاگادار بم"شنار"ی برات بەم ئەزمونەدا تێنەپەڕیوە، تـۆش تێتنەپەڕانـدووە چـونکە"سـت هـوس"ی باوکـت ویـستویەتی لەنزیکـەوە تـۆ ڕووبەڕووی گۆڕەپانی جەنگ و هەڕەشەکان بکاتەوە.

"ڕامسیس"وتی: تۆ وا دەزانی باوکی فیرعەونم کاتـەکانی بەم کارە پڕ و پـوچ و بێنرخانەوە تێدەپەڕێنێت.

"ساری"وتی: خەیاڵ پڵاوی بۆ خۆت دروست مەکە، ئەم گەمژەییەت وەلاوە نێ!

"ڕامـسیس"دڵگـران لەبیـستنی دووبارەکردنـەوەی وشـەی، گەمـژەیی؟ خرۆشـا و وتـی: "ساری"دەزانی کە لەکۆشکی فەرمانڕەواییـدا نـە ئەوەنـدە خۆشەویـستی و نـە ئەوەندەش ڕێزت لێدەگیرێت، زۆریش ڕەخنەت لێدەگرن.

"ساری"وتی: ڕەخنەی چیم لێدەگرن، دەتوانی پێم بڵێیت؟

"ڕامـسیس"کـەمێك مـاتی کـرد، دوای ئـەوە وتـی: پەیوەنـدی تـۆ بـە خێزانەکـەی ئێمەوە پەیوەندیەکی نالەبارە، تۆ هێشتا ئاشنایەتی تەواوت لەبارە نەریتی کۆشکی فەرمانڕەواییـەوە نیـە، هێـشتا لەهـەمان چوارچێوەی ژیـانی ئاسـاییدا ژیـان بەسـەر دەبەیت، بون بەزاوای فیرعـەون پێویستت بەچاودێری کردنـی هەنـدێك خاڵـە کـە تـۆ ڕەچاویان ناکەیت یان هەر نایزانیت.

ساری وتی: بەدڵنیاییەوە نایزانم بۆیە لەڕەفتار و گوتارەکانمدا ڕەچاویان ناکـەم، بەڵام دەمەوێت فێرم بکەیت!

ڕامسیس وتی: بەڵام تۆ بێئەوەی لەگوتەکانت وردبیتەوە دەیانهێنیتە زمان.

سـاری وتـی: هەنـدێك لەگوتـەکان بەلای هەنـدێك خەڵکـەوە لەبەرئـەوەی خۆشـیان لەبیستنی نایەت بە بێبنەما لێکی دەدەنەوە، بەڵام من لایەنگری ئەو خاڵە دەکـەم کـە

تۆ گونجاو نیت بۆئەوەی فەرمانڕەوایی و دەسەڵات بگریتە دەست، "شنار"ی برات کە چەند ساڵێك لەتۆ گەورەترە، بۆ بەدەست هێنانی ئەم دەسەڵاتە ساڵهایە مەشق دەکات و خەڵکی ئەو بە جێنشین لەقەڵەم دەدەن و لەهەموو گرنگتریش بەڕێزەوە گوێ لە گوتەکانی دەگرن!

ڕامسیس پرسی: دەتوانی مەبەستی خۆت ڕونتر بکەیتەوە؟

ساری وتی: تۆ دەتەوێت دەست و پەنجەت لەگەڵ گایەکی نێردا نەرم بکەیت، گەر"شنار"لەخۆت هاندبەیت دەم و دەست لەناوت دەبات، من هاوڕێی تۆم حەز بەچاکە و خۆشیت دەکەم، بۆیە داوات لێدەکەم خۆت لە"شنار"دور بگرە.

لەوڕۆژەدا"شنار"ئارەزویەکی تری لەسەردا بوو، بۆماوەیەك لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانیدا گفتوگۆی کرد، بابەتی گفتوگۆیان ئەوەبوو کە بەچ شێوەیەك خۆیان لەپاسەوانەکانی"کەپ"دەرباز بکەن و بڕۆن بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح". کلکی تیمساح لەسەرتاسەری"تبس"دا بەتایبەت لەنێو مامۆستایانی نێوەندی زانستی"کەپ"دا ناوبانگیەکی نمونەیی پەیدا کردبوو و گەشتبووە ڕادەیەك کە هەرکەسێك لەشەودا داوای ناونیشانی مەیخانەیەکی بکردایە یەکسەر مەیخانەی"کلکی تمیساح"یان پێدەدا. مەیخانەی"کلکی تیمساح" پێشتر ناوی"ستە هوس"ی شاژنی هەبوو، بەڵام لەدواییدا"کلکی تیمساح"یشان بۆ ئەو ناوە زیاد کرد، بەڵام بەهۆی ئەو مەیە تایبەتەوە زیاتر بەو ناوەوە ناوبانگی دەرکرد. "ڕامسیس" پرسیارێك لەهزریدا وەك چەکوش دەنگی دەدایەوە، دەیویست لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانیدا لەگۆشەیەکی خەڵوەتی وەك مەیخانەی"ستە هوس"دا گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات. شەو بڕیاربوو هەریەکێکیان بەشێوەیەك لەخەوگای قوتابخانەکەیان هەڵبێن و لەکاتژمێرێکی دیاریکراودا لە"کلکی تیمساح"دا کۆ ببنەوە!ژوری"ڕامسیس"لەنهۆمی یەکەمی ئەو تەلارەدا بوو، بەڵام لەخوار پەنجەرەوەکەوە باخچە و خۆڵێکی نەرم بوو، "ڕامسیس"لەسەر خۆ خۆی شۆڕ کردەوە و بەجوڵەیەکی لێهاتوانە بازی دایە سەر خۆڵە نەرمەکە، گەڵای باخچە و نەرمی خۆڵ ڕێی لەدەنگی کەوتنە خوارەوە گرت. لەسەرخۆ لەسەر پەنجەی پێکانی دەڕۆشت تا ئەوکاتەی گەشتە بەردەم دەرگای پاسەوانی. بەسنگەخشێ

تەماشایەکی شوێن و باروودۆخی پاسەوانەکانی کرد، بێ لەوەی کەس کە زۆر بەسەختی سەرگەرمی زارزارێن بون، ئەوانی تر خەویان لێکەوتبوو. "ڕامسیس" دوای ماوەیەك ڕۆشتن خۆی گەیاندە بەردەم دەرگای چونە دەرەوە و بینی سەگی هەوشاری قوتابخانەکە لەبەردەم دەرگاکەدا ڕاکشاوە. ناوی ئەو سەگە"بیدار"بوو، "ڕامسیس"هەموو ڕۆژێك پاشماوەی خواردنەکەی دەهێنا بۆ"بیدار"ی جوان و هۆشیاری قوتابخانەکەی و بۆماوەیەکیش یاری لەگەڵدا دەکرد. ئەو شەوە"بیدار"هەر ئەوەی چاوی بەبێدار کەوت دەستی کرد بەکلکە لەقێ و سەری خستە سەرزەوی و خۆی بۆیاری ئامادە کرد، "ڕامسیس" بەپەلە ڕۆشتە پێشەوە و دەستی هێنا بەسەر"بیدار"دا و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ لای دەرگای چونە دەرەوە. "ڕامسیس"ملوانکەی چەرمی پان و سوری"بیدار"ی بەدەستەوە بوو، بۆئەوەی نەوەك بۆ یاریکردن تەکانێك بەخۆی بدات و ببێتە هۆی ئەوەی سەرنجی پاسەوانەکان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. دەرگای چونە دەرەوەی"کەپ" کە کوڕی تەواوی کەسە مەزنەکانی میسر لەوێدا پەروەردە دەکران، لەسەرخۆ کرایەوە و"ڕامسیس"سەرکەوتوانە لەقوتابخانەی"کەپ"هەڵهات! بۆئەوەی بڕوات بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"  شار لەو ساتی شەوەدا چۆڵ بوو. شارێك کە نێوەندی زانکۆکان و کۆمەڵگای زانستی ئەو سەردەمەی میسر هەروەها"کەپ"ی شازادە و کەسە مەزنەکانی تێدا بنیات نرابوو. ئەو شارەش"تبس"بوو: تبس بەکۆنترین پایتەخت لەقەڵەم دەدرا. لە"تبس"دا بوو کە شازادە و کەسانی تر بۆ بەدەست هێنانی پلەوپایەیەك ناویان تۆمار دەکرد، هاوڕێکانی"رامیسس"یش لەکەسە وەجاخزادەکان بون. ڕۆشتنی ئەو لاوانە بۆ مەیخانەی کلکی تیمساح لەو تەمەنەدا قەدەغە بوو، بەڵام ئەمانە بەئاگاداربون لەو سنورداریەتیە بەلێهاتویەکی زۆرەوە خۆیان دەکرد بەناو ئەو مەخانەیەدا و لەشوێنێکی تاریکدا دادەنیشتن، یەکەمین کەس"ڕامسیس"بوو کە بەو کڵاوە گەورەی بەسەریەوە بوو زۆر خێرا خۆی کرد بەناو ئەو مەیخانەیەدا. بۆنی شەراب، بۆنی عەرەقی خورما، بۆنی ئاوجۆ، گۆزە فریودەرەکان کە لەدەوڵەتای یۆنانەوە دەهات، هەموویان چاویان لەو کوڕە لاوە دەگرت، خزمەتکار هات بۆ لای مێزەکەی"ڕامسیس" و پرسی: چی دەوێت؟

رامسیس وتی: لەئێستادا هیچم ناوێت، چونکە چاوەڕێی هەندێ کەس دەکەم.

خزمەتکاریش وتی: چ چاوەڕێ بکەیت یان نا دەبێت داوای شتێك بکەیت، سەرەرای ئەوەش لەبەرئەوەی کەسێکی بیانیت دەبێت پێشوەخت پارە بدەیت.

"رامسیس"دەسبەندی زێرینی گرانبەهای خۆی کرد بەگیرفانی خزمەتکارەکەدا و وتی: ئێستا ئەکرێت چاوەڕێ بکەم و هەرکاتێك خۆم بمەوێت بانگت بکەم؟

خزمەتکار ئا لەو جۆرە دەستبەندانەی تەنها لەدەستی دۆڵەمەندەکاندا بینیبوە، بەگومانێکەوە بەرجەستەی کرد و وتی: دڵنیایت لەوەی دەتەوێت لەبەرامبەر بەهای خواردنەوەدا خەرجی بکەیت؟

رامسیس لەوکاتەدا تەنها بەهێمای دەستی پێی وت: بڕۆ و لەهەمان ئەوکاتەدا چاوی بڕیبووە دەرگاکە و چاوەڕێی هاتنی هاوڕێکانی دەکرد. خزمەتکار لەوکاتەدا دور کەوتەوە، بەڵام زۆر زوو بەگۆزەیەك ئاوجۆ گەڕایەوە و وتی: تۆ لەڕێی ئەم گۆزە ئاوجۆیەی کە پێشکەشتی دەکەم دەتنێرم بۆ ئاسمان. ئەم ئاوجۆیە باشترین و دەگمەنترین ئاوجۆیە هەروەها لەگەڵ تەمەنی تۆدا زۆر دەگونجێت، تەنها زیادەڕەوی تێدا مەکە! ڕامسیس کەمێك ئاوجۆی ڕشتە ناو کاسەیەکەوە و خستیە بەردەم"بیدار"سەگی قوتابخانەکەیان لەوکاتەدا پۆزەی ڕاوەشاند و حەزی لێ نەدەکرد. لەماوەیەکی کورتدا هاوڕێکانی دانە دانە خۆیان کرد بەناو مەیخانەدا" ستائو، ئەمنی، عاشە" و دوایین کەسیشیان"موسا"بوو... هەرپێنجیان دەستیان کرد بەخواردنەوەی ئاوجۆ و"ڕامسیس" دەستی کرد بەباسکردن و پرسیارکردنی بابەتە تایبەتەکەی خۆی: بەچ شێوەیەك دەستەڵاتی ڕاستەقینە بەدەست دێت؟

"ئامنە"کە شارەزای بواری ئەدەب هەروەها شارەزای ناسینەوەی نوسین بوو وتی: شارەزایی لەبواری نوسینی"هیروگلیف"یدا، بەواتا دەستەڵات لەداناییدایە.

"ستائو"پێکەنی و"ئامنی"لەپێکەنینەکەی پەرێشان بوو و پرسی: بەبۆچونی تۆ دەستەڵات لەچیدا بەدی دەکرێت؟

عاشە وتی: دەستەڵاتی ڕاستەقینەی وڵات، لەبواری ڕامیاریدایە، هەرلەبەرئەوەش دەمەوێت گەشت بۆ وڵاتانی تر بکەم.

"موسا"تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو و ئەویش ڕویکردە"ڕامسیس" و وتی: حەزدەکەم گویم لەبۆچونەکانی تۆ بێت.

"ڕامسیس"وتی: باوکم من بۆ فیرعەون بون ئامادە دەکات.

"عاشە"وتی: مەگەر"ست هوس"ی باوکت برا گەورەکەتی بۆ جێنشینی هەڵنەبژاردووە؟ کەواتە بەچ شێوەیەك تۆ دەکات بەفیرعەون؟

"ڕامسیس"وتی: باوکم ئەگەر بیویستایە برا گەورەکەم ببێت بە فیرعەون، ئەوا ئەوی دەبردە گۆڕەپانی تاقیکردنەوە و لەگەڵ ئەو گایەدا دەیدا بەشەڕ.

"موسا"وتی: نەهێڵیت خەیاڵپلاویەکانت بەسەرتدا زاڵ بن، "ست هوس"ی باوکمان هێشتا هیچ کەسێکی دەستنیشان نەکردووە.

"ڕامسیس"پرسی: دەمویست بزانم ئێوە لایەنگری کاممان دەکەن؟

"ستائو و ئامنی"وتیان: ئێمە لایەنگری تۆین.

بەڵام"عاشە"وتی: من لایەنگری فیرعەون دەکەم، بەواتا هەرکەسێك ببێت بە فیرعەون بەرگری لێدەکەم!

"موسا"هیچی نەوت بەڵام بەهێمای سەری لایەنگری کرد.

سبەی ئەو شەوە تەواوی قوتابخانەی"کەپ"پڕ بوو لەپڕوپاگەندە و گوتەگەلێکی جۆراوجۆر لەبارەی پێشێلکردنی یاسای کوڕی هەڵبژێردراو. تا ئەو بەرەوارە هیچ کەسێك نەیدەوێرا شەوانە پێ بنێتە دەرەوەی قوتابخانەی"کەپ"ەوە، چ بگات بەوەی خۆی لەمەیخانەی "کلکی تیمساح"دا ببینێتەوە! ئەم ڕەفتار و دوو ڕۆژ ونبونی"ڕامسیس"ساری ڕاهێنەری قوتابخانەی بەسەختی خستبووە تەنگانەوە بۆیە بە"ڕامسیس"ی وت: ئەو ڕەفتارەی تۆ نواندت شایستەی فیرعەون زادە و کەسێك کە لەئایندەدا لەمیسردا پەرپرسیاریەتی لەئەستۆ دەگرێت نیە.

ڕامسیس لێی دەپرسێت: لەسەر چ بنەما و بەڵگەیەك ئەم قسانە دەکەیت؟

ڕاهێنەر و سەرپەرشتی"کەپ"دەڵێت: لەبەرئەوە گلەییت لێ دەکەم کە شەوانە ئەو کاتانەی لەساتێکی دیاریکراودا دەبێت هەموو خوێندکارێك بەشداری لە نانخواردنی ئێوارەدا بکات و بەیانی ئەو شەوە لەکاتی خۆیدا لەخەو هەستن، تۆ و چەند کەسێکی تر دەڕۆن بۆ شوێنێك کە ڕۆشتنتان بۆ ئەوێ قەدەغەیە، بەبۆچونی

من ئێوە لەیەك كاتدا دوچاری چەند تاوانێك بون...  دوای ئەوە وتی: ئەویش لەچ كاتێكدا؟ لەكاتێكدا كە"موسا"ی برات لەماڵی میرئور"MER ur" كە دەكەوێتە ناوچەی"فایوم"٦ەوە وەك بەڕێوبەر دامەزراوە، ئەم ئەركە بۆ كوڕێكی لاوی وەك ئەو بەوشێوەیەش ئاسان نیە.

ڕامسیس وتی: "موسا"ی برام لەو ناوچەیەدا كاریگەری خۆی نیشان دەدات.

دوای ئەوە"ساری" بەردەوامی دا بەقسەكانی: "ئامنی"یش بەرپرسیاریەتیەكی فورمی پێدەسپێدرێت ئەویش ئەنجامدانی كاروبارەكانە لە لەنوسینگەی كۆشكی نوسەران، بەڵام"ستائو" بەرپرسیاریەتی كۆكردنەوەی ژەهری پێدەبەخشم بۆئەوەی دەرمانی لێ دروست بكەن، ئەویش ئەگەر سزاكان ڕێمان پێبدات.

ڕامسیس وتی: ئەی هیچ بڕیارێكت لەبارەی"عاشە"وە نەداوە؟ بواری وەرگێڕیم لە"بیبلوس"دا بۆ لەبەرچاو گرتووە، بەڵام دوای فێربونی زمانی"لیبیایی و شامی"و بگرە...

ڕامسیس پرسی: چ كەسێك ئەم زمانانە فێری"عاشە"دەكات؟

ساری وتی: من و مامۆستاكانی قوتابخانەی"كەپ"، بەڵام سەرەتا دەبێت بڕیارێك لەبارەی ئەم ڕەفتارە هەڵەیەی كە ئەنجامتان داوە دەربكەم.

ڕامسیس وتی: بهێڵە لەبارەی ئەو هەڵەیەی من و براكەم و هاوڕێكانم ئەنجاممان داوە بەشێوەیەكی دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا بكەین. لەڕاستیدا هۆكاری سەرەكی ئەم ڕوداوە من بوم، ئەوە من بوم موسای برام و هاوڕێكانم بانگێشتی مەیخانەی كلكی تیمساح كرد هەروەها ئەوە من بوم كە بە بەخشینی دەسبەندێكی زێڕین خزمەتكاری مەیخانەكەم هاندا ئاوجۆمان بۆ بهێنێت. خودی من ئەو پلانانەی داڕشت و سەپاندم بەسەر ئەوانیشدا، ئەگەر من یەكێك بوایەم لە خوێندكارە ئاساییەكانی قوتابخانەی"كەپ"، ئەوا بەدڵنیاییەوە هاوڕێكانم لەگوێیان نەدەگرتم، لەبەرئەوەی كوڕی فیرعەون بوم ئێوە لەگوێتان كردم.

ساری وتی: لەئێستادا هەواڵی باش و بەرپرسیاریەتیەكانیان پێ ڕاگەیەنە، بۆئەوەی بڕیارێك لەبارەی ڕەفتارە هەڵەكانت دەربكەین.

---

[6] سەد كیلومەتر دەكەوێتە باشوری خۆرئاوای میسرەوە.

"ڕامسیس" بەپێی ئەو ڕاوێژەی شورای پەروەردەی فێرگاکە لەنێوان خۆیاندا ئەنجامیان دا لەماوەی پشودا لەقوتابخانەدا دەمێنێتەوە بۆئەوەی لەو ماوەیەدا وانەی بیرکاری و ڕێژە بخوێنێت. سەرەڕای ئەم سنورداریەتیەش"ڕامسیس"ماوەی نەبوو لە تەویلەکان نزیك ببێتەوە. ئەمە بەو واتایە دێت لەهاویندا لە جەژنی سالّی نوێدا–لەجەژنی هەڵچونی ڕوباری نیل کە لەلایەن فیرعەونی ئەو سەردەمەوە ئەنجام دەدرا–کە لەو سەردەمەدا"ست هوس"بوو نەیدەتوانی ئامادە بێت. لەوانەیە ئەم تەمیّ و ئامادە نەبونە لەو ئاهەنگەدا بەوشێوەیەش گرنگ نەبێت، بەلاّم بۆ"ڕامسیس" کە ڕکابەری لەگەڵ براکەیدا"کوس"دەکرد بۆئەوەی پلەوپایەی جێنشینی فیرعەون بەدەست بهێنێت، ئەم ئامادە بون و خۆنواندنەش بەلای ئەوەوە گرنگیەکی لەڕادەبەدەری هەبوو، بە نەبونی"ڕامسیس"و بەسود وەرگرتن لەئامادەنەبونی بەناو سزا، "شنار"لەتەنیشت"ست هوس"هەلومەرجی خۆی هەنگاوێك بەرەوپێش دەبات و ئامادەنەبونی ڕامسیس پەلەی ئامادەبونی ئاشکرای"شنار"لەتەنیشت فیرعەون و کەسە مەزنەکانی میسردا بەرز دەکردەوە.

پێش دەستپێکردنی قۆناخی گۆشەگیری ڕامسیس، "ساری"ڕاهێنەری"کەپ" وتی: ڕێت پیّ دەدەم ماڵئاوایی لەهاوڕێکانت بکەیت.

"ئامنی"بەوشێوەیەش دڵگران نەبوو، چونکە شوێنی کاری ئەو لە"تبس"دا لەتەنیشت دورخراوەکەی"ڕامسیس"دا بوو بۆیە بە"ڕامسیس"ی وت: سەرەڕای ئەوەی ناهێڵن سەردانت بکەم، بەردەوام لەبیری تۆدام.

"موسا"ش تەنها خۆی بە لەئامێزگرتنی"ڕامسیس"ی برای ڕازی کرد و وتی: نیگەرانی مەن مەبە میرئور"MER-ur" بۆمن وەك جۆرێك مەشق و تاقیکردنەوە وایە.

بەلاّم هاوڕێکەی تری"ڕامسیس"بەواتا"عاشە" کە لەو باوەڕەدا بوو هەرکەسێك ببێت بەفیرعەون ئەو بەرگری لێدەکات، ڕەفتارێکی زۆر سارد و وشکی لەخۆی نواند. "ستائو"ش زۆر ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ ئەو سزایەدا کرد و بە"ڕامسیس"ی وت: دوای تەواو بونی ئەم تەمێیە یەکتری دەبینینەوە.

ڕامسیس سەرەتا قۆناخی گۆشەگیریەکەی بەساردی و دانبەخۆداگریەکەوە دەست پێکرد و وتی: سەرئەنجام دەبمە فیرعەون... دوای ئەوە بۆ هاوڕێکانی ڕونکردەوە: باوکم هیچ کارێك لەخۆیەوە ئەنجام نادات.

سەرەڕای ئەوەش"ساری" ئەو هەواڵەی بە"ڕامسیس"ڕاگەیاند: بەلایەنی کەم ناوت لە لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا فەرامۆش کراوە، "شنار"چیتر تۆ بەڕکابەری ڕاستەقینەی خۆی نازانێت.

ئەو بە بەردەوامی سەردانی"ڕامسیس"ی دەکرد تا ئەو کاتەی شەوی ئازادبونی"ڕامسیس"نزیك بویەوە، "ساری و ڕامسیس"-ڕاهێنەر و شاگرد- لەتەلاری قوتابخانەدا لەسەر مێزێك پێکەوە نانیان خوارد، ئاوجوی سارد و ماسی سوێر و پاقلەی ئاوێتە بەدەرمانە جۆراوجۆرەکان ژەمی ئێوارەیان بوو.

ساری وتی: خۆڕاگریەکەت شایەنی ستایش کردنە.

ڕامسیس وتی: دەزانم کە سەرئەنجام سەرکەوتن بەدەست دەهێنم و شکست بە"شنار"ی برام دەهێنم.

دوای ئەوە"ڕامسیس"لێی پرسی: چ پلەوپایەیەکیان بۆ دەستنیشان کردوم؟

ساری بەبیستنی ئەم قسە دڵگران بوو و وتی: وتیان با بۆماوەیەك شازادە بحەوێتەوە.

ڕامسیس پێداگریەکی زیاتری کرد و وتی: پرسیم دەبێت چ کارێك ئەنجام بدەم؟

ساری وتی: بەپێی ئەو فەرمانەی دەرکراوە هیچ!

ڕامسیس پرسی: کێ ئەو فەرمانەی دەکردووە؟

ڕاهێنەرەکەش بەدڵنیاییەکەوە وەڵامی دایەوە: بەفەرمانی فیرعەونی باوکت"ست هوس"

ڕامسیس لەیەکەمین هەڵی دەرچونیدا ڕۆشت بەدوای"ستائو"دا، ستائو شارەزاییەکی تەواوی لەمار و دژە ژەهر و ژەهر ناسیدا هەبوو و پێشنیاری ئەوەی کرد لە"ڕامسیس" کە: دەتەوێت ئاشنای چەند هێمایەکت بکەم کە چیتر مارەکان نەتوانن هیچ زیانێکت پێ بگەیەنن.

ڕامسیس پرسی: مەگەر مار هۆش و ئەقڵی هەیە، مەگەر مار سەگە تا بتوانێت خاوەنەکەی بناسێت، مار چاوی بەهەر کەسێك بکەوێت دەیگەزێت.

ستائو وتی: منیش دەمەوێت ڕێگری لەهەمان شت بکەم، دەرمانێکت دەرخوارد دەدەم بۆئەوەی ئەگەر مارێك تۆی گەست، بەگەستنی ئەو مارە ژەهراوی نەبیت. دوای ئەوەی خواردنەوەیەکی تاڵ و بێتام کە لەپزیشکی گیای گەزنە ئامادەکرابوو پیشانی "ڕامسیس"دا و وتی: ئەم خواردنەوەیە سوڕی خوێن خاو دەکاتەوە و بۆ هەندێك کەسیش دەبێتە هۆی ڕاوەستانی سوڕی خوێن. ئەگەر بیڕشێنیتەوە دەبێتە هۆی لەناو چونت، ئایا دەتوانی بەرگەی تاڵیەکەی بگریت تا من بڕێك لەو دەرمانەت دەرخوارد بدەم، ئەم کارەمان وەك ئەزمونێك وایە. بیخۆرەوە!

"ڕامسیس"یش پێکەکەی لەدەستی گرت و وتی: سەرەتا تامی دەکەم! ڕامسیس کەمێك لەو ئاوێتەیەی خواردەوە و وتی: لەسەرتاپای جەستەم هەست بەسەرما دەکەم، دڵم خەریکە لەسینەم بێتە دەرەوە.

ستائو وتی: تۆ کە دەتەوێت ببیتە فیرعەون دەبێت لەم تاقیکردنەوەیەدا دەرچیت، خۆت ڕابگرە!

"ڕامسیس"یش وتی: ڕیخۆڵەکانم پێچ دەخۆن، هەست دەکەم خەریکە دەڕشێمەوە.

ستائو وتی: دان بەخۆتدا بگرە، چاوەکانت بکەرەوە، مەهێڵە چاوەکانت دابخرێن.

ورده ورده ئازاری ڕامسیس کەم بویەوە و دوای ماوەیەك دوبارە گەڕایەوە باری ئاسایی خۆی و پرسی: ئایا لەتاقیکردنەوەی ژەهری مارەکەدا سەرکەوتنم بەدەست هێنا.

ستائو وتی: بەڕاستی تۆ کەسێکی بەهێز و چاونەترسی، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بەکەڵکی فیرعەون بون نایەیت.

ڕامسیس دڵگران بوو و وتی: متمانەم پێت هەبوو بۆیە دژە ژەهرەکەم خواردیتەوە.

ستائو وتی: هەر لەبەرئەوەش پێت دەڵێم بەکەڵکی فیرعەونی نایەیت، چونکە حەتوانی بەم ئاوێتەیە ژهراویت بکەم و بتکوژم، لەم جۆرە حاڵەتانەدا فیرعەونێك نەفێت متمانەی بەهیچ کەسێك هەبێت.

ڕامسیس وتی: تۆ هاوڕێی منی، هاوڕێیەکیش دەبێت متمانەی بەهاوڕێکەی تری بکات، بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەوە چیتر دۆستی پیٚ ناوترێت.

ستائو وتی: ئەی ڕامسیس تۆ شازادەی و بانگەشەی ئەوە دەکەیت ببیتە فیرعەون، لەکوێوە زانیت من دۆستی تۆم؟

ڕامسیس وتی: دەزانم. دوای ئەوە لە"ستائو"ی پرسی: بەبۆچونی من مارەکان جێی متمانە نین.

ستائو وتی: لەبەرئەوەی تۆ مارەکان ناناسیت لەخۆتەوە ئەم قسانە دەکەیت، مارەکان تەنها پەیڕەوی لەسروشتی خۆیان دەکەن، بگرە بەئەندازەی گەردێکیش نەرموتی سروشتی خۆیان لا نادەن، بەڵام مرۆڤ وانیە! کەسێکی هەمیشە گۆڕا و متمانەی پیٚ نەکراو و بەردەوام بەدوای بەرژەوەندیەکانی خۆیدا دڕەوات.

ڕامسیس پرسی: ئایا تۆش بەو شێوەیەیت؟

ستائو وتی: لەباتی قسەکرد وەرە با بتبەم بۆ بیابان، بۆئەوەی بەچاوی خۆت ببینی بیابان لەشەودا چ جۆر شوێنێکە..... دوای ئەوە کراسێکی تایبەتی دا بە ڕامسیس و هەردوکیان ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنەی ستائۆ باسی کرد. ئاسمان سایەقە و بەمانگ ڕوناك بوبویەوە. ستائو دارێك بەدەستیەوە بوو و بەردەوام بەو دارە دەیدا لەزەوی و بەرەو تەپۆڵکەیەك ڕۆشتن کە بەبەردی بچوك هەڵچنرابوو. "ڕامسیس"یش بەپێدەنگی بەدوای ستائو دا هەنگاوی دەنا، "ستائو"ش دەرمانێکی دژە ژەهری بەکەمریەوە هەڵواسیبوو. ئەو لەبنی ئەو تەپۆڵکەیەدا ڕاوەستا و وتی: گەورەی من لێرەدا ژیان بەسەر دەبات! خۆی لەبێگانەکان شاردووەتەوە. سەرەتا لەبەرامبەر بەرگەی نادیاردا نزا بکەین، بەشکم مارێکمان بۆ ئاشکرا بکات. "ستائو و ڕامسیس"چەمانەوە و لەسەر زەوی دانیشتن.

ستائو پرسی: هەست بەچ دەکەیت؟

ڕامسیس وتی: هەست بەسوکی و خۆشی دەکەم، هەوای بیابان وەك دەرمانی ڕۆحبەخش هەڵدەمژم و لەقەفەس و دیواری فێرگای"کەپ"ڕزگارم بووە و هەست بەئازادی دەکەم، لەناکاو لەم کاتەدا شتێکی ئەڵقە ئەڵقەدار دەرکەوت: ماری کوبرا، بەدرێژی میتر و نیوێك و بەپولەکەیەکی درەوشاوە داپۆشرابوو. سەری لەسەرخۆ بەلەقەلەق هێنایە دەرەوە، تریفەی مانگ ئەوەندەی تر شکۆمەندتری دەکرد، سەری بۆچەند جارێك ڕاوەشاند و خۆی بۆ هێرش و گەستن ئامادە کرد. ستائو لەسەر خۆ بەرەو ڕوی ڕۆشت، کوبرای ڕەشیش بەزمانی کیفەکیفێکی ترسناکی دەکرد.

لەوکاتەدا"ستائو"وتی بە ڕامسیس لەجێی تەکان نەخوات، ماریش لەوکاتەدا کونجکاو بوو و لەجێی خۆیدا بێ جوڵە مایەوە.

ستائو وتی: دەیەوێت یەکێکمان هەڵبژێرێت، من یان تۆ! بەڵام تۆ هەر لێرەدا بمێنەرەوە، منیش دوو هەنگاو بۆ پێشوازی کوبرا دەڕۆمە پێشەوە... دوای ئەوە لەدوری یەك متر لەبەرامبەر کوبراکەدا ڕاوەستا و بە"ڕامسیس"ی وت: دەقاودەق لەدوای منەوە ڕاوەستە و وێرد و نزایەکی دە جار دوبارە کردەوە و دوای ئەوە بە"ڕامسیس"ی وت: تۆش لەدوای من بیڵێرەوە! ئاوازی وێرد خوێندنی ئەو دوانە ماری لەحاڵەتی هێرش بردن پاشەکشە پێکرد، بەڵام دوای چەند ساتێك دوبارە خۆی بۆ هێرش و گەستن ئامادە کردەوە و سەری سوڕاندەوە، لەنزیك ڕوخساری"ستائو"دا پاشەکشەی کرد، "ستائو"ش دەستی خستە سەر سەری کوبراکە بەڵام کوبراکە هیچ جوڵەیەکی نەکرد! ڕامسیس بەسەرسوڕمانەوە بیستی کە ستائو پێی وت: ئێستا نۆرەی تۆیە. لەهەمان ئەو کاتەدا"ڕامسیس"یش دەستی درێژکرد، بەڵام کوبرا پەلاماری"ڕامسیس"یی دا. ڕامسیس لەوکاتەدا هەستی بەوەکرد کە کوبراکە گەستبێتی، بەڵام بۆنی پیاز هێرش بەری بەڕادەیەك ئازاردا کە بگرە نەشی توانی دەمیشی دابخاتەوە!!

ستائو وتی: مەترسە دەست بخەرە سەر سەری! کوبراش لەوکاتەدا پاشەکشەی کرد... . ستائو بەخێرایی"ڕامسیس"ی کێشایە دواوە و ماریش هێرشێکی لەناکاوی بۆکرد، بەڵام لەباتی ئەوەی بەریەکێکیان بکەوێت بەهاوا و بۆشاییدا فڕی، چونکە لەوکاتەدا ئەودوانە زۆر بەخێرایی پاشەکشەیان کردبوو.

ستائو وتی: هاوڕێ بەڕێزەکەم زۆر بەخاوی جوڵایتەوە، نابێت ئەوە فەرامۆش بکەیت کە هێز و توانا تاریکەکان بەهیچ شێوەیەك شکست ناخۆن، مەگەر "ئورایوس[7]" بەسەرە تاجی فیرعەونەوە نیە، ئەگەر کەمێك درەنگتر بجوڵایەیتەوە بەدڵنیاییەوە ئێستا زیندوو نەبویت.

ڕامسیس لەوکاتەدا هەناسەیەکی هەڵکێشا و تەماشای ئاسمانی کرد و بیستی: هیچ دژە ژەهێرێك بۆ ژەهری ئەم مارە نیە، بۆیە تۆ بەختێکی زۆر مەزنت هەبوو.

---

[7] ئورایوس: ڕەگەزی مێیینەی ماری کوبرایە و لەمیسری کۆندا هێمای هێز و دەستەڵاتی میسر بووە.

# موسا و ڕامسیس

ڕامسیس بێ لە شنار"موسا"ش برای بوو. "ست هوس"ی فیرعەون ژنێکی زۆری هەبوو، دایکی"ڕامسیس" هەر بەوشێوەی دەزانین"ستە هوس"بەواتای"ئەهریمە زادە"دێت سێ منداڵی لەڕامسیس بوو"دولانت و شنار و ڕامسیس"، هەڵبەت ئەم سێ منداڵەی لەهاوسەرە جوان و خۆشەویستەکەی بوو، فیرعەون تا دوایین تەمەنی نزیکەی سەد کوڕ و کچی هەبوو. "موسا"ی کوڕی فیرعەون لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا دەژیا لەگەڵ منداڵەکانی تری فیرعەوندا لەڕوی شێوە و ناسنامەوە جیاوازیەکی زۆری هەبوو، لەڕوی ڕەفتار و شێوازی بیرکردنەوە و شێوازی ژیان، بەهیچ شێوەیەك لەمنداڵەکانی تری فیرعەون نەدەچوو. لەتەمەنی دەساڵیدا ئەو بەقژێکی ڕەش و بالایەکی بەرز و ڕێك هەروەها تایبەتمەندیەکی بەرجەستەی هەبوو ئەویش ئەوەیە کە لوتێکی درێژ و چەماوە و گەورەی هەبوو. بەهاوسەنگی ئەم لوتەی گەشە و گەورەبونی جەستەیی"موسا"ش زۆر بەخێرایی دەردەکەوت، ئەویش بەڕادەیەك کە سەرەڕای ئەوەی تەمەنی دە ساڵان بوو، بەلام بە کوڕێکی سیانزەساڵان یان چواردەساڵان دەهاتە بەرچاو. دایکی"موسا"ی هاوسەری فیرعەون زۆربەی کاتەکان سەردانی پزیشکە تایبەتەکەی خۆی دەکرد، پەیوەست بونێکی زۆری لەگەڵ ڕوکاری دەرەوەی جەستەی خۆیدا هەبوو و بەردەوام گلەیی لەوە دەکرد کە خەریکە پیر دەبێت، بۆیە"سنی"پزیشکی دەخستە تەنگانەوە بۆئەوەی ڕێگری لەپێشڕەوی پیریەکەی بکات. ناوی پزیشکی تایبەتی هاوسەرەکەی فیرعەون"سنی"بو، سنی کەسێکی بالاکورت، قەڵەو و کەتەبوو هەروەها شێوەیەکی لادێیانەی هەبوو، ئەوناوەی کە لەخۆی نابوو لەڕەسەنایەتی و

ڕەچەڵەکی خۆیەوە تاڕادەیەك دور بوو، چونکە"سنی"لەمیسری کۆندا بەناوێکی گرنگ لەقەڵەم دەدرا بۆیە لادێییەکان ئەم جۆرە ناوە بۆ منداڵەکانیان هەڵنابژێرن، لەکاتێکدا کە پزیشکی تایبەتی دایکی فیرعەون"سنی"لادێی بوو. هەڵبەت مایەی سەرسوڕمانە کە بەچ شێوەیەك لەو سەردەمەدا کە لادێییەکان توانای خوێندنیان نەبوو، بەڵام"سنی"توانی نەك تەنها ببێتە پزیشك، بەڵکو جێگەیەکی لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بۆخی کردەوە. هۆکاری ئەم ڕوداوە دەگمەنە پەیوەندی یەکێك لەکاهینەکانی بە دایکی"سنی"ەوە بوو و لەگەڵیدا هاوخەو بوو و ژنیش بەهۆی ئەم پەیوەندیەوە سکی پڕ دەبێت، بەڵام دوای لەدایك بونی منداڵەکەی دەمرێت. جەستەی دایکی"سنی"بەپێچەوانەی نەریتی زۆر بەهێز و پایەداری میسر بێئەوەی مۆمیا بکرێت بەخاك دەسپێردرێت، منداڵیش بەواتا کوڕی کاهین و ژنی کوچکردوو لەئەستۆی کاهیندا دەمێنێتەوە، ئەویش ئەو منداڵە دەسپێرێت بەدایەنێك، بۆئەوەی گەورە و پەروەردەی بکات، دوای ئەوە کاهین ناوی "سنی" لەباشترین قوتابخانەدا تۆمار دەکات. سنی هاوکات لەگەڵ گەشەی زانستی پزیشکیدا دەیزانی کە مرۆڤ لەهەزارەوە بگرە تا دۆڵەمەند بونەوەرێکی لەناوچووە و ئەم مۆمیا دۆڵخۆشکەرەش هەمیشەیی و جاویدان نیە.

ئەو بەدایکی موسای وت: تۆ هەڵەیت کە واهەست دەکەیت پیر بویت، هەرئێستا مەفرەغی ئاوێنەکە بەدەستمەوە دەگرم بۆئەوەی باش تەماشای خۆت بکەیت و بۆت دەردەکەوێت جوان و لاو و تەڕ و تازەیت.

دایکی فیرعەو وتی: دەزانم کە جوانم، بەڵام تۆ کە پزیشکی تایبەتی منی دەمەوێت دەرمانێکم بۆ دیاری بکەیت کە وەك کچی پانزەساڵە پێستم لوس و ساف و گەرمی جەستەشم سوتێنەر بێت.

پزیشکی دایکی فیرعەون بۆی دەرکەوت جگە لەوەی دەرمانی ساختەی پێبدات هیچ ڕێگەچارەیەکی لەبەردەستدا نەماوە و وتی: بۆ ئەو دەرمانەی کە شاژن داوای دەکات دەبێت مەڵهەمێکی تایبەت دروست بکەم بۆ ئەم کارەش پێویستم بەکاتێکی زۆرە.

دایکی فیرعەونیش بەپێداگری و بێئۆقرەییەکەوە پرسی: بۆنمونە پێویستت بەچەنێك کاتە؟

پزیشك وتی: بەلایەنی کەم تا بەیانی ئەم مەڵهەمە پێویستە کاری لەسەر بکرێت، ئێستاش هەرچی زوترە بڕۆم بۆئەوەی بتوانم زوتر ئەم مەڵهەمەت بۆ دروست بکەم.

دایکی فیرعەونیش لەوکاتەدا فەرمانی دا میوەی تازەی بۆ بهێنن، لەهەمان ئەم کاتەدا"موسا"ی کوڕی هات، دایکیش گلەیی ئەوەی لێکرد: بۆچی ئەوەندە درەنگ درەنگ سەردانم دەکەیت؟ بەو خێراییە دایکت فەرامۆش کرد؟

موساش بەزمانێکی نەرم و ئاوازێکی ڕەوشتانەوە بەدایکی وت: هەر ئەوەی هەلێکم بۆ بڕەخسێت سەردانت دەکەم.

دایکیشی وتی: باشە وەرە و ماچم بکە! موسا کەمێك سور وەرگەڕا و لەجێی خۆی هەستایە سەرپێ...

دایکی زانی کەموسا ئێستا جیاوازی نێوان ژن و پیاو بەباشی دەستنیشان دەکات، هەرلەبەرئەوەش دوپاتی کردەوە: من دایکی تۆم وەرە با ماچێکت بکەم. دوای ئەوە ژنی فیرعەون-ئنخاس ئامون-ڕۆشتە پێشەوە و کوڕەکەی ماچ کرد.

پێشتر باسی ئەوە کرا کە فیرعەون ژنێکی زۆر هەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم شاژنەی میسر بەواتا"ستە هوس و ئنخاس ئامون" پەیوەندیان لەگەڵ ئەم بەسەرهاتەی ئێمەدا هەیە بۆیە زیاتر باسی ئەوان دەکەین، ئێستا موسا بۆچی گومانی لەماچ کردنی"ئنخاس ئامون"دا هەبوو؟ ئەمە خۆی بۆخۆی بابەتێکی زۆر گرنگە، چونکە موسا لەخەڵکی"تبس"ی بیستبوو کە ئەو کوڕی فیرعەون نیە! هەروەها"ئنخاس ئامون"یش دایکی نیە، فیرعەون بەیەك یان چەند ژنێك ڕازی نەبوو و زۆری ژنەکانی ببوە وێردی زمانی هەموو خەڵکی. ژمارەی ژن و منداڵەکانی فیرعەون"وەرزای داگیرکەر"خەڵکی میسر بەهێلانە مۆریانەیان شوبهاندبوو، لەناو هێلانەی مۆریانەدا هەموو مۆریانەکان لەیەك دایك دەبن و ست هوس-ورزای داگیرکەر-یش دەیەوێت نەوەی داهاتوی میسر هەموی لەخۆی بێت، فیرعەون بەڕادەیەك منداڵی هەبوو کە ناوی هەندێکیانی نەدەزانی، بگرە ڕوخساری هەندێکیانیشی نەدەناسیەوە، ئەو بەردەوام ژمارەی منداڵەکانی لەزیاد بوندا بوو.

هەڵبەت لەبەرئەوەی"شنار و ڕامسیس" لەهاوسەری یەکەم و سەردەمی لاویەتی فیرعەون بوو، هەلومەرجی ئەوان لەوانی تر زۆر جیاوازتر بوو. بەپێچەوانەی"شنار و ڕامسیس"کە پەیوەست بونێکی زۆریان بەفیرعەونی باوکیانەوە هەبوو، موسا زۆر ڕقی لەفیرعەون بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ناچار بوو لەتەمەنی دە ساڵیدا بڕوات بۆ لای فیرعەون. ڕقی موسا لەفیرعەون دەقاودەق لەبەر لەخۆبایی و توندوتیژی ئەوەوە سەرچاوەی دەگرت، فیرعەون"ست هوس"کە ناوی گای کێوی داگیرکەری لەخۆی نابوو، لەڕاستیدا هەمان ئەو ترس و ڕقەی کە گای کێوی لەمرۆڤدا دروستی دەکات لەدڵی میسریەکاندا دروستی کردبوو. لەمیسردا لەترسی فیرعەون خەڵکی هەوڵیان دەدا ناوی خوداکان لەمنداڵەکانیان بنێن. میسریەکان کاتێک ناوی فیرعەونیان دەهێنا هەردوو ناوەکەیان دەهێنایە زمان، بەدەنگێکی بەرز و سەرزارەکی دەیانوت: "خودا پادشا"بەڵام لەدڵیاندا دەیانوت"خودای شەڕ"موسا بگرە بەشێوەیەکی سەرزارەکیش ئەو ناوەی نەهێنایە زمان، موسا لەوباوەڕەدا نەبوو یان بەهیچ شێوەیەك ئەوەی پەسەند نەدەکرد کە فیرعەون باوەڕی بەخودا هەبێت و ئەم نکوڵی کردنەش لەنەفرەتێکەوە سەرچاوەی دەگرت کە لەبەرامبەر فیرعەوندا هەیبوو، بەئەندازەی ئەم نکوڵیەش خودای فیرعەونی موسا نەیدەویست ناوی خودا لەدایکی بنێت. موسا برایەکی زۆری هەبوو، بێ لە"شنار و ڕامسیس" کە فیرعەون ڕێزێکی زۆری لێ دەگرتن کوڕەکانی تری بۆ نمونە خودی موسا بەو شیوەیەش گرنگی پێ نەدەدان. لەسەردەمی منداڵیەوە بەم منداڵانەیان وتبوو کە فیرعەون و منداڵەکانی فیرعەون نامرن، بەڵام چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی موسا بەبۆنەی گەشتنی بەتەمەنی دەساڵی بڕوات بۆ لای فیرعەون، لەگەڵ چەند برایەکی تریدا لەتەلاری کۆشکدا یاریان دەکرد و یەکێك لەوانە پێشنیاری ئەوەی کرد چ کەسێك دەتوانێت بەم پایە بەرزانەدا سەربکەوێت؟ پایەکانی کۆشك زۆر بەرزبوون و بەرزیان بەلایەنی کەم دەگەشتە سیانزە یان چواردە میتر، موسا لەوکاتەدا کشایە دواوە بەڵام یەکێك لە کوڕەکان بەسەر یەکێك لەپایەکاندا سەرکەوت، بەڵام لەنیوە ڕێدا ماندووبوو، دەستی بەردا و سەرەوخوار کەوتە سەر زەوی و لەهەمان ئەوکاتەدا مرد.

موسا کاتێك پەنجەی لەدەمیدا بوو وتی: کەواتە ئەوەی کە دەڵێن فیرعەونەکان نامرن درۆیە، ئەم خودای ئایندەیە بەکەوتنە خوارەوەیەك کۆچی دوایی کرد. ئەوانەی لەکۆشکدا نیشتەجێ بون بەهۆی مەرگی فیرعەون زادەوە زۆر دڵتەنگ بون و ماتەمینیان بۆ گێڕا، بەڵام فیرعەون بەهیچ شێوەیەك گرنگی پێنەدا. موسا لەو ڕۆژەدا کەلە لای دایکی بوو ئەو ڕوداوەی گێڕایەوە بۆ دایکی، دایکیشی بەبیستنی ئەو هەواڵە دەستی کرد بەگریان.

موسا وتی: بەچ شێوەیەك کە تۆ دایکی ئەو کوڕە نیت بۆی دەگریت، بەڵام فیرعەون کە باوکی ئەو کوڕە بوو هیچ گرنگیەکی پێنەدا!

دایکی نەیهێڵا موسا بەردەوامی بەم قسانە بدات و وتی: سبەی سەرتاشە تایبەتەکەم دەنێرم بۆئێرە بۆئەوەی ئارایشتی قژەکانت بکات، و گەردی زێڕ بەسەر قژەکانتدا بپژێنێت بۆئەوەی ڕەنگی قژت ئاڵتونی دەربکەوێت، ملوانکەیەکی ئاڵتونیشم هەیە دەیکەمە ملت، چونکە تۆ چیتر گەورە بویت و بویت بەپیاو، لەدواییشدا دەسبەندی"ئامون"ت بۆ دەنێرم، ئەو دەستبەندەش لەلایەن دایکمەوە بۆم هاتووە، دوایئەوەش پێلاوی زوینیشت لەپێ دەکەم دوای ئەوە پێکەوە دەڕۆین بۆلای فیرعەون..... موسا لەوکاتەدا بێدەنگ بوو.

ئنخاس خاتون پرسی: خۆشحاڵ نیت بەوەی دەڕۆین بۆ لای باوکت؟

موسا دوبارە بێدەنگ بوو.

ئنخاس خاتونیش وتی: ئایا دەزانی وەڵام نەدانەوەی پرسیاری دایکێك بە بێڕێزی لەقەڵەم دەدرێت، لەوانەیە تۆ منت خۆش نەوێت.

موسا نەیتوانی خۆی بگرێت و وتی: من تۆم خۆش دەوێت، بەڵام لەچونم بۆ لای فیرعەون دەترسم چونکە لە خوداپادشا دەترسم.

ئنخاس خاتونیش پرسی: بۆچی لەفیرعەون دەترسیت، پێم بڵێ بۆئەوەی دایکشت بزانێت.

موسا وتی: دەترسم خوداپادشا دوجار بمخاتە ناو ڕوباری نیلەوە!

ئنخاس خاتون لەرز کەوتە گیانیەوە و بە ترەترێکەوە وتی: تۆ ئەم قسەیەت لەکێ بیستووە؟

موسا وتی: مەپرسە لەکێم بیستووە.

ئنخاس خاتون بەتوڕەیی و دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئێستا دەزانم چ نەفرەت لێکراوێك ئەم درۆیەی بۆ کردویت، بێگومان کاهینی مەزن ئەم درۆیەی بۆ دروست کردویت.

موسا وتی: لەخۆڕا خەڵکی تاوانبار مەکە.

چیتر دوای ئەوە ئنخاس خاتون ئۆقرەی لێبڕا و پەلاماری موسای دا، بەلام لەناکاو توڕەییەکەی گۆڕا بەنەوازش و وتی: کوڕم تەماشام کە خەڵکی قسەی بیهودەی دەکەن، تۆ چیتر گەورە بویت.

موسا وتی: ئەگەر من گەورە بوم کەواتە تۆ ڕاستیەکەم پێ بڵێ!

ئنخاس خاتون بەپەرێشانیەکەوە وتی: تۆ تێکەڵاوی کەسانێکت کردووە کە مێشکتیان بەوشێوەیە تێکداوە.

موسا وتی: تۆ کە دایکمی خەریکە میشکی من تێکدەدەیت چ بکات بەخەڵکی!

ئنخاس خاتون وتی: قسەی پیاوانە و بگرە لەتەمەنی خۆت گەورە تر دەکەیت.

موسا وتی: خۆت وتت کە من بوم بەپیاو.

ئنخاس خاتون هیچ ڕێگەچارەیەکی تری بەدەستەوە نەما و وتی: من تا ئەم ساتە نهێنیەکم لەتۆ شاردووەتەوە، ئەو نهێنیەش ناسنامەی باوکتە، بەلام بەهەموو کەسێکم وتووە تۆ کوڕی ست هوس"ئەهریمە زادە"ی کە نازناوی ورزای داگیرکەری لەخۆی ناوە، بەلام ئێستاش پێت ناڵێم باوکت کێیە، لێم دڵگران مەبە، چونکە هۆکارێکم بۆ ئەم نەگوتنەم هەیە کە هەم لەبەرژەوەندی تۆ و هەم لەبەرژەوەندی مندایە. ئێستا دەتوانی بڕۆیت و هەریاریەك کە خۆت حەزت لێیەتی بیکەیت! بەلام موسا نەڕۆشت.

ئنخاس خاتون وتی: مەگەر پێم نەوتی بڕۆ یاری بکە.

موسا وتی: دوای ئەوەی وەلامی پرسیارەکەمت دایەوە هەرچیم پێ بڵێیت ئەنجامی دەدەم.

ئنخاس خاتون بێدەنگ بوو و موسا پرسی: دەمەوێت بزانم ئایا ئەو فیرعەونەی هاوسەری تۆیە، هەمان ئەو باوکەی منە؟

ئنخاس خاتوون وتی: تەنها شتێك تۆ دەبێت لەمبارەیەوە بیزانیت ئەوەیە جارێکی تر ئەم پرسیارەم لیّ نەکەیت، بەڵام ئەوە بزانە کە من دایکی ڕاستەقینەی تۆم، هەر ئەوە بۆتۆ بەسە، لەم کۆشکەدا ئەوە تەنها منم پارێزگاری لەتۆ دەکەم. ئێستا لەکانگای دڵمەوە حەز دەکەم تەنها بم.

موسا بێدەنگ لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە و بەکینە و دڵگرانیەکەوە ڕۆشتە هەیوانی کۆشکەوە بۆئەوەی کەمێك پیاسە بکات و دەنگێك بانگی کرد: موسا! موساش تەماشای دواوەی کرد و کاهینی کۆشکی بینی کە بەدەم زەردەخەنەوە دەڵێت: بۆچی دەموچاوت داوە بەیەکدا شازادەی مۆن!

موسا وتی: ئەی کاهینی پیرۆز تکات لێدەکەم بەم ناوە بانگم مەکە.

کاهنیش وتی: تۆ چیتر من بەکەسی پیرۆز بانگ مەکە، چونکە تەنها بەمردووەکان دەڵێن پیرۆز، ئەویش ئەو مردووەی کە جەستەی بۆ هەتاهەتایی و جاویدانی مۆمیا کرابێت، ناوم"ئامون تپ"ە.

"ئامون تب"وتی: من"ئنخاس"خاتونم پێش ئەوەی شوو بەفیرعەون بکات دەناسی، ئێمە پێکەوە پەیوەندیەکی دۆستانەمان لەگەڵ یەکدا هەبوو، لەبەرئەوە هەموو نهێنیەکی خۆتم بۆ بگێرەرەوە!

موسا وتی: تۆ وتت لەڕابردوودا دایکمت دەناسی هەروەها دەشزانی کە شوی کرد بەفیرعەون، ئایا دەتوانی بەرواری لەدایك بونم بەبیر بهێنیتەوە؟

"ئامون تب"ی کاهن سور وەرگەڕا و بەدڵگرانیەکەوە وتی: بۆچی تۆ من بە"مامان"دەزانی، ئەوە چ پرسیارێکی منداڵانەم لیّ دەکەیت!

موسا زۆر لەم شێوازی مامەڵەیە دڵگران بوو، ڕۆشت بۆئەوەی پلیکانەی کۆشك بڕوات خوارەوە، بەڵام لەوکاتەدا دوبارە دەنگی کاهین بەرز بویەوە: موسا ڕاوەستە.

لەوکاتەدا خۆی گەیاندە لای موسا و وتی: من ئەم نهێنیەت لەکاتی خۆیدا بۆ دەگێڕمەوە.

موسا پرسی: بۆچی ئێستا پێم ناڵێیت، لەکاتی خۆیدا چ کاتێکە کە تۆ و دایکم دەستنیشانتان کردووە!

کاهینی کۆشك دەستی خستە سەرشانی موسا و لەچاوەکانی موسا ڕاما و بەجێگیر و یەکلایی کەرەوە وتی: پێداگیری مەکە، کاتێك کاتی خۆی بێت ناچارم پێت بڵێم، بگرە ئەگەر خۆشت حەز نەکەیت. لەوکاتەدا موسا گوتەی"ئامون تب"بەجدی وەرگرت و چیتر دوای ئەوە پێداگری نەکرد.

# ئیزت یەکەمین عیشقی ڕامسیس

"ڕامسیس"ی کوڕی فیرعەون، بەناونیشانی کوڕی دووەم بۆ بەدەست هێنانی پلەوپایەی فیرعەون لەسەردەمی نێوجەوانیدا دەبێت ڕاکابەری لەگەڵ برا گەورەکەی"شنار"دا تێپەڕێنێت، بێ لەو تاقیکردنەوانەی کە ساتی نا ساتێك لەلایەن فیرعەونەوە ئەنجام دەدرێت، خودی خۆشی بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە مەشقی دەکرد. سەوڵ لێدان لەنێو نێجەواناندا کە خودی"ڕامسیس"ڕێکی خستبوو، ئەویش لەنێو کچانی جواندا کە چاویان بڕیبووە سەوڵ لێدەرەکان، بۆ ڕامسیس – کە بەگوتەی فیرعەون بووە بەپیاو و ئارەزوی ڕەگەزی بەرامبەر لەودا دەرکەوتبوو– لێوانلێوی وروژان بوو. لەکاتێکدا ئەوانی تر بۆ خۆنواندن لەبەرامبەر ئەو کچە جوانە تەماشاچیانەدا هانی پێشبڕکێ دەدا، ڕامسیس دوو پاڵنەری هەبوو ئەویش یان ڕەهەندی سێکسی یان خۆ نواندن بوو ، ئەو دەیویست خۆی تاقیبکاتەوە. ڕامسیس لەو پێشبڕکێیەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و هەر ئەوەی لە"گەمیٚ[8]"کەی دابەزی، کچێکی جوان و باڵابەرز و پێستێکی قاوەیی و نزیکەی پانزە ساڵانە هاتە پێشەوە و پارچەیەکی خستە سەرشانی ڕامسیس و ئەم ڕستەیەی هێنایە زمان:

---

[8]گەمیٚ: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە هەم بەواتای بەلەمی گەورە "کەشتی" دێت و هەم بەواتای قەیاخ و بەلەمی بچوکیش دێت، بەکەشتیە گەورەکان دەوترێت گەمێی باری و بە بەلەمە بچوکەکانیش تەنها دەوترێت"گەمیٚ" لەکتێبی سەرئەنجامی "ئەهلی حەق"دا کە کتێبی پیرۆزی ئەو ئاینەیە و لەساڵی ١٣١٦ بۆ ١٣١٧ زاینی بەزمانی هەورامی سەری هەڵداوە و نوسراوەتەوە، کەشتی و بەلەمیان بە وشەی"گەمیٚ"تۆمار کردووە، وشەیەك کە بەلایەنی کەم حەوسەد ساڵ تەمەنی بێت جێی ستایشە بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و لەنوسراوە مێژویی و ئەدەبیەکانماندا بەکاری بهێنین.... وەرگێڕ.

سلاو لەشازادە ڕامسیس، ئارقت کردووە ڕێبدە بەم پارچەیە داتپۆشم بۆئەوەی سەرمات نەبێت.

ڕامسیس زەردەخەنەیەکی کرد و تەماشایەکی کچەی کرد و پرسی: ناوت چیە؟

کچەش وتی: ناوم"ئیزت"ە. زۆر خۆشحاڵ بوم بەوەی تۆ لەم پێشبڕکێیەدا یەکەمیت هێنا، بەخۆشی ئەم سەرکەوتنەتەوە ئەمشەو لەگەڵ هاوڕێکانمدا ئاهەنگێك بەرپا دەکەم بۆئەوەی پاڵەوانی مەزنی سەوڵ لێدان ئەو شەرەفەیان پێ ببەخشرێت.

ڕامسیس وتی: سەرەڕای ئەوەی دەزانم ئەو ئاهەنگە زۆر سەرنج ڕاکێش دەبێت، بەڵام دەبێت داوای لێبوردن بکەم.

ئیزت وتی: من لەو شوێنەدا ماڵێکم هەیە- دوای ئەوەی ناونیشانی ماڵەکەی پێدا-پێی وت ئێمە لەوێ ئاهەنگێك بەرپا دەکەین ئەگەر ڕات گۆڕی پەیوەندیمان پێوە بکە، دوای ئەوە بەدەم زەردە خەنەوە دور کەوتەوە و چیتر دوای ئەوەی تەماشای دوای خۆی نەکرد.

"دولانت"خوشکی ڕامسیس لەتەنیشت"ساری"هاوسەری لەباخی ماڵەکەیاندا لەژێر سێبەری درەختی هەنجیرێکی عەرەبی گەورە و بەرزدا خەوتبون. "ڕامسیس"یش لەو دەوروبەرەدا پیاسەی دەکرد و جارجارێکیش تەماشای ئەو کورسیە درێژەی دەکرد کە "دولانت"ی بەسەرەوە ڕاکشابوو. دولانت ژنێکی نە جوان و نە ناشیرین، تەنها شتێکیش کە بیری لێدەکردەوە ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی بوو. هاوکات لەگەڵ هەلومەرجی"ساری"هاوسەری کەسەرۆکی قوتابخانەی"کەپ"هەروەها لەبەرئەوەی کچی فیرعەونە داوای هەرچی بکردایە دەیانخستە بەردەستی. "دولانت"کچێکی باڵابەرز بەڵام پێستێکی چەوری هەبوو هەر لەبەرئەوەش هەموو ڕۆژێك مەڵهەمگەلێکی جۆراوجۆری دەدا لەجەستەی و بەبەردەوامی چاودێری پێستی دەکرد.

دولانت شانازی بەوەوە دەکرد کە ئاگاداری هەموو نهێنیەکی خێزانە وەجاخزادەکان بوو. لەوحاڵەتەدا چاوی بە ڕامسیس دەکەوێت و بەدەم زەردەخەنەوە وتی: لەخزمەتی برا خۆشەویستەکەمدام.

ڕامسیس وتی: ئایا تا ئێستا ناوی"ئیزت"ت بەرگوێ نەکەوتووە؟

دولانت وتی: کەمێك باسی ئەوم بۆ بکە و بۆم ڕونبکەرەوە! دوای ئەوە وتی: بەڵێ ئەو کچێکی جوان و بەنازە، دەڵێن لە"تبس"دا لەجوانیدا بێوێنەیە، سەرەڕای ئەوەی تەمەنێکی کەمی هەیە بەڵام خوازبێنی زۆرە.

ڕامسیس وتی: ئەی هیچ شتێك لەبارەی خێزانەکەیەوە دەزانیت؟

دولانت وتی: بەڵێ ئەتوانی بڵێیت خێزانێکی پڕ بەواتای وشە دۆڵەمەندن، چەند نەوەیەکی وەجاخزادەکەیان لەم کۆشکەدا بۆچەند جارێك پێشوازیان لێکراوە، دەتوانین بڵێین خێزانێکی وەجاخزادەن. دوای ئەوە بەردەوام بوو: بەدڵنیاییەوە تۆی خستووەتە تەڵەوە؟

ڕامسیس وتی: ئەمڕۆ کاتێك لە"گەمێ"کەم پیادە بووم کچێك پارچەیەکی دا بەشانمدا و دوای گفتوگۆیەکی کورت ئەمشەو میوانداری کردم.

دولانت وتی: ئەو هەموو شەوێك میوانداری هەیە، هەموو شەوێك لەماڵەکەیدا ئاهەنگ دەگێڕێت، ئەرێ بەڕاست سەرنجی ڕاکێشاویت؟

ڕامسیس وتی: منی وروژاندووە.

دولانت وتی: سەرەڕای ئەوەی جیاوازیەکی ئەوتۆتان لەگەڵ یەکدا نیە، بەڵام ئەو لەم جۆرە بوارانەدا زۆر لێهاتووە، بەدڵنیاییەوە تۆ سەرنجت ڕاکێشاوە ئەگینا میوانداری نەدەکردی، بەدڵنیاییەوە بەشداری ئەو میوانداریەی بکە.

میوانداری"ئیزت"میوانداریەکی ئاسایی نەبوو، لەو میوانداریەدا کچانی وەجاخزادە کە لەسەمادا لێهاتوو بون، چەند سەمایەکی بەکۆماڵیان کە بەلای "ڕامسیسە"وە چوست و چالاکیەکی نوێ بوو ئەنجام دا. گروپێکیش گۆرانیان دەوت و گروپێکیش دەیانژەند! "ئیزت"لەتەنیشت "ڕامسیس"ەوە ڕاوەستابوو و تازە دەستی لەسەمایەکی هەناسەبڕ هەڵگرتبوو، بەدەم هەناسە بڕکێوە و بەشێوەیەك خۆی بە"ڕامسیس"ەوە چەسپاند کە ڕامسیس گوێی لەهەناسەبڕکێکەی بوو. کچانیش بەشێوەی میسریەکان نیوە ڕوت سەمایان دەکرد. ئاهەنگ تا نیوە شەو بەردەوام بوو و"ئیزت"کاتێك وردە وردە دەوروبەری بەچۆڵی

بینی، بەدوو پێك مەیەوە خۆی لەڕامسیس نزیك كردەوە و لێی پرسی: ئێستا پێم بڵێ كام یەك لەم كچانە زیاتر سەرنجی ڕاكێشایت.

ڕامسیس لەوكاتەدا شەرم گرتی و سەری دانەواند، بەڵام"ئیزت"كە وەك ئەوەی لەگەڵ ماردا یاری بكات زەردەخەنەیەكی كرد و وتی: پێكێك مەی كەمێك لەم شەرمەت كەم دەكاتەوە.

دوای ئەوە وەك مامۆستایەكی لێهاتوو پێكە شەرابەكەی بەچواردەوری سەری "ڕامسیس"دا سوڕاندەوە و كوڕی لاوی ئەفسون كرد، دوای ئەوە پێكە شەرابەكەشی نا بەلێویەوە و وتی: بیخۆرەوە بۆئەوەی شەرابی ترت پێبدەم.

ڕامسیس نەیدەزانی بەچ شێوەیەك ئەم كچە بەسەریدا زاڵ بووە، وەك منداڵێكی دێیی فەرمانەكانی جێبەجێ دەكرد، دوای ئەوە دەستی"ڕامسیس"ی گرت و وتی: پێم بڵێ چ كچێك لەمانە زیاتر سەرنجی ڕاكێشاویت بۆئەوەی مژدەیەكی مەزنت پێبدەم.

ڕامسیس كە سەری بە مەی گەرم ووروژانی لەسەرتاپای بونایەتیدا هێنابووە جۆش وتی: لەكچی دەریا كە نیوە تێری كردم.

"ئیزت"دای لەقاقای پێكەنین، دوای ئەوە قژە درێژەكانی كردەوە، بەڵام لەناكاو پرسیارێك بەهزری"ڕامسیس"دا هات: بیستومە كە تۆ دەستگیرانی"شنار"ی برای منی.

"ئیزت"یش كە چیتر خۆی هەڵدابووە باوەشی"ڕامسیس"ەوە تەماشایەكی چاوانی كرد و وتی: لەئێستادا سەرتاپای بونایەتیم هی تۆیە، تینوی خۆت بشكێنە! دەستگیرانداری قەرزە و تینو شكاندن و تێربونیش نەقدە...

ڕامسیس بۆ یەكەمین جار تامی عیشقی كرد ، خەون نەبوو، بۆماوەیەك لەدڵی خۆیدا قسەی لەگەڵ خۆیدا دەكرد، لەوانەیە خەوم بینیبێت، بەڵام هەموو ساتەكانی لەبێداری ڕابردوو و ئێستاش لە تەویلەدا ناچار بوو هەندێك فەرمانی"ساری" ڕاهێنەری قوتابخانەی"كەپ"ئەنجام بدات. ئەو كەسە بەتەمەنانەی كە لە تەویلەدا كاریان دەكرد لەبەرخۆیانەوە گاڵتەیان بەو دەكرد كە یەكێك لە وەجاخزادەكان بووەتە پاككەرەوەی تەویلەی ئەسپەكان! سەبەتەیەكی پڕ لە پەین و قەرسەقوڵ

ئەسپ و گوێدرێژەکان بەسەر سەری یەکێك لەهاوڕێکانی"ڕامسیس"ەوە بوو کە بەو ڕادەیەش جەستەی بەتوانا نەبوو، ئەوی زۆر بێزار کرد، "ڕامسیس"یش لێی نیزك بویەوە و"ئامنی"هاوڕێی ناسیەوە!

ڕامسیس بانگی کرد: ئامنی؟ دوای ئەوە بەدەم هاوار و تووڕەییەوە وتی: کێی وای لەتۆ کردووە!

لەناکاو دەستێکی بهێز شانی ڕامسیس گرت: تۆ کێیت کە بیّ مۆڵەت دەست لەکاروباری ئێمەوە وەردەدەیت؟ ئەم تەویلەخانەیە لەژێرچاودێری جێنشینی فیرعەونی ئایندە"شنار"دا بەڕێوە دەبرێت.

ڕامسیس بێئەوەی سەرزارەکیانە وەڵامی بداتەوە بەهەموو هێز و توانایەکی ئارنجێك دەدات لەسینەی کابرا و تەختی ناو تەویلەکەی دەکات.

پیاویش هەستایەوە سەرپێ و هاواری کرد: ئەم کوڕە لاوە دەبێت تەمێ بکرێت! هاوڕێیانی سەرپەرشتیاری تەویلەکان بێ هیچ ترسێك پەلاماری "ڕامسیس"یان دا، "ڕامسیس"یش فەرمانی دا بە"ئامنی": هەڵبێ و خۆشی بەپەلە لەتەویلەکان ڕۆشتە دەرەوە. یەکێك لەکرێکارەکان لەدەرەوەی تەویلەکان توانی خۆی بگەیەنێتە ڕامسیس، بەڵام لەناکاو ڕامسیس ڕاوەستا و پاشەقولەیەکی دا لەو پیاوە و تەختی زەوی کرد. هاوڕێیانی کابرای کرێکاری تەویلەکان خۆیان گەیاندە ئەو شوێنە و "ئامنی"ش ڕاوەستا. پیاو و هاوڕێکانی کە شەش کەس دەبون تیخی چەقۆیان بەدەستەوە گرت.

ئامنی هاواری کرد: ئەو!ئەو کەسە!شازادە "ڕامسیس"ە!

لەوکاتەدا"شنار"یش گەشتە ئەوێ و پرسی: ڕامسیس دوبارە لێرەیت؟ وەك بڵێی ئەو گیانەوەرانە باشترین هاوڕێی تۆ بن؟

ڕامسیس پرسی: "شنار"ی برام لێرەدا چی دەکەیت؟

شنار وتی: بەفەرمانی فیرعەون سەرقاڵی پشکنینم، فیرعەونی ئایندە دەبێت ڕێڕەوی خۆی باش بناسێت! من فیرعەونی ئایندەم، بۆیە فەرمان بەتۆش دەدەم نەك تەنها چواردەوری ئەم ناوچەیە و نە دەورو و خولی ئەو کچە بدەیت! چونکە ئەو هاوسەری ئایندەی منە.

ڕامسیس پێکەنی و وتی: نە تۆ دەبیتەی فیرعەونی ئایندە و نە"ئیزت"دەبێتە هاوسەری ئایندەت. چونکە لەگەڵ مندا هاوخەو بووە!

"شنار"بەدڵگرانیەکەوە هاواری کرد: ئەم قسە هەلەق و مەلەقانە چین دەیکەیت؟

ڕامسیس وتی: ئەمانە قسەی هەلەق و مەلەق نین، بەڵکو ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە، "ست هوس"ی باوکم ئەو مژدەیەی پێبەخشیم کە من دەبمە فیرعەون، شەوی ڕابردوش"ئیزت"لەلای من بوو...

ستە هوس-ئەهریمەن زادە-کە هاوسەری"ست هوس" و بە دایکی"شنار و ڕامسیس"لەقەڵەم دەدرا خۆی وەك فیرعەونێکی فەرمانڕەوای ڕەهای میسر لەقەڵەم دەدا. ئێمە کە ئاشنایەتیەکی تەواومان لەپێشینەی"ستە"هەیە و دەزانین"نفر نفر نفر"ی دایکی لەو شەوە ترسناکەدا کە بەفەرمانی"سینۆهە"بێهۆش سپێدرا بە مردووخانە و لەو هەموو کرێکاری مردوخانەیە نەیزانی لەکامیان سکی پڕ بووە، کچێکی دەبێت کە ناوی"ستە هوس" بەواتا -ئەهریمەن زادە-ی لێنا. دەقاودەق وەك"ست هوس"ی هاوسەری کە دیار نەبوو شازادە"باکتامون" لەنێو ئەو هەموو پیاوەی بەردیان بۆ دەهێنا بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێرن لەکامیان سکی پڕ بووە. لەڕاستیدا"شنار و ڕامسیس و دولانت"سێ ئەهریمەن زادەی پڕ بەواتای وشە بوون. "ستە هوس"ی شاژن بەهۆی بێشەرمی و هەندێك تایبەتمەندی تایبەت بەخۆیەوە لەکۆشکدا دەستەڵاتێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، ئەو بەلەش و لارێکی باریك و چاوێکی بادامی و تیژ و کاریگەر و لوتێکی جوان و ناسك و بەلەخۆباییەك کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی بۆساتێکیش بەرگەی بگرێت ترس و تۆقان و دڵەڕاوکێی دەخستە نێو دڵی خەڵکیەوە. "ستە هوس" لەڕادەبەدەر بە"ڕامسیس"ەوە پەیوەست بوو و لەوساتەدا "ڕامسیس"ی زۆر بەدڵگرانی بینی، ئەویش بەم دیمەنە زۆر دڵگران بوو بۆیە هۆکاری دڵگرانیەکەی لێپرسی... لەوکاتەدا ڕامسیس بەڕێز و مەزنیەکەوە دایکی لەئامێز گرت.

دایکی وتی: دایکت زۆر باش دەتوانێت هەست بەوە بکات کە کوڕەکەی دڵگرانە. ئایا دوبارە لەگەڵ"شنار"ی براتدا شەڕت بووە؟

ڕامسیس وتی: هیچ کارێکم بەوەوە نیە.

ستەهوس–ئەهریمەن زادە–وتی: شنار لەتۆ دەترسێت.

ڕامسیس وتی: ئەو فەرمانی ئەوەم بەسەردا دەدات کە دەبێت یەکسەر "تبس" بەجێ بهێڵم.

ستە هوس وتی: وادیارە هۆکارەکەشی"ئیزت" بێت، تۆ بەقۆرخ کردنی "ئیزت"و "ئیزت"یش بەبەخشینی پەردەی کچێنی بەتۆ تووڕەیی و کینەی"شنار"ی وروژاندبێت!

ڕامسیس بەسەرسوڕمانەوە پرسی: چۆن بەو خێراییە ئاگادار ئەم نهێنیە بویت؟

ستە هوس وتی: "ئیزت"یەکێکە لەکچە خانەدان و وەجاخزادەکان، لەم کۆشکەدا هەرکەسێك هەناسەیەك بدات من یەکەمین کەس دەبم کەئاگام لەو هەناسەیە دەبێت. ئەم نزیك بونەوەی تۆ و"ئیزت"بۆ"شنار"کە دەیەوێت"ئیزت"بهێنێت سەرشۆڕیە، بەڵام تۆ کە نیازی ئەوەت نیە ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنی؟

ڕامسیس دوپاتی کردەوە: بەهیچ شێوەیەكاژیانی هاوسەرەی؟مەحاڵە!

بەڵام دایکی وتی: تا ئەو شوێنەی من"ئیزت"بناسم، لەبەرئەوەی پەردەی کچێنی بەتۆ بەخشیوە، بەم زویی و ئاساییە دەستبەردارت نابێت.

ڕامسیس دەستی دایکی گرت و وتی: تەنها کەسێکیت کە دڵنیام خیانەتم لێ ناکەیت، دەمەوێت کار و بەرپرسیاریەتیەك بدەیت بە"ئامنی"هاوڕێم.

ستە هوس–ئەهریمەن زادە–وتی: ئایا بە نوسەری بارەگای فەرمانڕەوایی ڕازی و خۆشحاڵ دەبێت؟

ڕامسیس پرسی: چ کەسێك دەبێتە بەڕێوبەر و ئەو دەستەڵاتەی پێ دەبەخشرێت کە"ئامنی"نوسەرەکەی بێت.

ستە هوس کوڕەکەی ماچ کرد و وتی: لەم ساتە بەدواوە تۆ بەڕێوبەری و ئەودەستەڵاتە بەتۆ دەبەخشرێت و دەتوانی"ئامنی"هاوڕێت بەناونیشانی نوسەری بارەگای فەرمانڕەوایی هەڵبژێریت، بەڵام بۆئەوەی ببیتە بەڕێوەبەری دەستەڵات بەناچاری دەبێت بەچەند ئەزمون و تاقیکردنەوەیەکدا تێپەڕیت، بۆیە بڕۆ و خۆت ئامادەی تاقیکردنەوەکان بکە، بەڵام ڕێ بەترس مەدە ڕۆ بچێتە دەرونتەوە، تۆ هەڵدەبژێردرێیت.

ڕامسیس بۆ تاقیکردنەوەکان خۆی بە بەڕێوەبەری دەستەڵات و فەرمانڕەوایی ناساند، بەڵام ئەو بەپێی پێویست ئامادە نەبوو. ئەزمون و تاقیکردنەوەکان لەژوری بەرپرسەکەدا ئەنجام دەدرا. مەراسیمی تاقیکردنەوەی بەڕێوەبەری لەهەیواندا ئەنجام دەدرا، دەبوو کەپریان بۆ ئامادە بوان ئامادە بکردایە، بۆئەوەی لەڕوناکی و گەرمی خۆر پارێزراو بن. لەم تاقیکردنەوەیەدا بەڕوکەش هیچ جیاوازیەك لەنێوان ڕامسیس و خۆبەخشەکانی تردا بەدی نەدەکرا، لەڕاستیدا ڕامسیس زانیاری پێویستی بۆ تێپەڕاندنی ئەو تاقیکردنەوەیە نەبوو. پەنجا کەس لەلاوانی ئامادە بۆ تاقیکردنەوە بەشداری لەم ئەزمونەدا کرد، لەم پەنجا کەسە تەنها دوو کەس دەیانتوانی ئەو پلەیە بەدەست بهێنن. پیرمێردی بەتەمەن، بەڕێوبەری بارەگای فەرمانڕەوایی سەر و تەختەیەکی دا بە هەریەك لەو لاوانە-تەختەیەکی لەداری "ئاقاقیا"ی دا بەهەر یەکێکیان کەڕوپۆشی توێژێکی کەچی کرابوو و لەناوەڕاستی ئەو تەختەیەدا چاڵێك هەبوو کە پێنوسێکی قامیشیان تێدا دانابوو. تاقیکردنەوەکە لەچەند نهێنیەك پێك دەهات: ڕامسیس لەنهێنی چوارەمیاندا گیری کرد، نهێنیەکەش ئەوەبوو کە بەچ شێوەیەك مەرگ بگۆڕن بۆ ژیان! ڕامسیس بیری بۆ هیچ شتێك نەدەڕۆشت، نەیتوانی هیچ شتێك لەمبارەیەوە بنوسێت...

دەنگێك بەگوێیدا چرپاند: بەڕێوەبەر بەتیغێك کە لەڕەگەزی لمە لایەکی ئەو تەختەیە هەندێك شتی لەسەر نوسراوە دەتاشێت بۆئەوەی تەختەیەکی نوێ ئامادەی نوسین بکات، ئەم کارەش ڕێی پێدەدات بەسود وەرگرتن لەتەختە، تەختە لەحاڵەتی مەرگەوە بگۆڕێت بۆ حاڵەتی ژیان.

دوای ئەوە ڕامسیس لە"ئامنی"هاوڕێی نزیك بویەوە و وتی:

-من گەناوم"ڕامسیس"ە وەك فەرمانڕەوایەك تۆ دەکەم بەنوسەری خۆم.

## موسا لەبارەگای گەشەدا

لەوکاتەدا دەبوو موسا و دایکی لەلایەن فیرعەونەوە پێشوازیان لێ بکرایە. فیرعەون لەو ساتەدا لەسنوری چل ساڵی تێپەڕیبوو، لەبەشێکی ئەو کۆشکەدا پێشوازی لە موسا و دایکی کرد کە موسا تا ئەو ساتە چاوی بەو شوێنە نەکەوتبوو. موسا خۆی کرد بەناو تەلاردا بەبینینی زۆر تۆقا، زەوی ئەو تەلارە بەبەردی ڕەشی ناوچەی میسری سەرو داپۆشرابوو، درێژی و پانی ئەو تەلارە زۆر فراوان بوو، تەختی فیرعەون لەسەروی ئەو تەلارەدا دانرابوو، لەهەردوو لای تەختەکەوە دوو پایەی درێژ و زۆر ئەستور هەبوو کە بەسەر ئەو پایانەوە باسی جەنگ و داگیرکاریەکانی فیرعەونی لەسەر تۆمار کرابوو. لەپشتی ئەو تەختەشەوە وێنە جەنگەکانی لەسەر کێشرابوو. موسا چاوی بەفیرعەون کەوت کە بەسەر تەختەکەیەوە دانیشتبوو و ناو تەلارەکەش پڕبوو لەخەڵکی. هەموو ئامادەبوانیش بەپێی پلەو و پایە و هەلومەرجیان لەپاڵ یەکتردا دانیشتبوون. موسا بەبینینی کەسانی جیاواز، بگرە کەسە بیانیەکانیش بیری لەوە کردەوە کە دایکی بۆچی لەڕۆژێکی ئاوادا کوڕەکەی هێناوە بۆ لای فیرعەون، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەموو کەسێك بوو. سەیرترین شت جلوبەرگی فیرعەون بوو کە هیچ کەسێك وەك ئەو جلی سادەی لەبەر نەکردبوو. فیرعەون چاوی بە"ئنخاس ئامون"ی هاوسەری کەوت، هەروەها چاوی بە"موسا"ش کەوت. فیرعەون بەدەستی ئاماژەی بەوەدا کە ژن و کوڕەکەی بڕۆن بۆ لای. لەهەمان ئەم ساتەشدا ئەو کاهینەی کە لەگەڵ فیرعەوندا سەرقاڵی گفتوگۆ بوو لەخۆی دور خستەوە و چیتر دوای ئەوە خۆی بەتەنهایی مایەوە و

لەسنوری دوری شەش مەترەوە هیچ کەسێك ماوەی ئەوەی نەبوو لەوە زیاتر لەفیرعەون نزیکتر ببێتەوە. "ئنخاس ئامون"دەمی لەگوێی موسا نزیك کردەوە و وتی: کاتێك گەشتینە شوێنی دیاری کراوی فیرعەون کڕنوشی بۆ بەرە.

"موسا"ش کڕنوشی برد و فیرعەون بەدایکی دەڵێت: ئەی شاژن تۆ هێشتا جوان و چوست و چالاکیت.

شاژن"ئنخاس"یش سوپاسی کرد و ئاماژەی بۆ موساکرد و وتی: ئەمە کوڕی ئێمەیە کە ئەمڕۆ تەمەنی بوو بە دەساڵ، ئەوم لەبەرئەوە هێناوە بۆ ئێرە تا پادشا بەرەکەتی پێ ببەخشێت.

فیرعەون تەماشایەکی سەراپای"موسا"ی کرد، وەك بڵێی ڕوبەڕوی کوڕێکی بێگانە بووەتەوە، چونکە ئەوە یەکەمین جاربوو فیرعەون چاوی بە موسا بکەوێت..... دوای ئەوە پرسی: ناوی چیە؟

"ئینخاس" خانمیش وتی: ناوی "موسا"یە.

فیرعەون وتی: موسا هەر ناو نیە.

"موسا"ش هاتە گۆ و وتی: ئەگەر موسا ناو نیە، ئەی کەواتە چیە؟

فیرعەون وتی: کوڕەکەمان زمانی وەك بوبول وایە، دوای ئەوە لەوەڵامی موسا دا وتی: موسا نیوەی ناوە و بەواتای "بەخشراو"دێت! بۆ نمونە ئەگەر ناوت ئامون موسا"بەواتا خودا بەخش"بوایە ئەو کات ڕون و ئاشکرا دەتزانی واتای چی دەگەیەنێت.

ئنخاس ئامون وتی: ئەی فیرعەون تۆ ناوێك لەم کوڕەمان بنێ!

فیرعەون وتی: چیتر بۆ گۆڕینی ناوی درەنگە، شازادەیەك کاتێك لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دادەنیشێت دەتوانێت ناوی بگۆڕێت، بۆ نمونە خۆم ناوم لە "ست هوس"ەوە گۆڕی بۆ "وەرزای داگیرکەر"، هەروەها کاتێك کە تەرمی مومیاکراوی ڕەوانەی جیهانی خۆرئاوا دەکرێت دەتوانیت ناوی بگۆڕێت. دوای ئەوە بە موسای وت: وەرە پێش! و دەستی خستە سەر سەری موسا و وتی: من بەرەکەتت پێ دەبەخشم و لەبەرئەوەی بەرەکەتت پێ بەخشراوە ئەگەر نێزەیەك بۆ ملت بهاوێژن بەهیچ شێوەیەك بەرت ناکەوێت، هەرکاتێکیش خەنجەرێك بدەن لەسینەت ئەو

خەنجەرە بەهیچ شێوەیەك كارت تێناكات، ئەگەر هەڵیشت دەنە ناو بیرێكەوە ناخنكێیت، هەركاتێكیش مارێك پەلامارت بدات یەكسەر لەهەمان كاتدا پاشەكشە دەكات و ناتگەزێت، ئەگەر بكەویتە ناو ڕووباری نیلەوە و تیمساحەكانی نیل چاویان پێت بكەوێت پەلامارت نادەن، من كە پادشا و فیرعەونی میسرم تۆ لەبەرامبەر هەموو بەڵایەك دەپارێزم و بەركەتی خۆمم پێ بەخشیت.

دوای ئەوەی لەكۆشكی فەرمانڕەوا هاتنە دەرەوە"ئنخاس"بەخۆشحاڵی و لەخۆباییەكەوە بە "موسا"ی كوڕی وت: چاوت بەمەزنی فیرعەون كەوت؟

موسا هیچی نەوت: جیاوازیەك لەنێوان هەلومەرجی ژیانی كچان و كوڕانی فیرعەوندا هەبوو. ئەم جیاوازیەش پەیوەست دەكرا بەخۆشەویستی و كاریگەری دایكیان لەسەر فیرعەون. كاتێك كەنیزەكێك سكی لەفیرعەون پڕ دەبوو و لەدایك دەبوو لەكۆشكی فەرمانڕەواییدا جێگیر دەكرا. شوێنی خەوتنی ئەم جۆرە دایكانە و ئەوانی تر لەیەك شوێندا بوون، شەوانیش لەیەكێك لەتەلاری كۆشكە مەزنەكاندا دەخەوتن. ئەگەر ئەو منداڵەی لەدایك دەبێت كوڕ بوایە، دایكی تا تەمەنی حەوت ساڵی لەلای خۆی دەیهێڵایەوە، دوای ئەوە دەسپێدرا بەیەكێك لەكاهینەكان بۆئەوەی بەچاودێری كردنی كاهین پەروەردە بكرێت، بەڵام ئەگەر ئەومنداڵەی لەدایك دەبێت كچ بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا دایك نەیدەتوانی منداڵەكەی لەلای خۆی بهێڵێتەوە، چونكە منداڵەكەیان دەسپارد بەدایەنێك تا ئەو كاتەی گەورە دەبوو، بەڵام ژنەكانی فیرعەون هەریەكێكیان جێگایەكی تایبەت و سەربەخۆیان هەبوو و منداڵەكانیشیان لەگەڵ ئەواندا دەژیان، هەڵبەت لەڕۆژدا لەلای دایكیان نەبوون، بەتایبەت كوڕەكانیان چونكە دەبوو فێری زانستی جۆراوجۆر و وانەگەلێكی جۆراوجۆر بونایە، هەروەها فێری بەكارهێنانی چەكە جۆراوجۆرەكان بونایە، بەدرێژایی ڕۆژ لەقوتابخانەدا و شەوانیش لەلای دایكیان دەمانەوە. پلەی دایكی موسا"ئنخاس"خانم پلەوپایەیەكی دیاری هەبوو، ڕاستە كە شاژن"ستە هوس"بۆخۆی فیرعەونێك بوو و كوڕەكانی"شنار و ڕامسیس"لەسەروی هەموو كوڕەكانی ترەوە بون، بەڵام لەچاو ژنەكانی تردا بەخۆشەویست و هەڵبژاردە لەقەڵەم

ئەدرا. لەبەرئەوەی"ئنخاس ئامون"لەکەسانی نزیکی فیرعەون بوو، پلەوپایەیەکی تایبەتی هەبوو زۆریش موسای خۆش دەویست.

بەڵام موسا دەیوت: دەبێت ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەم! چونکە کاهینی مەزنی کۆشك باسی شتێکی بۆ کردم...

موسا لەنێو کوڕەکانی فیرعەوندا سەرەڕای ئەوەی کەسێکی بێدەنگ و مات بوو، بەڵام زۆر ئازا و بەهێز بوو، لەچەند مەشقێکی جیاوازدا ئەم توانایییەی خۆی نیشان ئەدا. لەناو کۆشکدا شوێنێکی تایبەتیان بۆ مەشقی بواری جەنگ دیاری کردبوو، کوڕەکان لەو گۆڕەپانەدا مەشقیان دەکرد و کچەکانیش لەدەرەوەی ئەم گۆڕەپانە تەماشای ئەم دیمەنەیان دەکرد، مەشقەکانی جەنگ تا نیوەڕۆ بەردەوام بوو. دوای تەواوبونی مەشقەکانیان کوڕەکانی فیرعەون بەفەرمانی ڕاهێنەر خۆیان هەڵدەدایە ناو هەسێرەوە[9] بۆئەوەی پاك خۆیان بشۆرن، دوای ئەوەی پاك خۆیان شۆری، نۆرەی خواردنی نانی نێوەڕۆ دەهات. نانی نێوەڕۆی شازادەکان برێتی بوو لە لەهەنجیر، ترێ، گوێزی هندی تازە و خواردنەوە. لەقوتابخانە و مەشقەکاندا خواردنەوەی باوی میسری بۆنمونە ئاوجۆیان بە شازادەکان نەدەدا. یەکێك لەڕاهێنەرانی سەرداری جەنگ کە لەگەڵ دەستیارەکانیدا کە لەچەند ئەفسەرێك پێك هاتبون مەشقیان بە کوڕەکانی فیرعەون دەکرد. ئەم دەستیارە زۆر سەختگیر و بەڕادەیەك وردبین بوو کە کوڕەکانی فیرعەونی لەکاتی مەشقدا بێزار دەکرد و دەیگریاندن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نەیاندەتوانی ناڕەزایی خۆیان دەربڕن، چونکە ئاگاداری ئەوەبوون فیرعەون دەستەڵاتێکی تەواوی دابوو بە ڕاهێنەرەکان و گوتە و فەرمانی ڕاهێنەر دەقاودەق وەك گوتە و فەرمانی فیرعەونە. ئەم پشتگیریە دەستی ڕاهێنەرانی بۆ ئازادی کارکردن دەکردەوە. لەبابەتێکدا هەستی کرد کە کوڕەکانی فیرعەون بەدوای هۆکاری ئەم سەختگیریەدا دەگەڕێن بۆیە پێی وتن: ئێوە دەبێت پێشوازی لەم سەختگیریانە بکەن و خۆشحاڵ بن، چونکە ئەم جۆرە مەشقانە و ئامادە بون بۆ جەنگ، بۆتان دەسەلمێنێت کاتێك دەڕۆنە گۆڕەپانی جەنگەوە نوکی

---

[9] هەسێر: وشەیەکی پاراوی کوردی پەتیە کە بەواتای"حەوز" دێت، هەروەها لەهەندێك ناوچە کورد نشینەکاندا دەڵێن"ئەستێل"... وەرگێڕ.

تیژی نێزەیەك هیچ جیاوازیەك لەنێوان سینەی سەربازێکی ئاسایی و فیرعەونێکدا ناکات، چونکە بەشێوەیەکی یەکسان ڕۆدەچێتە هەردوو سینەکەوە، شازادە و هەژار زادەیەك لەگۆڕەپانی جەنگدا بونی نیە، ئەگەر لەگۆڕەپانی جەنگدا ئاگاتان لەخۆتان نەبێت سنگتان بەنوکی چەقۆ هەڵدەدڕن! نوکی شمشێرێك بێئەوەی مۆمیا بکرێن ڕەوانەی جیهانی خۆرئاواتان دەکات، چونکە جەستەتان لەپێناو ئامێرە ڕازاوەکان هەڵدەدڕن و پارچە پارچەی دەکەن!!موسا ئەم گوتانەی کە ڕاهێنەرێکی لێهاتوو باسی گۆڕەپانی جەنگی بۆ دەکردن، لەگەڵ گوتەکانی ئەو ڕۆژەی فیرعەون کاتێك بەرکەتی پێ بەخشی هەڵسەنگاند! لەبەرئەوەی فیرعەون زۆر حەزی لە تیرهاوێشتن بوو، لەکاتی مەشقدا تیروکەوانی بەیەکێك لەچەکە هەستیارەکان لەقەڵەم دەدرا. میسریەکان لەبارەی تیرهاوێشتنەوە بیروباوەڕێکی تایبەتیان هەبوو و ڕاهێنەری کوڕەکانی فیرعەونیش لەمبارەیەوە هەموو هەوڵێکیان دەخستە گەڕ. موسا لەم مەشقانەدا زۆر لێهاتوو بوو و تەنها ڕامسیس دەیتوانی لە موسا باشتر تیر بهاوێژێت، هەرکاتێك تیری موسا بەهەڵدا بڕۆشتایە، ڕامسیس قەرەوڵی لەو نیشانەیە دەگرت و بێ هیچ ئەملاولایەك دەیپێکا.

# جەنگی نێوان ڕامسیس و موسا لەگۆڕەپانی تیر هاوێشتندا

پێشەنگی ڕامسیس لە موسا لەبواری تیرهاویشتندا وردە وردە گۆڕا بەجۆرێکی تری لایەنی نهێنی ئامێزی نیوان ئەو دوانە، چونکە ئەو دوانە بەهۆی هەرزەکاری و لاویەتی و هەوڵدانیان بۆئەوەی یەکێکیان ببێتە پێشەنگی ئەوتریان کە ئەمەش هەڵگری جۆرێك ڕوبەڕوبونەوەی تایبەت بەو تەمەنەیە کە ناچار دەبێت بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن.

ڕاهێنەری تیرهاوێشتن کە ناوی"ستی هوپ"بوو بەخوێندکارە فێرخوازەکانی وت: جوان لێی ورد بنەوە، من تەنها شێوازی کەوان گرتن و کەوان کێشانتان دەکەم، بەڵام قەرەوڵگرتن و پێکانی ئامانج دەکەوێتە ئەستۆی ئێوە هەروەها پەیوەستە بەئامادەکاری و توانای بەهرەی ئێوەوە. دەبێت ئەوەندە تیر بهاوێژن تا دەبنە تیر هاوێژێکی لێهاتوو. موسا بەوردی و دانبەخۆداگیریەکەوە تیر ئەندازی دەکرد، بەڵام ڕامسیس بەپەلە تیرەکانی دەهاویشت.

"ستی هوپ" بۆی دوپاتکردنەوە: خێرایی تیرهاویشتن دەستپێشخەری خۆی لەدەستپێکردنی جەنگدا دەکات، لەگۆڕەپانی جەنگدا تیرهاوێژێك بەزیندویی دەمێنێتەوە کە پێش هەموویان تیری خۆی بهاوێژێت. موسا لەکاری تیرهاوێشتندا زۆر خاو بوو، لەو ڕۆژەدا تیرێکی هاوێشت کە ئاسایی وەك جاران کەمێك خواری گرت و ئامانجی نەپێکا. ڕامسیس بەخێرایی کەوانەکەی کێشا و قەرەوڵی خۆی گرت، بۆئەوەی بیسەلمێنێت لەکەوان کێشان و تیرهاوێشتندا چەنێك خێرایە، لەهەمان ئەو کاتەی ڕامسیس کەوانەکەی کێشا منداڵێك لەبەرامبەریدا سەری دەرهێنا. منداڵی کەنیزەکان لەوبەری گۆڕەپانەکەوە چاودێریان لێ دەکرا و سەرپەرشتێك لەو نزیکانەدا چاودێری لێدەکردن بۆئەوەی لەسنوری گۆڕەپانەکەمان

نزیـك نەبنـەوە، بـەڵام ئـەو منداڵـە هـارە خـۆی لەنیـشانەی تـیر هاویـشتنەکە نزیـك کردبویەوە، موسا کە بیر و هەستی لەلای نیشانەکە بوو بینی ئەو منداڵەی بەسـەر درختەکـەدا سـەرکەوت و لـەپاڵ نیـشانەکەدا خـۆی ڕاگرتـووە، لەوانەیـە بـەهۆی تـیری"ڕامـسیس"ی برایـەوە تـەختی زەوی بکرێـت، بۆیـە بـەخێرایی و بەهـەموو توانایەکیەوە مشتێکی دا لەکەوانەکەی ڕامسیس، ئەم لێدانە نەك تەنها بو بەهۆی ئەوەی کەوانەکە لەدەستی ڕامسیس بکەوێتە سەر زەوی، بەڵکو خۆشی بەهۆی ئەم لێدانە لەناکاوە تەختی زەوی بوو!! ئەم کەوتن و دیمەنە تەواوی تەماشاچیان کە کچانی فیرعەون هەروەها کوڕانی فیرعەونی سەرگەردان کرد.

ڕامسیس هەستایە سەرپێ و بەتوڕەییەوە وتی: موسا ئەوە چیت کرد؟

موسـا وتـی: مەبەسـتی ئـەوەم نـەبوو سـوکایەتیت پـێ بکـەم، تـەنها شـتێك کـە بوبـەهۆی ئـەوەی بێئاگایانـە ڕێ لەتیرهاویـشتنت بگـرم بـونی یـەکێك لەمنـداڵی کەنیزەکـەکان بـوو بەسـەر یـەکێك لەدرەختـەکانی نزیـك نیـشانەکە، ئەگـەر تیرەکـەت بەهەڵەدا بڕۆشتایە بەدڵنیاییەوە ئەوی دەکوشت...

هەموویان گوێیان لەم گفتوگۆیە دەگرت و چاوەڕێی کاردانەوەی ڕامسیس بوون. وەڵامدانـەوەی موسـا بەهـەمان ئەنـدازەی کـەوتنی کـەوانی تـیر و کـوڕی فیرعـەون چاوەڕواننەکراو و سەیر بوو! چونکە خستنی کوڕی فیرعەون-کەسێك کە ئومێدی ئـەوەی لـێ دەکـرا ببێتـە فیرعـەونی ئاینـدە-سـوکایەتیەکی نەبەخـشراوبوو، ئەگـەر کەسێکی ئاسایی ئەم کارەی بکردایە یەکسەر بڕیاری مـەرگی بەسـەردا دەدرا، بـەڵام لەبەرئـەوەی لەلایـەن براکـەی ڕامـسیس"موسـا"وە ئـەم هەڵەیـە ئـەنجام درا ئـەوا بابەتەکە بەشێوەیەکی تر لێکدانەوەی بۆ دەکرێت. موسا ڕوخساری سپی وەرگەڕا، چـونکە تـازە ئاگـاداری ئـەوە بـوو کـە چ هەڵەیـەکی ئـەنجام داوە، لەکاتێکـدا هـیچ کەسـێك نەیـدەتوانی بگـرە ماوەشـی نـەبوو بـەهۆی ئـەو ڕەفتارەیـەوە لێکۆڵینـەوەی لەگەڵـدا بکـات، بـەڵام ڕامـسیس کـە هـەموانی لەچـواردەوری گۆڕەپانەکـەدا بینـی لەبەرامبەر ئەو ڕەفتارەی موسا نواندی زلەیەکی بەهێزی کێشا بەڕوخساری موسای برایدا. "موسا"ش لەدوای ئەو زلەیە سور وەرگـەڕا و زۆر توڕە بـوو، بـەڵام بۆئـەوەی بەسەر خۆیدا زاڵ بێتەوە چاوەکانی داخست و بۆماوەیـەك نەیکردنـەوە، بـەڵام دوای

ئەوەی چاوی کردەوە لەو گۆڕەپانەدا بێ لە ڕاهێنەری تیرهاوێشتن"ستی هوپ"هیچ کەسێك لەوێدا بەدی نەدەکرا. "موسا"ش بۆئەوەی ڕاهێنەرەکەی چاوی بەفرمێسکەکانی نەکەوێت پشتی تێکرد.

"ستی هوپ"یش لەسەرخۆ بەرەو ڕوی موسا ڕۆشت و لێی پرسی: شازادە موسا لەبیری کە، زۆر خۆشحاڵ بوم بەوەی بینیم توانیت بەسەر تورەیی خۆتدا زاڵ بیت. ئەوەت بۆ سەلماندم کە تۆ شایستەی فەرمانڕەواییت، بەڵام تەنها پرسیارێك ماوە لێتی بکەم ئەویش ئەوەیە بۆچی لەپێناو گیانی منداڵی کەنیزەیەکدا ئامادە بویت شازادە تەختی زەوی بکەیت؟

موسا وتی: من مەبەستم ڕامسیس نەبوو، بەڵکو ویستم کەوانەکەی لێ وەرگرم و ڕێنەدەم تیرەکەی بهاوێژێت.

"ستی هوپ" هەستی بەوەکرد لەوانەیە دژایەتی نێوان ئەو دوانە بارودۆخی گۆڕەپانی مەشقی تیرهاویشتن تێکبدات، بۆیە کردنی بەدوو بەشەوە و لەدوو کاتی جیاوازدا مەشقی پێدەکردن.

موسا لەناوچەیەکی شار بەناوی"شاری ڕامسیس"کە دەکەوێتە ناوچەی باکور نزیك دەلتای ڕوباری نیل-نزیك قاهیرەی ئێستا-نیشتەجێ بوو. کۆشکی فەرمانڕەوایی"شاری ڕامسیس" بەیەکێك لە کۆشکە مەزنەکانی میسر لەقەڵەم دەدرا، "موسا"ش هەموو سەر لەئێوارەیەك لەکاتی خۆرئاوابوندا لەناو کۆشکدا پیاسەی دەکرد. کاتێك تیشکی خۆر بەر ستونی کۆشکی بەردینە سواقدراوەکان دەکەوت، دیمەنێکی ئەفسوناوی دروست دەکرد، موسا بۆماوەیەك تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد، تا ئەو کاتەی بەتەواوی ئاو و هەوا تاریك دەبوو. ئەم تەماشاکردنە یەکێك بوو لەکاتی خۆش بەسەر بردنەکانی ڕۆژانەکانی موسا.

# دیداری ئاشقانە و تۆڵەی ڕکابەریانە

لەکەنار گیلگەیەکی گەنمدا لەناو"کەیەڵ"[10]یکی قامیشی و چۆڵ و دوردا ژوانی شەوانەی ڕامسیس و "ئیزت"بوو.

ڕامسیس لێی پرسی: هۆکاری ئەوەی تۆ منت هەڵبژارد چی بوو؟ من لەئێستادا نوسەری فەرمانڕەواییم، هەر لەبەرئەوەش ناتەوێت بۆنمونە لەگەڵ جێنشینی برامدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنیت؟

"ئیزت"وتی: تۆ فیرعەونی ئایندەی میسریت!سەرەڕای ئەوەش سەرەتا من و شنار نێوانمان بەوشێوەیەش باش نیە، کاتێك ئەوە دەهێنمە بەرچاوم کە دەیەوێت دەستم لێبدات، زۆر دڵگران دەبم، بەڵام شنار کەسێکی ئاشق و هەڕەشەئامێزە...

"شنار"بەسەر کەژاوەکەیەوە کە کۆڵبەرەکان بەسەر شانیان هەڵیانگرتبوو سلاوی لەو ڕاوچیانە دەکرد کە خۆیان ئامادەی ڕۆشتن بۆ ڕاو دەکرد. دوای ئەوە ڕامسیس سواری گالیسکەیەکی تاڕادەیەك سوك بوو کە سەربازە کۆنەکان لێیان دەخوڕی، بەخۆشحاڵیەوە ڕێگای بیابانی گرتەبەر. "شنار"بەچاوەکانی کەوتە شوێنی بەڵام خۆی بەشداری لەو ڕاوەدا نەکرد. بەرنامەڕێژی لەئەستۆی میری ڕاوچیاندا بوو. سەگە ڕاوەکیەکان بەچواردەوری گالیسکەکەدا ڕایاندەکرد. هەموو کەرەستەیەکی چەند ڕۆژ ڕاوگرن بگرە چادریشیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ خەوتن هێنابوو.

لێخوڕی گالیسکەکە لە"ڕامسیس"ی پرسی: ئایا دەتەوێت بەگوریس نێچیرەکانت گرفتار بکەیت یان دەیانکوژیت؟

---

[10] کەیەڵ: وشەیەکی کوردی پەتیە کە کەواتای"خانە باخ"دەگەیەنێت ئەو ژورە یان ئەو خانووە بچوکەی لەپاڵ یان لەناو باخێکدا دروست دەکرێت پێی دەوترێت "کەیەڵ"... وەرگێڕ.

ڕامسیس وتی: ئەوە بەباش دەزانم کە نێچیرەکەم بەگوریس بگرم.

لێخوڕی گالیسکەکە وتی: کەواتە گوریسەکەت بەدەستتەوە بگرە.

لەوکاتەدا ڕامسیس سێ گەلە ئاسکی لەدورەوە بینی، ئەو و گالیسکەوانەکە کەوتنە دوای گەلە ئاسکەکە و سێ دانە لەئاسکەکان کە بەتەمەن و بێهێز بون لە گەلەکەیان جیابونەوە، بەڵام گەلە ئاسکەکە بەخێرایی خۆیان کرد بەنێو دۆڵێکی تاشەبەردیندا، گالیسکەکە ڕاوەستا و گالیسکەوانەکە پێشنیاری کرد: چیتر نابێت بەگالیسکە بڕۆین، بەڵکو دەبێت بەپێ دوایان بکەوین.

ڕامسیس لێی پرسی: بۆچی بەپێ؟

گالیسکەوانەکە وتی: بەهۆی ناڵەباری و ناڕێکی زەوی، ئەم بەردەڵانە دەبێتە هۆی شکاندنی چەرخی گالیسکەکان.

ڕامسیس وتی: بەم شێوەیە ناتوانین خۆمان بگەیەنینە گەلە ئاسکەکان.

گالیسکەوانەکە وتی: زۆر باش شارەزای ئەم ناوچەیەم، ئەم ئاسکانە پەنا بۆ ئەشکەوتێك دەبەن لەمکاتەدا کەوتونەتە داوی ئێمەوە. نزیکی تا نیوەڕۆ ڕێیان کرد بۆئەوەی خۆیان بگەیەننە گەلە ئاسکەکان. قورسی چەك و کەلوپەلەکانیان توانای لێ بڕیبون، بەڵام فشاری تاوی گەرما لەماندویەتیەکەیان زیاتر بوو، ناچار بۆئەوەی کەمێك بحەوێنەوە پاڵیان دا بەتاشە بەردێکەوە.

گالیسکەوانەکە پرسی: ماندوو بویت؟ ئەگەر حەز دەکەیت بەردەوامی پێدەدەین ئەگەر حەزیش ناکەیت دەگەڕێینەوە.

ڕامسیس وتی: بەردەوامی پێدەدەین، بەڵام هیچ بونەوەرێك بگرە مار و دوپشکیش لەم بیابانەدا ناژیت چ چۆڵەوانی و وێرانەیەکی سەیرە!

لەناکاو گالیسکەوانەکە وتی: پێی چەپم بەهۆی برینێکی کۆنەوە ئازارم دەدات، ئەگەر ڕازی بیت کەمێك بحەوێینەوە؟

ئەو دوانە لەوشوێنەدا مانەوە تا شەو داهات. گالیسکەوانەکە وتی: تۆ بخەوە، چونکە ئەم برینەم ناهێڵێت بەو ئاسانیە خەوم لێ بکەوێت، ئەگەر ویستیشم بخەوم، ئەوا هەڵتدەستێنم.

ڕامسیس خەوت، دوای کاتژمێرێك چاوی کردەوە، خۆی بەتەنهایی بینی. گالیسکەوانەکە خۆی بەکەسێکی بێهز و توانا نیشان دابوو، بەڵام هەڵهاتبوو! ئەو بەتەنها خۆی نەڕۆشتبوو بەڵکو چەك و شتومەکەکەشی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، ڕامسیس بێ خواردن و چەك لەبیابانی تاریکدا مایەوە!

ڕامسیس وتی: پلانگێری"توطئة"دەیانەوێت بەڕێکردن و بێخواردن لەم بیابانەدا لەناوم ببەن! ڕامسیس ئەو پەیوەندیەی هاتەوە یاد کە لەسەرتای ڕۆشتنیاندا لەنێوان گالیسکەوان و"شنار"دا بەرقەرار بوو، بێگومان"شنار"لەچاوەڕوانی مەرگی ونبویەکی بیاباندا سات ژمێری دەکات. ڕامسیس هەوڵی دا ئەو ڕێگایەی کە لێیەوە هاتبوو بەبیر بهێنێتەوە، لەناکاو ئاسکێك لەبەردەمیەوە هەڵهات، ڕامسیس بۆی دەرکەوت دەبێت لەم ناوچەیەدا سەرچاوەی ئاوێکی لێبێت، باشتر وابوو متمانە بە گیانەوەرەکان بکات، بۆیە دوای ئاسکەکە کەوت تا خۆی گەیاندە گەلەکەیان و لەو شوێنەدا درختێکی خورما سەرنجی ڕاکێشا، دار خورمایەکی بیابانی کە بەرزیەکەی نزیکەی دە مترێك دەبوو لەدورەوە خۆی دەنواند. ئەم جۆرە دار خورمایە بەلەق و پۆپی پژوبڵاو و توێکڵێکی خۆڵەمێشی، هەروەها گوڵگەلێکی بچوك و بۆندار و زەردباوی مەیلەو سەوز جوانیەکی تایبەتی بەخۆی دەبەخشی. ڕامسیس بەرەو ڕوی درختە خورماکە ڕۆشت، زۆر لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا بۆئەوەی دوچاری بێتوانایی وماندویەتی نەبێت، بەڵام کاتێك گەشتە لای دار خورماکە پیاوێکی لەوێدا بینی کە پاڵی دابوو بەدرەختەکەوە! بەسەرسوڕمانێکی تەواوەوە لێی نزیك بویەوە و چاوی بە سەرپەرشتیاری تەویلەخانەکان کەوت- هەمان ئەو کەسەی لە تەویلەخانەکەدا شەڕی لەگەڵدا کردبوو- لەوکاتەدا سەرپەرشتیاری تەویلەکان سڵاوی لێکرد. "ڕامسیس"یش لەتینواندا لێوی لکابوو بەیەکدا بۆیە نەیتوانی وەڵامی سڵاوەکەی بداتەوە و چاوی تەنها مەشکە ئاوی کابرای دەبینی کە لەتەنیش پێیەوە لەسەر زەوی دانرابوو.

کابرای سەرپەرشتیاری تەویلەخانەکە وتی: تینوتە؟بەڵام من ئەم ئاوە بۆ کەسێك کە بڕیارە لەناو بچێت بەفیڕۆ نادەم. تۆ زۆرباش منت لەبەردەم کرێکارانی تەویلەخانەکەدا ڕسوا کرد؟

ڕامسیس وتی: ئایا لەبەرئەوە دەتەوێت بمکوژیت، یان بەفەرمانی "شنار"کە لەدەروازەی شار چاوەڕێی مەرگی منە، هاتویت بۆ ئێرە؟

کابرای سەرپەرشتیاری تەویلەخانەکە پێکەنی و وتی: بێگومان خواستی خۆشم یەکێکە لەو هۆکارانەی منی پەلکێشی ئێرە کردووە و چەقۆ بەدەست هەستایە سەرپێ. ڕامسیس یەکسەر دەستی دوژمنی خوێندەوە و زانی کابرای سەرپەرشتیاری تەویلەخانەکە لەزۆرانبازیدا لێهاتووە و دەیەوێت بەشێوەیەکی هونەری لێیبدات و تەختی زەوی بکات، ڕامسیس بێ لەکۆکردنەوەی هەموو توانایەکی خۆی بۆئەوەی نەکوژرێت هیچ ڕێگەچارەیەکی تری لەبەردەستدا نەبوو. لەناکاو هەموو توانایەکی لەقوڕگیدا کۆکردەوە و بەهەموو توانایەکی قیڕاندی و بەشێوەیەکی خافڵگیرانە خۆی هەڵدا بەسەر کابرای سەرپەرشتیاری تەویلەخانەکەدا بۆئەوەی نەتوانێت سود لەچەقۆکەی دەستی وەرگرێت، ئەم پەلامار و لێدانەی ڕامسیس کابرای سەرپەرشتیاری سەرەوژێرکرد و چەسپاندی بەخورماکەدا: ئەو درەختە درکێکی گەورە و بەئەندازەی چەقۆیەکیش تیژ هەبوو....

خۆر لەنێوەندی ئاسماندا بوو، ڕاوچییەکان سەرگەردان و نیگەران بەهۆی ون بونی ڕامسیس لەهەموو شوێنێك بەدوایدا دەگەڕان و نائومێدانە خۆیان بۆ گەڕانەوە و ئاگادارکردنی "شنار" ئامادە کرد، لەوکاتەدا لەدورەوە خێوێك دەرکەوت: شەرپەرشتیاری پیر وای دەزانی چاوی بەجنۆکە کەوتووە، هەموویان سەرتاپا چاو تەماشای ئەو خێوەیان دەکرد، بەڵام لەناکاو دەنگێك هاواری کرد: من "ڕامسیس"م، لەگوریسی ڕاوچی خۆم دەرباز کردووە! بەڕاستی ڕاوکردن شوێنێکی باشە بۆ تاقیکردنەوە...

ئاڕایشکەرەکان لەچواردەوری "شنار" لەکۆشکە تایبەتەکەیدا سەرقاڵی ناخون و ئارایشتی قژی بون. شنار گرنگیەکی تایبەتی بەخۆی و شێوازی ژیان و تێپەڕاندنی تەمەنی دەدا. بەهۆی ئەوەی خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر بوو هەمیشە خوازیاری باشترین ژیان بوو. جوانی و ئاڕایشتی تایبەت و شوێنێکی تایبەتی لەژیانی وەجاخزادەکاندا هەبوو. کاتێك ئاڕایشتکەرەکان ڕۆنێکی

بۆنداریان لەجەستەی شنار دەماڵی، شنار لەژێر دەستی ئاڕایشتگەرەکاندا هەستی بەئارامی دەکرد و فەرمانی دەدا لەچواردەوریدا بێدەنگی بپارێزن، ئەو ڕۆژە وەکو جاران خەریکی عەترماڵینی شنار بون لەناکاو دەنگەدەنگێك هێمنی کۆشکی هەژاند و بەدەم هاوارەوە کەسێك وتی: من دەمەوێت ڕاستی ئەم بابەتە بەدەست بهێنم... لەناو ئەو کۆشکەدا دەنگی دایەوە و خۆی کرد بەناو حەمامەکەی"شنار"دا و دوبارەی کردەوە: دەمەوێت بزانم، هەر ئێستا!

شنار کە ڕەشۆی دەستەڵاتی خۆی لەدەست دابوو بەلەرزەوە ئاڕایشگەرەکانی چواردەوری کردە دەرەوە و هاواری کرد: برا بچوکەکەم هێور بەرەوە، چیت دەوێت؟ ئەوە باسی چی دەکەیت؟

ڕامسیس بەگاڵتەپێکردنەوە وتی: خۆت وا نیشان دەدەیت کە ئاگاداری هیچ شتێك نیت، چەند کەسێکت بەکرێ گرتبوو بۆئەوەی بمکوژن.

شنار وتی: کێ ئەم قسە هیچ و پوچانەی پێ وتویت، هەر ئێستا ئەو کەسانەم پێ نیشان بدە!

ڕامسیس پێکەنینێکی ژەهراوی کرد و وتی: خۆیان، خۆم ئەو گوتانەم لێ دەرکێشان، ئەگەر دەتەوێت بیبینی بڕۆ تەماشای بکە چەسپاندومە بەدار خورمایەکی بیاباندا! یەکەمیان مردووە و دووەمیشیان دیار نەماوە، گالیسکەوانەکەش!

"شنار"کاتێك زانی چیتر جێی نکوڵیکردن نەماوە، هەوڵیدا بەنەرم و نیانی ڕەفتاری لەگەڵدا بکات و وتی: هیچ کاتێك ئەوە فەرامۆش نەکەیت کە من برای تۆم.

"ڕامسیس"یش وتی: منیش ئەرکی برایەتی خۆم بەجێ دەهێنم.

لەوکاتەدا شنار دەستی خستە سەرشانی ڕامسیس و وتی: سەرەڕای ئەوەی بیروبۆچون و سەلیقەمان بەیەك ناخوات هەروەها چەند ناکۆکیەکمان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هیچ کاتێك حەز ناکەم لەناو بچیت.

ڕامسیس وتی: کاتێك گالیسکەوانەکە پەیدا بویەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەم گوتانەت تا چەنێك ڕاستن.

ڕامسیس دوای ئەم گفتوگۆیانە ڕۆشت بۆلای"ئامنی"، "ئامنی"ش پێی وت: لەگەڕانەوەت دڵنیابوم.

شەو کاتێك ڕامسیس ڕۆشت بۆ ئەو"کەیەڵ"ەی کە بەقامیش دروست کرابوو، شوێنێك کە هەموو شەوێك چاوپێکەوتنی لەگەڵ"ئیزت"دا دەکرد و لەوێ چاوەڕێی کرد. ماوەیەك تێپەڕی و بینی"ئیزت"لەسەرخۆ خۆی کرد بەناو کەیەڵەکەدا و وتی: خۆشەویستەکەم هاتم، "شنار"ی برات خەریکە شێت دەبێت.

ڕامسیس وتی: هەر لەبەرئەوەش ویستی لەکاتی ڕاوکردنەکەمدا بەکوشتم بدات، ئێستا کاتی ئەم جۆرە قسانە نیە، وەر بۆئەوەی کەمێك نەوازشت بکەم.

"ئیزت"یش سەری خستە باوەشی ڕامسیس و دەستی کرد بە نەوازشکردنی پێکانی. کاتێك سپێدەی بەرەبەیان هەڵهات دەستی بەقژی"ئیزت"دا دەهێناو و نەوازشی دەکرد و"ئیزت"یش وتی: وتیان کەسێکت لەکاتی ڕاوەکەتدا کوشتووە.

ڕامسیس وتی: چونکە فەرمانی پێدرابوو بمکوژێت.

"ئیزت"یش وتی: منیش دەبێت تۆ بکوژم، چونکە واهەست دەکەم تۆش نیازی کوشتنی منت هەیە.....

# ڕامسیس لەپلەی نوسەری"کاتب"فەرمانڕەواییدا

کاتێك ڕامسیس بیستی: ئێستا بەڕێ دەکەوین! نەیتوانی باوەڕ بەوە بکات بەم زووانە بەفەرمانی فیرعەون یەکەمین ئەرکی لەپەلەی نوسەری فەرمانڕەواییدا دەست پێدەکات، ڕامسیس لەگەڵ"ئیزت"لە کەیەڵەکەدا بوو، چیتر نەیدەتوانی بەپێی ئەو فەرمانە شەوانی لەلای خۆشەویستەکەیدا تێپەڕێنێت، بۆیە دەبێت زیاتر لەگەڵ پاپیرۆسدا تا ئەوەی لەگەڵ جەستەی"ئیزت" جواندا بژیت. ڕامسیس یادگاری گەشتەکەی لە دەفتری ڕۆژانەکەیدا دەنوسی، هەروەها نەیدەتوانی دیمەنی جوانی سەر ڕێگای گەشتەکەی لەبەرچاو نەگرێت. ئەو شوێنەی بۆی دەڕۆشتن زنجیرە چیا"جبل سلسلە"بوو. ڕامسیس بەدرێژایی گەشتەکەی نەیتوانی چاوی بەفیرعەونی باوکی بکەوێت، چەندین ڕۆژ هەر بەوشێوەیە تێپەڕی و دەفتەری یاداشتەکەی پڕبوو لەنوسین. تائێستا بە شەشەمین ساڵی فەرمانڕەوایی"ست هوس" لەقەڵەم دەدرا کە بەبۆنەی ئەم شەشەمین ساڵەوە بەردتاشەکان ڕێژەی هەزار بەردتاشی دەریاوانیان لە"زنجیرە چیا"دا زیاد کرد بۆئەوەی بەردەکان بگوازنەوە بۆ ناو کەشتیەکان. بەردتاشەکان تاوێرە مەزنەکانیان دوای ئەوەی درزێکیان دەخستە نێو تاشەبەردەکانەوە دەریان دەهێنان، وەستا و بەردناسەکان شان و ڕەگی بەردەکانیان دەستنیشان دەکرد دوای ئەوە هێمایەکی تایبەتیان لەسەر بەردەکان دەکێشا، دوای ئەوە نەخشەکێشەکان بەکێشانی چەند وێنەیەکی جۆراوجۆر بەردەکانیان ئامادەی هەڵکۆڵین دەکرد بۆئەوەی بەردتاشەکان کاری لەسەر بکەن.

شێوازی دەرهێنان و ئامادەکردنی بەردە گەورەکان پواز[11]ی دارینی وشك ڕۆدەکەنە نــاو کلۆشــی بەردەکانــەوە، دوای ئــەوە تــەڕیان دەکــرد، داری وشــکیش بــەهۆی هەڵمــژینی ئاوەوە دەکشا و هەڵدەئاوسا و فشارێکی زۆری دەخستە سـەر تـاوێرە بـەردەکان، بـەهۆی ئاوسـانی دارە وشـکەکەوە درز دەکەوتـە تـاوێرە بەردەکانـەوە، کاتێك تـاوێرە بـەردەکان دەبـون بەچەند پارچەیەکەوە بەردتاشـەکان لەهـەمان ئـەو شـوێنەدا دەسـتبەکار دەبون. بـەردە گەورەکانیـشیان دەخـستە سـەر شـتێکی خـز و خلیـسکاو، بەم شـێوەیە ئـەم بەردانـەیان لـەو ناوچـە دورەوە دەگواسـتەوە بـۆ ئێـرە، بەمشێوەیەش لەکەشتیەوە هەڵیاندەڕشتە کەنار ڕوبارەکەوە، کەشتیە بارهێنـەرەکان بەردەکانیان دەگواستەوە بۆ ئەو کارگایانەی کە لەپەرستگادا دەستنیشان کرابوو.

ڕامـسیس لـەتۆمارکردن و نوسـینی ئـەو هـەموو کرێکـارە سـەرگەردان و دودڵ و سەرلێـشێواو بویـو، بـەڵام وردە وردە خـووی بـەو کـارە گـرت و لەگـەڵ ژینگـەی کارکردندا ئاشنایەتیەکی تـەواوی بەدەست هێنـا: پیاوگـەلێکی زبـر و سـەختکۆش، ناکۆکیــە بێــشومارەکانیان، ئەوانــەی بەنمایــشی قەڵــەم و چەکوشــی ئاســنین بەلێهاتوییــەکی سەرســوڕهێنەر بــەردەکانیان دەتاشــی، ئەوانــەی ئــارەق ڕشــتن و مانـدوبونیان نەدەناسـی، نەگـەرما، نەسـەرما کـاری لەجەسـتەیانی نـەدەکرد، تـەنها چـالاکی، هــەوڵ، کــار و دەرئــەنجام هــەموو چــاوێکی لــەخۆی ڕادەمانـد. ڕامـسیس هەموو ئەمانەی پیت بەپیت نوسی. ئەو پەیامەی فیرعەون لەو ناوچەیەدا دەیویـست بیگەیەنێت بە ڕامسیس ئەوە بـوو: سـەردەمی منـداڵی تێپـەڕیوە و قۆنـاخی هـەوڵ و کۆشش و ڕاستی دەستی پێکردووە. "ست هوس"یان"وەرزای داگیرکەر" کوڕەکەی لــەکۆرەدا توانــدەوە و خــستیە نــاو قــاڵبی هەنــدێك ڕوداوەوە بۆئــەوەی قــاڵبی هەمیشەیی فیرعەون لەخۆ بگرێت.

ئــارامی کــانزا لەشــەودا، هەڵــچنینی بــەردە گــەورە دەرهاتووەکــان و کارێکــاران لــەحاڵی خۆشــی و خۆشــگوزەرانی و گاڵتــەکردن لەگــەڵ یەکــدا، هــەموو ئەمانــەی

---

[11] پواز وشەیەکی پاراوی کوردیە کە بەواتای ئەو دارە شێوە قوچەکیە دێت کە دەخرێتە نێوان ترزی بەرد و دارەکان بۆئەوەی بیانتلیشێنن... وەرگێڕ.

لەدەفتەری یاداشتەکەیدا تۆمار کرد. لەوکاتەدا سەرقاڵی نوسین بوو بیستی: بیستومە کەسێکت کوشتووە؟ دەنگی فیرعەونی باوکی بوو!

ڕامسیس وتی: تەنها بەرگریم لەخۆم کردووە، ئەو بەچەقۆیەکەوە دەیویست بمکوژێت، هەڵبەت بەفەرمان"شنار"!

فیرعەون وتی: کەواتە توانای کوشتنت هەیە، کەواتە بۆئەوەی بگەییتە پلەوپایە فیرعەون دەبێت توانای کوشتنت هەبێت، بەردێك هەڵگرە و یەکسەر بیکێشە بەو سەگەی دوات کەوتووە!

ڕامسیس وتی: ئەم تاقیکردنەوەیە تاوانە، ئەگەر ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ڕێگای بەدەست هێنانی فیرعەون بون بێت، ئەوا"شنار"لەگۆڕی ئەم جۆرە کارانە دێت و دەتوانێت ئەو پلەوپایە بەدەست بهێنێت، چونکە من ناتوانم هیچ کەسێك بکوژم، ئەو کەسەش بەهۆی بەرگری کردن لەخۆم کوژرا.

فیرعەون وتی: ملکەچی فەرمانەکان بە!

ڕامسیس وتی: لەتوانای مندا نیە ناتوانم، مەگەر ئەوەی ئەم سەگەش بەفەرمانی کەسێکی تر وەك ئەو پیاوە بیەوێت بمکوژێت، منیش ناچار بەرگری لەخۆم بکەم.

"ست هوس"ی فیرعەون وتی: ئایا ئاگاداری دەرئەنجامی ئەم سەرکێشەی خۆتیت؟

ڕامسیس یەکسەر وتی: حەز دەکەم بچمە ڕیزی بەردتاشەکانەوە و هەرگیز پێ نەنێمە خاکی میسرەوە!

فیرعەون پرسی: ئایا تۆ ئامادەیت لەپێناو سەگێکدا چاوپۆشی لەفیرعەون بونت بکەیت؟

ڕامسیس وتی: ئەم سەگە متمانەی بەمن هەیە، منیش ناچارم لەبەرامبەردا بەرگری لێبکەم... دوای ئەوە ڕویکردە سەگەی"بیدار" و وتی: وەرە با بڕۆین!

"ست هوس"ی فیرعەون و ڕامسیس و سەگەکەی هەرسێکیان بەڕێکەوتن، لەنێوندی ڕێگاکەیاندا فیرعەون وتی: ئەگەر ئەو سەگەت بکوشتایە ئەوا نغرۆترین و ڕسواترین پیاوت لێدەردەچوو، بەم ڕەفتارەت سەلماندت بیروباوەڕێکی مەزنت هەیە.

ڕامسیس لەخۆشیاندا ڕاوەستا و وتی: منیش جگە لەو گوتەیە چاوەڕێی هیچ شتێکی ترم لەفیرعەونی باوکم نەدەکرد... دوای ئەوە وتی: دەتوانم لەم کانەکانزایەدا لەلای کرێکارەکان بمێنمەوە.

ست هوس وتی: فیرعەونی ئایندە کارگەلێکی گرنگتر لەمانەوەی لەکانە کانزاکان چاوەڕێی دەکات.

# ئیزت وەڵامی نەخێر دەدات بە شنار

"ئامنی"بەناونیشانی نوسەری تایبەتی فەرمانڕەوایی سەرقاڵی ڕێکخستنی زانیاریەکان بوو، دیاربوو جێگری ڕامسیس لەکارەکەی ڕازی بوو. لەوکاتەدا سەرقاڵی چاوپیاخشاندن بوو بە تەختەقوڕە نوسراوەکاندا و لەناکاو"ئیزت"خۆی کرد بەناو بارگاکەی"ڕامسیس"دا و بەهەموو هێزێکی دەرگاکەی کردەوە و پرسی: ڕامسیس لەکوێیە، زوو پێم بڵێ!

ئامنی وتی: نازانم.

ئیزت وتی: چۆن نازانی لەکاتێکدا ئاگاداری هەموو نهێنیەکی "ڕامسیس"ی.

ئامنی وتی: لەناکاو دیار نەماوە کەس نازانێت بۆ کوێ ڕۆشتووە، باوەڕم پێبکە ڕاستیەکەت پێ دەڵێم.

ئیزت وتی: دەڵێن مەحاڵە ڕامسیس نهێنیەك لەتۆ بشارێتەوە.

ئامنی وتی: وایە بەڵام بێئاگام لەوەی بەچ شێوەیەك لەناکاو دیار نەماوە، بگرە بۆ خۆشحاڵکردنیشت ناتوانم درۆت لەگەڵدا بکەم.

ئیزت وتی: ئەگەر وایە چۆن نیگەرانی نابیت؟

ئامنی وتی: بۆچی نیگەرانی بم؟

ئیزت وتی: کەواتە تۆ دەزانیت لەکوێیە و پێم ناڵێیت!

ئامنی وتی: ئەگەر بێشەرمی نەبێت جەنابتان بێهودە من تاوانبار دەکەیت، دەتەوێت درۆت لەگەڵدا بکەم، نایکەم، بەڵام دەزانی لەهەرکوێ بێت بەم زوانە دەگەڕێتەوە. لەوانەشە"شنار"پلانێکی نوێی بۆ دارشتبێت، چونکە تازە

لەئیشقێکدا شکستی خواردووە و دەیەوێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، بڕۆ بەدوای ئەودا بگەڕێ لەوانەیە دەرئەنجامێکی باشتر بەدەست بهێنیت.

"شنار"تازە دەستی لەنانی نیوەڕۆ هەڵگرتبوو، ژمی نیوەڕۆشی گۆشتی"پۆڕ"ی برژاو بوو. "ئیزت"بەتوڕەییەوە خۆی کرد بەژورەکەیدا"شنار"یش بەنەرم و نیانیەکەوە بەخێرهاتنی کرد: "ئیزت"ی جوان، سەربەرزت کردم. فەرموو لەسەر ئەم حەریرە دانیشە بۆئەوەی پێکەوە نان بخۆین.

ئیزت توند و خێرا لێی پرسی: ئێستا پێم بڵێ ڕامسیس لەکوێیە؟

شنار وتی: ماوەیەکە ئاگاداری هیچ هەواڵێکی ڕامسیس نیم.

ئیزت وتی: هەمان ئەم ڕستەیە درۆکانتی ئاشکرا کردووە، پێم بڵێ ڕامسیس لەکوێیە.

شنار وتی: سەرەتا فەرموو دانیشە و پێکەوە قسە بکەین بۆئەوەی بزانم "ڕامسیس"یان ناردووە بۆ کوێ!

ئیزت دانیشت و گوێی لێگرت. شنار کاتێك چاوی بڕیبوە ئەو وتی: تۆ بۆچی لەقە لەبەختی خۆت دەدەیت، لەباتی ئەوەی ببیتە هاوسەری نوسەرێکی فەرمانڕەوا ببە بە هاوسەری فیرعەونی داهاتوو، بۆ ئاینده بڕوانە، ساتی هەنوکە لەبیر بکە.

ئیزت پرسی: چ ئایندەیەك؟

شنار وتی: ژیانێکی خۆش و بریسکەدار لەتەنیشت فیرعەونی داهاتوودا.

ئیزت هەوڵیدا خۆپارێز بێت بۆیە بێدەنگ بوو و بیستی: بەڕاستی دەتەوێت بزانیت ڕامسیس لەکوێیە؟

ئیزت دوبارە هیچی نەوت و شنار بەردەوام بوو: ئەگەر پێت بڵێم دڵگران نابیت.

ئیزت وتی: خۆم بۆ خراپترین شت ئامادە کردووە.

شنار وتی: ئەوم ناردووە بۆ باشور بۆ ناو کانە کانزاکان، بەشێوەیەك سەرقاڵم کردووە کە ماوەیەکی زۆری دەوێت تا بتوانێت خۆی بەتۆ بگەیەنێت. پێشتر ئاگادارم کردی. ئێستا هەڵبژێرە، دەبینی ئەوە من فەرمان دەردەکەم... شنار ڕۆشتە پێشەوە و دەستی"ئیزت"ی گرت.

ئیزت دەستی کێشایە دواوە و وتی: بەریدە.

شنار وتی: تۆ شەق لەبەختی خۆت دەدەیت.

ئیزت وتی: دڵم بە"ڕامسیس"ەوە پەیوەست کراوە.

شنار وتی: تۆ دەبیتە هاوسەری فیرعەون دەست لەکاری شێتانەوە مەدە.

ئیزت وتی: جەنابتان فیرعەونی خۆتانن، من بڕیاری خۆم داوە.

لەنگەرەگای"تبس"زۆر قەرەباڵغ بوو، پیاوانی زەحمەتکێش، کەشتیگەلێکیش لەحاڵی هات و چۆی کۆڵبەرانی بار لەکۆڵ و گەشتیاران کەخۆیان بۆ کۆچ ئامادە دەکرد، کەشتی فیرعەون بەرەو باکور دەڕۆشت، کەشتی بە بەجێهێشتنی"مەفیس" خۆی کرد بەناو "دەلتا"دا، ڕامسیس بەسەرگەردانیەکەوە تەماشای چواردەوری دەکرد. هەموو شوێنێك ئاو بوو. باڵندەی ئاوی و مراوی و ماسیخۆرەکان وڵاتێکی بەرفراوانیان هەبوو. کەشتی بەپێی فەرمانی کەشتیەوان کە ئاشنای دەریا بوو ڕێگایەکی تایبەتی گرتە بەر، فیرعەونی میسر لەسەکۆی کەشتی و کوڕی فیرعەونیش بێدەنگ لەپاڵ باوکیدا ڕاوەستابوو. "ست هوس"بێدەنگ نوقمی بیروهزری بوبو، "ڕامسیس"یش پابەندی ئەم بێدەنگیە بوو، لەناکاو فیرعەون هاواری کرد: ڕامسیس ئەوێ! بەئاسمانەوە باڵندە کۆچەریەکان لەشێوەی ژمارە حەوت دەفڕن، ئەو دوانە بۆماوەیەك لەوبارەیەوە قسەیان لەگەڵ یەکتردا کرد و شەویش بەهۆی درەوشانەوەی ئەستێرەکان فیرعەون زانستی ئەستێرەناسی فێری ڕامسیس دەکرد: وێنەی فەلەکیەکان، جوڵەی کاکێشانەکان، مانگ، خۆر و چەمکی هەریەك لەمانە... دوای ئەوە پرسی: فیرعەون نابێت دەستەڵاتی بگەیەنێتە ترۆپکی ئاسمان؟

ڕامسیس لەماڵینی ڕۆنێکی تایبەت زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام کاتێك بینی مێش و میرو هێرشیان بۆ دەبات بەهۆی ئەو بۆنە تایبەتەوە نایانگەزن و پاشەکشە دەکەن، چیتر دوای ئەوە چاوپۆشی لەو بۆنە ناڕەحەتە کرد، کەشتی دوای ئەوەی خۆی کرد بەناو دەریاچەیەکدا کە دەکەوتە نێوان دورگەی بچوکەوە و لەشارێك نزیك بونەوە کە فیرعەون بەمشێوەیە بۆ"ڕامسیس"ی ڕونکردەوە: شارە پیرۆزەکانی"ڕپ و دپ"

"ڕامسیس"یش تەماشای شاری پیرۆزی کرد، لەبەرامبەر پەرستگایەکی بچوکدا ڕۆچـووە هـزری خۆیـەوە و وتـی: بەرنامـەی فیرعـەون ئەوەیـە سـەرەتا ببێتـە خزمەتکاری خودایان، بەڕاستی جگە لەزۆردارێکی سەیر هیچ شتێکی تر نیە.

فیرعەون بەدرێژایی ئەو گەشتە بە"ڕامسیس"ی وت: تۆم لەبەرئەوە هێنایە ئەم ناوچەیەوە بۆئەوەی ئاشنای بونایەتی خۆت بیت و جیهانی سەردەمی منداڵیت بەجێ بهێڵیت... ئەوە هەمان پەیامی فەرمانڕەوایی و جێنشینی منە بۆ تۆ. دوای ئەوە کەشتی گەڕایەوە بۆ"ممفیس" و لەدورەوە شار دەرکەوت.

"ست هوس"ی فیرعەون ڕۆشت بۆ لای"ستەهوس"ی هاوسەری. کاتێك شاژنی مەزن قسەی لەگەڵ بەڕێوبەری ئاسایش دەکرد ئاگادار هاتنە ژورەوەی فیرعەون بوو، ئەوەی بە بەڕێوبەری ئاسایش وت: وا بزانم ئاگاداری ئەوەیت کە کرێکارێکی تەویلەخانەکان هەوڵی کوشتنی"ڕامسیس"ی دابوو؟

بەڕێوبەری ئاسایاشیش وتی: بەڵێ گەورەم.

دوای ئەوە لێی پرسی: تۆ دەزانیت کە دەبێت یەکسەر گالیسکەوانەکە پەیدا بکەیت، هەمان ئەو کەسەی لەگەڵ ڕامسیس دا بوو؟

هەموو وەڵامەکان بە: بەڵێ گەورەم دەدرایەوە...

پرسیاری ئەوەی لێکرا: ئەو کەسەت دۆزیوەتەوە کە دەستی لەم پلانەدا هەیە.

سەرۆکی ئاسایش سەری دانەواند و بیستی: بەدڵنیاییەوە لەڕاستی و گەڕان و پشکنین دەترسیت؟

بەڕێوبەری ئاسایشیش وتی: گەورەم خۆیان ئەو پلانەیان داڕێژاوە...

ستە هوس وتی: کەواتە ئەوەی بیستومە ڕاستە؟

بەڕێوبەری ئاسایشیش بەسەر لەقاندن وەڵامی بەڵێی دایەوە...

ئیزت لەشەوی سەری ساڵی نوێ و ئاهەنگی هەڵچونی ڕوباری"نیل"دا نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت، سەرەڕای ناڕازی بون و ڕێگری ڕامسیس ، ڕۆشت بۆ ئەو هەیوانەی کە ڕامسیس و سەگەکەی"بیدار"ی لێبوو. بیدار وەڕی"ڕامسیس"یش ئاگاداری هاتنی کەسێکی بێگانە بوو و "ئیزت"ی لەتەنیشت خۆیەوە بینی.

ڕامسیس بێگوێدانە هیچ شتێك تەماشایەکی کرد و"ئیزت" نیگەران بوو و پرسی: چی ڕویداوە؟

ڕامسیس وتی: هیچ نەبووە تەنها دەمەوێت تەنها بم.

ئیزت تکای لێ دەکرد: قسە بکە.

ڕامسیس ئارام و لەسەر خۆ وتی: تەماشای"نیل" بکە!

ئیزت وتی: دەتوانم لەتەنیشتەوە دانیشم؟ و بێئەوەی مۆڵەتی پێبدات دانیشت، بەڵام بێدەنگ.

ڕامسیس وتی: ئەستێرە"سوتیس"لەناو تاریکیدا لەحاڵی هەڵهاتندایە، ئەم ئەستێرەیە سبەی لە ڕۆژهەڵات هاوکات لەگەڵ خۆردا هەڵدێت، ئەوکات هەڵچونی ڕوباری نیل دەست پێدەکات!

ئیزت پرسی: هەموو ساڵێك کاتێك ئەمە ڕوو دەدات، ئەوەندەش شتێکی سەیر نیە.

ڕامسیس وتی: بەڵام ئەمساڵ ساڵێکی زۆر جیاوازە، باوکم منی لەبەرامبەر خۆیدا داناوە.

ئیزت وتی: مەبەستت چیە؟

ئەویش وتی: دەبێت ئەو ڕێگایەی بۆی هەڵبژاردوم بیگرمە بەر.

ئیزت وتی: بەلامەوە گرنگ نیە چی ڕوو دەدات، تەنها تۆ بەلامەوە گرنگی.

ئاهەنگی هەڵچونی ڕوباری"نیل"–وەکوو جاران بەدەنگی خودای"ئیزیس" خودای جیهانی ژێرەوەی دۆزیوەتەوە– دەستی پێکرد. کەمێك دوای سپێدەی بەرەبەیان بنەوانی ئاویان کردەوە، ئەم بنەوانە ئاوی باخچەی شاری پێ دەدێررا. جموجولێك لە کۆشکدا بەدی دەکرا، فیرعەون لەسەروی ئەم مراسیمەوە پێشکەشکردنێکی لەئەستۆدابوو. دیار نەبوو کەسایەتیەکان چ پلەوپایەیەکیان لەشورادا پێ بەخشراوە. شنار بۆ چەندمین جار لەخزمەتکاری تایبەتی پرسی، ئازانی چ پلەوپایەیەکیان بۆ دەستنیشان کردوم؟ وەڵامی کابراش نەخێر بوو...

ئیزت خۆی بەگەردنی ڕامسیس دا هەڵواسی و باوەشی پێدا کرد و وتی: هیچ نەبێت کەمێك لەباتی ئەو سەگەی هەمیشە باوەشی پێدا دەکەیت کەمێك باوەش بەمنیشدا بکە. دەمەوێت نهێنیەکت پێ بڵێم. بەمەرجێك ماچم بکەیت!

ڕامسیس"ئیزت"ی ماچ کرد و وتی: توانیم"دولانت"ی خوشکت ڕازی بکەم بۆئەوەی بانگێشتی ماڵە هاوینەکەیانم بکات، بەم شێوەیە هەم تۆ زیاتر لەگەڵ کەسوکارتدا دەبیت و هەم دەنگوباسی پێکهێنانی ژیانی هاوسەری من و تۆ بەهێزتر دەبێت و بەنێو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە.

لەوکاتەدا ڕامسیس لەئامێزی گرت و لەهەیوانەکەوە تێی پەڕاند و وتی: بەفەرمانی فیرعەون دەبێت گەشتێك بکەم، بەشی یەکەمی ئەم گەشتەم بەکەشتی دەبێت و بەشی دووەمیشی بەپێی دەڕۆم، تەنها ئەوە دەزانم و بەس...

# دڵنەوایی ڕامسیس و دەستەڵات نواندنی موسا

بارەگـای فـەرمانڕەوایی"میرئـور" –ئیـشقی مـەزن– دەکەوێتـە شـوێنی چـونە ناو"ئالفەیوم"ەوە. ئەلفەیوم شارێکی سەوز بوو کە خودای"تماحوش" –روبك– فەرمانڕەوایی ئەوێی دەکرد. بارەگـای"میرئور" چەندین هیکتـار١٢ فـراوان بـوو و لەلایەن باخەوانە شـارەزاکان چاودێری لـێ دەکـرا. بەلەبەرچاوگرتنی شـوێنی ئـەو بارەگایە و وردبینی باخەوانەکانی بارەگای"میرئور"بەجوانترین و دڵڕفێنترین ناوچە لەقەڵـەم دەدرا. لـەم کاتەشـدا ژنـانی جـوان بـۆ کـارکردن لـە کارگـەی چـنیندا، لـە قوتابخانـەی شـیعر و موزیـك و سـەمادا پەسـەند دەکـران. بارەگـای"میرئـور"وەك کەنوی"سەرەك"ی هەنگ دەهاتە بەرچاو کە بۆساتێکیش لەدەنگ دەنگ نەدەکەوت.
ڕامـسیس پـێش ئـەوەی خـۆی بـە پاسـەوانی بارەگـای"میرئـور"بناسـێنێت، ئـەو پارچەیەی کە لەکەمەری پێچابوو گۆڕی و کورسی پەرستگاکەی پێداپۆشی.

پاسەوانەکە پێی وت: بۆ چونە ناو دەبێت نوسراوێك لەگەڵ خۆتدا بهێنیت.

ڕامسیس وتی: لەوباوەڕدام پێویستم بە نوسراو نەبێت.

کابرای پاسەوان بەسەرسوڕمانەوە پرسی: بۆچی پێویستت بە نوسراو نیە؟

ڕامسیس وتی: لەبەرئەوەی کوڕی"ست هوس"ی فیرعەونی میسرم.

پاسـەوان وتـی: گاڵتـە دەکـەیت! کـوڕی فیرعـەون بەتـەنهایی نـاڕوات بـۆ هـیچ شوێنێك.

ڕامسیس وتی: ئەم سەگەی لەگەڵمدا بۆ من بەسە.

سەرەڕای ئەوەش پاسەوانەکە ڕێی چونە ژورەوەی لێگرت.

---

[12] هەر "هیکتارێك"دە هەزار مەتر چوار گۆشەیە... . سەرچاوە"فەرهەنگی عەمید"... وەرگێڕ.

بەڵام ڕامسیس هاواری بەسەردا کرد بۆئەوەی بڕواتە کەنارەوە!

پاسەوانەکە پرسی: ناوی براکەت کە دەتەوێت چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەیت چیە؟

ڕامسیس وتی: براکەم ناوی"موسا"یە.

پاسەوان وتی: بۆماوەیە چاوەڕێ بکە، دوای ئەوە موسا بەپەلە ئامادە بوو و"ڕامسیس"ی لەئامێز گرت و بانگێشتی ژوورەوەی کرد. بەو ڕێڕەوەی کە سەنگفەرش کرابوو و بەناو درەختی هەنجیری عەرەبیدا تێدەپەڕی و بەهەسێرێك کۆتایی پێدەهات تێپەڕین. لەو ڕێڕەوەدا لەسەر کورسیەك دانیشتن.

موسا وتی: بەڕاستی بەم هاتنەت ڕاتوەشاندم. ئایا هیچ کارێکت هەبوو ئاوا سەردانی ئێرەت کردووە؟

ڕامسیس وتی: تەنها بۆ بینینی براکەم سەردانی"میرئور"م کردوە.

موسا وتی: بەتەنهایی هاتویت، بێ هیچ پاسەوان و ئەفسەرێك؟

ڕامسیس وتی: بۆچی بەلاتەوە سەیرە؟

موسا وتی: هەڵبەت بەلامەوە سەیر نیە کە ڕەفتارگەلێکی ئاوا لە ڕامسیس بوەشێتەوە؟ بەهەرحاڵ دوای پەرتەوازەکردنی گروپە پێنج کەسیەکە چیت کرد؟

ڕامسیس بەم شێوەیە بۆ موسای ڕنکردەوە: بومە نوسەری فەرمانڕەوایی، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت پێشەکیەکە بۆئەوەی فیرعەون بمکاتە جێنشینی خۆی.

موسا پرسی: ئایا شنار ڕازی بوو؟

ڕامسیس وتی: موسا، شنار بەلامەوە گرنگ نیە، توانا و هێزێك دەمبزوێنێت و گەرمیم پێدەبەخشێت کە بەچ شێوەیەك بژین ؟

موسا وتی: ئەوە پرسیارێکە کە خۆشم لەخۆمی دەکەم. تۆ بەچ شێوەیەك وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەیتەوە؟

ڕامسیس وتی: بەهەمان ناخۆشیەکانی تۆ.

موسا وتی: لەئێستادا یەکێکم لە نوێنەری کاربەدەستانی ئەم بارەگایە. ئەو کارگایەی کاری تێدا دەکەم کارگای چنینە، هەروەها گۆزەگەریش دەکەم. شوێنی

نیشتەجێبونم خانوویەکە لەپێنج ژور و باخچەیەك و ئەوەی پێویست بێت، هەروەها هەموو جۆرە خواردنێك، ئەوکاتانەش کە هیچ کارێکم نیە لەکتێبخانەدا خۆم فێری زمانی "عبری" دەکەم بۆئەوەی زیاتر ئاشنای فەرهەنگی دۆڵەمەندی میسر ببم. ئەم کارانە دەقاودەق هەمان ئەو کارانەن کە بەسەختی سەرنجیان ڕاکێشاوم.

ڕامسیس پرسی: هیچ ژنێکی جوان شك دەبەیت؟

موسا زەردەخەنەیەکی کرد.

دوای ئەوە ڕامسیس وتی: ئەریَ بەڕاست لێرە ژن دەست دەکەوێت؟

موسا وتی: ئاشقی؟بەڵێی ژنگەلێکی جوانی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام وەك بڵێی ئاشق بوبێتیت.

ڕامسیس وتی: نازانم، بەتەواوی نازانم، ئاشقم یان نە؟ لەوانەیە.

موسا وتی: ئاشقی کێ بویت؟

ڕامسیس وتی: ئیزت.

موسا وتی: بیستومە کە ئیزت زۆر جوانە، بەڕاستی جوانیەکەی وام لێ دەکات ئیرەییم لەبەرامبەرتدا بوروژێت، بەڵام بۆچی دودڵی، ئیشق و خۆشەویستی هیچ دودڵی و دڵەڕاوکێییەك لەخۆ ناگرێت.

ڕامسیس وتی: موسا خۆت دەزانی کە ئیزت کچێکی بێوێنەیە، تێگەشتنێکی تەواو لەنێوانماندا هەیە، بەڵام دەقاودەق ناتوانم بانگشەی ئەوە بکەم کە ئاشقم، چونکە بەدیدێکی جیاواز دەڕوانمە ئیشق، بەبۆچونی من ئیشق دەبێت زۆر گەرم و ڕەنگاوڕەنگ و ڕاوەشێن بێت.

موسا وتی: زۆر پەلە مەکە، پەی بەهەنوکەی خۆت ببە.

ڕامسیس وتی: ئەی تۆ چی موسا تائێستا ئاشق نەبویت؟

موسا وتی: ئاشق؟ من بەشێوەیەکی تر بیر لەئیشق دەکەمەوە، ئەم جۆرە ئیشقانە بەوشێوەیەش ڕازیم ناکەن، لەدڵمدا هەست بەئیشقێك دەکەم کە دەمسوتێنێت، زمانم لەبەرامبەر پێناسەکردنی ئەم ئیشقەدا لاڵ دەبێت، نازانم بەردەوامی پێبدەم یان فەرامۆشی بکەم، منیش وەکو تۆ دودڵم.

ڕامسیس وتی: موسا دەبینی کە ئێمە لەهەڵبژاردنی ئیشقدا بێدەستەلاتین و هیچ هەڵبژاردنێکمان لەبەردەستدا نیە.

موسی پرسی: تۆ وادەزانی ئەمە جیهانی ڕوناکیە؟

ڕامسیس وتی: ڕوناکی لەجیهاندا دەبینم، کەواتە ڕوناکی لەجیهاندا بونی هەیە.

موسا سەری بەرزکردەوە و تەماشای ئاسمانی کرد.

ڕامسیس پرسی: تۆ وا لێکی دەدەیتەوە کە ڕوناکی لەدەرونی خۆردا شاردراوەتەوە؟

موسا هەروەکو پێشوو تەمشای ئاسمانی دەکرد.

ڕامسیس بەردەوامی پێدا: خۆریش -کە پێشتر ئاماژەی پێدا- ئەگەر کەمێك لێی ڕا بمێنیت کوێرت دەکات.

موسا وتی: دەمەوێت ئەوەی شاردراوەتەوە بەدەستی بهێنم. لەم نێوەندەدا لەناکاو هاوارێك گۆشەیەکی گفتوگۆکەیانی لەت کرد. دو کەس لەژنانی چنین بەدەم قیژە و دڵەڕاوکێ و ترسەوە ڕایاندەکرد و لەبەر خۆیانەوە دەیانوت مار مار و لەوکاتەدا خۆیان گەیاندە لای ڕامسیس و موسا.

موسا وتی: ئێستا نۆرەی منە کە تۆ بەشتێك ڕاوەشێنم، لەگەڵم وەرە بۆئەوەی بزانم کێ ئازاری ئەم ژنە داماوانەی داوە.

کەسێکی دڵگران و تێکدەر کە بەهیچ شێوەیەك هەوڵی هەڵهاتنی نەدا و زۆر بەئارامی هەردوو ئەژنۆی خستە سەرزەوی و مارێکی سەوزباوی ترسناکی لەزەویدا هەڵگرت بۆئەوەی بیخاتە ناو تورەکەکەیەوە.

ڕامسیس هاواری کرد: ئاه!ستائو!ستائو! ئەوە تۆی؟

ستائو هیچ کاردانەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدا، بەڵام ڕامسیس ڕۆشتە پێشەوە و لێی پرسی: لێرە چی دەکەیت؟

ستائو وتی: سلاو لەموسا، سلاو لە"ڕامسیس"ی فیرعەونی ئایندە، من ژەهری مار بە تاقیگای بارەگای"میرئور"دەفرۆشم، خۆشحاڵم بەوەی تۆ لێرەدا دەبینم.

موسا وتی: ئێستا نۆرەی منە، هەربەوشێوەی پێم وتی، دەمەوێت بەشتێك ڕات وەشێنم، ئێرە گۆڕەپانی مەشقی تیر هاوێشتن نیە کە دوبارە هەڵەیەکم لێ بوەشێتەوە، بەهەرحاڵ چاوەکانت دابخە! ئێستا بیکەرەوە!

ڕامسیس بینی موسا لەسەر هەردوو پێی ڕاوەستاوە و دارێکی جوانی لەڕەنگی داربەڕوی بەدەستەوەیە.

ڕامسیس وتی: باشە، دوای ئەوە؟

موسا وتی: ئێستا جوان تەماشام بکە... لەناکاو دار دەستەکەی گیانی تێکەوت و وەك لقی دەرختێك کەوتە لەرزین، دوای ئەوە بوبە مارێك و موسا لەسەر زەوی بەرەڵای کرد... ستائو یەکسەر مارەکەی هەڵگرت...

ڕامسیس وتی: ئەم کارە چاوبەستی و جادوگەریەکی ئاسایی نەبوو، بەڕاستی ڕایوەشاندم، بەدڵنیاییەوە کوڕەکەی فیرعەونی سەرسوڕماو کرد. موسا بەچ شێوەیەك ئەم کارەت ئەنجام دا؟

دوای ئەم پرسیارە هەرسێکیان خۆیان کرد بەناو باخێکی میوەداردا و"ستائو"ش لەگەڵ مارەکانیدا دەستی کرد بەیاری تەڕدەستی. لەو باخەدا کچانی جوان و بالا بەرز سەرقاڵی مەشقی سەماکردن بون، هەریەك لەکچەکان پارچە قوماشێکیان لەکەمەریان پێچابوو و نیوەی جەستیان ڕوت، لەسەر سینەشیان چەند •نەوارێکی ڕەنگاوڕەنگ بەدی دەکرا، قژیشیان بۆ دواوە و پێکەوە چەند جوڵەیەکی هاوسەنگیان ئەنجام دەدا. ڕامسیس زۆر خۆشحاڵ بوو بەسەمای کچەکان و ئامادەبونی موسا کە خودی کچەکانیش گرنگیەکی زۆریان پێدەدا، بەڵام خودی موسا خۆشحاڵ نەبوو، بەڵکو سەرتاپای خەم دایگرتبوو! "ستائو"ش لەجیهانی مارەکاندا دەژیا و زۆر گرنگی بەچواردەوری نەدەدا. ژیانی بەردەوامی لەگەڵ مارەکاندا کارێکی زۆری تێکردبوو و بوبووە هۆی ئەوەی جیهان بەشێوەیەکی تر ببینێت. جگە لەگەستنی مارێك و ژەهرێکی لەناوبەر بیری لەهیچ شتێکی تر نەدەکردەوە... موسا حەزی دەکرد وەکو ستائو هەمان ئەو ژیانە تاقی بکاتەوە، بەڵام بۆ سەرۆکایەتی بارەگای"میرئور"هەڵبژێردرابوو.

لەناکاو موسا وتی: ڕۆژێك دێت دەست لەهەموو شتێك هەڵدەگرم.

ڕامسیس وتی: موسا باش لەمەبەستت تێنەگەشتم.

موسا وتی: نازانم ئەم ژیانە لەبەرچاوم تا دێت تەنگتر دەبێت، ناتوانم بەرگەی بگرم. کچەکان نزیك بونەوە و بانگێشتی خواردنی نانی ئێوارە لەکەنار هەسێرەکەدا لێکردن. کچەکان بەناونیشانی فیرعەونی داهاتوو چەند پرسیارێکیان لێکرد، "ڕامسیس"یش وەڵامی پرسیارەکانی نەدەدانەوە. کچانیش نائومێد لەبەدەست هێنانی وەڵامی پرسیارەکانیان وا خۆیان دەنواند کە لەگەڵ یەکدا سەرقاڵی گفتوگۆکردنن، بەڵام لەم نێوەندەدا تەنها کچێك بێدەنگ بوو.

## موسا و کاهینی کۆشك

ئێوارەیەکیان لەکاتی خۆرئاوا بوندا وەکوو جاران موسا پیاسەی دەکرد، پاڵی بەستونێکی بەرزەوە دابوو و خۆی سەرقاڵی نمایشی ئاوابونی خۆر دەکرد.

لەناکاو دەنگێکی بیست کە پێی دەوت: شازادە چ تێڕوانینێکی لەبارەی ئەم جوانیەوە هەیە؟

موساش لەوکاتەدا سەری وەرگێڕا و کاهینی کۆشکی فەرمانڕەوایی"ئامون تپ"ی بینی و لەوەڵامی پرسیارەکەیدا وتی: بێ وێنەیە.

کاهین وتی: بەڵام بەبۆچونی من ئەم دیمەنە تەنها بۆ فریودانی ئێمەیە. هەرکاتێك زۆر تەماشای ئەم دیمەنە بکەم نەخۆش دەکەوم.

موسا وتی: زانیاریم لەبواری پزیشکیدا نیە، بەڵام دەزانم تەماشاکردنی دیمەنێکی ئاوا بەهیچ شێوەیەك نابێتە هۆی نەخۆش کەوتنی هیچ مرۆڤێك، بەپێچەوانەی بۆچونەکەی تۆوە، جوانی و دیمەنەکان دەبێتە مایەی خۆشحاڵی و تەندروستی مرۆڤ... لەوکاتەدا خۆر ئاوابوو و ئاو و هەوا بەتەواوی تاریك بوو.

کاهین وتی: کەواتە بەبۆچونی تۆ هەرشتێك ببێتە مایەی چێژ وەرگرتن بەسودە؟

موسا وتی: نەخێر، نەموت هەرچی چێژ بەمرۆڤ بگەیەنێت باش و بەسودە، بەڵکو وتم جوانی و دیمەنەکان دەبێتە مایەی خۆشحاڵی مرۆڤ.

کاهین کە لەسەر یەکێك لەپلیەکانەکان دانیشتبوو هەستایە سەرپێ و دەستی موسای گرت و وتی: وەرە با کەمێك لەباخچەکەدا پیاسە بکەین. ئەو باخچەیە ناوێکی تایبەتی نەبوو، بەڵام بەبەرد دروستیان کردبوو و ناوی فیرعەونیان لێ نابوو-فیرعەون بەواتا خانویەکی مەزن! کاهین و موسا بۆماوەیەك بێدەنگ

لەباخـچەکەدا پیاسـەیان کـرد، تـا ئەوکاتـەی کـاهین هاتـە گـۆ و وتـی: ماوەیـەك دەمویست پرسیارێکت لێبکەم، بەڵام ئەو هەلەم بۆ نەڕەخسا.

موسا وتی: ئێستا ئەو هەلەت بۆ ڕەخساوە، پرسیارەکەت بکە!

کـاهینی کۆشـکیش وتـی: چـی لـەنێوان تـۆ و ڕامـسیس دا ڕویـداوە کـە ناچاری کردووە بێت بۆلات و دڵنەواییت بکات؟ چی بووە هۆی ئەوەی زلەت لیٚ بدات.

موسا وتی: دەزانـی؟ ڕامـسیس بۆ دڵنـەوایی کـردنم تـەنها و بـیٚ پاسـەوان ئـەرکی کێشاوە و هاتووە بۆ ئێـرە، منـیش بەخـشیم و ئـەو ڕوداوەشـم بەفەرامۆشـی سـپارد، چیتر نامەوێت لەمبارەیەوە هیچ شتێك ببیستم.

ئامون تـپ وتـی: بـەهیچ شـێوەیەك مەبەسـتم شـەڕ و تۆڵـە سـەندنەوە و ئـەم جۆرە قسانە نیە، تـەنها هۆکـاری پەلاماردانەکـەی تـۆ لەبەرامبـەر فیرعەونـدا بـەلای منـەوە گرنگە، ئایا ڕاست دەکەن تەنها لەپێناو ڕزگارکردنی گیـانی منـداڵی کەنیزەیـەك ئـەو کارەت کردووە؟

موسا وتی: بەڵیٚ؟

کاهین وتی: مـن گۆڕەپـانی مەشقی تیرهاوێشتنم بینیـوە و دەزانم کە نیشانەکان لەسەر دیوار هەڵدەواسن، هەروەها دەزانم لەپشتی ئـەو دیـوارەوە درەختێکـی بچوك هەیە کە منداڵ و کەنیزە زادەکان بەسەریدا سەردەکەون، ئەو درەختە بـەو ڕادەیـەش لەدیوارەکەوە نزیك نیە کە تیرئەنداز ئەو درەختە لەگەڵ نیشانەکەدا بەهەڵـەبگرێت و لەیـەکیان جیـا نەکاتـەوە، سـەرەڕای ئـەوەش ڕامـسیس لـەنێو لاوەکانـدا بەباشـترین تیرئەنـداز لەقەڵـەم دەدرێـت، بـەو ڕادەیـەش ناشـی نیـە کـە درەختێـك ئەوەنـدە لەنیشانەکەوە دورە لەگەڵ خودی نیشانەکەدا بەهەڵە بگرێت.

موسا وتـی: تـۆ ڕاسـت دەکـەیت، نـەك تـەنها ڕامـسیس کـە باشـترین تیرئەنـدازە، بـەڵکو مەحاڵـە ناشـیترین تیرئەنـداز لـەباتی نیـشانەی سـەر دیوارەکـە درەختـی چواردەوری نیـشانەکە بپێکێـت، بـەڵام ئـەوەی مـن ئاگـاداری بـوم ئـەوەبوو لـەناکاو بینـیم ڕامـسیس بـۆ نیـشانەگرتن لـە منـداڵی سـەر درەختەکـە کـە نۆکـەر زادەبـوو، کەوانەکەی کەمێك بەرزتر کردەوە و قەرەوڵی لەو گرت، خۆشم دەستی تیرئەندازیم هەیە و دەزانم ئەوە دەستنیشان بکەم کە تیر بەرەو چ ئاڕاستەیەك دەڕوات، گۆشەی

کەوانەکە کە من هەمیشە لەوێوە قەرەوڵم لە نیشانەکە پێدەگرت دروست لەبەرامبەری شانمدا بوو، بەڵام نوکی تیرەکەی ڕامسیس ڕێك قەرەوڵی لەدرەختەکە دەگرت، بێگومان بەو لێهاتوییەی کە ڕامسیس لەتیرهاویشتندا هەیبوو دەقاودەق قەرەوڵی لەکەنیزەك زادە یان منداڵەکە گرتبوو... "ئامون تپ"بەهیچ شێوەیەك سەری لەقسەکانی موسا سوڕ نەما، چونکە نیشانەگرتنی نۆکەرزادەیەك لەلایەن فیرعەون زادەیەکەوە پێویست بەهیچ لێکۆڵینەوەیەك ناکات.....

بەڵام ئامون تپ بەموسای وت: خۆ ئەو ڕۆژە ئەو نیشانەی لەنۆکەر زادەکە نەگرتبوو کە ببێتە هۆی ئەوەی بەوشێوە توندە ڕەفتار لەگەڵ براکەتدا بکەیت و لەبەرچاو ئەو هەموو خەڵکەدا سوکایەتی پێ بکەیت.

موسا وتی: تەنها مەبەستم ئەوەبوو ئەو منداڵە ڕزگار بکەم، نەك سوکایەتی کردنی "ڕامسیس"ی برام.

ئامون تب وتی: کەواتە بەپێی لێکدانەوەکانت براکەت مەبەستی کوشتنی ئەو منداڵەی هەبووە؟

موسا وتی: بێگومان وابوو.

ئامون تپ وتی: بۆچی نەتهێشت تیرەکەی بهاوێژێت، گریمان بەری منداڵەکەش بکەوتایە هیچ کێشەیەك دروست نەدەبوو.

موسا وتی: لەوانەیە بەبۆچونی"ڕامسیس"ی برام ئەم کارە بەلایەوە چێژبەخش بێت، هەروەها لەدیدی کاهینی کۆشکیشەوە کوشتنی منداڵێك کێشە نەبێت، بەڵام ئەم کارە لەدەستەڵاتی مندا نەبوو، نەمدەتوانی بینەری کوشتنی منداڵێکی نۆکەرزادە بم.

کاهین بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: دەزانی دایکت لەئێستادا لەکوێیە؟ خۆ درەنگت پێ نەبووە تا چاوەڕێت بکات؟

موسا وتی: دایکم لەئێستادا لەکەنار ڕوباری"نیل"دا دانیشتووە و چاوەڕێی هەڵهاتنی مانگ دەکات، ئەو حەز دەکات مانگ لەناو ڕوباری"نیل"دا ببینێت.

ئامون تپ وتی: دایکت لەسەردەمی لاویەتیدا مانگی سەر زەوی بوو، باش لەبیرمە کە پیاوگەلێکی زۆر شەیدای بوبون، ئەو بەڕادەیەك جوان بوو کە کاتێك

لەشوێنێکەوە تێدەپەڕی خەڵکی دەستیان دەخستە سەر ئەژنۆیان و کڕنوشیان بۆ دەبرد، هەرگیز لەجیهاندا خودایەك بەجوانی دایکت لەدایك نەبووە.

موسا پرسی: ئەی"ئامون تپ"تۆش یەکێك بویت لەو کەسانەی کاتێك چاوت بەدایکم دەکەوت سەری ڕێزت بۆ دادەنواند؟

ئامون تپ وتی: ئەی موسا تۆ پرسیارگەلێکم لێ دەکەیت کە چیتر ناتوانم لەم تەمەنی پیریەمدا بەبیریان بهێنمەوە، ئەرێ بەڕاست دەزانی شوێنی چاودێری لەکوێیە؟...

موسا دەیزانی کاهین نایەوێت لەمبارەیەوە باسی هیچ شتێك بکات، بۆیە وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە و وتی: بەڵێ، بۆچی پرسیاری شوێنی چاودێرکردنەکەم لێ دەکەیت؟

ئامون تپ وتی: تائێستا بەشەودا لەشوێنی چاودێریکردنەکەوە تەماشای ئاسمانت کردووە چەنێك ورووژێنەرە.

شوێنی چاودێریکردنی کۆشکی فەرمانڕەوایی میسر منارەیەکی زۆر بەرزی هەبوو، بۆئەوەی بگەیتە سەر ئەو منارەیە دەبێت چەندین پلیکانە ببڕیت، لەبەرئەوەش کاهین بەهۆی پیریەوە کەوتە هەناسە بڕکێ، بەڵام موسا زۆر بەخێرایی خۆی گەیاندە ترۆپکی منارەکە. پێش ئەوەی بگاتە ترۆپکی منارەکە لەهەردوو لای بەشی سەرەوەی ئەو منارەیەوە دوو پەیکەر سەرنجی موسای ڕاکێشا.

کاهین بۆ موسای ڕونکردەوە: ئەم دوانە یەکێکیان"ئیزیس"ە کە یەکێکە لەخوداکانی میسر و ئەویتریان"ئوزیریس"ی هاوسەریەتی، "ئوزیریس"ی هاوسەری"ئیزیس"خودای نابوتی و مەرگ و جیهانی خۆرئاوایە. لەترۆپکی ئەو منارەیەدا دەنگی کاهینانی چاودێریخانەکە "زەبور"یان دەخوێند و بەچواردەوری ئەو منارەیەدا دەنگی دەدایەوە.

موسا کە گوێی لەو ئاهەنگە بوو وتی: ناوی ئەم ئاهەنگە"زەبوری شەوە"

کاهین وتی: دەبێت چاوەڕێ بکەین تا کۆتایی بەئاهەنگەکە بێت، دوای ئەوە بۆ تەماشاکردن دەڕۆینە ترۆپکی ئەو منارەیە. بەسەر ئەو منارەیەوە سەربانێکی تاڕادەیەك فراوانی تێدایە کە چوار لەکاهینەکانەکان لەوێدا دانیشتبون. ئەمانە

سـرودبێژانی "شـەوی زەبـور" بـون. کاهینـەکان لەیەکـەمین تەماشـاکردندا سـەرۆکەکەیان "ئـامون تـپ"یـان ناسـیەوە، بـەڵام "موسـا"یـان نەناسـیەوە بۆیـە لەبارەیـەوە دەستیان کرد بەگفتوگۆ و بەزمانی هێماکان لەکاهینەکەیان پرسیاری ئەویان لێکرد.

ئامون تـپ وتـی: ئەم مەزنزادەیەی کە بەلاتانەوە کەسێکی نامۆیە، بەڵام ئێستا بزانن کـە کـوڕی شـازادە "ئنخـاس ئـامون"ی شـاژنی میسرە. کاهینـەکان هـەمویان پێکـەوە بەخێرهاتنیان لێکرد. ترۆپکی منارەکـە بنمیچ و کـەپری نـەبوو و لـەوێوە مانگ کە کەمێك بەرز بوبویەوە بەڕونی دەبینرا.

ئامون تـپ بـەهێمانی دەستی داوای ڕونکردنـەوەی لێکرد و وتـی: دەزانـی نـاوی چیە؟

موسا وەڵامی دایەوە: مانگ، خودای "ئیزیس"ە.

کاهین وتی: تۆ کە ئەوەندە شارەزایت بەدڵنیاییەوە ناوی خۆریش دەزانی چیە؟

موسا وتی: ناوی خۆر، خۆرە.

ئامون تپ وتی: وەڵامەکەی تۆ وا دەگەیەنێت کە دەبێت بڵێم﴿مانگ مانگە﴾! ئایا دەتوانی ناوێکی تری خۆرم پێ بڵێیت... موسا وەڵامی نـەخێری دایەوە و کاهینی مەزن وتی: ئەی موسا! خـۆر نـاوێکی تـری هەیە کە بە "ئامون" بـانگ دەکرێت، بەچ شێوەیەك تۆ ئاگاداری ئەم ناوە نیت.

موسا وتی: لەبەرئەوەی خۆر بێ لەناوی خۆر هیچ ناوێکی تر لەخۆ ناگرێت، ئـەم ناوەیان بۆ دروست کردووە، نەفرەت لە "ئاتون"!

کاهینی مەزن پرسی: بۆچی نەفرەت لە "ئاتون" دەکەیت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی "ئاتون" تاوانبار و ستەمکار بووە و تـەواوی خوداکانی میسری نابوت کردووە.

کاهینی مەزن پرسی: کێ ئەم قسانەی بۆ کردویت؟

موسا وتی: لەمامۆستاکانم بیستووە.

کاهینی مەزن وتی: ئەوانەی بۆیان باسکردویت ڕاست نین.

موسا وتی: تۆ لەوباوەڕەدایت نابێت نەفرەت لە"ئاتون" بکرێت و ئەو خوداکانی میسری لەناو نەبردووە؟

ئامون تپ بۆی ڕونکردەوە: تۆ خۆت باش دەزانی خودایانی میسر بێشومارن و لەئەنجامدا کوشتنیان بەوشێوەیەش ئاسان نیە، سەرەڕای ئەوەش "ئاتون" بکوژ و تاوانبار نەبووە!

موسا وتی: کەواتە مامۆستاکانم درۆیان لەگەڵدا کردوم؟

کاهینی مەزن وتی: مامۆستاکانت بیروبۆچونی"وەرزای داگیرکەریان"بۆ گێڕاویتەتەوە، دەقاودەق ئەمە بۆچونی فیرعەونە.

موسا وتی: مەگەر تۆ چاوت بە"ئاتون" کەوتووە، کە بەو دڵنیاییەوە باسی دەکەیت؟

ئاموت تپ وتی: ئاتون نەبینراوە.

موسا پرسی: ئەگەر ئاتون نەبینراو بێت، دەی کەواتە بەچ شێوەیەك دەڵێیت"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسر و خەڵکی دەیانپەرست. منیش هەرئێستا"ئیزیس"لەئاسماندا دەبینم و دەزانم بەچ شێوەیەکە، بەڵام کاتێك نەتوانرێت"ئاتون"ببینرێت بەچ شێوەیەك دەیپەرستن؟

ئامون تپ وتی: ئەی موسا ڕاستیەکانی ئەم جیهانە نەبینراون، ئەوەی دەبینرێت تەنها شتە لاوەکیەکانن.

موسا وتی: تێناگەم.

ئامون تپ وتی: تێناگەیت لەبەرئەوەی هێشتا بچوکی، لەدواییدا کاتێك تەمەنی گەنجیەتیت تێپەڕاند لەمەبەستم تێدەگەیت، بەڵام بیَ لەبچوکی و هەرزەکاری و کەم تەمەنیت، لەبەرئەوەی بەردەوام پەیکەری خودایانی میسریت بینیوە، وادەزانی هەموو خودایەك دەبێت قاڵب و شێوەیەکی دیار و ناسراوی هەبێت. ئایا کاتێك بەنێو ئەم باخەدا پیاسە دەکەیت و بۆنی عەتری گوڵەکان دەکەیت دەتوانیت خودی ئەو بۆنە ببینیت؟ "ئاتون"یش دەقاودەق وەك ئەو عەترە وایە.

موسا وتی: جەنابی ئامون تپ هێشتا من بەهەرزەکار دەزانی، بەڵام هیچ نەبیَ دەزانم سەرەڕای ئەوەی هەندێك لەشتەکان بینراو و هەندێکیشیان بیستراو و

بۆندارن، بونیشیان هەیە، ئەم"ئاتون"ەی کە نەبینراوە پەیوەست دەکرێت بەکامیەك لەم سێ بەشەوە و چ هێمایەکیان هەیە؟

ئـامون تـپ وتـی: لێـرەدا دەبێـت پـەنا بـۆ هزرمـان ببـەین و داوای هاوکـاری لـێ بکەین.

موسا وتی: تۆ بەچ شێوەیەك داوای هاواکاریت لەئەقڵت کرد؟

ئامون تپ وتی: ئەقڵم پێم دەڵێت"ئاتون" بونی هەیە.

موسـا وتـی: ئەمـە گاڵتەجاڕیـە، تـۆ کـە بـاوەڕت بـەبونی"ئـاتون"ە بۆچـی ناوت"ئامون"ە؟

ئامون تپ وتی: دایك و باوکم ئەم ناوەیان بۆ هەڵبژاردوم، نەك خۆم.

موسا وتی: هـەم دایکـم و هـەم مامۆسـتاکانم پێیـان وتـوم"ئـاتون"تاوانبـار بـووە و"ئـامون هوتـپ"ی چوارەم دوای ئەوەی پلەوپایەی فیرعـەون دەگرێتـە دەسـت ئـەو خودایەی بۆخۆی دروست کردووە، بەواتا لەڕاسـتیدا دایك و باپیرەی ئـەم فیرعەونـە خودای"ئاتون"یان دروست کـردووە و وایـان لەخـەڵکی کـردووە باوەڕی پـێ بهێـنن، "ئامون هوتپ"یش ناوی گۆڕی بە"ئاخن ئاتون"کـە بەئەخناتون بانگیـان کـردووە و بووە هۆی ڕشتنی خوێنی خەڵکی میسر.

کـاهینی مـەزن وتـی: ئـەوەی دایـك و بـاوك و مامۆسـتاکان لەسـەردەمی منداڵیـدا فێری منداڵەکانی دەکەن، کاتێك گەورە بون زۆر بەسەختی دەتوانرێت مێشکیان لەو فێرکاریە هەڵەیە پاك بکەیتەوە، بەڵام ئەوەی پێـشتر باسـت کـرد کـە دایکـی فیرعـەون خودای"ئاتون"ی دروست کـردووە داسـتانێکی دوورودرێـژە، نـاوی ئـەم ژنـە"نفـر تـی تی"بـووە و تـا ئەوسـەردەمە هـیچ ژنێـك لەمیـسردا بەئەنـدازەی ئـەو جـوان نـەبووە... ئێستا بەڵێنم پێبدە ئەم گفتوگۆیەمان بۆ هیچ کەسێك نەگێڕیتەوە.

موسا وتی: بەڵێنت پێدەدەم.

# کچێك بەناوی"نفر تاری"!

ئەم کچە لەکچەکانی تر جوانتر بوو. قژێکی ڕەش و چاوی سەوز و ڕوخسارێکی سەرنج ڕاکێشی هەبوو.

ڕامسیس لەموسای پرسیی: ئەو کچە ناوی چیە؟

موسا وتی: ئەو کچە ناوی"نفر تاری"ە.

ڕامسیس دوبارە لەموسای پرسی: بۆچی"نفر تاری" ئەوەندە شەرمنە؟

موسا وتی: "نفر تاری"لەخێزانێکی ئاساییە و بەم تازەییانە لەبارەگای"میرئور"خراوەتە سەرکار، بەڵام لەماوەیەکی کورتدا لەتەواوی کچەکانی ئەم بارەگایە لێهاتوتر و خێراتر و ناسکتر کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەر لەبەرئەوەش سەرنجی هەموو کەسێکی دەوروبەری بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و هەر ئەم کارەش بووەتە هۆی ئەوەی زۆرێك لەکچە وەجاخزادەکان ئیرەیی پێ ببەن. لەم کاتەدا چەند کچێك بۆ سەرنج ڕاکێشان چواردەوری"موسا" و "ڕامسیس"یان دا و پرسیاری دەنگۆی پێکهێنانی ژیانی هاوسەر لەگەڵ"ئیزت"یان لێکرد، بەڵام ڕامسیس بیر و هۆشی لەلای"نفر تاری"بوو و دواجار دانبەخۆداگری خۆی لەدەست دا و ڕۆشت لەتەنیشتیەوە دانیشت و وتی: هیوادارم نەبوبێتمە مایەی دەردیسەریت... "نفر تاری"شڵەژا، لەوکاتەدا تەنها توانی بەسەر سوڕمانەوە تەماشای نێوچەوانی ڕامسیس بکات.

ڕامسیس وتی: بۆچی بەتەنها دانیشتوی؟

نفر تاری وتی: لەبەرئەوەی ڕۆچومەتە ناو هزری خۆم و لەحاڵی بیکردنەوەدام.

ڕامسیس وتی: دەتوانم بپرسم لەهزرتاندا بیر لەچی دەکەیتەوە؟

نفر تاری وتی: بیر لەوە دەکەمەوە کە دەستەیەك گوڵ بڕازێنمەوە و بەدرێژایی ساڵ بتوانم لەپەرستگادا گۆشەگیری بۆخۆم هەڵبژێرم.

ڕامسیس وتی: ئەم ژیانە هیچ شتێکی تیدا نیە کە بتوروژێنێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە ژیانێکی زۆر سەختە.

نفر تاری وتی: من چێژ لە تەنهایی و بێدەنگی وەردەگرم، مەگەر نەیانوتووە بێدەنگی ڕۆح دەپاڵێوێت؟

لەم کاتەدا سەرپەرشتی ئارایشتگەرەکان هات و داوای لێکردن کۆ ببنەوە هەروەها پێش ئەوەی بڕۆنە ژوری وانە خوێندنەوە جلەکانی بەریان بگۆڕن. لەمکاتەدا"نفر تاری"هەستایە سەرپێ و ڕامسیس وتی: دەمویست تکای ئەوەت لێ بکەم کە کارێکم بۆ ئەنجام بدەیت.

نفر تاری وتی: سەرپەرشتیارەکەمان زۆر جدیە دەبێت بمبوریت.

ڕامسیس وتی: دەتوانیت گوتیەکی کورتمان پێی بڵێیت.

نفر تاری وتی: ***گوتەی حەق لە بەردی شاراوەی سەوزباوی ژێر زەوی قورسترە، گەر لەدەمی خزمەتکارێکی شێوە بەرداشی وەك منیش بیبیستیت...*** نفر تاری دوای ئەم گوتەیەی بۆیەك ساتیش چاوەڕێی نەکرد و ئەو شوێنەی بەجێهێشت.

موسا و ڕامسیس هەفتەیەك لەبارەگای"میر ئور"دا پێکەوە بون. موسا بەهۆی زاڵ بونی بەسەر زمانی"عبری"دا بەرپرسیاریەتیکی زۆریان خستە ئەستۆی و چیتر دوای ئەوە نەیتوانی لەگەڵ"ڕامسیس"دا بمێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەش لەهەر ساتێك کە بۆیان دەرەخسا گفتوگۆی هزریان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد.

ڕامسیس وتی: ئەی موسا تۆ یەکێکیت لەو کەسانەی کە پەی بەهەست و دڵ و دەرونم دەبات، بەو تەڕدەستیەی کە نمایشت کرد زۆر سەرم پێی سوڕما، چونکە دارکەی دەستت گوڕی بە مارێك، ئەوە چ توانایەکە؟

شنار لە پلەی جێنشینی و فەرماندەی جەنگ میوانداریەکی بەرپاکردبوو و هەزار کەسی لە پلەوپایە بەرزەکانی بانگێشتی ئەو میوانداریە کردبوو. ئەو میوانداریە ئاهەنگێك بوو کە ژەنیاران تێیدا چێژی ڕۆحیان بەئامادە بوان دەبەخشی و مەیی

نایاب و خواردنگەلێکی خۆشیش چێژە جەستەییەکانی پیێ دەبەخشین. فیرعەون تەنها چەند ساتێك لەو ئاهەنگەدا ئامادە بوو.

"ڕامسیس و موسا و ستائو"ش بانگێشی ئەم میوانداریە کرابون. ستائو پۆشاکێکی جوان و شکۆمەند کە ڕامسیس پێی بەخشیبوو لەبەردا بوو.

هەرئەوەی بەڕێوبەری کارەکانی شنار چاوی بە ستائو کەوت بەرەو ڕوی ڕۆشت و پێی وت: بۆچی مارت کردبووە ناو گۆزە شیرەکانەوە؟

"ستائو"ش بەدەم پێکەنین و گاڵتەجاڕیەوە لێی پرسی: ترسای؟

بەڕێوبەری کارەکانی"شنار"یش وتی: ئەگەر شنار ئاگاداری ئەم ڕەفتارانەت بێت، ئەگەر مارەکان لەگۆزەکان سەر دەربهێنن، بگومان بڕیاری لەناوبردنت بۆ دەردەکات.

ستائو وتی: ئاسودە خەیاڵ بە ئەو مارانە گەر سالێکیش لەو گۆزەیەدا بن بۆ هیچ شوێنێك ناڕۆن، چونکە بڕێك سیر و ماسی بۆگەنم لەبەردمی دەرگاکەیاندا داناوە، ئەو گیانەوەرە داماوەش مەحاڵە لەدەرگای ئەو گۆزەیە نزیك ببێتەوە...

دوای ئەوە دەستی برد بۆ گیرفانی و مارێکی سوری دەرهێنا. بەڕێوبەری کارەکانی"شنار"یش یەکسەر دور کەوتەوە، ڕامسیس و موسا پێکەنین.

ستائو وتی: خەڵکی زانیاریەکی ئەوتۆیان لەبارەی مارەوە نیە، تەماشای ئەم مارە بکەن هیچ کاتێك زیان بەهیچ مرۆڤێك ناگەیەنێت. دەتوانی پەی بەحەوانەوە و ئاسودە خەیاڵی ببەیت، سەرەڕای ئەوەش چزی نیە، ئەم مارە ژەهراوی نیە و دەتوانم هەرئێستا بەبەرچاوی ئێوەوە بەنجەم بخەمە ناو دەمیەوە.

موسا کە جارێکیان تواناى خۆی لەگۆڕینی دار دەستێك بۆ مار پێنیشان دابوو بێئەوەی هیچ گرنگیە بە قسەکانی بدات وتی: مار گیانەوەرێکی بێئازار و بێزیانە، تەنها نابێت پیێ بەکلکیاندا بنێین... لەهەمان ئەو کاتەدا چەند کچێکی جوان چواردەوری"موسا"یان دا و بەردەوام وەسفی ئەو و"ڕامسیس"ی برایان دەکرد. ڕامسیس و "موسا"ش کاتێك بینیان ناتوانن بەئامادەبونی ئەم کچانە لەم میوانداریەدا ئاگایان لەخۆیان و چواردەوریان بێت، بۆیە هەلی نێوان دوو سەمایان

قۆستەوە و خۆیان خزاندە ژێر درەختەکانەوە. لەمکاتەدا ڕامسیس بە موسای وت: گوێت لەگوتەکانی شنار بوو؟

موسا وتی: بەهۆی بەشداری کردنی لەفلان جەنگدا بانگەشەی داگیرکەر و سەرکردەیەکی مەزنی بۆخۆی دەکرد، بەڵام هەموو ئەم قسانە لەخۆویستی و لەخۆباییەکانیەوە سەرچاوە دەگرێت.

ڕامسیس وتی: ئەی موسا ئەم برایەمان دەیەوێت میسر بکاتە وڵاتێکی ملکەچ و وێرانە. وڵاتی فیرعەونەکان وڵاتێکی ترە. کاتێك ئاسیاییەکان میسریان داگیرکرد کە لاواز و کەسێکی خۆشباوەڕیان لێ دەرچوبو، بەڵام ئێمە دەبێت هەوڵی خۆمان بدەین.

گەرمی ڕامسیس و بوو بەمایەی سەرسوڕمانی موسا و وتی: ئەوەی تۆ ئێستا باست کرد گوتەی سەرکردەیەکە، بۆیە لەگەڵ تۆدا هاوڕام، بەڵام هەموو کارێك ڕێگایەکی تایبەت بەخۆی هەیە.

ڕامسیس وتی: ئەی موسا پاراستنی تەواوی میسر هەروەها بۆئەوەی تەواوی خوداکان لەم وڵاتەدا بمێننەوە، جگە لەجەنگ هیچ ڕێگایەکی ترمان بەدەستەوە نیە.

موسا تەماشایەکی"ڕامسیس"ی کرد و پرسی: بەبۆچونی تۆ خوداکان بونایەتیەکی دەرەکیان هەیە. شەوی ڕابردوو لەسەر منارەی چاودێرگاکەدا تەماشای"ئیزیس"م دەکرد، چ خودایەکی سەیرە! ئەو مانگە بەخودا بانگ دەکەن!

ڕامسیس وتی: موسا مەبەستی خۆت ڕونتر بکەرەوە، خوداکان، خوداکانن، هەزاران ساڵە میسریەکان لەگەڵ ئەم خودایانەدا دەژین، بەڵام تۆ بوچونێکی جیاوازت هەیە؟

موسا نەیتوانی وەڵامی ڕامسیس بداتەوە، چونکە کچانی ئەو میوانداریە بەشێوەیەك چواردەوریان دابوون و پرسیاریان لەبارەی ئاینده و هەندێك بابەتی تایبەت لێ کردن کە بوو بەهۆی ئەوەی بابەتی گفتوگۆکەیان بگۆڕن.

لەوکاتەدا "ئیزت" لە ڕامسیس نزیك بویەوە و وتی: شناری برات منی ڕاگرتبوو و پێشنیاری پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لێکردبوم و وتی: دەبیتە هاوسەری ئایندەی میسر، ئایا بەڕاستی ئەو دەبێتە فیرعەونی ئایندەی میسر؟

ڕامسیس زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: ئەوە بۆمن وەك مژدەیەك وایە، تۆ دەبیتە شاژنی میسر و منیش دەبمە خزمەتکارت.

ئیزت بەم گوتانەی دڵگران بوو و وتی: ڕامسیس گوێم لێ بگرە، من تۆم لەبەرخۆت دەوێت، ئیتر فیرعەون بیت یان کارێکی ئاساییت لە کۆشکی فەرمانڕەواییدا پێ بسپێرن، هیوادارم لەگوتەکانم تێگەشتبی.

ڕامسیس وتی: تۆش دەبێت تێبگەیت لەوەی چی بەهزرمدا تێدەپەڕێت.

ئیزت وتی: خۆزگە دەمزانی بیر لەچی دەکەیتەوە؟

ڕامسیس وتی: پێش ئەوەی ببمە هاوسەر و باوکی منداڵەکانت، دەبێت وێنەیەکی ڕونی میسر کە لەئێستادا بەدوای ئەو وێنەیەدا دەگەڕێم لەهزرمدا بکێشم و کێشانی ئەم وێنەیەش کاتێکی زۆری دەوێت، بەچاوی خۆت دەبینی کە لەناو خێزانەکەمدا ڕکابەرم هەیە و بێئەوەی شایستەی ئەو پلەوپایە بێت خۆی بە فیرعەونی ئایندەی میسر لەقەڵەم دەدات، بۆیە لەئێستادا دەبێت هزر و هۆشم تەرخانی ئەم ڕکابەریە خێزانیە بکەم بۆئەوەی نۆرەی قۆناخی ئایندە بەواتا پێکهێنانی ژیانی هاوسەری و ئەم جۆرە بابەتانە بێت، بۆیە دڵنیابە لەئێستادا هزرم هەژگێك[13] بەکلکی ئامانجەکەیەوە نابەستێت.

لەو شەوە عەتراو و بۆندارەدا بێدەنگیەکی قوڵ باڵی بەسەر "ڕامسیس و موسا و ئیزت"دا کێشا، دەنگی ژەنینی ژەنیار و گۆرانی بێژەکانی ناو کۆشك زۆر بەباشی دەبیسترا، بێدەنگی باخ بە هاوارێکی دڵڕوشێن هەژێنرا و ڕامسیس بەپەلە خۆی گەیاندە ناو کۆشك و تێگشەت کە ئەو هاوارە لەچێشتخانەدا بووە و بینی بەڕێوبەری کارەکانی شنار بەمقاشێك دەدات لەپیاوێکی بەتەمەن. ڕامسیس یەکسەر بەرەو ڕوی کاربەدەستەکەی شنار ڕۆشت و دەستی گرت و مقاشەکەی لێسەند و لێی پرسی: چی ڕویداوە.

[13] هەژگ: بەلقە دارێك دەوترێت کەچڵ و پۆپێکی زۆری پێوە بێت... وەرگێڕ.

کاربەدەستەکەی"شنار"یش وتی: ئەم پیاوە هەڵهات و ویستی لەنێو خزمەتکارەکاندا خۆی بشارێتەوە.

موساش لەمکاتەدا خۆی لەم بابەتەدا هەڵقورتاند و وتی: خەریك بوو ئەو پیاوەت دەکوشت چ کارێکی ناشایستی کردووە تا بەوشێوەیە سزای بدەیت؟

ئەو پیاوەش وتی: ئەم پیاوە یەکێکە لەدیلەکانی"حیتا"، بەکورتیەکەی دیلە!

موسا لەوکاتەدا شڵەژا و لێی پرسی: ئایا تۆ بەو شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ هەموو دیلێکدا دەکەیت؟

کاربەدەستەکەی"شنار"یش وتی: تەنها لەگەڵ دیلەکانی"حیتا"دا بەوشێوەیە ڕەفتار دەکەم!

رامس لەوکاتەدا ئۆقرەی لێبڕا و قژی کاربەدەستەکەی شناری گرت و توند سەری کێشا بەزەویدا و وتی: ئەم پیاوە شایستەی ئەوە نیە لە بارەگای کۆشکی فەرمانڕەواییدا کار بکات، ئەو دیلانەی کە لەمیسردا کار دەکەن دژمن نین.....

لەم کاتەدا"شنار"ی براگەورەی ڕامسیس گەشتە ئەوێ و وتی: قسەی زل زل دەکەیت!

موسا وتی: شایەتی ئەوە دەدەم کە بەڕێوبەری کارەکانت ڕەفتارێکی نەشیاوی لەبەرامبەر ئەم پیاوەدا نواندووە!

ڕامسیس بە موسای وت: ئەم کاربەدەستە ببە و بیسپێرە بە"ستائو"بۆئەوەی سبەی دادگایی بکەین..... "شنار"یش ناچار دەبێت خۆی بدات بەدەستەوە چونکە لەو شوێنەدا بەپێی پێویست گەواهیدەر هەبووە، دوای ئەوە بە"ڕامسیس"ی وت: پێش ئەوەی پەنا بۆ ئەم کارە ببەیت دەبوو داوای هاوکاریت لەمن -کەلەئاییندەدا دەبمە فیرعەونی میسر-بکردایە. تۆ دەبوو ئەم ڕێزەت لەبەرچاو بگرتایە، سبەی کاتێك بوم بە فیرعەونی میسر پەی بەم گوتەیەی من دەبەیت.

ڕامسیس وتی: جارێکی هێشتا سبەی نەهاتووە... . دوای ئەم قسەیەی لەگەڵ موسادا لەو شوێنە دور کەوتنەوە.

موسا بە"ڕامسیس"ی وت: شنار کەسێکی بەهێز و هەڕەشەئامێزە، دەبێت ئاگات لەخۆت بێت.

ڕامـسیس وتـی: بگـرە بەئەنـدازەی گـەردێکیش لێـی ناترسـم... بەهــەرحاڵ بگەڕێینـەوەی سەر بابەتەکەی خۆمـان، دەتویـست لـەبارەی خودایانـەوە باسـی چی بکەیت؟

موسا وتی: لەڕاستیدا خۆشم نازانم، بیرگەلێکی سەیر بەهزرمدا تێدەپەڕێت، ئەم جۆرە بیرۆکانە ڕۆح و جەستەم ئازار دەدەن. تا پەی بەنهێنییەکانیان نەبەم ناتوانم هێور ببمەوە، بەڕاستی خەریکە دەمسوتێنێت.

ڕامسیس بەهۆی ئەوەی موسای برای لەبارەگای"میر ئور"وە بۆ کارێکی تایبەت بـانگ کردبـوو زۆر دڵگـران و تـوڕە بـوو. موسـا لـەماوەی نیـشتەجێ بـونی لـەبارەگای"مـیر ئـور"دا هـیچ هەڵەیـەکی لـێ نەوەشـاوەتەوە، تـەواوی کارمەنـدان و کانزاگـەران و سـەربازان بگـرە ئـەو دیلانـەش کـە بێگاریـان پێدەکـەن لەشـێوەی بەڕێوەبردنی کـارگێڕی"مـیر ئـور"خۆشـحاڵ و ڕازی بـون. موسـا لـەلای ئـەم جـۆرە کەسـانەدا زۆر خۆشەویست بـوو و ئـەم خۆشەویستیەش خـەڵکی ناشایستی ئـازار دەدا و دەبـووە هـۆی ئـەوەی ئیرەیـی پـێ ببـەن، بـەڵام بوختـان و لەپـشت ملـەوە قسەکردن هەر بەردەوام بوو.

ڕامسیس بە"ئامنی"هاوپۆلی قوتابخانەی وت: بەهیچ شێوەیەك نیگەرانی موسـا نیم، چونکە ئەزمون و تاقیکردنەوەکان لەباتی ئـەوەی بێـزار و لاوازی بکـەن لێهـاتوو تـر و بـەهێزتری کـردووە. موسـا زۆر خـۆڕاگرە، بـەڵام بۆچـی دوبـارە بانگێـشتی کۆشکیان کردووە، ئەم کارە نیگەرانی کردوم... . ڕامسیس بەچواردەوری کۆشکدا بەنیگـەرانی و دڵـەڕاوکێوە پیاسـەی دەکـرد، تـا سـەرئەنجام نزیکـی نیـوەڕۆ موسـا لەکۆشك، لەهەمان ئەو شوێنەی بانگێشتیان کردبوو هاتە دەرەوە و ڕامسیس بـەرەو ڕوی ڕۆشت و لێی پرسی: چی ڕویداوە؟

"موسـا"ش وتـی: بەرپرسـیاریەتی کاروبـاری دروسـت کردنـی تـەلار و کۆشـکی فەرمانڕەواییان پێ سپاردووم.

ڕامسیس وتی: چیتر هیچ کارێکت لە بارەگای"میر ئور"دا نەماوە؟

موسا وتی: دەبێت لەکاروباری دروست کردنی کۆشك و پەرستگاکاندا بەشداری بکەم و بڕۆم بۆ شار بۆئەوەی چاودێری و پشکنینی ئەوکارانە بکەم کە وەستاکان ئەنجامیان داوە.

ڕامسیس وتی: ئایا تۆش ئەم پێشنیارەت پەسەند کرد؟

موسا وتی: هیچ کاتێك هیچ بەرپرسیاریەتیەك ڕەت ناکەمەوە و پەسەندی دەکەم.

ڕامسیس وتی: ئەمشەو من و تۆ و ئامنی و ستائو لەشوێنێکدا کۆ دەبینەوە.

دو فیرعـــــەون زادە"ڕامـــــسیس و موســـــا"لەگـــــەڵ هاوڕێیـــــانی قوتابخانەی"کەپ"شەوێکی خۆشیان لەگەڵ سەماکەرانی لێهاتوو بەجل و پۆشاکی تایبەتیان و خزمەتکارەکانیش بەجۆرەها خۆراك کە وەك ئاهەنگێکی تایبەت وابوو تێپەڕاند. ستائو لەسەر سەکۆ بەمارەکانی دەستی بەنمایش کرد و کچە جوانەکانی بەڕادەیەك ترساند کە قیژەیان لێ بەرز بویەوە.

موسا پـێش ئـەوانی تـر هەسـتا و وتـی: دەبێـت یەکـەمین کـەس لـەکارگای بیناسازیەکاندا ئامادە بم بۆئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ ئەوانەدا پەیدا بکەم کە لەوێدا کار دەکەن، لەبەرئەوە پێویست بەوە دەکات ئەمشەو باش بخەوم.

ڕامسیس وتی: هەر ئەوەی هەلێکم بۆ ڕەخسا سەردانت دەکەم.

شـــازادەکانی میـــسر بەشـــێوەیەکی ئاســـایی مەشـــقی مەلـــەکردن بەبەشـــێکی جیانەکراوەی فێرکاریەکانیان لەقەڵەم دەدا. لەسـەرەتای دەسـتپێکردنی شارسـتانی میـسر هـەموو شـارەکان چ بـچوك و گـرنگ نـەبن یـان گـەورە و گـرنگ بـن لەکـەنار ڕوباری"نیل"دا دروست دەکـران، بۆئـەوەی ڕوبـاری نیـل تینویـان بشکێنێت و سـود لەتایبەتمەندیـەکانی وەرگـرن. شـازادەکان لەبـەر دوو هۆکـار خۆیـان فـێری هونـەری مەلەکردن دەکرد، یەکەم لەترسی لافاو و هەڵچونی ڕوباری نیـل و لـەکاتێکی دیـاری نەکراو و چاوەڕوان نـەکراودا نـوقم بـون، دووەم لەبەرئـەوەی لـەڕوباری نیلـدا خۆیـان بـشۆرن و لـەوەرزی هاوینـدا خۆیـانی تێـدا فێنـك بکەنـەوە. لـەڕۆژدا کـەم کەسـانێك دەیانوێرا پێ بنێنە ڕوباری نیلەوە، چونکە پەلاماری تیمساحەکان بۆ ئەوانەی مەلە دەکەن بەگەورەترین هەڕەشە لەقەڵەم دەدرا، بەڵام دوای خۆر ئاوا بون هەرئەوەی ئاو و هەوا تاریك بوو تیمساحەکان لەڕوبارەکە دێنە دەرەوە بۆئەوەی لەقەراخ ڕوباردا

بحەوێنــەوە، مەلەوانــەکان بەئاســودەیی خۆیــان هەڵدەدەنــە نــاو ڕوبــاری بــێ تیمساحەوە. لەشـەوەکاندا بەتایبـەت کاتێـك بڕیـار بـوو وەجـاخزادە و شـازادەکان لەناو ئاوی ڕوباری نیلدا مەلە بکەن، کەشتی فـەرمانڕەوایی بارەگای فـەرماڕوایانی کۆشکیان دەبـردە شـوێنێکی ئـەو ڕوبـارە کـە پانتاییـەکی زیـاتری لـەخۆ دەگـرت و لەوشـوێنەدا جلـەکانی بـەریان دادەکەنـد و خۆیـان هەڵدەدایـە نـاو ڕوبارەکـەوە. موسا[14]شـەوێکیان لەگـەڵ خوشـك و بـرا و وەجـاخزادە فیرعەونیـەکانی تـردا کاتێـك لەناو ڕوباری نیلدا خـەریکی مەلـە کـردن بـون بینـی کچێکـی جـوان کـە نـاوی"نیفرو ئیـزیس" بەئەنقەسـت خـۆی لـێ نزیـك دەکاتـەوە، موسـا دەیزانـی کـچان لەتەمـەنی چواردەسـاڵیدا دەگوازرێنـەوەی بـۆ مـاڵی هاوسـەرەکەیان، بگـرە هەنـدێك لەتەمـەن سیانزە ساڵەکانیش بەهۆی گەشەی خێرا و ئاو هـەواوە خوازبێنیـان هـەبوو، "نفیرو ئیـزیس"یـش هـەمان ئـەو تەمەنـەی هـەبوو کـە باسـمان کـرد بەچواردەوری موسـادا دەسـوڕایەوە و لەتەنیـشت کـچێکەوە دەسـتی کـرد بەقـسە کـردن و پەیوەسـت بـونی خۆیان بۆ یەکتری دەربڕی، "موسـا"ش سـەرەڕای ئـەوەی لەکۆشـکی فەرمانڕەواییـدا دەژیـا بەپێـچەوانەی زۆربـەی ئەوانـەی لەکۆشـکی فەرمانڕواییـدا نیـشتەجێبون زۆر شەرمن بوو و زۆر بەکەمی مامەڵەی لەگەڵ کچاندا دەکرد، بـەڵام ئـەو شـەوە ڕەفتـار و جوانی و بێشەرمی ئـەو کـچە بـووە هـۆی ئـەوەی موسـا بەسـەر شـەرمنی خۆیـدا زاڵ بێـت و لەکـەنار ڕوبـاردا ئەحواڵپرسـی لـێ بکـات. ئـەو دوانـە بۆماوەیـەك پەیوەنـدیان لەگەڵ یەکتردا هەبوو تـا گەشـتە ڕادەیـەك موسـا بڕیـاری دا بـە"نیفرو ئیـزیس"بڵێـت دەمــەوێت بیمــە خوازبێنیــت، بــەڵام زۆر بــەزویی بــۆی دەرکــەوت کــە"نیفــرو ئیـزیس"دەستگیرانی یـەکێك لەدەسـتەڵاتدارانی میـسرە و زۆر زوو موسـای بەتـەنها جێهێـشت، موسـا بـەم ڕوداوە خـەمگین بـوو و ئـەم دڵگرانیـەی گەشـتە ڕادەیـەك کـە بۆماوەیـەکی زۆر لەگۆشـەیەکی بـاخی کۆشـکی فـەرمانڕەوایی هـەمان ئـەو شـوێنەی

[14] موسا کە لەم بڕگەیەدا باسی دەکەم ئەوەمان لەبیر نەچێت تەواوی ئەم ڕوداوانە لەزمانی"موتیە"ئەو کچەی لەڕوباری نیلدا لەناو سەبەتەیەکدا بەهەمان شێوەی سینۆهە لەڕوباری نیل گرتویانەتەوە، دوای ئەوە دەگوازرێتەوە بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی دەگێڕدرێتەوە، ئەو کاتانەی واژەی"من"لەگێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتانەدا دەکەوێتە بەرچاوتان لەباتی"موتیە"بەکار هێنراوە، کە هەندێجار لەوانەیە بەهۆی گێڕانەوەی ڕەوتی ڕوداوەکان ناوی کەمێك کاڵ بوبێتەوە بۆیە لەباتی ناوەکەی"من"مان بەکارهێناوە.

قسەی لەگەڵ"نیفرو ئیزیس"دا کردبوو دادەنیشت و ئەو ڕۆژانەی دەهێنایەوە یاد خۆی. موسا بەڕادەیەك گۆشەگیر بوو کە"ئامون تپ"کاهینی مەزنیش ئاگاداری باری دەرونی فیرعەون بوو. لەوشەوەی کە لەسەر ترۆپکی منارەی چاودێری ئەستێرەکانی ئاسماندا دەربارەی هەندێك بابەتی جۆراوجۆر گفتوگۆیان لەگەڵ یەکدا کردبوو، کاهینی مەزنی فیرعەون بەواتا"ئامون تپ"بەشێوەیەکی تر تەماشای موسای دەکرد و ئەوی بەکەسێکی شایستە و بەتوانا و جێی متمانە بینی. سەرەڕای ئەوەی"ئامون تپ" ناوی"ئامون"بوو و بەپێی گوتەکانی خۆی دایك و باوکی ئەم ناوەیان لێنابوو، بەڵام ئەو"ئاتون"پەرستی دوو بریسکە بوو[15]. "ئامون تپ" باسی"ئاتون"ی بۆ موسا کردبوو کە میسر بەهۆی دەرکەوتنی ئەو و لەناوبردنی"ئامون"سوتێنرا، بەڵام لەدواییدا لەبەرئەوەی خەڵکی خۆشیان لەم خودا ساختەیەش نەهاتبوو لەناوبرا و بۆ جارێکی تر"ئامون تپ" لەبارەی ئەو خوداوە هزری موسا پڕ دەکات.

ئامون تپ بەمشێوەیە بۆی ڕوندەکاتەوە: ئەی موسا ئاگات لەخۆت بێت"ئاتون"خودایەکی نەبینراوە، هیچ کەسێك ناتوانێت چاوی پێی بکەوێت و گوێش ناتوانێت گوتەکانی ببیستێت. "ئاتون"هێمای هەیە و هێمای ئەو خودایەش خۆرە، هەر لەبەرئەوەش لەڕابردوودا خۆریان بە"ئاتون"بانگ دەکرد، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بیت کە خودا لەگەڵ"ئاتون"دا جیاوازە. بۆ چەندین هەزار ساڵ هەمان ئەم"ئاتون"ە بەکاریگەریەکەوە تەماشای میسری دەکرد و دڵگرانی خەڵکی میسر بوو کە بۆچی خەڵکی میسر دەبێت خودا بچوکەکان بپەرستن! هەروەها بۆچی"ئامون"ی خودای درۆینە بەوشێوەیە دەپەرستن و قوچەکیەکانیان بۆ ئەم جۆرە خودایانە دروست کرد؟! فیرعەونەکان لەباتی پەرستنی خودای نەبینراو بەواتا"ئاتون"دوای"ئامون"کەوتن!

---

[15]خوێنەرانی بەڕێز بەدڵنیاییەوە ئەوەیان لەبیرە کە هەم ئامون و هەم ئاتون بگرە سەدان خودای جیاواز، کاهینەکانی بۆچەند مەبەستێکی تایبەتی خۆیان دروستیان کردووە و مراندونیان. "ئاتون"یش "نفر تی تی" و "ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئامون" بۆ میسریەکان دروستیان کردووە.

دوای ئـەوە کـاهینی مـەزن بـەم شـێوەیە بـەردەوامی دا بەقـسەکانی: تـۆ کە"موسا"یت دەبێت ئەوەت لەبیر بێت"ئاتون"ی خودای نەبینراو کوڕێکی هەیە بەناوی"شـای" کـە بـەواتای چـارەنوس دێـت. کـوڕی"ئـاتون" جیـاوازە لەهـەموو کوڕەکـانی تـر، هـەر بەوشـێوەی خـودای"ئـاتون"نـەبینراوە کوڕەکـەی"شـای"-چارەنوس-یش بەهـەمان شێوەی ئەو نـەبینراوە. لەسـەردەمی "ئـامون هوتـپ"ی چـوارەمدا"ئـاتون"ئاگـاداری ئـەوە بـوو کـە"ئـامون هوتـپ"پادشـایەکە ئامادەکـاری ئـەوەی تێدایـە بـاوەڕی پـێ بهێنێـت و بیپەرسـتێت، لەبەرئـەوەش فـەرمانی بە"شـای"کوڕی دا ئاوێتـەی جەسـتەی فیرعـەونی میسر ببێت و"ئاتون"ی خـودای تاك و تەنها بەو بناسێنێت. فیرعەونی میسریش بەئاوێتە بونی ڕۆحی کوڕی خودا لەجەستەیدا توانی خۆی بناسێتەوە و ئایینی"ئاتون"پەرستی بڵاو بکاتـەوە، دوای ئـەوەی نـاوی خـۆی نـا"ئـاخن ئـاتون" بـەواتا-خۆشەویـستی ئـاتون- کـە بە"ئەخناتون"بانگ دەکرا. ئەو ڕوداوە خوێنینەی لەسەردەمی"ئەخناتون"دا ڕویـدا و دوای ئەوە بەهەرشێوەیەك بوو کۆچی دوایی کرد. کاهینـەکانی"ئامون"بەکۆچی دوایـی"ئـەخناتون"ئـەو هەلـەیان بـۆ ڕەخـسا چـونکە ئـەوانیان لەپەرسـتگاکان دەرکردبوو، دوبـارە گەڕانـەوە سـەر تـەختی دەسـتەڵاتیان و دوبـارە کیسەکانیان پڕ لەزێڕ و زیو کردەوە.

کاهینی مەزن باسی ئەوەی بۆ موسا کرد کە لایەنگرانی خودای"ئاتون"چینی کەسانی ئاسایی و هەژار نەبوون، هەروەها نـاتوانن ئـەوە بهێننە بەرچاو خۆیـان کـە خودایـەك بـونی هەیـە کـە جەسـتەی نـەبێت!دوای ئـەوە ئـامون پەرسـتەکان کەوتنـە گیـانی"ئـاتون"پەرسـتەکانەوە و جـەنگێکی نـاوخۆی بێوێنـە لەمیـسردا دەسـتی پێکـرد. تـەواوی کاهینـانی"ئـاتون"پەرسـت دەسـتیان گـرت بەسـەر سـەروەت و سامانی"ئاتون"پەرەستەکاندا، چیتر هیچ کەسێك نەیدەوێرا نـاوی"ئاتون"بهێنێتـە زمان.

موسا وتی: ئێستا تۆ مەبەستت لەگێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە چی بوو.

کاهینی مەزن وتی: دەمەوێت دوای کۆچی دوایی"ست هوس"ی فیرعـەون ئێستا لەسەردەمی فەرمانڕەوایی"ڕامسیس"ی کوڕی کە دەزانم دەبێتە جێ نشینی بـاوکی

و لەئێستاشدا بەناونیشانی جێگری سەرۆکی حکومەت دەستەڵاتێکی فراوانی هەیە، "ئاتون"ی خودای نەبینراو زیندوو بکەینەوە و هیواداریشم تۆ بەردەوامی پێبدەیت.

شەش مانگێك لەتەمەنی سیانزە ساڵی موسا تێدەپەڕێت و چیتر دەبێت لەشوێنەکەی خۆی بگوازێتەوە، چونکە لەو شوێنەی کە نیشتەجێ بوو شوێنی تایبەتی هەرزەکاران بوو و موسا لەم تەمەنی لاویەتیەیدا بەکەسێکی باڵغ لەقەڵەم دەدرا. لەهەمان ئەوکاتەدا خوێندنیشی تەواو کرد، چیتر ناچار نەبوو هەموو ڕۆژێك ژیانی لەلای مامۆستاکانیدا تێپەڕێنێت، چیتر دوای ئەوە مەشق و خوێندن بەئارەزوی خۆی بوو ئەنجامی بدات یان نە، ئەو لەبارەگای پیاوبوندا گەشتبووە قۆناخی باڵغ بون. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی باڵغ بون سنوردار نەکردنی کاتی دەرچون و گەڕانەوەی بوو بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی، بەواتا کۆشکی فیرعەون، هەروەها ڕێی پێدەدرا چەك هەڵگرێت، سود وەرگرتن لە خەنجەر، شمشێر، تیروکەوان، قەڵخان و نێزە بۆ موسا چیتر قەدەغە نەبوو. والاترین تایبەتمەندیش لەپەنجەکردنی ئەنگوستیلەی فەرمانڕەوایی بوو کە لەدەستی فیرعەون و جێنشینەکەیدا-ئیتر هەرکەسێك بێت-بەدی دەکرا. هەرکەسێك ئەنگوستیلەی فەرمانڕەوایی لەپەنجەدا بوایە هەڵگری هێزی فەرمانڕەوایی بوو: ئەو ئەنگوستیلەیە، ئەنگوستیلەیەك بوو کە وشەی"هو"ی لەسەر هەڵکۆڵرابوو.

موسا بەپێی غەریزەی گەنجیەتی بەسەرتاپا چەکەوە ڕۆشت بۆ لای دایکی "ئنخاس ئامون" لەشوێنە تایبەتەکەیدا کاتی خۆی بەسەر دەبرد و موسا بۆ ماڵئاوایی دەبێت بەسەرتاپا چەکەوە بەنێو کۆشکدا تێپەڕێت، ئەوانەی دەیانبینی وایان دەزانی موسا بۆ جەنگ دەڕوات! هەر ئەوکاتەی موسا خۆی کرد بەژورەکەی دایکیدا"ئنخاس ئامون"ی بەدەم گریانەوە بینی.

موسا لێی پرسی: دایکە بۆ دەگریت؟

ئنخاس ئامون وتی: ئەمە گریانی خۆشحاڵیە، دەبینم بویت بە لاوێکی شایستە، هەمیشە ئارەزوی ئەوەم دەکرد کوڕێکی وەك تۆم هەبێت، ئێستاش بەو ئاواتەی

خۆم گەشتوم، هەر لەبەرئەوەش خۆشحاڵم. تۆ ئێستا کوڕێکی تەواوی، بەڵام شتێکت کەمە.

موسا پرسی: دایە گیان لەدیدی تۆوە چ کەم و کورتیەکم هەیە.

دایکی وتی: کەموکورتیت ئەوەیە کە خاوەنی ئەنگوستیلەیەك نیت کە وشەی"هو"ی لەسەر هەڵکۆڵرابێت!

موسا وتی: تۆ خۆت باش دەزانی کە دوو کەس لەسەرتاپای میسردا دەتوانێت ئەو ئەنگوستیلەیە لەپەنجەیان بکەن کە ناوی"هو"ی لەسەر هەڵکۆڵرابێت، یەکێکیان فیرعەون و ئەویتریان جێ نشینەکەیەتی کە هەردوکیان تەندروست و لەسەر تەختی فەرمانڕەواییدا دانیشتووە و ئەنگوستیلەیەك کە ناوی"هو"ی لەسەر هەڵکۆڕاوە لەپەنجە کردوە.

ئنخاس ئامون وتی: جێ نشینەکەی تری فیرعەون کێیە؟

موسا وتی: فیرعەون نزیکەی چەند سەد کوڕێکی هەیە.

ئنخاس ئامون وتی: بەڵام تۆ لەسەروی هەموو کوڕەکانی تری فیرعەونی، تۆ شایستەی ئەوەی ئەو ئەنگوستیلەیە لەپەنجەت بکەیت!

موسا وتی: بەڵام..... دوای ئەوە گوتەکەی تەواو نەکرد.

ئنخاس ئامون وتی: بەڵام چی، بۆچی گوتەکەت تەواو نەکرد؟

موسا وتی: بەڵام تائێستا دیار نیە ئایا من کوڕی فیرعەونم یان نە، چونکە گومانم لەوە هەیە کە کوڕی فیرعەون بم.

ئنخاس ئامون وتی: بۆچی دڵنیا نیت، ئایا هیچ کەسێك باسی ئەم بابەتەی بۆ کردویت.....

موسا وەڵامی نەخێری دایەوە، لەدواییدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: بەڵام خەڵکی لەنێو خۆیاندا وەك دەنگۆیەك بۆ یەکتری باس دەکەن، بەهەرحاڵ ئەمانیش لەکەسانی تریان بیستووە.

ئنخاس ئامون لەسەر تەختە خەوەکەی ڕاکشا و وتی: ئەوەی من ئاگام لێی بێت تۆ کوڕێکی ژیر و ڕاستبینی و لەبەردەم بارەگای پیاو بونتدا ڕاوەستاویت، لەوە

زیاتر نامەوێت لەحاڵی گومان و دودڵیدا بتهێڵمەوە، ڕاستە ئەوەی بیستوتە ڕاستە، فیرعەون باوکی تۆ نیە.

موسا وتی: ئەگەر فیرعەون باوکم نەبێت، کێ باوکمە؟

ئنخاس ئامون وتی: لەئێستادا ناتوانم ئەم نهێنیەت بۆ ئاشکرا بکەم، بەڵام لەکاتی خۆیدا خۆم پێت دەڵێم کە باوکت کێیە.

موسا وتی: بەڵێنم پێ دەدەیت ئەم نهێنیەم پێ بڵێیت؟

ئنخاس ئامون وتی: بەڵێن بەکوڕەکەم دەدەم لەکاتی خۆیدا ئەم نهێنیەی بۆ ئاشکرا بکەم... لەمکاتەدا موسا ئەژنۆی چەماوەی لەئامێزگرت و ڕۆچووە هزری خۆیەوە.

ئنخاس ئامون لێی پرسی: بۆچی خەمگین و ڕۆچویتەتە هزری خۆتەوە؟

موسا وتی: بەهەرحاڵ ئێستا من کوڕی فیرعەون نیم، مانەوەشم لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا هیچ واتایەکی نیە، بۆیە باشتر وایە کۆشک بەجێ بهێڵم و بڕۆم بۆ شوێنێکی تر، لەبەرئەوەی شازادە و فیرعەون زادە نیم تا وەك ئەوانی تر لەکۆشکدا بژیم.

ئنخاس ئامون وتی: ئەوە ڕاستە کە پێم وتی تۆ کوڕی فیرعەون نیت، بەڵام خۆ کوڕی منیت و منیش خودایەکم، هەرلەبەرئەوە تۆش بەشازادە لەقەڵەم دەدرێیت، ئیتر چ بتەوێت یان نەتەوێت لەئێستادا بەیەکێك لەدۆڵەمەندەکانی میسر لەقەڵەم دەدرێیت، لەبەرئەوەی هەموو سەروەت و سامان و داراییەکم هی تۆیە، ئەگەر بزانی چەنێك کێڵگە و چەند سەر گا و چەنێك زێڕ و زیوم هەیە، چەند کەشتیم هەیە، ئەوکات دەزانی کە خاوەنی چ سەروەت و سامانێکیت. ئنخاس ئامون سەری موسای نەوازش کرد لەبەرئەوەی لەوکاتەدا موسا دەگریا!

ئنخاس ئامون وتی: بۆچی دەگریت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی دەبینم دایکم دڵگرانە.

ئنخاس ئامون وتی: دڵگران نیم، بەڵکو ماندوم و پێویست بە کەمێك حەوانەوە و بیرکردنەوەیە، تۆش ئازادی بڕۆ بۆ هەرشوێنێك کە خۆت حەزی پێ دەکەیت، ئایا تا ئێستا خەڵکی کوچە و بازاڕەکانت بینیوە.

موسا وتی: لەبەرئەوەی نەیانهێڵاوە گفتوگۆ و مامەڵە لەگەڵ خەڵكانی ئاساییدا بكەم زۆر حەز دەكەم بڕۆمە ناو خەڵكی و بەوردی گوێ لەگفتوگۆكانیان بگرم...

دوای ئەوە كاتێك بینی دایكی ڕاكشاوە بۆئەوەی كەمێك بحەوێتەوە، بەتەنهایی لەكۆشك ڕۆشتە دەرەوە و بەمەبەستی پیاسەكرد ڕێگای شاری گرتە بەر.

لەكەنار ڕوباری نیلدا لەنگەرگایەكیان دروست كردبوو ئەم لەنگەرگایە كاری هاتوچۆی كەشتیەكانی ئاسانتر دەكرد، لەكەنار ئەم لەنگەرگایەشدا بازاڕێكی مەزن و قەرەباڵغ كە جۆرەها شتومەكی تێدا بەدی دەكرا هەبوو. لە لەنگەرگادا نەتەوە و هێماگەلێكی بەرجەستە دەبینرا و بەهاوسەنگی ئەم كەرەستە جۆراوجۆرانەش بەلێشاو بۆ كڕین و فرۆشتن ئاڵوگۆڕیان پێدەكرا: لەخواردن و میوەكانی ولاتەوە بگرە تا پارچەی كەتان، كاسەی زیوی، سدر، بیبەر، دارچین، و دەرمانگەلێكی تری جۆراوجۆر، خواردەمەنی، میوەی ڕەنگاوڕەنگ، ماسی دوكەڵی١٦، خواردنی وشكە، خورمای وشك، بگرە گیانەوەرگەلێكی وەك شێر و پڵنگ و یوزپڵنگیش لەو بازاڕەدا ئاڵوگۆڕی پێدەكرا. موسا بۆ تەماشا كردن هاتبوو بۆ ئەو بازاڕە و مەبەستی كڕینی هیچ كالایەكی نەبوو، لەبەرئەوەش لەبازاڕی كۆیلە فرۆشی دەرچوو بۆئەوەی سەردانی شوێنەكانی تر بكات.

زۆرێك لەو شتانە بەلای موساوە سەرنج ڕاكێش بوو، لەو ڕۆژەدا موسا بۆ یەكەمین جار وێنەیەكی ڕونی خەڵكی میسری لەهزری خۆیدا كێشا. خەڵكی نەخۆش و پەك كەوتە، شڕپۆش و سەرگەردان، بەتایبەت منداڵەكان. موسا بەدەم پیاسەوە سەردانی بازاڕی میوە فرۆشەكانی كرد و چاوی بەدوو جۆر میوە كەوت كە دایكی زۆر حەزی لێی بوو، بەلام لەبەرئەوەی قورس بوو و نەیدەتوانی بەتەنهایی هەڵیگرێت باربەرێكی بۆ هەڵگرتن بەكرێ گرت. باربەرەكان شتومەكەكانی موسایان تا بەردەم دەرگا بۆ هەڵگرت و بۆیان بردە ژوریشەوە. ئنخاس ئامون لەوەرگرتنی میوە و ئەو گولانەی بەدیاری پێی دابوو لەخۆشیاندا سەرتاپا موسای كوڕی نەدەناسیەوە. ئنخاس ئامون كەمخۆر بوو، بەلام ئەو ڕۆژە بۆ

---

[16] جۆرێك ماسیە كە بەبنمیچی ژورێكدا هەڵیدەواسن و ئاگری تێدا دەكەنەوە و تەنها بەهەڵم و دوكەڵی ئەو ئاگرە ماسیەكە دەبرژێت... وەرگێڕ.

خۆشحاڵکردنی کوڕەکەی فەرمانی دا یەکێك لە خربزەکانیان بۆ لەت بکەن، دوای ئەوە بەئارامی بۆ هاندان و پێزانینی موسا لەو خربزەیەی چەشت و بۆی دەرکەوت زۆر شیرینە و زۆریش ئەو خربزەیەی لا پەسەند بوو.

***

ڕامسیس بە بینینی موسای برای لەکارگای بیناسازیەکی مەزندا کە بۆ چاودێری کردنی کاروباری ئەو کارگایە دامەزرابوو، هاوارێکی کرد موسا! موسا! و موساش دەستی لەچاودێری کردنی گروپی بەردتاشەکان هەڵگرت و ڕۆشت بۆئەوەی پێشوازی لە ڕامسیس بکات و پێی وت: سڵاو لە"ڕامسیس"ی خۆشەویست...

ئەویش لەوڵامدا وتی: سڵاو لەموسا.

ڕامسیس وتی: دەبینم بەسەختی سەرگەرمی کارەکەی خۆتی و زۆریش بەسەریدا زاڵی ، پیرۆز باییت لێ دەکەم.

"موسا"ش وتی: منیش پیرۆزبایت لێ دەکەم.

ڕامسیس خۆی بەبێئاگا نیشان دا و وتی: پیرۆزبایی چیم لێ دەکەیت.

لەوکاتەدا موسا"ڕامسیس"ی لەئامێز گرت و وتی: ئێستا پێت دەڵێم، دوای ئەوە وەك بەڕێوبەرێك ڕۆشتە دواوە و سەری ڕێزی بۆ دانەواند و وتی: سڵاو لەجێگیری فەرمانڕەوای حکومەت!

ڕامسیس قاقا پێکەنی و لێی پرسی: سەرقاڵی چ کارێکیت؟

موسا وتی: دروست کردنی خشت و تاشینی بەرد، ئەو کارانەی لەکەنارەکانی خۆرئاوادا فێری بوم. ئێمە دەبێت تەلارێکی ستوندار و فراوان کە هەموو سەر ستونێك لەشێوەی گوڵی "پاپیرۆس"دروست بکەین. بۆئەم کارەش پێویستم بەچەند بەرد تاشێکی لێهاتوو و شارەزایە بۆئەوەی دەستکەوتەکانی میسر بەسەر بەردەکانەوە هەڵکۆڵن.

ڕامسیس وتی: وابزانم بەم کارەوە زۆر پەیوەست بوبێتی.

موسا وتی: دروست کردنی پەرستگایەك وەك دروست کردنی کاسەیەکی زێڕین وایە، دەتوانی تەواوی شتە سەیرەکانی تێدا بکێشیت، بەڕاستی ئاشقی هونەری تەلارسازیم، چونکە خۆم لە بواری تەلار سازیدا دۆزیوەتەوە... دوای ئەوە وتی:

وەرە بــا ئاشــنای بــەش بەشــی ئــەم کارانــەت بکــەم، بەڕێگایــەکی بنمیــچدار و سەرداپۆشـراودا تێپـەڕی کـە"ئـامن هوتـپ"ی سـێیەم هاوکـات لەگـەڵ سـتونگەلێك بەبەرزایی بیست مەتر بنیاتی نابوو کە هێشتا بۆ مەزن ڕاگرتنـی ئـەو کۆشـکە بـەس نەبوو، چونکە لەچڕە ستونێك کە مەودایەکی کەم لەنێوانیاندا هەبوو و لەڕێی چەند پەنجەرەیەکەوە ڕوناکی بۆ دەڕۆشت پێك دەهات. بەبۆنـەی بەرپاکردنی مـەراسمی خوداکان پەیکەری ئـەوان و خـودی فیرعـەون بەسـەر ستونەکانەوە هەڵدەکۆڵین. ئـەم بەردانە ڕوناکی سەرتایی کە میسر لەڕێی ئەوەوە خۆراکی خۆی پەیدا دەکات لـەناو خۆیــدا دەپارێزێــت. موســا ئــەو بابەتانــەی بــۆ بــاس کــرد کــە بــەخۆڕاگری کەرەستەکانەوە پەیوەست دەکرا و وتـی: بڕیـارە بەفـەرمانی فیرعـەون لـەژێر دەسـتی وستاکاری"بارەگای ڕاستی" لە گوندی"ویرالمدینـە"و کەنارەکانی خۆرئاوای نیل، فێری نهێنـی پیشـەیەك ببم و ئەنجامیشی بدەم... لەم کاتەدا چیتر کاتی نانی ئێوارە بوو، کرێکارەکان کەرەستەی کارەکانیان کۆکردەوە و خۆیان ئامادەی ڕۆشتن کرد، دوای ماوەیەکی کەم شوێنی کار بەتەواوی چۆڵ و هۆڵ بوو.

ڕامسیس وتی: دەڕۆم بۆئەوەی خۆم بۆ سەردانی"چاوی شار"ئامادە بکەم.

موسا وتی: لەگەڵ کێدا دەڕۆیت؟

ڕامسیس وتی: لەگەڵ فیرعەوندا.

# فیرعەون لایەنگری"ڕامسیس"ی کرد

لەناو جەرگەی شاری پیرۆزی"چاوی شار"دا پەرستگای مەزنی"رع"ڕوناکی یەزدانی، خودای ڕۆح بەخش خۆنوێنی دەکرد. خەریك بوو وەرزی زستان دەهات بۆیە لەکاتەکانی شەودا هەوایەکی ساردی هەبوو و کاهینەکانیش خۆیان بۆ ئاهەنگی"ئزیریس"ی هێمای نهێنی"رع"بون.

فیرعەون بە"ڕامسیس"ی وت: تۆ"تبس"دەناسی و ئێستاش دەبێت ئاشنای"چاوی شار"بیت. بیروهزری باوباپیرانمان لە"چاوی خۆر"داڕێژراوە. بەرزڕاگرتنی"چاوی خۆر"، ئەم ڕێبوارە هەمواره لەهزرتدا تۆمار بکە، چونکە بنیاتنەری زنجیرە یەك لەدوای یەکەکانی دەستەڵاتی بەشێوەیەکی یەکسان لەنێو کاهینە مەزنەکانی"چاوی خۆر"دا دابەش کردووە، لەبەرئەوە من ڕێزی لەم بیروهزرە دەگرم، تۆش دەبێت ڕێزی لێ بگریت، لەئایندەدا نابێت فەرمانی هیچ کاهینێك جێبەجێ بکەیت، بەڵکو دەبێت وەك پەیوەندی ئەڵقەی زنجیرێك ڕەفتار بکەیت کە هەم ئەوان بەیەکگرتویی بهێڵیتەوە لەهەمان کاتیشدا بەبەردەوامی بەیەکیان ببەستیتەوە.

"ڕامسیس"یش بەباوکی وت: بەڵام شاری"ست"[17]بەلای منەوە گرنگترە.

فیرعەون بە"ڕامسیس"ی وت: چیتر هەڵبژاردنی تۆم بۆ جێنشینی جێگیرکرد، بگەڕێرەوە بۆ هەمان شار"شاری ست" و پەیوەندی بەو دەستەڵاتە نهێنی ئامێزەوە بکە، هەڵبەت لەوکاتەی کە تۆ دەڕۆیت منیش دەگەڕێمەوە بۆ نیشتمانی خۆرئاوا و بەمۆمیا کراوی زیندو دەمێنمەوە!

---

[17]شاری ست: شاری خوێنڕێژی، شاری ئەهریمەن و شەڕەنگێزی و زۆرداریە.

ڕامـسیس وتـی: باوکـە گیـان تـۆ هـەرگیز نامریـت!..... فیرعـەون لەمکاتـەدا پێنەکـەنی بـەڵام ڕوخـساری شـێوە گاڵتەجاڕیـەکی لـەخۆگرت. فیرعـەون ڕێنمایی"ڕامسیس"ی کرد و بردیە ناو پەرستگای"رع"، ناو ئەو پەرستگایە زۆر فـراوان و سـتونگەلێکی شـێوە قوچـەکی هـەبوو، نـوکی هەریـەك لـەو قوچـەکیانە ڕوپۆشـی زێـڕ کرابـوو و سـەری لـە ئاسمـان دەخـشاند بۆئـەوەی کاریگەریـە زیانبەخشەکان کم بکاتـەوە. هێمـای ئـەم بـەردە سـەرەتاییە لـە"شـنار"دەچـوو کـە بونایـەتی خـۆی- لـە سـەرەتای ئۆقیانۆسـی بەرەبـەیانی دروسـت بونـەوە هەڵـدێت و دواجـار بـەرەو وشـکانی دەڕوات-دەنوانـد. فیرعـەون"ڕامـسیس"ی بەخـەم و پەژارەیەکـەوە بـردە ژێـر درەخـتی"ئـەقاقیا"سـورەکانەوە کـە دوو کـاهین لەشێوەی"ئیزیس و نفتیس"سەرقاڵی ستایش کـردن بون. فیرعەون-سـت هـوس- بـەم شـێوەیە بـۆ"ڕامـسیس"بـاس دەکـات: خـودای نـەبینراو فیرعـەونی لەم"درەخت"ەوە هێنایە دنیاوە، دوای ئەوە بەشیری ئەستێرەکان بەخێوی دەکات و ناوێکی تایبەتی لێ دەنێت..... ڕامسیس سات لەدوای سـات سەرسوڕماویەکانی زیـاتر دەبـوو تـا ئەوکاتـەی گەشـتە ژوری نزاکـردن: بڕێـك زێـڕ و زیـوی زۆر لەدار"مرمرین"بەپانی نزیکەی دوو متر و بەرزایی کەمێك لەدوو متر زیاتر لەژوری نزاکردنـدا بـەدی دەکـرا، بەسـەر تـرازی شـەهێنێکەوە مـەیمونێك لـەئاڵتون دانرابـوو. وەرزای داگیرکـەر-فیرعـەون- وتـی: ئـەم مەیمونـە هێمـای خـودای"تحـوت"ە، خودای"تحوت" مامۆستای"هێرۆگلیف و پێوەرەکانە".

ڕامسیس پرسی: ئایا ئەم ترازووە بەکار دەهێنرێت.

وەرزای داگیرکەر وتی: بۆ تۆ کە ئومێدی ئایندەی فیرعەونی میسرت لێدەکرێت زانین و ئاگـایی بەکارهێنانی تـرازوی"چاوی خـۆر" زۆر پێویستە. تـرازوی"چاوی خـۆر"پێوانەکردن و کێشانی ڕۆح و دڵ لەئەستۆ دەگرێت، ئـەم تـرازووە دەتوانێت کێشانەی هەموو شتێك بکات! دوای ئـەوە دەستەکانی ئارستەی ئـەو ترازووە کـرد و وتـی: ئومێـدی ئـەوە دەکرێـت"مـات" کـەهێمای"سـت"ە، بـەردەوامی ئیلهامبەخشی ڕەفتار و کردارەکانت بێت.

سەر لەئێوارەی ئەو ڕۆژە ڕامسیس بەباوکی وت: ئێستا کە منت ئاشنای"چاوی خۆر"کرد، ڕێم پێبدە بڕۆم بۆ کارگایەك کە شارەزام لەکوێیە، بۆئەوەی بەردی بنیات نانی پەرستگای داهاتویان پێ ڕاسپێرم.

# جێگری سەرۆك دڕکێکه لەچاوی"شنار"ی برایدا

ڕۆژی لەدایك بونی کچی فیرعەون"دولانت"بیانویەك بوو بۆئەوەی میوانداری کاربەدەستە مەزنەکانی دەوڵەت بانگێشتی ئەو یادە بکەن و کۆیان بکەنەوە، ئەمانە لەم دانیشتنەدا ئاشنایەتیان لەگەڵ چەند ڕوخسارێکدا پەیدا کرد، سەرەڕای ئەوەی پێشتر بینیبویان، بەڵام لەم مەراسیمی ڕۆژی لەدایك بونەدا ڕوبەڕوی ئاڵوگۆڕێکی سیاسی و ژیانی بونەوە، ڕامسیس لەپلەی جێگری سەرۆك و"شنار"یش پلەی سەرۆکی مەزنراگرتنی پێ بەخشرا، "ڕامسیس"ئەم بەرپرسیاریەتیەی بە"شنار"بەخشی بۆئەوەی یەکەمین کوتەکی فەرمانڕەوایی خۆی پیشان بدات، ڕامسیس دەیزانی فیرعەونی باوکیان بێگومان لەم مەراسیمەدا بەهۆیساڵڕۆژی لەدایك بونی کچەکەی بەشداری دەکات، لەبەرئەوە ئەم کارەی بە"شنار"سپارد، چونکە نەیدەتوانی چاوپۆشی لێ بکات، فیرعەون بەگوتەکانی"ڕامسیس"ی لەبەردەم هەمواندا وەك جێگری سەرۆك پێی ناساندن و وتی: دەبێت بەناچاری گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، بگرە ئەم فەرمانە خودی"شنار"ی برایشی دەگرێتەوە. هاوسەری"دولانت"بەورگێکی زلەوە بەدەم پێکەنینەوە لە ڕامسیس نزیك بویەوە و بەدەم خێرهاتن و کەمێك دەم لوسیەوە وتی: ئامادە بونی جێگری سەرۆك خۆشحاڵمان دەکات، منیش دەبێت هەم خۆشحاڵ و هەم خەمگین بم!

"موسا"ش لێی پرسی: تۆ هۆکاری خۆشحاڵبونی خۆتت دەربڕی بەڵام بۆچی خەمگینی؟

ڕاهێنەری قوتابخانەی"کەپ"و زاوای فیرعەون ڕاهێنەری تایبەتی ڕامسیس وتی: چیتر لەمڕۆ بەدواوە مامۆستای جێگری سەرۆکی حکومەت ئەمڕۆ و خوێندکاری خۆشەویستی دوێنێم نیم.

ڕامسیس وتی: تۆ لەقوتابخانەی"کەپ"دا دەیان خوێندکارت هەیە.

ساری وتی: بەڵێ وایە، بەڵام ڕامسیس بۆ من وەك گوڵێکی بۆنخۆش و بێوێنە وابوو.

ڕامسیس وتی: پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایك بونی هاوسەرەکەت لێ دەکەم، بەبۆنەی ئەم ساڵڕۆژەوە دەمەوێت دیاریەکت پێشکەش بکەم، ئایا کارێکی نوێت لەبەرچاو نەگرتووە بۆئەوەی پێتی ببەخشم؟

ساری وتی: دەبێت ئەوەت پێڕاگەیەنم کە بەرپرسیاریەتی بەڕێوبردنی خەزێنەکانم لەبەرچاو گرتووە، ئەم کارەش ئەو هەلەم پێدەبەخشێت لەدولانتی هاوسەرم زیاتر نزیك ببمەوە، دەزانیت کە"دولانت" پەیوەندیەکی تایبەتی بە"ڕامسیس"ەوە هەیە. لەمکاتەدا"دولانت"ی خوشکی ڕامسیس بەهێمایەکی دەستی ساری خۆی گەیاندە لای هاوسەر و براکەی. دولانت بەڕادەیەك ئاڕایشت و خشڵ و زێڕی لەبەرکردبوو کە دە ساڵ لەتەمەنی خۆی گەورەتر دەهاتە بەرچاو. لەمکاتەدا ساری هاوسەری ئەو دوانەی بەتەنهایی بەجێ هێڵا.

"دولانت"یش براکەی ماچ کرد و لێی پرسی: ئایا هاوسەرەکەم قسەی لەگەڵدا کردیت؟

ڕامسیس وتی: بەڵێ.

دولانت وتی: بویتە مایەی خۆشحاڵی من چونکە توانیت"شنار" لەگۆڕەپانی ڕکابەری بکەیتە دەرەوە. هەرچەند"شنار"یش برامە بەڵام دەبوو لەباتی"شنار" ناوی"شڕەت"یان لێ بنایە.

ڕامسیس وتی: شنار چ زیانێکی بەتۆ گەیاندووە؟

دولانت وتی: نامەوێت لەم کاتە خۆشەدا جێگری سەرۆکی حکومەت دڵتەنگ بکەم، ئەوە بەلای منەوە گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە تۆ پەی بەهاوڕێکانت ببەیت.

ڕامسیس وتی: تۆ و هاوسەرەکەت لەبارەی دەستەڵاتەکانی منەوە بەهەڵەدا چوون.

دولانت پرسی: چ هەڵەیەك؟

ڕامسیس وتی: من دەست تێوەردان لە لابردن و دامەزراندنی هیچ کەسێکەوە نادەم، هەموو هەوڵێکم بۆ بەڕێوبردنی وڵات تەرخان دەکەم، هەروەك چۆن فیرعەونێك وڵات بەڕێوە دەبات، هەوڵ دەدەم ئەم جۆرە بەرنامانە لەژیانمدا جێبەجێ بکەم.

دولانت وتی: ئەمانەی باست کرد بیرگەلێکی ڕاستەقینە نین، بەڵکو خەیاڵ پڵاویە. تۆ توانای ئەنجامدانی هەموو کارێکت هەیە، تۆ دەبێت سەربەخۆیی کار لەخۆتدا نیشان بگەین، جێگری سەرۆك واتای هەنگاوێك دور لە فیرعەونەوە دەگەیەنێت، من و هاوسەرەکەم"ساری"دەمانەوێت لەڕیزی کەسانی نزیك و نهێنی پارێزی فیرعەونی ئایندە و"ڕامسیس"ی برامدا بین. ئێمە دەمانەوێت لەزۆر بابەتدا وەك چاو و گوێت ئەوەی لەچواردەورتدا ڕوودەدات پێت ڕاگەیەنین، بەڕاستی ئێمە توانای ئەنجامدانی ئەم کارەمان هەیە.

ڕامسیس وتی: خۆشکی بەڕێزم، بەداخەوە تۆ بابەتەکان لەدیدگای خۆتەوە هەڵدەسەنگێنی، میسر بەم جۆرە ساختەکاری و فریوکاریە بەڕێوە نابرێت، بەڵکو دەبێت بەکردار ئاشنای ڕەگ و ڕیشەی گرفتەکان بم و لەکەنار فیرعەوندا ئاشنای ئالۆزی و پێچ و ڕەتی کاروبارەکان بم، من لەئێستادا لەحاڵی فێربوندام، بارەگای فەرمانڕەوایی بۆ من وەك قوتابخانەی"کەپ"دێتە بەرچاوم، لەقوتابخانەی"کەپ"دا وانەی تیوریمان دەخوێند، بەڵام لێرەدا وانەکان کردارین.

دولانت وتی: بەهیچ شێوەیەك گوتەکانتم بەدڵ نیە، تۆ دەبێت بزانیت فیرعەون بون پێویستی بە پلەوپایە خوازیە، ئەگەر بتەوێت پەیڕەوی ژیانی ڕاستەقینە بیت لەناو دەچیت.

لەگۆشەیەکی ئەو تەلارەدا"شنار"بیر و هەستی لای ڕامسیس بوو. پیاوەکانی زانیاری وردی ئەملا و لای ئەو تەلارەیان بۆ دەهێنا و شنار لەوە دڵنیا بوو کە دوای کۆچی دوایی کردنی فیرعەون"ڕامسیس"دەبێتە جێنشینی. گوزارشی"چاوی

خۆر"ئەوەی خستە ڕوو کە فیرعەون دوایین قۆناخی گواستنەوەی دەسەلات بەڕامسیس دەسپێرێت. بەپێی یەکێك لەو گوزارشتانەی کەبە"شنار"یان گەیاندبوو، ڕامسیس لەسەر بنەمای ئەو گوتانەی کە لەلایەن یەکێك لەکاهینەکانی پەرستگا"چاوی خۆر" باسی کردبوو، ڕووبەڕووی ترازوی"چاوی خۆر" بووەتەوە. چیتر هیچ ماوەیەك بۆ"شنار"نەمابویەوە، دەبێت هێرشی بۆ بکات، هێرش بردن لەدەرونەوە بۆ ئەو بەس نەبوو، ئەو بیرۆکانەی بەهزری"شنار"دا هات بۆ"عاشە"ی دۆستی-دۆستی ڕامسیس و سیخوڕی شنار-گێڕایەوە، "عاشە"ش لەرز گرتی و وتی: ئەم تۆڵە سەندنەوەیە زۆر ترسناکە.

شنار وتی: هەرچی بێت نیازی پاشەکشەکردنم نیە.

***

بەسەر ڕووباری نیلەوە چارۆکە سپیەکان بەسەر کەشتیەکانەوە دەشەکانەوە و بەبچوکترین شنەی با شەپۆلانیان دەدا. شنار لەژوری بچوکی کەشتیدا دور لەڕوناکی خۆر بۆئەوەی خۆی لەسوتانی پێستی بپارێزێت خزابووە کونجێکی ئەو ژورەوە. "عاشە"لەبەرامبەریدا بوو و ئاوی"خرنوب"ی دەخواردەوە: هیوادارم لەکاتی هاتنم بۆ ناو ئەم کەشتیە هیچ کەسێك چاو بەمن نەکەوتبێت... بەپێی پێویست ئامادەکاری خۆپارێزی کراوە!

شنار وتی: دەزانم کە تۆ کەسێکی زۆر خۆپارێز و سیاسیت.

"عاشە"پرسی: گوتە و پرسیارەکانت زیاتر گونجکاو و گومانـاویم دەکات، چونکە بۆچی دەبێت ئەوەندە خۆپارێز و لەخۆمان دودڵ بین؟

شنار وتی: هەموو کەسێك دەزانێت "عاشە"یەکێکە لەهاوڕێ زۆر نزیکەکانی سەردەمی قوتابخانەی"کەپ"ی ڕامسیس. وانیە؟

عاشە وتی: وایە، ئێمە پێکەوە لەیەك پۆل و لەیەك شوێندا دادەنیشتین.

شنار پرسی: ئایا لەوکاتەوە ڕامسیس بۆ جێگری سەرۆك دەستنیشان کراوە پەیوەندیت پێوە کردووە؟

عـاش وتـی: مـن داوای نوێنەرایـەتی یـەكێك لـە وڵاتـانی ئاسـیام كـردووە و"ڕامـسیس"یـش یەكـسەر ئـەو داوایـەی پەسـەند كـردم، بڕیـارە بـڕۆم بـۆ یـەكێك لەباڵوێزخانەكانی وڵاتی ئاسیا، بەڕاستی دەبمە باڵوێزی میسر.

شـنار وتـی: بـاوەڕ بـەوە دەكـەیت كـە هـەوڵێكی زۆرم داوە بۆئـەوەی كەسـێكی ناوبانگت لێ دەر بكەم، سەرەڕای ئەوەی توڕەم، بەڵام ئەم پشتگوێ خستنەم نابێتە ڕێگر لەبەرامبەر ئەوشتەی بۆ ئێوە لەبەرچاوم گرتووە.

عاشە وتی: زمانی توڕەیی شایستەی تۆ نیە. تۆ بەهیچ شێوەیەك توڕە نابیت. بەڵام من كەمێك زیادەڕۆیی تێدادەكەم.

شـنار وتـی: ڕامـسیس زۆر ڕقـی لێمـە، ئـەو بـیر لەمیـسر و خۆشـبەختی میـسر ناكاتـەوە، چـونكە پێـشبینی هەڵوەشـان و ڕوخـانی میـسر دەكـەم، ئەگـەر كەسـێك لەبـەردەم"ڕامسیس"دا نەبێتـە ڕێگـر، میسر ئاڕاسـتەی لەناوچـون دەبـات. مـن وەك خۆم ئەو مافە بەخۆم دەدەم كە ڕێ لەم وێران بونە بگرم. داوا لە هەموو كەسێكی بە توانا و دڵسۆز و ژیر و لوجیك دەكەم... شنار تەماشایەكی ڕوخساری"عاشە"ی كرد بۆئەوەی بزانێت قسەكانی تا چەنێك كاری تێكردووە.

بەڵام عاشە وتی: مـن وەك خـۆم بەهۆی ئەوەی چەندین ساڵ لەگەڵ ڕامسیس دا بووم، زۆر ئاشنای لایەنی ڕۆحـی و ڕەفتـاری ئـەوم، ڕامـسیس لێهاتوویـەكی تـەواوی هەیە لـەوەی خـۆی وەك كەسایەتیەكی مـەزن پیشانی دوروبـەری بدات. هـەمان ئـەم تایبەتمەنیـەش بـووە هـۆی ئـەوەی فیرعـەون ئـەو وەك جێگـری سـەرۆك هەڵبـژێرێت، لەكاتێكـدا شایـستەی ئـەم پلەوپایـە نیـە. ڕامـسیس ئـەوەی بـیری لێدەكاتـەوە حوكمڕانیـــە، ئـــەو بەشـــێوەیەكی تەماعكارانـــە هـــانی فیرعـــەونی دا ســـەردانی پەرستگای"چاوی خۆر"بكەن بۆئەوەی كاهینی ئەو پەرستگایە لایەنگری بكەن.

عاشـە شـڵەژا و وتـی: بەبۆچـونی مـن فیرعـەون پێـشنیاری ئـەوەی لێكردبێـت سەردانی ئەو پەرستگایە بكەن.

شـنار وتـی: خـۆت وتـت، ڕامـسیس دەتوانێـت وا لەفیرعـەون بكـات دەسـت لەفـەمانڕەوایی هـەڵگرێت و بەهـەردوو دەسـتی تـاج و تـەختی خـۆی بـە ڕامـسیس ببەخشێت.

عاشە وتی: کەواتە جەنابت دەڵێیت فیرعەون بەدەستی ڕامسیس مومیا کراوە؟

شنار وتی: فیرعەونی مومیاکراو دەتوانێت ڕامسیس بەو حاڵەوە بەجێگری خۆی هەڵبژێرێت، باش گوێم لێ بگرە وڵات یاسا و نەریت و پێشەکی خۆی هەیە، من بەناونیشانی کوڕە گەورەی فیرعەون بەپێی نەریت و یاسا مافی ئەوەم هەیە ببمە جێگری باوکم.

عاشە وتی: بەپێچەوانەی ئەوەی بیری لێدەکەیتەوە، تۆ دەتەوێت چاوپۆشی لەزۆربەی نەریتەکانی میسر بکەیت!

شنار وتی: تەنها ئەوە بەسە کە چاوپۆشی لەنەریتە کۆنەکان بکەیت. مەگەر"هورم هب"ی مەزن کۆمەڵێك یاسای نوێی دانەڕێژاوە؟ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جیهان پێویستی بەیاسای نوێی تایبەت بەو سەردەمە هەیە.

عاشە لێی پرسی: ئایا تۆ دەتەوێت دەروازەی میسر بەڕوی جیهاندا بکەیتەوە؟

شنار وتی: بەڵێ، چونکە لەوباوەڕەدام ئەوە بازرگانیە ناوبانگیت پێ دەبەخشێت نەك جەنگ و خوێنڕشتن کە بکوژی بازرگانی و ناوبانگیە.

عاشە وتی: تۆ لەچاو ڕابردوودا زۆر گۆڕاویت.

شنار ڕۆچووە هزری خۆیەوە و وتی: فەرمانڕەوایی ئایندەی ڕامسیس ناچارم دەکات، پلانەکانم بگۆڕم، هەر لەبەرئەوەش بەنهێنی تۆم بانگێشتی ناو ئەم "گەمی"یە کرد بۆئەوەی هیچ بێگانەیەك نەتوانێت گوێی لە گفتوگۆکانمان بێت و بتوانین ئازادانە پێکەوە گفتوگۆ بکەین. لەهەوڵی ئەوەدام میسر ڕزگار بکەم، دەبێت چالاکی ژێرزەمینی دژی ڕامسیس بەرپا بکەم. ئایا ئامادەیت هاوکاریم بکەیت؟ ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بهێنین ئەوا لەفەرمانڕەواییدا بەشدارم دەبیت.

عاشە بێدەنگ تەماشای ڕەوتی ڕوباری نیلی کرد و وتی: تۆ وتت لەبەرئەوە هاتوینەتە ناوەڕاستی ڕوباری نیلەوە بۆئەوەی بێ پەردە قسە لەگەڵ یەکتردا بکەین، کەواتە بۆچی بەزمانێکی ئاڵۆز قسەم لەگەڵدا دەکەیت؟

شنار وتی: پەیوەندی بازرگانی و پەیوەندیگەلێکی تری ئاوا لەگەڵ وڵاتانی ئاسیادا ڕامسیس ڕازی ناکات.

عاشە وتی: ئایا تۆ چەند پەیوەندیەکی ترت لەبەرچاو گرتووە؟

شنار وتی: ئەو سەردەمانەی"هیکسوس"ەکان بۆ ماوەی چەند سەدەیەك فەرمانڕەوایی میسریان کرد، لەڕێی سەرکردەکانی"دەلتا"وە هاتنە ناو گۆڕەپانی فەرمانڕەواییەوە، ئێمە دەتوانین لەمێژووەوە فێری باشترین ئەزمون ببین و بۆ هەڵسەنگاندنی ڕامسیس دەتوانین سود لە"هاتی"ەکان وەرگرین.

عاشە وتی: ئەم کارە مەزنترین هەڕەشەیە.

شنار وتی: یەکەمین هەنگاویش هەمان ئەم دەستبەکاربونەی تۆیە لەئاسیا، من باوەڕێکی تەواوم بەتۆ هەیە، دەزانم لەو ناوچانەدا چالاکیەکی باشت دەبێت.

عاشە پرسی: ئایا هیچ کەسێك ئاگاداری نیەتی"هاتی"ەکانە؟

شنار وتی: ئەم جۆرە زانیاری و ئاشکرا کردنی نیەتی"هاتی"ەکان لەئەستۆی تۆدایە، ئێمە دەبێت ڕامسیس بەهەڵەدا ببەین و سود لە"هاتی"یەکان وەرگرین.

عاشە وتی: ئەمە نەخشەیەکی تیژ و خەنجەرێکی دوو نوکە.

شنار وتی: ترسنۆکەکان هەموو ڕۆژێك دەمرن و ئازاکانیش یەك جار دەمرن.

عاشە وتی: من دەزانم کە"هاتی"ەکان بەردەوام حەز لەئاگر تێبەردان و جەنگ دەکەن.

شنار وتی: ئەمەش هۆکارێکی زۆر باشە و لەبەرژەوەندی ئێمەدایە، بۆ ڕێگرتن لەدانیشتنی ڕامسیس لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دەبێت پەنا بۆ هەموو کارێك ببەین، ئەگەر شکست بخۆین لەناوەوە هێرشیان بۆ دەبەین و وێرانکاری دەکەین، ڕامسیس ڕکابەری چارەنوسە و بەهیچ شێوەیەك مل بۆ چارەنوس نەوی ناکات، هەر لەبەرئەوەش دەبێت ئاگایانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

عاشە وتی: بێپەردە پێم بڵێی من لەکوێی ئەم پلانەدام.

شنار وتی: پلەوپایەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە ڕازیت دەکات؟

عاشە وتی: تا ئەوکاتەی لەژێر فەرمانی ڕامسیس بم سنوردارم.

شنار تەماشایەکی ڕوخساری عاشەی کرد و وتی: لەم ساتە بەدواوە سنوردارتر دەکرێیت، ئەوەش بزانێت ئەو گفتوگۆیەی لەنێوان من و تۆدا ئەنجام درا گەر ڕامسیس لێ ئاگادار بکرێت، دڵنیابە سیخوڕەکانم کەم نین و دڵنیابە لەم بابەتە ئاگادارم دەکەنەوە و بێگومان بە لەوەی مەرگت بۆ خۆت مسۆگەر کردووە.

***

لەسەرەتای ڕۆژانی گەشە و بون بەپیاو"موسا"بڕیاری دا سەردانی ئەو بەشانەی کۆشك بکات کە تا ئەوکاتە هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسابوو تەماشایان بکات. لەناو کۆشکدا لەگەڵ جۆرایەتی و بەرفراوان بونی هەموو کەسێکدا دەیتوانی تەنها لەو شوێنەی کە تایبەت کرابوو بەو نیشتەجێ یان سەردانیان بکات، لەبەرئەوەی هەندێك شوێنی تر هەبوو نەیدەتوانی سەردانیان بکات. موسا ئەو ڕۆژە ڕۆشت بۆ سەردانی کۆشکی فەرمانڕەوایی وەرزای داگیرکەر-ست هوس-ی فیرعەون، ئەو سەردەمە هەندێك بەش قەدەخە بوو سەردانی بکەیت و هیچ یەك لەشازادە و ژنەکان نەیاندەتوانی سەردانی ئەو شوێنانە بکەن، مەگەر بەتایبەت بانگێشتی ئەو شوێنە بکرێن. بەشێکی تر هەبوو کە شازادەکان دەیانتوانی هاتوچۆی تێدا بکەن ئەویش بەمەرجێك گەشتبنە تەمەنی پیاوەتی-چواردە ساڵی تەواو-... موسا سەرەتا ویستی سەردانی کۆشکی فیرعەون بکات، بەڵام لەبەرئەوەی مۆڵەتی چونە ژورەی پێنەدرابوو، سەردانی ئەو شوێنانەی کرد کە ڕێیان پێدابوو. موسا بەردەوام پێش ئەوەی بڕواتە ئەو جۆرە شوێنانە لەخۆی دەپرسی، ئایا چی لەو شوێنانەدا هەیە کە منداڵەکان ناتوانن سەردانی بکەن و مۆڵەتی چاوپێکەوتنیان نادەنێ!؟هەرلەبەرئەوەش زۆر کونجکاوی ئەوە بوو بڕوات و سەردانیان بکات بۆئەوەی بزانێت چی لەوێدا بەدی دەکرێت. ئەو شوێنە قەدەغەکراوە کۆشکێکی مەزن بوو و موسا ئازادانە بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت و گەشتە تەلارێك. دەرگای تەلار کراوە و پەنجەرەکانیشی ڕوویان لە"نیل"ەوە بوو. لەناو ژورەکەدا موسا چاوی بەچەند سنوقێکی پڕ لە"پاپیرۆس[18]"کەوت. لەنزیك یەکێك لەپەنجەرەکانەوە پیاوێك ڕو لەنیل و پشتی لە"موسا"وە بوو لەبەردەم مێزێکی مەزن کە لەداری"سەدر[19]"دروست کرابوو دانیشتبوو و بەپێنوسێکی لەڕەگەزی مس بەدەستەوە سەرقاڵی نوسین بوو. لەلایەکی ئەو مێزەوە کەرەستەی ئەندازیاری

---

[18] کاغەزی ئەو سەردەمی میسر.

[19] سەدر: درەختێکە لەناوچە گەرمە سێرەکاندا دەڕوێت و بەرەکەی وەك"گوێژ"وایە. بەعەرەبی پێی دەڵێن"نبق" کە بە"نەبک"دەیهێننە زمان... وەرگێڕ.

بۆنمونه ڕاسته، بازنه و چوارگۆشه و سێگۆشه دەبینرا. موسا لەبەردەم دەرگاکەدا ڕاوەستا و بیستی ئەو پیاوە بێنەوەی تەماشای بکات و سەری بۆ دواوە وەرگێڕێت وتی: شازادە دور کەوە!

"موسا"ش بەسەرسوڕمانەوە پرسی: تۆ کە هێشتا چاوت پێم نەکەوتووە لەکوێوە زانیت من شازادەم.

کابرای نوسەریش وتی: چونکە تەنها شازادە، دەتوانێت بێشەرمانە سەردانی شوێنێك بکات کە بەوەوە پەیوەست نەبێت.

موسا وتی: ئەگەر بوبێتمە ڕێگر لەبەردەم کارەکانتدا ئەوا داوای لێبوردنت لێدەکەم، ئەگەر بمزانیایە دڵگران دەبیت خۆم نەدەکرد بێرەدا ، لەبەرئەوەی دەرگام بەکراوەیی بینی وتم با سەردانێکی ئەم ژورە بکەم.

پیاویش هەر بەو شێوەی سەری دانەواندبوو وتی: ئەوە بۆ یەکەمین جارە دەبیستم شازادەیەك داوای لێبوردن بکات، پێشتر کاتێك نارەزایی خۆم دەردەبڕی و دەموت بۆچی بێ داوای مۆڵەت خۆت دەکەیت بەم ژورەدا سوکایەتی و هەڕەشەیان لێ دەکردم. پێم بڵێ ناوت چیە شازادە؟

موسا وتی: ناوم"موسا"یە.

کابرای نوسەر وتی: موسا ناوێکی ناتەواوە، ئەمە نیوە ناوە.

موسا وتی: هەرچی بێت موسای کوڕی"ئنخاس ئامون"ی شاژن و خودای میسرم.

نوسەر وتی: ئۆه!کەواتە تۆ کوڕی شازادە نهێنی ئامێزەکەی کۆشکیت، لەم کۆشکەدا شازادە"ئنخاس ئامون" بەشازادە نهێنی ئامێز ناسراوە، زۆر ئارەزوی ئەوە دەکەم ئەم شازادەیەی دایکیت ببینم..... لەمکاتەدا سەری بەرز کردەوە و ڕوی بەرەو موسا وەرچەرخاند و تەماشایەکی موسای کرد و وتی: ئەگەر ناوت نیوە بێت، بەڵام خۆت زۆر تەواویت، چ قەد و باڵایەکی کەتەت هەیە، پیرۆزباییت لێ دەکەم. لاوێکی قارەمانی وەك تۆ نابێت نیوە ناوی هەبێت، دەتوانم ناوێکت بۆ بدۆزمەوە.

موسا وتی: هەر ئەم موسایە تەواو و بەلای منەوە باشە و هەموو کەسێك من بەم ناوە دەناسێت، تۆش بەهەر ناوێك کە خۆت حەزت لێیەتی بانگم بکە، بەڵام هەمان ئەو موسایەی پێشوم.

پیاو زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: ئێستاش منیش خۆم بە موسا دەناسێنم ناوم"نف"ە، سەرۆکی تەلارسازانم، کۆشکەلێکی زۆرم بۆ فیرعەون دروست کردووە، تەواوی تەلارسازەکانی "تبس"لەهەموو شوێنێکدا لەژێر چاودێری مندا کارەکانیان ئەنجام دەدەن، خۆشم سەرۆکی خۆمم، لەم وڵاتەدا تەنها فیرعەون دەتوانێت فەرمانم پێبدات، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە خۆم فەرمان بەهەموو کەسێك دەدەم! و زۆریش لەفیرعەونەوە نزیکم.

موسا وتی: هۆکاری نزیك بونت لەفیرعەون چیە؟

نف وتی: چونکە"وەرزای داگیرکەر" فیرعەونی ئەم سەردەمە ئاشق و شەیدای هونەری تەلار سازیە، ئەو بەتەنهایی بەئەندازەی چەندین فیرعەون لەم ماوەیەدا تەلاری دروست کردووە. هەر لەبەرئەوەش بەڕادەیەك گرفتاری ڕاسپاردەکانی ئەوم کە تاقەتی ئەوەم نیە شازادەکان بێن بۆ لام و ببنە مایەی دەردیسەریم.

موسا وتی: تۆ ڕەخنەت لەناوەکەم گرت، ئێستاش من دەمەوێت بزانم بۆ ناوت"نف"ە؟

"نف"ی ئەندازیار وتی: دایك و باوك کاتێك ناوی"نف"لەمنداڵەکەیان دەنێن کە ڕێژەی منداڵەکانیان سنوری ئاسایی تێپەڕاندبێت، چونکە ئەوەندە ناوی جۆراجۆریان لەمنداڵەکانیان ناوە کە دواین منداڵیان تەنها بەناوی"نف"خۆیان ڕازی دەکەن، هەڵبەت دایك و باوکم جوتیاربون یانزە منداڵیان هەبوو، منیش تاکە منداڵێکیان بووم کە بەزیندویی ماومەتەوە! ئایا تائێستا ناوی"ستی کاف"ت بیستووە؟

موسا وتی: تا ئێستا ناوی وام بەرگوێ نەکەوتووە.

"نف"ی ئەندازیاری وتی: "ستی کاف" یەکێك بوو لە زەوی خۆرەکانی شاری "تبس"، زەوی جوتیارانی وەك گرەو[20] لێی وەردەگرتن و بڕێك سامانی بەقەرز پێدەدان و ماوەیەکی بۆ گەڕانەوەی سامانەکەی بۆ دیاری دەکردن، ئەگەر کابرای جوتیار نەیتوانیبا لە کاتی خۆیدا قەرزەکەی بداتەوە ئەوا"ستی کاف" بەشێوەیەکی یاسایی دەستی بەسەر زەویەکانیاندا دەگرت، ئەو لەبەرئەوەی هۆشیارانە یان ساختانە کاری دەکرد، هەمیشە کارەکانی لایەنێکی یاسایی لەخۆ دەگرت و هیچ کەسێك نەیدەتوانی بیانوی پێ بگرێت. من، بەواتا دایك و باوکم بونە قوربانی ئەم"ستی کاف"ە، ئەو دوانە دوای لەدەست دانی زەویەکانیان دیقیان کرد و مردن، منیش بەتەنهایی مامەوە، بەڵام دایەنێك منی سپارد بە چەند تەلار سازێك کە لەکۆشکی فیرعەوندا کاریان دەکرد، بۆئەوەی بتوانم موچەیەك بەدەست بهێنم، لەوکاتە بەدەواوە گرنگیەکی زۆرم دەدا بەکاروبارەکانی تەلارسازی و تا ئەوکاتەی کەم کەم سەرکەوتنم لەوەدا بەدەست هێنا نەخشەی خانوویەك بکێشم، هەمان ئەم نەخشەیە بووە هۆی پێشکەوتنم و بەرزبونەوەی ئاستی کارکردنم.

موسا وتی: ئێستا کە بەو شێوە سەرنج ڕاکێشە قسە دەکەیت و سەرگوزەشتەیەکی ورووژێنەرت هەیە دەتوانم لەتەنیشتتەوە دانیشم و گوێت لێ بگرم.

"نف"ی تالارساز وتی: زۆریش بەدانیشتنت خۆشحاڵ دەبم، بەڵام بەمەرجێك قسە لەگەڵ یەکتردا نەکەین، چونکە سەرم زۆر قاڵە، لەبەرئەوە تەنها دانیشە و تەماشا بکە..... دوای ئەوە یەکسەر خۆی بەنەخشەکێشانەوە سەرقاڵ کرد، سەرەتا کاتێك موسا چاوی بە"نف" کەوت وای دەزانی نوسەرە و سەرقاڵی نوسینە، بەڵام

---

[20] گرەو: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە دەتوانرێت لەباتی وشەی"رهن"ی عەرەبیدا بەکار بهێنرێت، چونکە ڕەهنیش هەمان واتای"گرەو"ی هەیە، چونکە کاتێك تۆ شتێك دەدەیت بە"ڕەهن"واتای ئەوە دەگەیەنێت تۆ گەرەوێکت لەگەڵ کەسێکدا کردووە کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەو شتەی لێت وەرگرتووە بۆی نەگەڕێنیتەوە، ئەوا ئەو کەسە ئەو شتەی بەڕەهن پێت داوە دەستی بەسەردا دەگرێت، بۆیە ئەم مامەڵەیە دەقاودەق وەك گرەو وایە، کاتێك گرەو لەگەڵ کەسێکدا دەکەیت ئیتر لەسەر شتێك بێت یان شتێکی لێ قەرز بکەیت و لەکاتی دیاری کراودا بۆی نەگەڕێنیتەوە ئەوەی وەك گرەوێك لەلای ئەو داتناوە دەیدۆڕێنی یان بەشێوەیەکی جوانتر دەتوانین بڵێین لەبەرامبەر ئەوشتەی کە لێت وەرگرتووە یان لێت قەرز کردووە دەستی بەسەردا دەگرێت... وەرگێڕ.

لێی وردبویەوە و ئاگاداری ئەوەبوو بەپێنوسێکی مسی دووسەرە کە تا ئەو کاتە چاوی بەو جۆرە پێنوسە نەکەوتبوو وێنەی جۆراوجۆری دەکێشا. موسا لەسەردەمی خوێندنیدا فێری زانستی ئەندازیاری بوبو و شێوە ئەندازەییەکانی بەباشی دەناسیەوە، بەڵام نەیدەزانی نەخشەکێشان چیە، بۆیە تەنها لێی وردبوویەوە و بینی "نف"ی تەلارساز لەکێشانی شێوە ئەندازەییەکاندا وێنەگەلێکی جوان و ورد دەکێشێت. چەندجارێك چەند پرسیارێك بەهزری موسادا هات، بەڵام لەبەرئەوەی "نف"ی تەلارساز پێی وتبوو نابێت بەهیچ شێوەیەك گفتوگۆ لەنێوانماندا ئەنجام بدرێت، بۆیە پرسیارەکەی لێ نەکرد. موسا بەسەرسوڕمانەوە تەماشای هەموو جوڵە و شتومەکەکانی "نف"ی تەلارسازی دەکرد، بەڵام کاتێك چاوی بە"موروو ژمێر[21]"ەکەی"نف"ی تەلارساز کەوت بەشێوێنێکەوە هەڵواسرابوو، کە هەندێجار "نف"ی تەلارساز مورووەکانی ئەمبەرەوبەر پێدەکرد، بۆی دەرکەوت تەواوی شتومەك و کەرەستەی کابرای تەلارساز بەلایەوە تازەیە. موسا بینی کابرای تەلارساز بۆ ژمارەی یەك موورویەکی دەهێنایە ئەمبەرەوە و بۆ ژمارە دووش دوو مووروی دەهێنایە ئەمبەرەوە بەو شێوەیە بەپێی هەر ژمارەیەك ئەوەندە مووروی جێبەجێ پێ دەکرد و ژمێریاری خۆی پێ ئەنجام دەدا. ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و "موسا"ش هەر بەوشێوەیە تەماشاچی "نف"ی تەلارساز بوو، هەروەك بڵێی بەلای ئەوەوە موسا لەوێ نەبێت بەوشێوەیە سەرقاڵی کارەکەی خۆی بوو. لەناکاو "نف"ی تەلارساز بۆئەوەی کەمێك بحەوێتەوە سەری بەرز کردەوە و تەماشایەکی "موسا"کرد و بینی پەرێشان و سەرسوڕماو دەردەکەوێت. کاتێك موسا بینی "نف"ی تەلارساز دەستی لەکارەکەی هەڵگرتووە وای زانی دەتوانێت قسەی لەگەڵدا بکات، بۆیە لێی پرسی: ئەو شتەی لەسەر کاغەزی "پاپیرۆس" نەخشەی دەکێشیت کەڵکی چی دەخوات؟

---

[21] مووروی ژمێریاری: ئەو ئامێرەیە کە لەچەند ڕیزێك موورو پێك دێت کە سەردەمانی کۆن بەو ئامێرە پارە و شتومەکەکانی خۆیانیا پێ دەژمارد-لەباتی حاسیبەی ئەلکترۆنی ئەم سەردەمە-... کە لەزمانی فارسیشدا "چرتکە"ی پێ دەڵێن کە لەبنەچەدا لەڕوسیەوە وەرگیراوە بەواتا ئەوانیش ناوێکی تایبەتیان نیە بۆ ئەم ئامێرە بۆیە منیش ناچاربوم پیناسەی خودی ئامێرەکە وەك ناوێك بەکار بهێنم... وەرگێڕ

"نف"ی تەلارسازیش وتی: ئەمە نەخشەی تەلارێکە.

موسا پرسی: کام تەلار؟

نف وتی: ئەو تەلارەی فیرعەون دەیەوێت دروستی بکات؟

موسا وتی: بەڵام هیچ تەلارێك لەم نەخشەیەدا بەدی ناکرێت.

نف وتی: نەخشە کێشان وەك دارتاشی و پەیکەرتاشی نیە، تۆ هیچ تەلارێك لەنەخشە کێشاندا نابینیت... دوای ئەوە بۆی ڕونکردەوە: نەخشە وەك ڕێبەر و ڕێنمایەك وایە و وردەکاری کارەکان بەرفراوانتر دەکات، نەخشە ماوەیکیش پێش مێژوی دروست بونی قوچەکیەکان بۆ دروست کردنی خانو و تەلارەکان سودیان لێ وەرگرتووە.

موسا وتی: لەو باوەڕەدا نیم نەخشە بەئەندازەی دروست کردنی تەلارێك گرنگی مێژوویی هەبێت.

کابرای تەلارساز وتی: هیچ خانو و تەلارێکی بتەو و بەهێز بێ نەخشەکێشان مەحاڵە بتوانێت خۆی ڕابگرێت.

موسا پرسی: ئەو نەخشەیەی ئێستا دەیکێشیت چیە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: نەخشەی خەزێنەیەکە.

موسا وتی: ئەوە بۆ یەکەمجارە نەخشەی خەزێنەیەك دەکێشیت؟

"نف"ی تەلارسازیش وتی: ئەی موسا تائێستا دەیا خەزێنەم دروست کردووە، لەڕاستیدا ئەم خەزێنانە لەخۆرئاوای میسردایە، چونکە لەوێ بەهۆی هەڕەشەی هێرشی دراوسێکانەوە پێویستی بەخەزێنەیەکی زیاترە، بەڵام فەرمانیان پێداوم لە"دلتا"ی نیل خەزێنەیەکی"گەنم"دروست بکەم.

موسا وتی: بیستومە کە خەزێنەی گەنم لەشوێنێکدا دروست دەکەن کە وشك بێت، بۆئەوەی دانەوێڵەکە نەگەنێت، بەڵام لەم ناوچەیەدا ئاوهەوا زۆر شێدارە، ئایا جیاواز نیە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: فیرعەونیش لەبەر هەمان تایبەتمەندی دەیەوێت لەوێدا دروستی بکات، بەڵام لەوباوەڕەدایە ئەو خەزێنەیەی کە لە"دەلتا"دروست دەکرێت

لەهێرشی دوژمنان پارێزراوە، ئەگەر دوژمن هێرش بکاتە سەر"تبس"ئەوا سەرەڕای ئەو شەڕەش خەڵکی گەنمیان بۆ دروست کردنی نان دەبێت.

موسا وتی: دەتەوێت کەی دەست بەدروست کردنی ئەم خەزێنەیە بکەیت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: سبەی، ئایا حەز دەکەیت ببیتە چاودێری دروستکردنی ئەم خەزێنەیە؟

موسا وتی: زۆریش حەز دەکەم.

"نف"ی تەلارساز وتی: کەواتە لە لەنگەرگا لەبەردەم ئەو کۆشکەدا ڕاوەستە و خۆت ئامادەی ڕۆشتن بکە، پێش هەڵهاتنی خۆر بەڕێ دەکەوین، ئەگەر درەنگت پێ ببێت ئەوا چاوت پێمان ناکەوێت.

موسا بەهەموو هەوڵێکی هەوڵیدا پەیوەندی بەگروپی ئەندازیارانەوە بکات بۆئەوەی بەجێ نەمێنێت. شەوی ڕابردوو لە پاسەوانی پرسی: لێرەدا چ کاتێك خۆر هەڵدێت، بەچ شێوەیەك دەتوانم پێش هەڵهاتنی خۆر لەخەو هەستم؟

پاسەوان وتی: لەم کۆشکەدا چوارکەس لەچوار کاتی جیاوازدا پاسەوانی دەکەین، من پاسەوانی سێیەمم و دوای ماوەیەکی تر پاسەوانێکی تر دێت و دەمگۆڕێت. موسا بەشێوەیەك لەگەڵ کابرای پاسەواندا ڕێکەوت کە لەگزنگدا خۆی بگەیەنێتە لەنگەرگا و لەگەڵ گروپی ئەندازیاراندا بەڕێ بکەوێت و لەوکارەشدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. موسا بەهۆی پەلەکردنیەوە بێ بالاپۆش لەکۆشك ڕۆشتە دەرەوە، سەرمای گزنگی بەیانان ئازاری بەگیانی دەدا و ئاگاداری ئەوەبوو کەسێك بالاپۆشەکەی دا بەشانیدا. موسا ویستی نەهێڵێت ئەو کەسە ئەوکارە بکات، بەڵام کاتێك لێی ورد بویەوە بینی"نف"ی تەلارسازە.

نف وتی: بۆ ئەوەندە زوو هاتی؟

موسا وتی: دەترسام خەوم لێ بکەوێت و بێبەشبم لەوەی لەگەڵ ئێوەدا بەڕێ کەوم....دوای ماوەیەك کەشتیەکی زۆر گەورە و درێژ لەلەنگەرگا نزیك بویەوە. دوو کەس لەسەوڵ لێدەرەکان لەکەشتیەکە دابەزین و لەلەنگەرگا نزیك بونەوە بۆئەوەی کەشتیەکە بەگوریس ببەستنەوە تا بەملاولادا نەجوڵێت، "موسا"ش لەم کاتەدا ڕۆشتە ناو کەشتیەکەوە. لەبەشی کۆتایی کەشتیەکە لەپاڵ ئەوکەسەی سوکانی

کەشـتیەکەی بەدەسـتەوە بـوو چـاوی بەدیمـەنێك کـەوت چـەند کەسـێك لەوێـدا دادەنیشت بۆئەوەی لە خۆر و باران پارێزراو بێت. موسا بەرەڕوی کورسیەك ڕۆشت و بینی سێ کەسی بەسەرەوە دانیشتووە، دوانیان کاغەزێکی"پاپیرۆس"ی درێژیان بەدەستەوە بـوو و سـێیەمیان کەرەسـتەیەکی وەك سـێپایە و چـەند کەرەسـتەیەکی تری بەدەستەوە بوو. موسا لـەڕوکار و کەرەسـتەکانی دەسـتیان تێگەشـت ئەمانـەش ئەندازیارن. دوای ماوەیەکی کورت گوریسی کەشتیە کە بەلەنگەرگاکـەوە بەسترابوو کـردەوە و چیتر دوای ئـەوە کەشـتی لـە لەنگـەرگا ئـازاد کـرا، سـەوڵ لێـدەرەکانیش دەستیان کرد بەسەوڵ لێدان، سەوڵ لێدەرەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لەیـەك کـات و پێکەوە سەوڵیان لێدەدا. دوای تێپـەڕبونی ماوەیـەکی تـر ڕونـاکی خـۆر لەکەشتیەکە هەڵهات. هەڵهاتنی خۆر بەڕوی ڕوباری نیل بەلای موسـاوە تـازە بـوو. موسـا لـەکاتی ڕێکردنیاندا پرسیارێکی زۆری لە"نف"کرد، چونکە ئەو گەشـتە بـەلای ئـەوەوە تـازە بوو. موسا بەردەوام دەیپرسی: کەی دەگەینە ئەو شوێنە و چەنێکی تـر بەمشێوەیە بەردەوام دەبین.

"نف"ی تەلارسازیش وتی: دەبێت بۆماوەی سـێ کاتـژمێر بـەم شـێوەیە بـەردەوام بین، هەروەها دەبێت لەولاتی کوش نزیك"نزیك"ببینەوە.

موسـا پرسـی: دەمویـست بـزانم ئـەوە ڕاسـتە کـە لـەولاتی"کـوش" خێڵێکـی تێـدا دەژیت کە هەموویان کۆیلەن؟

"نف"ی تەلارساز سەری سوڕما و وتی: مەگەر تائێـستا ئاگـاداری ئەمـە نەبویت؟ بـەچ شـێوەیەك مامۆسـتایانی"کـەپ"بابـەتێك بـەو گرنگیـەیان بەخوێنـدکارەکانیان نەوتووە.

موسا پرسی: دەقاودەق ولاتی"کوش"دەکەوێتە کوێوە؟

"نـف"ی تەلارسـاز وتـی: ولاتـی"کـوش"دەکەوێتـە ڕۆژهـەلاتی"دەلتـا"ی نیلـەوە، ولاتێکـی بـەرفراوان و شـایەنی ئـەوە نیـە هـیچ گرنگیـەکی پـێ بـدەیت بۆیـە چـەقی کۆیلایەتیـە، "کـوش" وەك تـەواوی دانیـشتوانی میـسر لەکـەنار ڕوبـاری"نیـل"دا بنیاتنراوە، "کوش"یش بەهەمان شێوەی میسر زۆر لەڕوبارەکەوە دور نیە، بەڵام لـە"کـوش"دا ڕوبـاری نیـل هەڵناچـێت و لافـاو دروسـت ناکـات، هـەر لەبەرئـەوەش

لەهەندێك شوێندا چەند ساڵێك لەنیعمەتی هەڵچونی ڕوباری نیل بێبەش دەبن و کێڵگەکانیان تێرئاو نابێت. خاڵێکی تری ئەم ولاتە هەلومەرجی سەربازیەتی، ئەم ناوچەیە هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی"هاتی"دان، هەرکاتێك خێڵی"هاتی"لە ولاتی"کوش"ەوە تێپەڕن کوشت و کوشتاریان تێدەخەن، بۆئەوەی بتوانن سەروەت و سامانیان تالان بکەن، هەر لەبەرئەوەش هیچ میسریەك لە"کوش"دا نیشتەجێ نابێت.

موسا پرسی: ئەو کۆیلانەی لەکوش جێگیرن لەکوێوە دەیانهێنن؟

"نف"ی تەلارساز وەڵامی دایەوە: کۆیلەکان لەخێڵە دڕەندە و ئەفسانە پەرستەکانن و زمانی گفتوگۆیان وەك زمانی"فینیقی"ەکان وایە. هۆکاری بونیان لەوێ بەهۆی وشکەساڵیەوە لەولاتەکەیانەوە کۆچیان کردووە بۆ ئێرە. ئەمانە دەبێت لە پادشا مۆڵەت وەرگرن، کاتێك ئەم خێڵە داوایان کرد بێنە ناو میسرەوە، لەمیسردا پادشایەکی نەفرەت لێکراو-فیرعەونی لاینگری خودای نەبینراو- دەستەلاتی ئەم ولاتەی بەدەستەوە بوو، هەمان ئەم فیرعەونە کە ناوی لەڕیزی فیرعەونەکانی تردا کوژاوەتەوە...

موسا لەم کاتەدا قسەی بە"نف"ی تەلارساز بڕی و لێی پرسی: بۆچی ئەو فیرعەونە بەنەفرەت لێکراو بانگ دەکەیت؟ خۆ کارێکی خراپی نەکردووە، تەنهای پەنا بەهەندێك خەڵك داوە کە وشکە ساڵی ڕوی لەولاتەکەیان کردووە، بەبۆچونی من پادشایەکی باش بووە..... لەمکاتەدا ڕەنگ لەڕوخساری"نف"ی تەلارسازدا نەما و ترس و تۆقان سەرتاپای جەستەی داگیرکرد و تەماشای سێ ئەندازیارەکەی تری کرد بۆئەوەی بزانێت ئایا ئاگاداری گفتوگۆکەیان بون یان نە و کاتێك دڵنیابوو لەوەی هیچ وشەیەکیان لەم گفتوگۆیە نەبیستووە هێور بویەوە و وتی: لەبیری بکە...

یەکێك چرپاندی بەگوێی"موسا"دا و وتی: ئەوە تۆ چی دەڵێیت، هێنانە زمانی ئەم جۆرە گوتانە تاوانە، هەر ئەوەی کەسێك گوزارشتێکی ئاوا بدات بەفیرعەون یەکسەر سەرت لێدەکاتەوە.

موسا وتی: دەزانی لەمیسردا دوژمنێکی زۆرم هەیە!

نف وتی: زۆربەی خەڵکی ئاگادارن.

موسا وتی: هەڵبەت هەموو شت و بیروباوەڕێکی خۆم بەخەڵکی ڕاناگەیەنم، بەڵکو تەنها لەگەڵ تۆدا ئەم جۆرە قسانە دەکەم.

نف وتی: موسا تۆ هێشتا لاویت و نەك لەسەر بنەمای ئەزمون و لۆجیك بەڵکو بەپێی هەستەکانت بڕیار دەدەیت، زۆربەی خەڵکی لەڕوکاری دەرەوەیاندا کەسێکی باش و جوانن بەڵام ناخیان پێچەوانەیە، بۆیە هیچ کاتێك متمانە بەڕوکاری دەرەوەی هیچ شتێك مەکە. لەبارەی خێڵی "کوش"یش دەبێت پێت بڵێم ئەو خەڵکە نیوە دڕندەیە خاوەنی هیچ پیشەیەك نەبون، نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك سود لەکانزاکان وەرگرن و کەرەستەی لێ دروست بکەن، ئەمانە هێشتا لەقۆناخی بەردیندا دەژین و وەك چەکێك سود لە بەرد وەردەگرن، بەڵام دوای ئەوەی کۆچیان کرد بۆ"کوش"دەستیان چووە ناو کارەوە و وردە وردە فێری دروست کردنی کەرەستە کانزاییەکان بون. هاتنی ئەم خێڵەی کە لە"کوش"دا جێگیربون لەبەرژەوەندی ئێمەدایە، چونکە کەرەستە کانزاییەکانمان بۆ دروست دەکەن و پەنیر و خوری دەدەن بەمیسریەکان و لەبەرامبەردا کانزایان وەردەگرت.

موسا بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە"وەرزای داگیرکەر"فیرعەونی میسر ئەو خێڵەی کە تا ئەو کاتە سەربەخۆ و ئازاد بون دوای جێگیربونی بارودۆخی میسر کردنی بەکۆیلە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: لەژیان و بەتایبەت ژیانی سیاسی و دەوڵەتداریدا دەبێت هەندێك سیاسەت پیادە بکرێت کە لەئاست و پێوەری وانەکانی تۆدا کە لەلایەن مامۆستاکانەوە فێریان کردوویت نیە!

موسا وتی: ناتوانم ئەوە پەسەند بکەم، چۆن خێڵێکی ئازاد کە پەناهەندەیی وڵاتێکی پێدەدرێت، لەباتی خانەخوێی و خزمەتیان بکەیت بیانکەیت بەکۆیلەی خۆت؟!

"نف"ی تەلارساز وتی: بارودۆخی ئەمڕۆی میسر لەگەڵ ڕابردوودا زۆر جیاوازە. میسری کۆن فەرمانڕەوایانی وەك"خوفو" و "می سری نئوس"هەبووە، پانزە سەدە پێش ئێستا میسریەکان قوچەکیەکانیان دروست کردووە کە تا هەتاهەتا

دەمێنێتەوە. ئەو ڕۆژانەی ئەم قوچەکیانەیان دروست دەکرد نەتەوەی میسر نەتەوەیەکی دانا و ڕۆشنبیر بووە، ئێستاش میلەتێکی ئەفسانە پەرستە. میلەتێك کە خودی قوچەکیەکانیان دروست کردووە، لەئێستادا خەڵکەکەی نازانێت بەدەستی چ کەسانێك دروست کراون و دەڵێن ئەم قوچەکیانە خودای "ئزیس"دروستی کردووە! لەوانەیە لەقوتابخانەدا پێیان وتبیتن ئەم قوچەکیانە بەدەستی چ کەسانێك دروست کراون، فەرمانڕەوایانی میسر بۆ دروست کردنی ئەم قوچەکیانە سودیان لە کۆیلەکان وەرگرتووە، بەڵام وەریابە باوەڕ بەم جۆرە قسانە نەکەیت، ئەم بینا مەزن و پایەدار و جاودانانە مەحاڵە کاری کۆیلەکان بێت. کاتێك خەڵکی ولاتێك لەناخەوە خاڵی بوو و زانست و دانایی ڕوی لێ وەرگێڕان دەبنە کەسانێکی ئەفسانە پەرست و دەڵێن قوچەکیەکان کە مرۆڤەکان دروستیان کردووە، خوداکان دروستیان کردون. من و هاوڕێیانم کە هەموومان تەلارسازین، زۆر باش دەزانین کە ئەم قوچەکیانە بەدەستی مرۆڤ دروست کراوە، ئەو کەسانەی شارەزای بواری تەلارسازی بون، ئەو کەسانەی دەیانتوانی نەخشە بکێشن کەسە پسپۆڕ و زاناکان بون. لەدروست کردنی قوچەکی مەزنی"خوفو" نزیکەی دوو ملیون و نیو بەردیان بەکار هێنا تا قوچەکی"خوفو"یان کرد بەقوچەکی"خوفو". سەیرترین گوتە کە بەرگوێی کەسانی نەزاندا دەچرپێنرێت و خەڵکە نەزانەکەش بەهۆی نەزانیانەوە بێ ئەملاولا ئەو جۆرە گوتانە پەسەند دەکەن ئەوەیە کە دەڵێن قوچەکیەکانیان بەکۆیلەکان دروست کردووە! باشە کاتێك ئێمە چاوێك بە مێژووی دروستی ئەو قوچەکیانەدا بخشێنین بۆمان دەرکەوێت کە لەو سەردەمەدا هیچ کۆیلەیەك لەمیسردا بونی نەبوو، لەبەرئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو جۆرە گوتانە تا چ ڕادەیەك بێ بنەمایە. لەوانەیە لەو سەردەمەدا دیلی جەنگ هەبوبێت، لەوانەشە لەهەندێك کاروباردا سودیان لەدیلەکان وەرگرتبێت و بەکاریان هێنابێتن، بەڵام نەك بەوشێوەی کە بڵێن قوچەکیەکانیان لەڕێی کۆیلەکانەوە بنیات نراوە، ئەم جۆرە پێناسە و گوتانە بێ بنەمایە. ئەو سەردەمانەی قوچەکیەکانیان دروست دەکرد جوتیارانی میسر زەویان هەبوو و بەخاوەندار لەقەڵەم دەدران، مەبەستم وردە خاوەنداره. چەند چالاکیەکیان لەسەر زەویەکانیان ئەنجام دەدا و بەروبومەکەشیان

کۆدەکردەوە و بەئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانەش بژێوی ژیانیان دابین دەکرد، بەڵام لەمڕۆدا تەماشای جوتیارانی میسر بکە، جوتیاری میسری تەنها پیشەی جوتیارەیە بەواتا کرێکارێکی تەواوە، بەواتا جوتیارێك کە بۆ کەسانی تر کار دەکات، هەرچی بچێنێت و درەوی بکات دەبێت بیداتەوە بەخاوەن زەوی.

نف وتی: موسا دەزانی بۆچی باسی ئەمانەت بۆ دەکەم، چونکە تۆ بۆت سەلماندم لاوێکی جێی متمانەیت. لەم سەردەمەدا خەڵکی میسر هەمان ئەو جوتیارانە بون کە متمانەیەکی تەواویان بەحکومەتەکەیان هەبوو و لەکاتی پێویستیشدا لەکانگای دڵیانەوە بەرگریان لێ دەکرد، چونکە یەکەم لەبەرئەوەی تێر بون، دووەم حکومەتی ئەو سەردەمە وەکو ئێستا خەڵکی دیل و بەکرێگیراوی نەبوو و پشتگوێ نەدەخستن، بۆنمونە لەلافاو و هەڵچونە ترسناکەکانی ڕوباری"نیل"دا کە پێویستی بەهاوکاری خەڵکی بوو لەسەرتاسەری میسر هەزاران کەس بەویست و ئارەزوی خۆیان بەکەرەستەی کار و تۆشەرەی پڕ لەنانەوە دەکەوتنە ڕێ، چونکە دەیانزانی بۆ ئەنجامدانی چ کارێك دەڕۆن، هەڵبەت بۆ ئەنجامدانی کارێك دەڕۆشتن کە سود و بەرژەوەندی خۆیانی تێدابوو. بەڵام ئێستا گەر ڕوباری نیل هەڵچێت و لافاو دروست ببێت، ئەگەر حکومەت داوای هاوکاری لەخەڵکی بکات یان ناڕۆن یان هەر ناتوانن بڕۆن، هەر تاکێکی میسری جگە لەپێست و ئێسقان هیچی بۆ نەماوەتەوە. هەڵبەت کەسانی بەهێز و کەتەشی تێدا بەدی دەکرێت، ئەوانە خۆویست و تەمەڵ و زۆردارەکانن، ئەمانە بەئەنقەست لەڕیزی سەربازیدا خزمەت دەکەن. بەدرێژایی ئەو دوو ساڵە جەنگە بەردەوامەی لەگەڵ دراوسێکانیدا لەخۆرئاوای میسردا ئەنجامیان داوە دە هەزار دیل لەوڵاتی خۆرئاوا"لیبی" و پێنج هەزار کەسیش لە کوش"سودانی ئەمڕۆ" بەدیلی گیراون کە لەمیسردا سەرقاڵی کارکردنن. میسریەکان بەهۆی سادەیی و بێتوانایی لەوەی قەرزەکانیان بدەنەوە، ناچارن خۆیان بفرۆشن و بچنە ڕیزی کۆیلەکانەوە. هەر لەبەرئەوەش بارودۆخی گشتی خەڵکی میسر بەوشێوەی لێهاتووە کە بۆم باسکردی.

موسا وتی: من ناتوانم چاوپۆشی لەو ستەمە بکەم کە لەبەرامبەر خەڵکی"کوش"دا کراوە و بەردەوام بیری لێدەکەمەوە.

نف وتی: ئامۆژگاریەکت دەکەم وەك گوارەیەك بیکە بەگوێتدا، ئەویش ئەوەیە، هەرکەسێك ویستویەتی لەبارەی دادوەری و ستەم، تەندورستی و نەخۆشی، چاکە و خراپە، هێزی لەکاروبارەکانی جیهاندا بخاتەگەڕ ئەوا خۆشی لەگێژاوی ئەم ناڵەباریەدا دەخنکێت.

چیتر موسا دوای ئەوە باسی خەڵکی"کوش"ی نەکرد. دوای ئەوە موسا وتی: ئێستا دەزانم کە خەڵکی میسر لەچ بارودۆخێکدا دەژین، کاتێك لەکۆشکدا بوم بەشێوەیەکی تر بیرم لەمیسر و خەڵکی میسر دەکردەوە.

"نف"ی تەلارساز وتی: چ کاتێك یەکەمین بزیسکەی ئەم ڕونکایە بەر هزرت کەوتووە؟

موسا وتی: ئەم بزیسکەیە لەبازاڕی میسردا بەر هزرم کەوت، چونکە پێش ئەوەی سەردانی بازاڕی مەزن و پێش دەرچونم لەکۆشك، بێ لەو کۆشکە ڕازاوە و ژیانی ناو کۆشك هیچ شتێکی تر لەهزرمدا نەدەگونجا و وام دەزانی خەڵکانی تریش بێکەم و زیاد وەك من دەژین، وەك من جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردایە و قەڵەون و وەك کاربەدەستانی دەوڵەت دەژین، بەڵام لەبازاڕی مەزندا ڕوبەڕوی جیهانێکی تەواو جیاواز بومەوە. ئەم بیرۆکەیە بەسواربونم بۆ سەر ئەم کەشتیە و بیستنی گوتەگەلێکی زۆر تادەهات بەهێزتر دەبوو، ئالێرەدا زانیم ستەمکار کێیە و کێ ستەم لێکراوە، چونکە لەکۆشکی فیرعەوندا وام دەزانی وڵات بەشێوەیەکی دادوەرانە بەڕێوە دەبرێت، بەڵام هەرچی بەنێو خەڵکیدا بگەڕامایە باشتر پەیم بەوە دەبرد کە لەچ جیهانێکی دوفاقەدا دەژیم. دوای تەواو بونی ئەم گفتوگۆیە موسا و"نف"ی تەلارساز پەیوەندیان بە سێ ئەندازیارەکەی ترەوە کرد.

***

ڕامسیس لەنۆیەمین ساڵی فەرمانڕەوایی-وەرزای داگیرکەر-ئاهەنگی حەفدەیەمین ساڵڕۆژی لەدایك بونی گێڕا: "ئامنی و ستائو"ئامادەی ئەو ئاهەنگە بون، بەڵام موسا و"عاشە"لەوێ نەبون. موسا هەر بەوشێوەی بینیمان لەگەڵ"نف"ی تەلارسازدا گەشتێکی کورتی ئەنجام دا و لەناو کەشتیدا پەیوەندی

به ئەندازیارەکانەوە کرد و"عاشە"ش لەلایەن"ڕامسیس"ەوە بەناونیشانی باڵوێز بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری ڕۆشتبوو بۆ لوبنان، بۆیە کۆکردنەوەی هاوپۆلەکانی ڕابردو دوای ئەوە بەمەحاڵ دەهاتە بەرچاو، مەگەر جێگری سەرۆك پێشنیاری ئەوەی لێ بکردایەن لەچواردەوریدا سەرقاڵی کارێك بن. تاکە کەسێك کە هەرگیز"ڕامسیس"ی بەجێ نەهێشت"ئامنی"بوو. "ستائو"ش هەرکاتێك هیچ کارێکی بەمارەکانی نەبوایە، دەڕۆشت بۆ لای ڕامسیس و لەوەڵامی ڕامسیس کە لێی پرسیبوو هاوڕێیان لەکوێن؟ بەدەم پێکەنینەوە دەیوت: کەیەڵێك لەیەکێك گۆشەکانی بیابان شك دەبەم، ئەمشەو دەڕۆم بۆئەوێ چونکە دڵنیام مارەکان پەنا بۆ ئەو کەلاوەیە دەبەن، بۆئەوەی بیانگرم، لەبەرئەوەی دەمەوێت شارەزای جۆرەکانی مار ببم، هەڵبەت ئەگەر بتوانم خۆم لەژەهری مەرگباریان ڕزگار بکەم...

"ئامنی"ش کە دەیزانی مەبەستی لەکەیەڵی ئەو بیابانەماڵەکەی"ستائو"یە وتی: کەیەڵ نیە، نە کەیەڵە و نە تاقیگا، سەرەڕای ئەوەش تۆ چیتر ئەوەندە سامانت لەڕێی مارەکانەوە کۆکردووەتەوە کە چیتر پێویست بەوە ناکات دەست لەهیچ هەڕەشەیەکەوە بدەیت.

ستائو پرسی: تۆ لەکوێوە ئاگاداری ئەو هەموو نهێنیانەی منیت؟

ئامنی وتی: دەبێت لەگەڵ باوکمدا بڕۆم بۆ"ئەسوان" چونکە پەیکەرەکان، دەرگاکان، دەروازەی پەرستگا و زۆر لەبەرهەمە هونەریەکان کە لەبەردە سەخستەکان دروست دەکرێن لەشاری"ئەسوان"بەدەست دێن، بەڵام لە"ئەسوان"دا جیاوازی کرێکاران لەگەڵ سەرپەرشتەکاندا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبوو، جیاوازیەکی مەزن لەبارەی هەڵگرتنی بەردی چەند تەنی هاتەپێشەوە و گرفتێکی مەزنیش بۆ ئەم گرفتە زیاد بوو، ئەویش خاڵی بونی خەزێنەی سروشتی کانزای دایکە، کە تەنها چەند ڕەگێکی کورت و کەمی مابوو.

جێی باسە گروپێك لە ئەندازیاران بەوردی و شارەزاییەوە ئەرکی سود وەرگرتنیان لەبەردی"خارا"لەئەستۆدا بوو و چاودێریەکی وردیان دەکرد، بەرد تاشەکان لەچەند گروپێکی تایبەتدا بۆ دەستنیشان کردن و هەڵسەنگاندنی باشترین بەرد پشکنینیان بۆ دانە دانەیان دەکرد، هەموو فیرعەونەکان بەشێوەیەکی

گشتی بەرپرسی کاروباری کانزا و هەلومەرجی ژیانی کرێکارانی کانە کانزاکان بون، ئەرکی چاودێری هەر لەکرێکارەوە تا ئەندازیاریان لەئەستۆدا دابوو، هەر لەبەرئەوەش ڕامسیس هەستیاریەکی تایبەتی لەشەوی ساڵرۆژی لەدایکبونیدا لەبارەی ئەم جۆرە کاروبارانە نیشان دەدا. هەمان ئەم چاودێریە بووە هۆی ئەوەی لەو سەردەمەدا "ڕامسیس"ـەی بەئاڵۆزترین ڕوداو کە بەسەریدا هاتبوو ببات: لەیەکێك لەکانە کانزاکاندا کەسێك کارەساتێکی بەسەردا هات...

"شنار"داوای ئەوەی کردبوو ڕێی پێ بدرێت ژیانی لەباشوردا بەسەر ببات و لەپەرستگایەکدا گۆشەگیر ببێت! شنار ئامانجێکی لەم داواکاریەدا هەبوو: ئەویش چاوپێکەوتن لەگەڵ موسادا بکات. شنار بە بەدەستهێنانی ئەم مۆڵەتە توانی بەهەر شێوەیەك بووە، لەگەڵ ئەو زانیاریانەی لەڕێی سیخوڕەکانیەوە بەدەستی هێنابوو خۆی بگەیەنێتە لای موسا. "موسا"ش سروشتی بەهێزی بەهێزتر بوبو، بە بینینی شنار کە زۆر قەڵەو بوبوو هەم سەری لێی سورما و هەم پێی شڵەژا.

شنار پرسی: سڵاو لە موسا، سەرقاڵی چیت؟

"موسا"ش پێی وت: خۆم فێری چەندکارێك دەکەم.

شنار وتی: بەڵام"نف"ی تەلارساز تۆ کەسێکی شارەزا و لێهاتویت.

موسا وتی: لەچەورەیی و زمان لوسی زۆر بێزارم، چ کارێکت پێمە کە تا ئێرە هاتویت بەدوامدا؟

شنار پرسی: وا بزانم بە بینینم زۆر خۆشحاڵ نەبیت و لەکاتکای دڵتەوە ڕقت لێم بێت.

موسا وتی: لەوباوەڕەدام ئەمە هەستێکی دوو فاقەیە، پێم بڵێ لەپێناو چیدا ئازاری ئەم ڕێگاو و گەشتەت گرتووەتە بەر و تا منت نەدۆزیەوە دەستبەردا نەبویت؟

شنار وتی: بۆ بەدەست هێنانی هەندێك هێمنی و ئارامی، دەبێت پێت بڵێم بەهۆی هەڵبژاردنی ڕامسیس وەك جێگری سەرۆك خەنجەرێکی ژەهراوی لەپشتم داوە، براکەم پیاوێکی زۆر نیەت خراپە، دەمەوێت تۆ بکەمە دادوەر و داوای دادوەری لەتۆ بکەم، ئایا ئەو پلەوپایە شایستە منە یان نە؟

موسا وتی: مەبەستی خۆتم بەجوانی پێ بڵێ و بێ پەردە قسەم لەگەڵدا مەکە.

شنار وتی: دەبێت لەوە ئاگادارت بکەمەوە ئایندە و چارەنوسێکی مەزن چاوەڕێی موسا دەکات. تۆ دەبێت بەهیچ شێوەیەك متمانە بە"ڕامسیس"نەکەیت. چونکە بەهیچ شێوەیەك جێی متمانە نیە و هەرئەوەی لەسەر تەختی پادشایەتیدا دانیشت تەواوی هاوڕێکانی خۆی لەناو دەبات.

موسا وتی: دەتەوێت چیم پێ بڵێیت؟

شنار وتی: دەمەوێت هاوکاری و بەرگری لەمیسر بکەم، ڕزگاری میسر و تەنها ئامانجم خزمەتکردنی میسرە.

موسا وتی: ئەی شنار! باش بزانە خوداکان هاوار و دەنگ و گوتەکانت دەبیستن و ئەوەش باش بزانە کە زۆر لەدرۆ بێزارن.

شنار وتی: خوداکان ئایندەی میسر دیاری ناکەن، ئەوە ئێمەین کە ئایندەی میسر تۆمار دەکەین، دەمەوێت دەستی هاوکاری و دۆستایەتی بۆ موسا ڕابکێشم، پێکەوە کار بکەین!

موسا وتی: بێهودە ئازاری ئەم ڕێگایەت لەئەستۆ گرتووە شنار، بۆیە لەکۆشك هاتمە دەرەوە بۆئەوەی لەم جۆرە بابەتانە دور بکەمەوە و خۆم بەهەندێك شتی ترەوە سەرقاڵ بکەم، لەبەرئەوە وازم لێ بهێنە، چونکە باوەڕ ناکەم لەمبارەیەوە هیچ هاوکاریەکت بکەم.

شنار وتی: موسا تۆ هەڵەیت، زۆریش هەڵەیت.

موسا وتی: ئەگەر دەتەوێت پەنا بۆ زۆر ببەم، پێداگریەکی زیاترم لێ بکە و بەگوتەکانت ئازارم بدە.

شنار وتی: ڕۆژێك دێت پەشیمان دەبیتەوە... دوای ئەم گوتانە موسا بەتوڕەیی چاودێری ڕۆشتنی شناری کرد.

***

"دولانت"ی خوشکی ڕامسیس-هاوسەری ڕاهێنەری کەپ" هاواری کرد: لاچۆ لەبەرچاوم دەمەوێت جێگری سەرۆك ببینم.

ئامنی بەرپرس و نوسری ڕامسیس ڕێی لێگرت و وتی: دەبێت سەرەتا داوای مۆڵەت بکەیت.

دولانت وتی: تۆ داوای مۆڵەت لەکچی فیرعەون کە بۆ چاوپێکەتنی براکەی هاتووە دەکەیت؟ دوای ئەم قسانەی بەهەردوو دەستی پاڵی نا بە"ئامنی"ەوە و خۆی کرد بەژووری جێگری سەرۆکدا.

لەوکاتەدا ڕامسیس سەرقاڵی خوێندنەوەی چەند فەرمانێك بوو کەلەلایەن فیرعەونەوە گەشتبوو و دەبوو یەکسەر جێبەجێی بکردایە.

دولانت هاواری کرد: ناتەوێت هیچ کارێکم بۆ بکەیت؟

ڕامسیس پرسی: بۆچی بەزۆر خۆت کرد بەژووردا؟

دولانت وتی: خۆ ناتەوێت بڵێیت ئاگاداری هیچ شتێك نیت.

ڕامسیس وتی: تۆ سەرەتا بۆم ڕون بکەرەوە.

دولانت وتی: بە بەرزبونەوەی تۆ بۆ ئەم پلەوپایەیە ساری هاوسەرم چاوەڕێی ئەوەی دەکرد پلەکەی بەرز بکەیتەوە، تۆش دەبێت پلەکەی بەرز بکەیتەوە، ئەو کارەی خۆی دەیەوێت و حەزی لێیەتی پێی ببەخشیت.

ڕامسیس وتی: ڕاستە من جێگری سەرۆکم، بەڵام فیرعەون نیم، ئەو پلەوپایەی کە خوشکەکەم بۆ هاوسەرەکەی لێم داوا دەکات، لەدەستەڵاتی فیرعەوندایە، من ئەو دەستەڵاتەم لەدەستدا نیە.

دولانت وتی: سەردانی باوکیشم کردووە، ئەو ڕازی نیە ئەم جۆرە پلەوپایەیە ببەخشێت بەئەندامانی خێزانەکەی.

ڕامسیس وتی: کەواتە منیش هیچ دەستەڵاتێکم لەدەستدا نیە.

دولانت لەوکاتەدا تورە بوو و وتی: ئەم جۆرە قسانە بەگوێمدا ناچن، تۆ دەبێت سەرپەرشتی هەموو خەزێنەکان ببەخشیت بەساری هاوسەرم.

ڕامسیس وتی: بەواتا تۆ دەتەوێت بڵێیت هەم دەست لەکاروبارەکانی فیرعەونەوە بدەم، لەهەمان کاتیشدا دژایەتی بکەم؟

دولانت وتی: تۆ هیچ کات ترسنۆك نەبویت، من خوشکتم هەنگاوێك لەپێناو مندا بنێ.

**ڕامسیس وتی: هەر لەسەرتای ئەم بەرپرسیاریەتیەی کە پێم بەخشراوە دەتەوێت ناچارم بکەیت بەڕێی هەڵەدا بڕۆم.**

**دولانت بەتوڕەییەوە"ڕامسیس"ی بەجێ هێشت و"ڕامسیس"یش دوای ڕۆشتنی خۆشکەکەی سەرقاڵی پشکنینی ئەو گوزارشتە سامانیانە کرد کە لەلای "ئامنی"ەوە هاتبوو. دوای ماوەیەك ئاگاداری ئەوە بوو نوسەرانی "کاتب"شنار هەلی باشیان بۆ خۆیان قۆستوەتەوە، دوای ئەو پشکنینە ڕامسیس"شنار"ی برای بانگ کرد. شنار بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا زۆر خۆشحاڵ بوو.**

**ڕامسیس وتی: ئایا تۆ چاودێری ڕاستەوخۆی نوسەر و ژمێریارەکانی خۆت کردووە یان نە؟**

**شنار وتی: بەگشتی بەڵێ، بەڵام لەکاروبارە لاوەکیەکاندا نەخێر.**

**ڕامسیس وتی: کاروباری کاغەزی"پاپیرۆس" و ئەو مامەڵانەی بەمانەوە پەیوەست دەکرێن کاروباری گشتین یان لاوەکی؟**

**شنار وتی: مەبەستت چیە! گرفتێك هەیە؟**

**ڕامسیس وتی: باش بزانە ئەوانەی هەڵەیان لەم کارانەدا کردوو بەتوندی سزایان دەدەم.**

**شنار وتی: دەمەوێت لەمەودوا لەژێر چاودێری براکەم و بەپێی فەرمانی ڕامسیس کاروباری بازرگانی بەڕێوە ببەم.**

**ڕامسیس سەری لەگۆڕینی بارودۆخی شنار سوڕما و وتی: پێشنیارێکی تازە شك دەبەیت؟**

**شنار وتی: ئێمە براین، دەبێت شان بەشانی یەکتری کار بکەین و پشتی یەکتری بگرین و دژایەتیەکانمان ولا بخەین. تۆ جێگری سەرۆکی من بە بەڕێوبەری کاروبارەکان دەستنیشان بکە، بەم شێوەیە کاروبارەکان باشتر بەڕێوە دەچن...**

**شنار بەم دوایین ڕستەیە "ڕامسیس"ی بەجێ هێشت... ڕامسیس نیگەرانی گۆڕانی لەناکاوی شنار بوو و زۆریش لێی بەگومان بوو، بۆیە بەئامنی وت: پلانێکی نوێی لەژێری سەردایە، سەرەڕای ئەوەش فەرمانێك لەلایەن فیرعەونەوە هاتووە و دەڵێت بەیانیان لەگەڵ ئەودا بەشداری لەمەراسیمی بەیانیان بکەم...**

ستە هوس-شاژنی میسر-شابانوی جوانی کۆشکی فیرعەون جیاواز بوو لەهەموو ژنانی ئەو کۆشکە، مەراسمی هەڵبژاردنی سرود بێژەکانی بۆ بەشداری کردن لەئاینی پەرستنی"حانحور" لەپەرستگادا لەئەستۆ گرت. لەم مەراسیمەدا کچانی لاو بۆئەوەی بەختی خۆیان بۆهەڵبژاردن تاقی بکەنەوە بەسەختترین ئەزموندا تێدەپەڕین، ئەم کچانە لەسەرتاسەری میسرەوە هاتبون بۆ"تبس" لەنێو هەموو ئەم کچانەدا تەنها کچێك کارەکانی بەرجەستە و شایەنی دەستخۆشی بوو ئەویش شاژنی فیرعەون بوو، چیتر دوای ئەوە ئەو ئەزمون و تاقیکردنەوەیە کۆتایی پێهات و لەو ئێوارەیەدا نۆرەی ناساندنی کەسی براوە و ئەنجامدانی چەند مەراسیمێك کە بەو یادەوە پەیوەست بوو. لەباخی پەرستگادا میوانداریەکی خواردنیان بەبۆنەی دەستگیراندارە ئامادەبوەکان ڕێك خست و هەموو نیگاکان ئاڕاستەی کچێکی بێدەنگ بوو کە عود بەدەست ئاوازێکی بۆ ژەنین ئامادە کردبوو. ناوی ئەو کچە"نفر تاری"بوو کە پەیوەندیەکی ئاشکرای لەگەڵ "ڕامسیس"دا هەبوو. شاژن لە"نفر تاری"نزیك بویەوە و دەستخۆشی و ستایشی لێکرد. عود ژەنی جوان خۆی بەشاژن ناساند: ناوم "نفر تاری"ە.

ستە هوس پرسی: لەکوێیت و چۆن فێری ژەنیاری بویت؟

نفر تاری وتی: من خەڵکی"تبس"م و خوێندکاری بارەگای"میر ئور" بوم و خوێندنیشم لەوێ تەواو کردووە.

شاژن وتی: وەك لەڕوخسارتدا دیارە زۆر دڵت بەم هەڵبژاردنەت خۆش نەبێت، بەڵام دەبێت خۆشحاڵ بیت.

نفر تاری وتی: خۆشحاڵم بەڵام دەبێت هەرچی زوترە بگەڕێمەوە بۆ پەرستگای ئامون و پەیوەندی بەکارمەندانی ئەوێوە بکەم.

شاژن پرسی: دەتەوێت کەسێکی گۆشەگیرت لێ دەربچێت؟

نفر تاری وتی: ئاشنا بون بەنهێنیەکان ڕێگا و ئامانجی منە.

شاژن وتی: تۆ زۆر لەوە لاوتری کە دەست لەم جۆرە کاروبارانەوە بدەیت، بۆچی چێژ لەسەردەمی لاویەتیت وەرناگریت؟

نفر تاری وتی: بەلای منەوە پەرستن و مەراسیمی ئاینی مەزنترین چێژە.

ستە هوس پرسی: نیازت نیە پەیوەندی هاوسەری پێك بهێنیت؟

نفر تاری وتی: هیچ بیرم لیٚ نەکردووەتەوە.

ستە هوس-شاژنی میسر-وتی: ژیان لەپەرستگادا بۆ کچێکی وەك تۆ بێزارکەرە..... دوای ئەوە وتی: ئەگەر لەباتی ئەوەی لەپەرستگای"ئامون"دا گۆشەگیر ببیت و خۆت سەرقاڵی عود ژەنین بکەیت، پێشنیارێکت لیٚ بکەم پەسەندی دەکەیت؟

نفر تاری پرسی: چ پێشنیارێکم لیٚ دەکەیت؟

-ستە هوس"ی شاژن وتی: لەکۆشکدا ببیتە سەرپەرشتی کاروباری ناو ماڵەکەم! من لەکۆشکدا هاودەم و هاوڕێیەکی پیرم هەبوو و ماوەیەك لەوەوپێش کۆچی دوایی کرد، بۆیە دەمەوێت ئەو پلەوپایە ببەخشم بەتۆ! بەلاتەوە چۆنە؟

نفرتاری وتی: ئەزمونی من ژەنینی عودە، نەك بەڕێوبردنی کاروباری ناوماڵی شاژنی میسر.

شاژن وتی: فێرت دەکەن!

نفر تاری وتی: ماوەم بدە بیری لیٚ بکەمەوە.

ستە هوس ڕاهاتبوو بەوەی پێش هەڵهاتنی خۆر لەخەو هەستێت، چونکە زۆر چێژی لەهەڵهاتنی خۆر وەردەگرت و پێی ڕاهاتبوو. "نفر تاری"یش دەقاودەق هەمان خوی هەبوو، لەبەرئەوە ئەوە هەردوکیان پێکەوە هاوکات بەرنامەی ڕۆژانەیان هەماهەنگ دەکرد. "نفر تاری"دوای چەند ڕۆژێك وەڵامی ڕەزامەندی پیٚ ڕاگەیاندبوو و سەرقاڵ بوو بەفێربونی کاروباری ناوماڵەوە، سەرەڕای ئەوە هەموو شتێك نامۆ دەهاتە بەرچاوی. لەیەکێك لەڕۆژەکانی سەرقاڵ بونی بەکارەوە. شنار هات بۆ لای دایکی و یەکسەر داوای لێکرد بڵێت بەهاوڕێکەی بڕواتە دەرەوە بۆئەوەی دو بەدور چەند گفتوگۆیەکی نیهێنی لەگەڵدا بکات.

ستە هوس پرسی: گفتوگۆکەمان ئەوەندە نهێنی ئامێزە کە پێویست بەوە بکات بڵێم بەهاوڕێکەم بڕواتە دەرەوە و گوێی لەهیچ گفتوگۆیەکمان نەبێت؟

شناری وتی: بەڵیٚ وایە دایە گیان!

"ستەهوس"یش بەهێمای دەستی تێیگەیاند کە بڕواتە دەرەوە و بە"شنار"ی کوڕی وت: ئێستا پێم بڵێ!

"شنار"یش وتی: دودڵم لەوەی ئایا پێت بڵێم یان نە.

"ستە هوس"ی شاژن وتی: بڕیارت داوە بێیت بۆ لام و ئەوەی لەدڵتدایە پێم ڕاگەیەنیت، بەڵام کاتێك ئەو هەلەت بۆ ڕەخساوە دودڵ بویت؟

شنار وتی: لەوە دەترسم قسەکانم دایکم ئازار بدات.

ستە هوس بەنیگەرانیەوە لێی پرسی: ئایا شتێکی دڵتەزێن ڕویداوە؟

شنار وتی: دایەگیان هەڵت هێنا، فیرعەونی باوکم و ڕامسیس و هاوڕێکانی دیار نەماون!

شاژن وتی: ئایا دڵنیایت لەوەی ون بون.

شنار وتی: ماوەیەکی زۆرە ڕۆشتون بۆ ناو بیابان. ڕۆشتون بۆئەوەی بەدوای کۆڵبەرانی ئاڵتوندا بگەڕێن، بەڵام هیچ هەواڵێکیان نیە.

"ستە هوس"ی شاژن وتی: ئەگەر شتێك بەسەر فیرعەونی باوکتدا بێت یەکسەر منی لێ ئاگادار دەکەنەوە.

شنار پرسی: بەچ شێوەیەك؟

"ستە هوس"ی شاژن بۆی ڕونکردەوە: لەنێوان من و باوکتدا پەیوەندیەکی نهێنیمان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بگرە ئەو کاتانەش کە لەیەکتر جیا ببینەوە، بەشێوەیەك لەشێوەکان هەست بەباری دەرونی یەکتری بکەین، دڵنیابە لەوەی باوکت هیچی شتێکی بەسەردا نەهاتووە و تەندروست و باشە.

شنار وتی: دایە گیان ئێمە نابێت تەنها پشت بەم گوتانەی تۆ ببەستین، وڵات لەو جۆرە هەستانەی تۆ باسی دەکەیت جدی ترە.

ستە هوس وتی: پێویست بەوە ناکات ئەوەندە خۆت نیگەران بکەیت، ئەگەر فیرعەون بەڵایەکی بەسەردا بێت من و هاوڕێکانم سەرتاپای وڵات بەدوایاندا دەگەڕێین.

شنار پرسی: پێویستت بەهاوکاری من نیە؟

ستە هوس وتی: ئەگەر بیر لەوە بکەیتەوە لەسەروی ئەو کەسانەی دەڕۆن بۆئەوەی فیرعەون لەبیاباندا بدۆزنەوە دابنێم، بەهەڵەدا چویت.

شنار وتی: هۆکارێك لەپشت ئەمەوەیە کە تۆ ئەم بەرپرسیاریەتیەم پێناسپێریت؟

ستەهوس وتی: گوێ لەهاواری ویژدان و دەرئەنجامی کارەکانت بگرە.

لەڕاستیدا "ستە هوس" بەهۆی نیگەرانی شنار یان هۆکاری ئەوەی شنار داوای کرد بڕوات بۆ ناوبیابان تا بەدوای ونبونی چەند ڕۆژەی فیرعەون و ڕامسیسدا و هاوڕێکانیدا بگەڕێت، چەند کەسێکی نارد بۆئەوەی بەدەوایاندا بگەڕێن. ئەو نوێنەرانەی بۆ گەڕان نێردران لەچەند کەسێك زیاتر نەبون بەدەستی کۆمەڵێك دەوار نیشین کە کەتبونە بۆسەیانەوە کوژران. بەهۆی نەگەڕانەوەی ئەمانە، سیخوڕەکانی "شنار"بەمشێوەیە دەنگۆیان بڵاو کردووە کە فیرعون و هاوڕێکانی بونەتە قوربانی جادویەکی شوم و لەناوچون. شنار بەئاگادار بون لەم ون بونە هەوڵێکی زۆری دا بۆ تێکدانی بارودۆخەکە، بەڵام بەهۆی هۆشیاری دایکی-شاژن ستە هوس- پلانەکەی شناری پوچەڵ کردەوە، بەڵام هێشتا هیچ هەواڵێك لە فیرعەون و ڕامسیس و هاوڕێکانیەوە نەگەشتووە، ئەم درەنگ بونەیان شاژنی دڵگران کرد و"ئامنی"نوسەری "ڕامسیس"ی بانگکرد و ئەوی بەسەرۆکایەتی کۆمەڵێکی شایستە نارد بۆ بیابان بۆئەوەی بەدوای فیرعەوندا بگەڕێن.

کەسە گەڕۆکەکان بەرەو ئەو چاڵانە ڕۆشتن کە فیرعەون و ڕامسیس ڕویان تێکردبوو: بەڵام هیچ کەسێك لەناو نەچوبوو جێگری سەرۆك و هاوڕێکانی لەمەرگێکی ڕاستەقینە ڕزگاریان بوو، چونکە"شنار"تەواوی بیرە ئاوەکانی سەر ڕێی فیرعەون و ڕامسیسی ژەهراوی کردبوو، بەڵام بەهۆی هۆشیاری"ڕامسیس"ەوە دوای نەخۆش کەوتنی چەند کەسێك لەهاوڕێیانی بوە هۆی ئەوەی تیری"شنار"ئامانجی خۆی نەپێکێت، چونکە شنار پێشوەخت لەدواین دانیشتنی لەگەڵیاندا ئاگاداری ئەوە بوو کە ڕامسیس و باوکی دەیانەوێت بۆ چ شوێنێك بڕۆن، بۆیە هاوڕێکانی نارد بۆئەوەی بیرە ئاوەکانی سەر ڕێیان ژەهراوی بکەن.

فیرعەون هەر ئەوکاتەی گەڕایەوە کاروباری وڵاتی گرتەوە دەست و دەربارەی پلانەکەی"شنار"ڕاوێژی لەگەڵ "ستە هوس" و جێگری سەرۆکدا کرد...

تەلارسازەکان نەخشەکانیان بەرفراوانتر کرد و گفتوگۆی هونەریان لەنێوان خۆیاندا دامەزراند. "نف"بەشێوەیەك لەو دورگە بچوکەدا سەرگەرمی بواری ئەندازیاری و هونەری تایبەت بەتەلارسازی بوو و بەشێوەیەکیش موسای فەرامۆش کردبوو کە بگرە ئاگاداری ئەوەش نەبوو"شنار"ی کوڕی فیرعەون کە سات لەدوای سات هەولی ڕاوکردنی موسای دەدا، لەوێدا لەگەڵ موسادا دەستی کردووە بەگفتوگۆکردن. "موسا"ش بۆ نائومێدکردنی شنار ئەوی بەجێهێشت و ڕۆشت بۆ لای"نف" و بینی ئەو و سێ تەلارسازی تر بڕێك نان و خورمایان لەبەردەمیاندا داناوە و چاوەڕێیان دەکرد. خواردنی سادەی ئەندازیارەکان لەناو جەرگەی ئەو دورگەیەدا بەناونیشانی خواردنێکی خۆش بۆ ئەو چەند کەسە زۆر چێژبەخش بوو و بەتامەزرۆوە دەستیان بەخواردنی کرد. ئامانجی دواییان دورگەیەك بوو کە زۆر لەم دورگەیەی تریان دور نەبوو. لەو دورگەیەشدا بڕیاربوو خەزێنەیەکی گەنم بنیات بنێن. "موسا و نف و هاوکارەکانی چونە ناو ئەو دورگەیەوە و دەستیان کردن بەلێکۆڵینەوە و پشکنینی ئەو شوێنە. موسا کەمێك پیاسەی بەنێو ئەو دورگەیەدا کرد تا گەشت بەچەند پیاوێکی ڕیش درێژ و تا ڕادەیەك ڕوت کە بەسەختی سەرقاڵی هەندێك کاری بێزارکەر بوون. موسا گوێی لەگفتوگۆیان گرت، زمانی گفتوگۆیان لەگەڵ زمانی گفتوگۆی میسریدا زۆر جیاواز بوو. لەهەمان ئەو کاتەدا چەند گەمێ و کەشتیەکی پڕ لەکەرەستەی بنیاتنان لەلەنگەرگادا کەناری گرت و بارەکەیان خاڵی کرد.

سەرۆکی ئەندازیاران موسای بردە ناوچەیەکی ئەو دورگەیەوە و لێی پرسی: بەشە زەوی ئەم دورگەیە بە چ شێوەیەك لێك دەدەیتەوە؟

موسا وتی: زەوی ژێرپێم زۆر ڕەقترە لەبەشە زەویەکانی تری ئەم دورگەیە.

"نف"ی تەلارساز بەم شێوەیە بۆ موسای ڕونکردەوە: هۆکاری ڕەقی و بتەوی ئەم زەویە ئەو خەزێنەیە کە لەژێر ئەم زەویەدا دروستم کردوەو، لەژێر ئەم بەشە زەویەدا خەزێنەیەکی گەنم هەیە، ئەم بەشە بەخاك و بەردیەوە کە لەناوچەیەکی ترەوە هێنراوەتە ئێرە، لەشوێنەکانی تر بەرزترە.

موسا وتی: ئەو خەندەقەی کە بەچواردەوری دورگەدا هەڵکەنراوە چیە؟

"نـف" بـۆی ڕونکـردەوە: هەربەوشـێوەی دەیبینـی، ئـاوی نـاو ئـەم خەندەقـە کۆکراوەتەوە، ئەم ئاوە هەرچەند ڕۆژ جارێك خاڵی دەکرێتەوە، ئەم خەندەقە بۆ ئاوە چۆڕکردنی زەوی ئامادە کراوە.

موسا وتی: ئاوەچۆڕ چیە؟

نف وتی: هەرشوێنێك لیتە و شێدار بێت بۆ وشککردنی ئەو زەویە بەچواردەوری ئەو زەویە شێدار و لیتەدا خەندەقێك هەڵدەکەنن بۆئەوەی لەڕێی شێداری زەویـەوە وەك ئاوەچۆڕ لەچینی خوارەوەی زەویەوە تێپەڕێت و ڕۆبچێتە ناو ئەم خەندەقانەوە تا وردە وردە وشك دەبێت.

موسا وتی: ئایا تۆ بیرۆکەی ئەم خەندەقانەت داهێنا؟

نف وتـی: دوهـەزار سـاڵ لـەوەوپێش ئـەم جـۆرە خەندەقانـەیان داهێنـاوە، بـەواتا پێنج سەد ساڵ پێش بنیات نانی قوچەکیەکان ئاگاداری شێوازی ئاوەچۆڕکردن و دروستکردنی خەندەقەکان بون.

موسا وتـی: دەزانم کە فیرعـەون زۆر حـەزی لەدروست کردنـی بینـا بەردینەکانـە، بۆئەوەی بەهۆی هۆکارە ژینگەیەکانەوە وێران نەبێت، بەڵام بۆچی ئـەمڕۆ کەشتیەك خشتت هێنـا بـۆ ئـەم دورگەیـە؟ ئایـا دەتـەوێت خەزێنـەی گـەنم بـە خـشت دروست بکەیت؟

نف وتـی: تـا ئێـستا خەزینـەی دانەوێڵـەکانمان بـە بـەرد دروسـت دەکـرد چـونکە دەمانزانی لەئاوهەواوی وشکی بیاباندا بەرد ئارەق ناکات و شێدار نابێت.

موسا بەسەرسوڕمانەوە پرسی: بۆچی بەردیش عارەق دەکات؟

نف وتی: بەڵێ لەناوچە شێدارەکاندا بەردی ناو خەزێنەکان عـارەق دەکـەن، بـەڵام ناوچەکانی وەك ئەم دورگەیە کە بـەردەوام هـەوای هەیـە بەهیچ شێوەیەك ناهێڵێت بەرد عارەق و شێدار ببێت.

موسـا وتـی: ئـەم بابەتـە بەلامـەوە زۆر تـازە بـوو، کەواتـە خەزێنـەی ئێـرە بـەچ کەرەستەیەك دروست دەکرێت.

نف وتی: بناغەی ئەم خەزێنانە بە خشت و دیوارەکەشی بەبەرد.

***

سەردانی وڵاتی "کوش"کاریگەریەکی زۆری کردە سەر "موسا" و کاتێکیش لە"کوش"گەڕایەوە ڕۆشتەوە بۆ کۆشك، بەڵام ئەم "موسا"یە "موسا"کەی جاران نەبوو، چونکە خۆی لەهەموو شازادەکانی تر دورەبەپەرێز دەکرد و ئەوانیش کاتێك ئەویان بەوشێوەیە دەبینی هیچ گرنگیەکیان پێ نەدەدا. سێ ڕۆژ دوای ئەوە گەشتێکی سێ ڕۆژەیان بۆ شازادەکان ڕێکخست بۆئەوەی سەردانی "بوتو"٢٢ بکەن. موسا نەیدەویست بڕوات، بەڵام دایکی "ئنخاس ئامون"هانی دا لەگەڵیاندا بڕوات. "موسا"ش لەگوێی دایکی کرد و لەگەڵیاندا ڕۆشت. لە"بوتو"دا سۆزانیخانەیەکی مەزن پیاوەکانی بەلای خۆیدا پەلکێش دەکرد و شەوانیشی زۆر قەرەباڵغ دەبوو، لەڕۆژیشدا دەلاڵەکان لەبازاڕی کۆیلە فرۆشیدا بازاڕێکی گەرمیان هەبوو. موسا کاتێك سواری کەشتی بو نەیدەزانی دەیانەوێت بۆ کوێ بڕۆن و شازادەکانیش لەبارەی ئەم گەشتەیانەوە باسی هیچیان نەکردبوو. موسا کاتێك خۆی کرد بەناو شاردا و خۆی کرد بەناوچەیەکی ئەو شارەدا، بینی بارودۆخی خەڵکی زۆر ئاساییە، ژنەکان تاڕادەیەك ڕوت، پیاوەکانیش مەست بون و لەکاتی ڕێکردندا ڕەتیان دەخوارد، لەدواییدا پێیان وت ئەم ژنانە سۆزانین و بەبینینی چەند دیمەنێکی دڵتەزێن وتی: ئەم ماڵانە چیان تێدا دەکرێت.

ڕێبەرەکەی پێی وت: ئێرە سۆزانیخانەیە ئەگەر دەتەوێت بڕۆ بۆخۆت ڕابوێرە.

موسا وتی: دەبێت هەرچی زوتر بگەڕێمەوە و لەم ناوچەیە بڕۆمە دەرەوە.

ڕێبەرەکەی پێی وت: تۆ ناچاریت تا کۆتایی لەگەڵ براکانی ترتدا بمێنیتەوە، چونکە هیچ کەشتیەك بەتەنهایی تۆ ناگەڕێنێتەوە بۆ"تبس" لەم ناوچەیەدا هەندێك شوێنی خۆشیش هەیە کە دەتوانی کاتەکانی خۆتی تێدا بەسەر بەریت.

موسا هەندێك کات لەکەنار ڕوباری نیلدا لەتەنیشت ڕاوچیانی ماسی یان ئەوانەی "گەمی"٢٣ یان هەبوو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، هەندێکاتیش قسەی لەگەڵ گوندنشینەکاندا دەکرد و لەوانەوە فێری هەندێك بابەت دەبوو کە هیچ

---

[22] بوتو: ئەسکەندریەی ئێستا.

[23] بڕۆ پەراوێزی ژمارە ٨.

مامۆستایەکی قوتابخانەکەی فێریان نەکردووە. موسا هەرچی زیاتر لەگەڵ چینی ئاسایی کۆمەڵگاکەی ئاشناتر ببوایە زیاتر پەیی بەناوەڕۆکی کۆمەڵگا و شێوازی ژیانیان دەبرد.

# موسا و جیهانێکی نوێ

موسا لەتەمنی حەڤدە ساڵیدا زانی جوانی ڕاستەقینە چیە و پەیی بەوەش برد کە بۆچی دایکی بەهۆی لەدەست دانی ئەو ڕوخسارە جوانەی خەمگین بووە. ئەو دایکی وەك شاژنێکی میسر دەبینی، ئێستا بەلەدەستدانی جوانیەکەی ناتوانێت زۆر ببێتــەی مایــەی سەرنجڕاکێــشانی دەوروبــەری، هــەر لەبەرئــەوەش زۆربــەی کاتەکانی لەگەڵ دایکیدا تێدەپەڕاند بۆئەوەی هەست بەتەنهایی نەکات و خەمگین نەبێت. "ئنخاس ئامون"کاتێك دەیبینی موسا لەتەنیشتیەوەیەتی زۆر خۆشحاڵ دەبوو و دەیبینی کوڕەکەی لەڕوی جوانی ڕوخسار و ئەندامی جوانیەوە لەلاوەکانی تر جیاوازترە. بەهاوسەنگی گەورەتر بونی موسا دایکی پیرتر دەبوو. کاهینی مەزنیش کە هەندێکات سەردانی دەکردن، زۆر باش ئاگاداری ئەو جیاوازیە بوو، هەروەها دەیزانی بێ لەحاڵەتی پیربونی"ئنخاس ئامون" هەڵگری نەخۆشیەکیشە کە دەبێت سەری کونبکرێت و نەشتەرگەری مێشکی بکەن، کاتێك باسی ئەم بابەتەی بۆموسا کرد، موساش پێی وت: هەرئێستا لەلای دایکم بوم، بەڵام باسی ئەم نەخۆشیەی بۆ نەکردم.

سەرۆکی کاهینەکانی کۆشکی فەرمانڕەوایی بەم شێوەی بۆی ڕونکردەوە: دایکت نەیدەویست باسی ئەم بابەتەت بۆ بکات، چونکە لەوە دەترسا تۆ دڵگرانی بیت و خەمی بخۆیت.

موسا وتی: ناحەقی نیە، چونکە هەرئێستاش بەبیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵگران بوم..... لەبەرئەوەی نەیدەویست لەوە زیاتر لەبارەی دڵگرانیەکانی دایکی قسە

بکات، بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: ئەی کاهینی مەزن دەربارەی ئەو پلانەی باست کرد دەتەوێت چی بکەیت؟

ئامون تپ بۆماوەیەك بەسەرسوڕماوی بێدەنگ ڕاوەستا و نەیتوان تێبگات لەوەی موسا مەبەستی چیە و موساش ناچار بوو ئاماژەی پێبدات، دەربارەی خستنە ڕووی گرنگی دان بەخودای "ئاتون" بۆماوەیەك "ئامون تپ"پەنجەی خستە لوتی و تەماشای چواردەوری کرد، دوای ئەوە لەسەر خۆ وتی: هێشتا کاتی ئەنجامدانی ئەو پلانە نەهاتووە.

موسا پرسی: کەی دەتەوێت ئەم پلانە جێبەجێ بکەیت، پێم بڵێ بۆئەوەی منیش ئاگادار بم.

ئامون تپ وتی: بەو ئاسانیەش ناتوانین بانگەشە بۆ خودای ئاتون بکەین، چونکە بچوکترین هەڵە دەبێتە هۆی لەناوچونمان.

موسا وتی: بەڵام جاری پێشوو وا بۆت باسکردم کە تەواوی خەڵکی میسر لایەنگری خودای ئاتونن!

کاهینی مەزن وتی: وام نەوت، ئەگەر ئامارژەشم بە لایەنگرانی ئاتون دابێت، مەبەستم خەڵکی نەبووە، بەڵکو نیوەی کاربەدەستە کۆنە بەتەمەنەکانە.

موسا وتی: وام دەزانی هەرئەوەی بانگەشە بۆ ئەم خودایە بکەین خەڵکی لایەنگریمان دەکات!

کاهینی مەزن دوبارە لەسەر خۆ وتی: تائێستاش کە سەرکەوتنمان لەوەدا بەدەست هێناوە کە ئەم نهێنیەمان ئاشکرا نەبێت و من و دایکت بۆئەوەی بتوانین تۆ لەئاگری فیرعەون بپارێزین کارێکی زۆر گرنگمان ئەنجام داوە.

موسا وتی: ئاگری فیرعەون؟ من هیچ هەڵەیەکم نەکردووە بۆئەوەی لەئاگری فیرعەوندا بسوتێنرێم، بۆچی دەمسوتێنێت؟

ئامون تپ وتی: فیرعەون چەند ڕۆژێك لەوەوپێش دایکتی بانگ کرد و پرسیاری تەندروستی لێکرد، ئایا دایکت باسی ئەم بابەتەی بۆ کردویت.

موسا وتی: نەخێر.

ئامون تب وتی: لەوانەیە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە نیگەرانی تۆ بێت، هەرچی بێت دایکت ڕازی بووە بەوەی کون بکەنە کاسەی سەریەوە و نەشتەرگەری مێشکی بکەن.

موسا بەدڵگرانیەکەوە لێی پرسی: دوای ئەوەی نەشتەری کرد چاك دەبێتەوە.

کاهینی مەزن وتی: ئەم پرسیارە وەڵامێکی سەیر و سادەی هەیە، ئەویش وەڵامەکەی بەڵێ- نەخێرە!

موسا وتی: ئەمە چ جۆر وەڵامێکە، وەڵام یان دەبێت بەڵێ بێت یان نەخێر.

ئامون تپ وتی: نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە بۆئەوەی باش لەمەبەستم تێبگەیت، ئەویش ئەوەیە ئەگەر بەختی چاکبونەوە و بەختی مردنی بەهۆی نەشتەرگەری مێشکی بخەینە سەر هەردو تای ترازویەکەوە و کێشانەی بکەین، هەردوو تاکە هاوسەنگ لەبەرامبەر یەکتریدا ڕادەوەستن!

موسا وتی: فیرعەون چی بەدایکم وت؟

کاهینی مەزن وتی: فیرعەون بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دایکتی تێگەیاند، لەبەرئەوەی ئەم نەشتەگەریەی ئەگەری مەرگ و ژیانیشی هەیە، پێی وت ئەگەر ڕاسپاردەیەکی هەیە ئێستا بیکات.

موسا پرسی: ئایا دایکم هیچی پێ ڕاسپارد.

کاهینی مەزن وەڵامی دایەوە: هەڵبەت، ئەویش ڕاسپاردەیەکی سادە بوو، کوڕەکەم نەکوژیت!

موسا تێکچوو و وتی: بەدڵنیاییەوە نهێنیەك هەیە وەك زۆربەی ئەو بابەتانەی ئاگام لێیان نەبوو، بەڵام لەدەرەوەی کۆشك تێکەشتم چ باسە، تۆش ناتەوێت پێم بڵێیت... دوای ئەوە بەردەوام بوو: فیرعەون چ وەڵامێکی دایەوە.

کاهینی مەزن لەسەرخۆ پێی ڕاگەیاند: فیرعەون بەڵێنی بەدایکت دا، تا ئەوکاتەی موسا دژم پلانڕێژی نەکات!

موسا وتی: چ پلانێك دەتوانم دژی فیرعەون داڕێژم؟

ئامون تـپ وتـی: بۆنمونـە هـەمان ئـەو داوایـەی لـەبارەی"ئـاتون"کـردت، بـەواتا بانگەشـە بـۆ ئـاتون بکـەیت! ئەمـەش خـۆی بـۆ خـۆی بـەجۆرێك پلانرێـژی لەقەڵـەم دەدرێت و سزاکەشی مەرگە.

موسا وتی: تۆ حەز دەکەیت ئێرە بەجێ بهێڵین؟

کـاهینی مـەزنی کۆشـك پرسـی: بـڕۆین بـۆ کـوێ؟ سـەرەڕای ئـەوەش بۆچی لێـرە بڕۆین؟

موسـا وەڵامـی دایـەوە: چـونکە لـەوباوەڕەدام گیانـت لەهەڕەشـەی مەرگـدا بێـت، ئەگەر فیرعەون کـەمترین بـۆنی ئـەوە بکات کـە تـۆ"ئاتون"پەرسـتی، لـەناوت دەبـات. گالیسکەیەك دەکڕین و دەڕۆین بۆ میسری سەرو.

کـاهینی مـەزن وتـی: ئـەم گواسـتنەوەیەمان هـیچ سـودێکی نابێـت، چـونکە تـەنها شـوێنێك کـە ئـەم نەخـشە و ئامانجـەمان گاریگـەری خـۆی هـەبێت، لەهـەمان ئـەم شوێنەدایە، سەرەڕای ئەوەش تۆ دایکێکی نەخۆشت هەیە، دەیانـەوێت کون بکەنـە کاسەی سەریەوە و نەشتەرگەری مێشکی بکەن، بۆیە ئامادەبونت لەکەنار دایکتـەوە ئـەرکێکی ژیانیـە... موسـا کاتێـك بـیری لەنەخۆشـی دایکـی کـردەوە دەسـتی کـرد بەگریان.

ئامون تپ پرسی: بۆچی دەگریت؟

موسا لەگریان کەوت و لە کاهینی پرسی: کەی نەشتەرگەری بۆ دەکەن؟

ئامون تپ وتـی: دوای چـەند ڕۆژێکی تـر نەشـتەرگەریەکەی بۆ دەکـەن..... دوای ئەم وەڵامە موسا لە کاهین دور کەوتەوە.

تـەلاری نەشـتەگەری کۆشـکی فـەرمانڕەوایی سـتونگەلێکی زۆر مـەزنی هـەبوو، موسا پاڵی بەستونێکەوە دابویەوە و چاوەڕێی نەشتەگەریەکەی دەکرد. بێ لەموسا نزیکـەی پێـنج سـەد کەسـی تـر بۆنمونـە کاهینـەکانی کۆشـك لـەوێ ئامـادەبون، هەرئەوەی"ئنخاس ئامون"یان بـردە ژوری نەشتەرگەریەوە هـەمویان دەسـتیان کـرد بەخوێندنـەوەی"زەبـور"، بۆئـەوەی خوداکـان هاوکـاری"ئنخـاس ئـامون"بکـەن بەزیندوویی بمێنێتەوە. گروپی پزیشکانیش لەگۆشەیەکدا ئامادە و دەستیان کرد بەپێـشەکی ئەنجامـدانی نەشـتەرگەری و کـونتێکردنی کاسـەی سـەری، سـەرەڕای

ئەوەی تەواوی پزیشکەکان دەیانتوانی نەشتەرگەری بکەن، بەلام نەشتەرگەری راستەقینە و ڕێپێدراو پزیشکێك بوو کە هەلومەرجێکی تایبەتی هەبوو و دوای تێپەڕاندنی چەند خولێکی جیاواز کە چەند ساڵێکی خایاند، بەلام کاتێك پزیشکی نەشتەرگەر پیر دەبێت مۆڵەتی پێ نەدەدرا نەشتەرگەری بکات. مۆڵەتی نەشتەرگەری دەبێت لەبارەگای "ماڵی ژیان"دەربکرێت و هۆکاری پوچەڵبونەوەی مۆڵەتی نەشتەرگەریش بەهۆی ئەوەوە دەردەکرا کە پزیشکی ناوبراو بەهۆی پیریەوە دەستی دەلەرزێت و چیتر ناتوانێت بەسەر ڕگ و ماسولکەی دەست و جەستەیدا زاڵ بێت. بێ لە کاهین و پزیشکان کۆمەڵێك لەخزمەتکارە پلە یەکەکانی کۆشکیش بەبۆنەی پلەوپایەیان مۆڵەتی ئامادەبونیان هەبوو. "ئنخاس ئامون" بەجوانترین شێوە ئاڕایشت و بەهەنگاوێکی جێگیر و هێور و لەسەرخۆ و بەسەر خۆدا زاڵ خۆی کرد بەناو تەلاردا. لەناوەڕاستی تەلاردا مێزێکی بەردینی ساف و سواقدراو هەبوو، ئەم مێزە تایبەت بوو بەنەشتەرگەریەوە. بەچواردەوری ئەو مێزەدا چەند چاڵێك دروست کرابوو بۆئەوەی لەکاتی نەشتەرگەری و خوێنڕێژیدا، خوێن لەڕێی ئەو چاڵانەوە لەشوێنێکی تایبەتدا کۆ ببێتەوە و نەڕژێتە سەر زەوی. لەتەنیشت ئەم مێزەشەوە، مێزێکی تر لەهەمان شێوە دانرابوو و بەسەریەوە کەرەستەگەلێکی جیاوازی نەشتەرگەری دەبینرا"چەقۆ، پنس، سوژن"دەبینرا کە هەموویان لە"مەفرەغ" -برنزی- دروست کرابون کە زۆر ساف و جوان بوون، سەدان شوشە و گۆزەی بچوك و گەورەی پڕ لەدەرمانی جۆراوجۆر لەلایەکی ئەو تەلارەدا بەجوانی ڕیزکرابوو و دیمەنێکی شکۆمەندی هەبوو، بەلام بەگشتی ئەو تەلارە زۆر کاریگەر و تۆقێنەر دەهاتە بەرچاوی موسا، لەوانەبوو دایکی لەو شوێنەدا بمرێت. بەهاتنە ژوری"ئنخاس ئامون"پزیشکی تایبەتی فیرعەونیش خۆی کرد بەژوردا و ڕاستەوخۆ بەرەوڕوی کەسی نەخۆش ڕۆشت. سەرۆکایەتی پزیشکان لەئەستۆی کەسێکی بالا بەرز بەناوی ریکوفار"Rekufar"بوو، ئەو سەرەتا ڕۆشتە لاسەری"ئنخاس ئامون" و وتی: ئێمە ئەوەی بۆ ئەم نەشتەرگەریە پێویست بێت ئامادەمان کردووە، ئێستاش لەگەڵ پزیشکانی بەئەزمونی میسر

دەست بەئەنجامدانی ئەم نەشتەرگەریە دەکەین، لەمیسردا پزیشکێکی لەو باشترمان دەست ناکەوێت.

"ئنخاس ئامون" زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: ئەگەر بەم قسانە هەوڵی دڵنەوایی دانەوەی من دەکەیت، ئەوا دڵنیابە لەوەی بەئەندازەی گەردێکیش ترسم نیە، بگرە زۆریش خۆشحاڵم.

رکوفار وتی: ئەی خودای خۆشەویست ڕێمان پێ بدە بۆئەنجامدانی ئەم نەشتەرگەریە سەرت بتاشین.

ئنخاس ئامون زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: خۆتان ماندوو مەکەن، دوای ئەوەی قژە دەستکردەکەی سەری لابرد و سەری کەچەڵی دەرکەوت..... بەدزیەوە کوڕەکەی خستبووە ژێری چاودێریەوە، کاتێك بینی موسا گریا بانگی کرد وتی: وەر با ماچێکت بکەم، ئەوەت لەبیر نەچێت لەم جیهانەدا خەم بۆ هیچ شتێك نەخۆیت، بەتایبەت ئەوشتانەی لەسنوری دەستەڵاتی تۆدا نیە، دڵگرانی کارێکی پەسەندکراو و ژیرانە نیە، بەڵام موسا هەر دەگریا، تا ئەوکاتەی"ئنخاس ئامون"خۆی ئامادەی نەشتەرگەری کرد و پەردەیەك لەنێوان ئەو و ئامادەبواندا هەڵواسرا، چیتر موسا دوای ئەوە نەیدەتەوانی چاوی بەدایکی بکەوێت.

لەمکاتەدا"ئامون تپ"دەستی خستە سەرشانی موسا و وتی: ئایا دەتوانی لەهەلومەرجێکی ئاوادا دایکت بەجێ بهێڵیت؟

موسا وتی: پێم بڵێ ئەرێ دایکم لەکاتی ئەم نەشتەرگەریەدا ئازاری پێدەگات؟

ئاموت تپ وتی: بەوشێوەی بیستومە دەرمانێك دەدەن بەکەسی نەخۆش، کاریگەری ئەم دەرمانە بەڕادەیەکە کە کەسی نەخۆش بۆماوەی کاتژمێرێك هەست بەهیچ ئازارێك ناکات.

موسا پرسی: ئەوە چ دەرمانێکە؟

ئاموت تپ وتی: گیایەکی کێوی و ژەهراویە بەناوی"خشخاش" شیرەی ئەو گیایە چەند ناوێکی پزیشکی جیاوازی هەیە، هیچ یەك لەو دەرمانانە تائێستا نەیتوانیوە وەك ئەم شیرەی"خشخاش"ئازاری نەخۆش هێور بکاتەوە. لەبەرئەوە

ئاسودە خەیاڵ بە، دایکت بەهیچ شێوەیەك هەست بەئازار ناكات، تەنها دەبێت بزانیت چ كاتێك دێتەوە هۆش خۆی!...

# هاتنی داگیرکەری"ترۆی"بۆ میسر

"نفر تاری"بەناونیشانی بەڕێوبەری نوێی کۆشك شاژن"ستەهوس"کاتێك خۆی کرد بەژوری شاژندا چاوی بە"ڕامسیس"کەوت، ڕامسیس کاتێك چاوی کەوت بە"نفر تاری"وەك هەورە بروسکە لێی بدات ڕاوەشا و ماتی کرد، بەشێوەیەك وشك بوو کە"ستە هوس"لێی پرسی: ئایا تۆ"نفر تاری"دەناسیت؟ بۆچی سەرت لەبینینی سوڕما؟

ڕامسیس وتی: بەڵێ پێشتر چاوم پێی کەوتووە، ئەو براوەی ژەنیارانە هەروەها قسەشم لەگەڵیدا کردووە،

ستە هوس وتی: ئەو دەقاودەق هاوتەمەنی تۆیە، تەمەنی حەفدەساڵە، بەڵام وەك کچێکی جوان ناز دەکات. ستە هوس ئاگاداری ئەوە بوو کە دڵی کوڕەکەی شەیدا ئەو کچە بووە. ئاماژەی بەتەمەنی دا بۆئەوەی ڕێگایەك بێت بۆ بڕیارەکانی داهاتوی، بەڵام ڕامسیس "ی دڵ دوڕاو گرنگی بەتەمەن نەدەدا...

ستە هوس بە"ڕامسیس"ی وت: چەند ئەرکێکی قورس چاوەڕێت دەکات، باشتر وایە بۆ پێشوازیکردنی"منلائوس"ی داگیرکەری"ترۆی"خۆت ئامادە بکەیت.....

"ڕامسیس"یش دەیزانی کە میوانێکی دەستەڵاتداری هەیە، دەبێت بڕوات بۆ پێشوازیکردنی.

ڕامسیس جلوبەرگێکی سەرەکی پۆشیبوو و لە لەنگەرگادا بەشێوەیەکی سەربازی ڕێی دەکرد لەناکاو دە دانە گەمێی یۆنانی یەك لەدوای یەك لە لەنگەرگا نزیك بونەوە و لەنگەریان گرت. پاسەوانەکانیش لەیەکەمین تەماشاکردنیاندا وایان دەزانی ئەمانە گەمێی جەنگین کە بەو شێوەیەك پێکەوە یەك لەدوای یەك لەنگریان

گرت بۆیە هەندێك لە گەمێوانە جەنگیەکانی میسر خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد، بەڵام بەتەماشاکردنی ئەفسرانی میسری ئەم نیگەرانیە ڕەوایەوە ئەم پێشوازیە بەلای"ڕامسیس"ەوە زۆر ماندوکەر بوو، چونکە لاوێکی کەم حەوسەڵە و مەراسیمی ڕەسمی و پێشوازیکردن زوو بێتاقەتی دەکرد، جێگری سەرۆك وشەی بەخێربێی لەبەر خۆیەوە دوبارە دەکردەوە نەوەك لەکاتی خۆیدا هەڵە بکات. ئەو کەشتیانەی لە لەنگەرگادا لەنگەریان گرت کەشتیگەلێکی تەواو نەبون، زۆربەی بەهۆی دوایین جەنگی یۆنانیەکان زیانیان پێکەشتبوو و بەشێك لە چارۆکە و بەشەکانی تری بەسەختی تێك شکابوون و پێویستی بە نۆژەنکردنەوە بوو، بێگومان ئەم کەشتیانەی گەشتبونە ئەویٚ لەڕێیاندا توشی چەتەی دەریا بوو بون و لەگەڵ ئەوانیشدا جەنگیبون، ئەوەی لەدەریای میدترانەدا"دەریای ناوەڕاست" بەسەر کەشتیە یۆنانیەکاندا هاتبوو دەرچونیان شتێکی مەحاڵ بوو. کەشتی یەکەمیان بەپردی جوڵاوەوە پەیوەست کرا و هەموان چاوەڕێیان دەکرد کە بزانن چ کەسێك لەکەشتیەکە دادەبەزێت: پیاوێکی باڵا بەرز، چوارشانە، تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ دەبوو، قژێکی زەرد، ڕوخسارێکی زبر لەکەشتیەکەوە دەرکەوت. ئەو پیاوە بەهۆ زرێپۆشی سینە و پێی، خودەیەکیش بەهێمای ئاشتی بەسینەیەوە چەسپاندبوو، لەدوای ئەوەوە ژن و مێردێك کە لەو پیاوە باڵایان بەرزتربوو، باڵاپۆشێکی ئەرخەوانی و ئەو نیوە تاجەی کە بەنێوچەوانیەوە نابوو بڵند پایەیی ئەو دوانەی نیشان دەدا. ژن و پیاو لەپردە جوڵاوەکە پەڕینەوە و گەشتنە لای ڕامسیس. ڕامسیس وەك خانەخوێیەك ڕێوڕەسمی پێشوازی بەجێهێنا و وتی: من ڕامسیس، جێگری سەرۆکی میسر، بەناوی فیرعەون بەخێرهاتنتان دەکەم.

دوای ئەوە نۆرەی میوان هات وتی: منیش ناوم"منلائوس"ی کوڕی "ئاتریوس"ی پادشای"ئیسپارت"و هاوسەرم"هلنە"لەشاری نەفرەتی"ترۆی"ەوە دێین. ئەو شارەی بۆماوەی دە ساڵ بەجەنگەوە سەرقاڵی کردین، بۆیە داوای لێبوردنتان لێدەکەین بەهۆی ئەوەی بەکەشتیگەلێك کە لەجەنگی"ترۆی"دا زیانیان پێکەشتووە هاتوین بۆ لاتان، ئایا میسر ڕێمان پێدەدات پێش ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ"ترۆی" لێرە کەمێك هێز بەبەرخۆماندا بهێنینەوە و بحەوێینەوە؟

ڕامسیس وتی: بەهۆی ئەوەی پێتان ناوەتە خاکی میسرەوە بەخێرهاتنتان دەکەین، بەڵام مۆڵەتی مانەوەتان لەدەستی فیرعەوندایە. من جێگری سەرۆکم و جێبەجێکاری فەرمانەکانی ئەوم، ئەگەر حەزدەکەن بەمەبەستی حەوانەوەتان لێرەدا کەمێك بمێننەوە دەبێت لەناو کەشتیەکانتاندا بمێننەوە تا ئەوکاتەی داوای مانەوەتان لە فیرعەون بکەین.

بۆ ئەو مەبەستەش شورای وڵات کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ یەکدا کرد و ڕامسیس لەو کۆبونەوەیەدا وتی: ئەم کابرا یۆنانیە بەکەسێکی ساختە دێتە بەرچاوم.

"مبوك"سیاسەتمەدار و ڕاوێژکاری کاروباری سیاسی فیرعەون کە تەمەنی نزیکی شەست تا حەفتا ساڵی هەبوو زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: دیپلوماسیەت وابزانم لەگەڵ گریمان و بەخێرهاتن و نەهاتنتدا ناگونجێت، بەڵکو بەڕاستی ئەوە پادشایەکە کە دەستی هاوکاری بۆ درێژ کردوین.

ڕامسیس دوپاتی کردەوە: ئەم پیاوە خیانەتمان لێ دەکات، بەئامادەبونی لەوڵاتی میسردا بەو هەموو کەشتیە جەنگیانەوە زۆر لێی بەگومانم.

مبوك وتی: گومانکردن باشە، بەڵام پەلە کردن لە بڕیارداندا کارێکی هەڵەیە.

فیرعەون لەوکاتەدا گوێ لەگوتەی ئەندامانی شورا دەگرت، بۆئەوەی لەکۆتاییدا بڕیارێکی گونجاو و باش بدات وتی: بەباشی دەزانم"منلائوس و هلنە"ی هاوسەری بانگێشتی نانی ئێوارەیان بکەین، دوای ئەوە بڕیارێکیان لەسەر دەردەکەین، بەڵام ئەوانەی لەگەڵیدان لەکەشتیەکانیاندا دەمێننەوە تا ئەوکاتەی بڕیارەکانمان یەکلایی دەکەینەوە...

"منلائوس"بەهەنگاوێکی جێگیر لەتەنیشت"هلنە"ی هاوسەریەوە لەفیرعەون نزیك بویەوە و کاسەی کانزایی جوان لەگەڵ چەند کەوانێك کە لەدارێکی نایاب دروست کرابوو پێشکەشی فیرعەون کرد و وتی: ئەم جۆرە کەوانانەمان لەجەنگی"ترۆی"دا بەکار هێناوە، بەناونیشانی باشترین دیاری و تیژبڕترین چەك پێشەکەشی فیرعەونی دەکەین... ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵ پادشای"ئسپارت"دا هاتبون دامێنێکی چواربەشی سور و جزمەی درێژیان بەناونیشانی شێوازی جلوبەرگی ڕەسەنی ئەو وڵاتە لەبەرکردبوو و بازنەی لولی قژیشیان تا خوار شانیان

شۆڕ دەبویەوە. "ستە هوس"لەتەنیشت"هلنە"کە کراسێکی سەوز و جوانی لەبەردابوو دانیشت و"منلائوس"یش لەلای دەستی ڕاستی فیرعەوندا ڕاوەستا. پادشای"ئیسپارت"چوبووە ژێر کاریگەری شکۆمەندی"وەرزای داگیرکەر"ەوە کە لەداگیرکردنی وڵاتاندا ناوبانگیەکی مەزنی بەدەست هێنابوو. دوای ئەوە شەراب بەنێو میواناندا دابەشکرا و زمانەکانی هێنایە گۆ.

منلائوس بەم شێوەیە باسی جەنگی"ترۆی"ی کرد: چ توانا و سامان و تەمەنێکی گرابەهامان لەپشت دەروازەی"ترۆی"ەوە بەفێڕۆ دا، بۆماوەی دەیە یەك..... لەمکاتەدا ئامادەبوان لەپاراوی و زاڵبونی"ستەهوس"ی شاژنی میسر بەسەر زمانی"یۆنان"یدا کە کاری وەرگێڕانی ئەو ڕوداوەی لەئەستۆ گرتبوو سەریان سوڕما...

ڕوخساری"هلنە"لەژێر پەردەیەکی تۆڕ شێوەدا داپۆشرابوو و ستەهوس لێی پرسی: بۆچی ڕوخسارتان لەژێر ئەم تۆڕەدا دەشارنەوە؟

هلنە وتی: لەبەرئەوەی من وەك ئاژەڵێکی نەفرەت لێکراو بومە هۆی ئەوەی زۆرێك لەپاڵەوانەکان گیانیان لەدەست بدەن. منیان دزی و ئەم دزینەشم بوبەهۆی ئەوەی جەنگێکی دە ساڵە بەدوای خۆیدا بهێنێت، من بومە هۆی ئەوەی "ئسپارت"یەکان لەشکرکێشی بکەن و"ترۆی"داگیر بکەن، لەڕاستیدا ئێمە دەستپێشخەریمان لەم جەنگەدا نەکرد، بەڵام هەر بەوشێوەی پێشتر بۆم باسکردی، من هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئەم ڕوداوە بوم.

ستە هوس پرسی: ئایا تائێستا خۆت بەتاوانباری سەرەکی جەنگی "ترۆی" دەزانی؟

هلنە وتی: لەبەرئەوەی"منلائوس"هێشتا لێم نابورێت، بۆیە منیش لەژێر ئەم پەردە تۆڕەدا هەست بەئازادی ناکەم.

ستەهوس وتی: بۆچی هەست بەئازادی ناکەیت؟

هلنە وتی: چونکە زۆر ڕقم لە"منلائوس"ە، چونکە ئەوە من بوم هانم دا پەنا بۆ وڵاتی میسر ببات و کەشتیەکانی لە لەنگەرگاکانی میسردا لابدات، بۆئەوەی بتوانم

داوای پەناهەنـدەیی لەمیـسردا بکـەم! بـیری گەڕانـەوەم بـۆ ئیـسپارت هـزرم ئـازار دەدات!

سـتەهوس بـەزمانی هێماکـان بەشـێوەیەك کـە"هلنـە"ئاگـادار نـەبێت، بـەدەم خواردنەوەی مەیەوە ئەم بابەتەی بۆ فیرعەون گێڕایەوە.

فیرعەونیش وتی: دەبێت لەمبارەیەوە ڕاوێژ لەگەڵ ئەندامەکانمدا بکەم.

"منلائـوس"کـاتێ سـەری بەشـەراب گـەرم بـوو باسـی چـۆنایەتی داگیرکردنـی "ترۆی"ی بەم شێوەیە بۆ کردن: ئەم جەنگە بۆماوەی یەك دەیە درێژەی کێشا، من لەهـەموو کەسـێك زیـاتر لـەڕەفتارەکانی"هلنـە" دڵگـران بـوم، بـەڵام دەبێـت دان بەئازایـەتی"ئـەخیل" و قارەمانـەکانی تـردا بنـێم. لەڕاسـتیدا ئـەوەی یەکـەمجار پێشنیاری ئەسـپە دارینەکـەی کـرد"ئولیـسیس"بـوو، بۆئـەوەی سـەربازەکان لـەناو ئەسپەدارینەکەدا خۆیـان بشارنەوە، خـەڵکی"تـرۆی"زۆربـون و ئەسـپە دارینـەکەیان کێشایە ناو قەڵاکەیانەوە و وایان زانی سەرکەوتنیان لەم جەنگەدا بەدەست هێنـاوە. ئـەوەی لـەم نێوەنـدەدا لەهـەموو ڕوداوەکـانی تـر سـەرنج ڕاکێـشتر دەهاتـە بەرچـاو، مامەڵـەی باشـی"شـنار"بـوو لەگـەڵ"پادشـای"ئیـسپارت"دا. دواجـار دوای تکـا و پێداگریـەکی زۆری"شـنار"بوبـە هـۆی ئـەوەی فیرعـەون بەشـێوەیەکی کـاتی ڕێیـان پێبدات لەمیسردا بمێننەوە، "شنار"شەو و ڕۆژ لەتەنیشت"منلائوس"دا چاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆئـەوەی لەگـەڵ پادشـای"ئیسپارت"دا دژی ڕامسیس یـەك بگـرن و دژی ڕاپەڕن!

شنار لەباخە گەورەکەیدا بەڕۆح و گیان پێشوازی لـە"منلائوس"کرد و منلائوس لێی پرسی: تۆ کوڕە گەورەی فیرعەونیت، وا نیە؟

شنار وتی: بەڵێ.

دوای ئــەوەش منلائــوس یەکــسەر پرســیارێکی تــری لێکــرد: بــەڵام لــە لەنگەرگاکەدا"ڕامسیس"ی براتـان وەك جگری سـەرۆك پێشوازی لێکردین و داوای لەفیرعەون کرد بۆماوەیەك لێرەدا بمێنینەوە، بەڵام ئەگەر بەهەڵـەدا نەچوبێتم بـەپێی نەریتـەکانی میسر دەبێـت کـوڕە گـەورە ببێتـە جێگـری سـەرۆك و لـەدوای پادشـای میسر ئەو لەسەر تەختی پادشایەتیدا دەبێت دانیشێت.

شنار وتی: بەڵام بەداخەوە وا نەبوو، لەهەمان کاتدا فەرمانڕەوایی"ڕامسیس"ی برام میسر لەناو دەبات، چونکە براکەم توانای فیرعەون بونی نیە.

منلائوس وتی: ناکۆکی و دژایەتی کردنی تۆ لەگەڵ"ڕامسیس"دا وەك ئەوە وایە کە دژایەتی فیرعەون بکەیت، وانیە؟

شنار وتی: "ڕامسیس"ی برام فیرعەونی باوکمی فریو داوە، ئەگەر هاوپەیمانێکی جێی متمانەم لەدەرەوەی وڵات شك ببردایە دەمتوانی بەجێگیری هەنگاوەکانم بنێم و هەرئەوەی فیرعەونی باوکم کۆچی دوایی کرد لەگەڵ هاودەست و هاوکارەکانمدا"ڕامسیس"م سەرنگون دەکرد. منلائوس لەوکاتەدا زۆر بەسەختی ڕۆچووە هزری خۆیەوە...

بارەگای"میرئور"یەکەمین شوێن بوو کە لە لایەن"نفر تاری"ەوە پیشانی "هلنە" درا.

هلنە وتی: بەڕاستی ئەمە هەلێکی زۆر بێوێنەیە، دە ساڵ ڕەنجی جەنگ، ئێستاش خاکی پڕ بەپیت و جوانی میسر بۆ برینە کۆنەکانم وەك مەڵهەمێك وایە کە لەحاڵی سارێژبوندایە. لەوکاتەدا لەبەرامبەر گۆماوێکدا دانیشتبوو و بێدەستەڵات دەگریا. "نفر تاری"دڵنەوایی"هلنە"ی دایەوە و لێی پرسی: مەگەر لە"ئیسپارت"دا تۆ شاژن نیت.

هلنە وتی: منلائوس بەڕوکەش والێکی دەداتەوە، بەڵام ئەو لەپلەوپایەی پیاوێکی جەنگیدا شارێکی لەگەڵ زەویدا یەکسان کرد و کوشت و کوشتاری خستە نێو دانیشتوانەکەیەوە، تەنها لەپێناو ئەوەی هاوسەرەکەی بگەڕێنێتەوە بارەگاکەی خۆی و پەڵەی ئەم نەنگیە لەدامێنی پاك بکاتەوە، بەڵام بەلای منەوە ژیان لە"ئیسپارت"دا وەك دۆزەخ وایە..... "نفر تاری"سەری لەم گوتانەی سوڕما و بێ لەبێدەنگی هیچ کارێکی تری لێ نەوەشایەوە، "هلنە"ش بەدەم گریانەوە گەڕایەوە بۆ ژورەکەی خۆی، نفرتاریش لەوکاتەدا ویستی دڵنەوایی بداتەوە:

-شاژن"ستە هوس"دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت.

هلنە وتی: لەم ژورە ناڕۆمە دەرەوە.

نفر تاری وتی: بەڵام شاژنی میسر چاوەڕێتان دەکات، بۆ تۆ باش نیە ئەو بەچاوەڕێ بهێڵیتەوە. دوای ئەوە "هلنە"ناچار هەستایە سەر پێ و خۆی ڕازاندەوە بۆئەوەی بڕوات بۆ لای"ستەهوس"ی شاژن...

منلائوس سەری لەبینینی هونەری دارتاشی میسر سوڕما، شوێنی چاکسازی کەشتی میسر کەشتی"یۆنان"ەکانی لەماوەیەکی کورتدا نۆژەنکردەوە، چارۆکە و ئەو بەشانەی زیانیان پێگەشتبوو وەك یەکەم ڕۆژی دروستکردنیان لێکردنەوە. نەك تەنها کەشتیەکان، بەڵکو سەربازەکانیش ڕێیان پێدرا دابەزنە ناوشارەوە و خودی پادشای"ئیسپارت"یش قەرەبوی ڕۆژانی جەنگی لەمیسردا دایەوە. "هلنە"ش لەپۆشش و نەریتی تازە، لەژێر کاریگەری و پێداگری"ستەهوس"بەنەریتی میسریەکان جلی لەبەرکردبوو کە ئەو جۆرە پۆشاکانە"منلائوس" بە بێشەرمانەی لەقەڵەم دەدا. ژنانی میسر لەچاو ژنانی یۆناندا زۆر ئازاد بون، یۆنانیەکان ژنەکانیان لەماڵەکانیاندا زیندانی دەکرد، لەکاتێکدا ژنانی میسر کەسانێکی ئازاد و کۆمەڵایەتی بون و کار و ئەرکێکی جیاوازیان ئەندام دەدا. "منلائوس" لە"هلن و ستە هوس"نزیك بویەوە، بەڵام "هلنە"ی هاوسەری بەهیچ شێوەیەك گوێی نەدا بەهاوسەرەکەی و لەبەریەوە هەڵنەستا!

منلائوس وتی: هلنە ئەوە منم.

"هلنە"ش وتی: دەتبینم.

منلائوس وتی: بۆچی نەریتی ڕێزگرتن بەجێ ناهێنی؟

هلنە وتی: بۆچی دەبێت ڕێزت لێ بگرم؟

منلائوس وتی: لەبەرئەوەی هاوسەر و فەرمانڕەوای تۆم.

هلنە وتی: فەرمانڕەوای ئێرە فیرعەونە.

منلائوس وتی: دەڕۆینەوە بۆ ئیسپارت، خۆت ئامادە بکە.

هلنە وتی: تۆ بەتەنهایی دەڕۆیتەوە.

منلائوس بەتوڕەییەوە پەلاماری"هلنە"ی دا، "هلنە"ش بەچەقۆیەك کە بەدەستیەوە بوو بەرگری لەخۆی کرد و پاشەکشەی بە"منلائوس"کرد و وتی: سزای دەستدرێژی کردنە سەر ژن لەمیسردا مەرگە... پادشای ئیسپارت و

هاوسەرەکەی لەمیسردا دوچاری دەرگیریەکی خێزانی سەخت بونەوە و"ستە هوس"ی شاژنی میسر بە بینینی ئەو دیمەنە ژن و مێردی بەتەنها جێهێشت بۆئەوەی بێ دەست تێوەردانی هیچ کەسێك گرفتەکانیان چارەسەر بکەن. منلائوس گەڕایەوە شوێنی نیشتەجێ بونی خۆی کە باخی"شنار"بوو و بەهۆی تورەییەوە لەبەر خۆیەوە دەینەڕاند. کاتێك"شنار"تورەیی پاڵەوانی یۆنانی بینی، هۆکارەکەی لێ پرسی، بەڵام"منلائوس" لەوکاتەدا نەفرەتی لەئاسمان و زەوی دەکرد، پێکێك شەرابی بۆ هێنا و"منلائوس"یش هەڵیدایەوە و لەسەر زەوی دانیشت: ئەم ژنە بێشەرەفە ژیانی منی نابوت کرد...

شنار وتی: ناحەقت نیە کە بەوشێوەیە تورە بیت، بەڵام ئێرە میسرە و ژنان لەدەست نیشانی کردنی چارەنوسیاندا ئازادن.

منالائوس وتی: ئەو جۆرە شارستانیە کە ژن بیەوێت قسەی خۆی بەجێ بهێنێت لەیۆناندا بونی نیە، نەفرەت لەم ئازادیە، نەفرەت لە"هلنە"

شنار وتی: هاوار و تورەیی، گرفتەکان چارەسەر ناکات، من لەخزمەتی پادشای"ئیسپارت"دام.

منلائوس وتی: ژنەکەم بەپێی یاساکانی ئێوە دەستی داوەتە سەرکێشی کردن و سەرپێچی لەفەرمانەکانم دەکات، ئەم فیرعەونەی میسر ئەوەندە ئازادی داوە بەژنانی ئێرە کە بووەتە هۆی ئەوەی کەسێکی بێشەرمیان لێدەربچێت.

شنار وتی: پادشای ئیسپارت میوانی خۆشەویستی منە، ئەگەر من بومە فیرعەونی میسر بەدەست بەستراوی فرێی دەدەمە بەردەمت.

منلائوس سەری لەم دەربڕینە سوڕما و وتی: من دەبێت چیت بۆ بکەم؟

شنار وتی: دێر یان زوو فیرعەون کەنارگیر دەبێت، ئەو بەتێپەڕبونی تەمەنێکی زۆر خۆیی لەڕادەبەدەر ڕەنجاندووە، ئێمە تەنها پێویستمان بەکەمێك کاتە، خولێکی پشوو لەمیسردا بەڕێوەیە، لەو ڕۆژانەدا دەتوانین پێکەوە بەمەبەستی خۆمان بگەین، پادشای ئیسپارت دەبێت هاوکاریم بکات بۆئەوەی بتوانم سەرەتا "ڕامسیس"ی برام لەناو ببەم.

منلائوس وتی: بۆ تەمێدانی هاوسەرەکەم هەرکارێکم پێ بسپێریت ئامادەم ئەنجامی بدەم، نامەوێت کاتێکی زۆر بەسەر ئەمەدا تێپەڕێت، دەمەوێت دەست بنێمە قوڕگیەوە.

ڕامسیس گۆڕینی لەناکاو و ڕێزێك کە بەم تازەییانە لەڕەفتاری کابرای پادشای ئیسپارتدا دەیبینی سەری سوڕما. منلائوس بەفەرمانی شنار هەوڵی دا لە"ڕامسیس"نزیك ببێتەوە، لەم نزیك بونەوەشی هاوڕێی بێگەرد و ملکەچی لێدەرچوو و خۆی بە ملکەچی فەرمانەکانی"ڕامسیس"نیشان دەدا. فیرعەونیش لە دەیەمین ساڵی فەرمانڕەواییدا هەوڵیدا"ڕامسیس"لەقۆناخێکی زۆر گرنگ و هەستیاردا بگەیەنێتە ئاستی پلەوپایەی بەڕێوەبردنی وڵات، ئەم قۆناخە ناسینی نهێنیەکانی"ئزیریس"بوو. هەرکەسێك پەی بەنهێنیەکانی"ئزیریس"نەبات نابێتە فیرعەون. هەڵبەت فیرعەون دەیویست کەمێکی تر دان بەخۆیدا بگرێت بۆئەوەی ئەزمونێکی زیاتر لەبەڕێوبەرایەتیدا بەدەست بهێنێت، دوای ئەوە ئاشنای نهێنیەکانی"ئزیریس"ببێت، بەڵام لەبەرئەوەی لەمدواییانەدا باری تەندروستی تا دەهات خراپتر دەبوو، بەباشی دەزانی هەرچی زوتر ڕامسیس بەقۆناخی"ئزیریس"دا تێپەڕێنێت. ئەو دوانە دەبێت بە"ئابیدوس"سەردانی تەختی ئەهریمەن بکەن.

# خودای ست یان ئەهریمەن

"ستە هوس"کە واتای -ئەهریمەن زادە- دەگەیەنێت، مەزنترین پەرستگای بۆ"ئزیریس" بنیات نابوو. خودای ئەهریمەن"ئزیریس"ی برایی کوشتبوو، و ئێستاش"ست"ی بکوژ بۆ هەتاهەتا جەستەی درەوشاوەی"ئزیریس"ی لەسەر شانی هەڵگرتبوو. ڕامسیس و فیرعەون لەیەکەمین دەروازەی بارەگای منارەی دوسەرەی پەرستگاوە تێپەڕین. دوو کەسیش لەکاهینەکان هاتنە پێش و لەهەمان ئەوکاتەی ڕامسیس و فیرعەون خۆیان کرد بەو پەرستگایەدا دەست و پێیان لەهەسێرێکدا ئەتراوی کرد. دوای ئەوە ئەو دوانەیان لەتەنیشت چاڵێکەوە تێپەڕاند، چەند دەرگایەك لەبەرامبەر ئەو دوانەدا کرایەوە، کاهینێك کە پۆشاکێکی سپی لەبەردابوو بەسەرێکی کەچەڵەوە"ڕامسیس"ی بردە ژورەوە و وتی: کڕونش بەرە! دوای ئەوە ڕامسیس پێی نایە زەوی ئەو پەرستگایەوە، بۆنی"کوندور٢٤"لەهەموو شوێنێکدا دەهات، لەو پەرستگایەدا حەوت ژور هەبوو و ڕامسیس و فیرعەن سەردانی هەر حەوت ژورەکەیان کرد و خوداگەلێکی جیاوازیان بینی، دوای ئەوە فیرعەون و کوڕەکەی ئەو فەرمانەکانی فیرعەونیان بەسەر ستونەکانی پەرستگا کەبە"هیرۆگلیفی"تۆمار کرابوو خوێندەوە و فیرعەون بە"ڕامسیس"ی وت: ناوی باوباپیرانت لەئاسماندا تۆمار کراوە. بەپێی یاسا دەبێت فەرمانڕەوایی بکەیت، فەرمانە هەڵکۆڵراوەکانی ئەم پەرستگایە لەهزرتدا تۆمار بکە.

---

[24] کوندور: کەتیرەیەکی بۆن خۆشە کە لەدرەختێکی دڕداری وەك"مرۆد" لێ دەکرێتەوە... سەرچاوە ﴿فەرهەنگی عەمید﴾... وەرگێر.

دوای ئـەوە فیرعـەون و ڕامـسیس لەپەرسـتگا هاتنـە دەرەوە و بـەرەو تەپۆڵکەیـەك ڕۆشتن کە بەدرەخت داپۆشرابوو.

فیرعەون وتی: هەموو ساڵێك لەساڵڕۆژی مەراسیم"ئزیریس"زینـدوو دەبێتەوە و کـاتێکیش زینـدوو بویەوە ڕوباری نیل هەڵدەستێت... شەوی دوای ئەو ڕامسیس لەئاوی ئۆقیانۆسی نادیاری خواردەوە، گەنمێکی خوارد کە بەجەستەی "ئزیریس" پـەروەردە و گەشـەی پێـدرابوو، دوای ئـەوە بـەرگێکی کـەتانی لەبـەرکرد و بـۆ ئەنجامدانی مەراسیم پەیوەندی بەگروپە پیرۆزەکانەوە کرد. کاهینێك کە دەمامکی چـەقەڵی لەسـەردا بـوو دەرکـەوت و"ڕامـسیس"یـان بـردە سـەر گـردی پـیرۆز و شەونخونیان بەسەر جەستەیەکی مردوودا دەستپێکرد و وێرد و نزاگەلێکی زۆریـان خوێنـد. ڕامسیس چەند شەوێکی لە"ئابیدوس"دا تێپەڕاند، لەکەنار دەریاچەی پیرۆز لەکاتی بەڕێوبردنی ڕێوڕەسمی پەرستندا"گەمێ"کەی ئوزیریس لەناو ئەو دەریاچەدا دەستی کرد بەمەلەکردن، جێگری سەرۆك ماوەیەکی درێـژی لەکەنار پلیکانـەی خـودای مەزنـدا تێپەڕانـد، شـوێنێك کـە چـواردەوری پڕبـوو لەئێسقان و ڕۆحی ئەو ئێسقانانە لەشێوەی باڵندەیەك سەردانی"ئابیـدوس"یان دەکرد. نۆرەی سـەردانی خەزێنـەی پەرسـتگا هـات: تـا چـاو کـاری دەکـرد پڕبـوو لـەزێڕ و زیـوی پوخت، هەموو کەسێك دەبوو بۆ خودایان بەناونیشانی قوربانی و باج و دیاریـەکی بکردایە بەقوربانی! ڕامسیس چەند جارێك سەردانی دالانی باوباپیرانی کرد و ناوی فیرعەنەکانی ڕابردوی خوێندەوە. جێگری سەرۆکی میسر لەحەوشەی پەرستگاوە تێپـەڕی و بـەرەو ڕوبـار ڕۆشـت، کـاتی گەڕانـەوەی بـۆ"تـبس"هـات و کـاتی ئـەوەش هاتبوو پەیوەندی بەکەس و کاریەوە بکات.

***

# ئاشکراکردنی نهێنیەکانی"ئنخاس ئامون"

موسا و کاهینی مەزن لەکۆشکی فەرمانڕەواییەوە بەرەو تەختی شاژن"ئنخاس ئامون"ڕۆشتن. "ئامون تپ" بە"موسا"ی وت: دایکت لەئێستادا زۆر پێویستی بەحەوانەوەیە، نەکەی قسەی لەگەڵدا بکەیت.

موسا وتی: قسەی لەگەڵدا ناکەم، بەڵام تەنها دەمەوێت لەتەنیشتیەوە بم. هەڵگرانی کەژاوەی تەختی دایکی"موسا" کەژاوەکەیان لەشوێنی تایبەتی خۆیدا دانا، چەندین کەنزەك بۆ خەواندنی شاژن بەپەلە ڕۆشتن. موسا لەوکاتەدا تەماشایەکی ڕوخساری دایکی کرد و بینی چاوەکانی داخراون و لەسەرخۆ پرسی: بۆچی چاوەکانی داخستووە.

ئامون تپ وتی: چونکە لەژێر کاریگەری مادەی بێهوشکەردایە"تلیاك"بۆماوەیەك هەر بەوشێوەیە بێهۆش دەبێت، دوای ئەوەی بێدار بویەوە دەبێت دوبارە تلیاکی پێ بدنەوە، چونکە ئازارەکانی هێشتا بەتەواوی ساڕێژ نەبونەتەوە و جێگەی بیرنەکان ئازاریان هەیە، بەڵام بەم شێوەیە بەهیچ شێوەیەك هەست بەئازار ناکات و بەچاوی خۆت دەبینی بەئاسودەیی خەوی لێکەوتووە، بۆیە ئێستا بەخەیاڵ ئاسودەیی بڕۆ بۆ نان خواردن.

موسا وتی: بەهیچ شێوەیەك هەست بە برسیەتی ناکەم.

ئامون تپ وتی: حەز دەکەیت پیان بڵێم خواردنەکەت بۆ بهێننە ئێرە.

موسا وتی: نانم پێناخورێت.

ئامون تپ وتی: بەڵام من بەپێچەوانەی تۆوە زۆر برسیمە و زۆریش حەز دەکەم نان بخۆم، حەز دەکەیت لەبرساندا لەپێ بکەوم.

ئەو شوێنەی"ئنخاس ئامون"یان تێدا خەواندبوو شوێنی تایبەتی ئەو بوو، لەهەمان ئەو ژورەشدا موسا سەردەمی منداڵی لەلای دایکیدا تێپەڕاندبوو. کاهینی مەزن لەکاتی خۆرئاوابوندا گەڕایەوە بۆ لای موسا.

موسا لەسەرخۆ وتی: هێشتا هەر بەوشێوەیە خەوتووە.

کاهینی مەزن وتی: چی لەوەباشترە، خەوتن باشترین چارەسەری دەردیەتی...

کاتێک موسا تەماشای دایکی دەکرد تیشکی خۆر لەدوایین ڕوناکی خۆرئاوابونیدا بوو و بینی، خەوی دایکی زۆر لەوە قوڵترە کە"ئامون تپ"وتبوی، چونکە مرۆڤ هەرچەنێك لەقوڵایی خەودا بێت، بەڵام جوڵەی سینەی بۆ هەناسەدان سەر و خوار دەکات، بەڵام موسا هەستی کرد سینەی دایکی بێجوڵەیە، بۆیە هەستا لێی نزیك بویەوە و ترپەی دڵی دایکی گرت، دوای ئەوە"ئامون تپ"ی بانگ کرد بەنیگەرانیەوە پێی وت کەوەك بڵێی دڵی لێنادات. کاهینی مەزنیش بۆماوەیەك ترپەی دلچی گرت و وتی: تۆ ڕاست دەکەیت، چیتر دڵی لێنادات... دوای ئەوە موسا بەپەلە لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە و ئاوێنەیەکی مەفرەغی لەژورەکەی تردا هێنا و لەبەرامبەر لوتی دایکیدا ڕایگرت بۆئەوەی بزانێت ئایا بەڕاستی هەناسە دەدات یان نە. بەڵام هیچ جوڵەیەکی لەناو ئاوێنەکەدا بەدی نەکرد، ئاشکرابوو کە ئنخاس ئامون چیتر هەناسە نادات. کاهینی مەزن ئاوێنەکەی لەدەستی موسا گرت و دوری خستەوە لەدایکی و پێی وت: دایکت کۆچی کرد بۆ نیشتمانی خۆرئاوا... موسا بەدەم هاوار و گریانەوە خۆی هەڵدایە سەر جەستەی دایکی. "ئامون تپ"بەهەرشێوەیەك بوو موسای لەو ژورە هێنایە دەرەوە و تەواوی ئەو شەوەی بۆ دڵنەوایی دانەوەی موسا تێپەڕاند: ئەی موسا مەرگ شتێکی سروشتیە، وەك لەدایك بون، نابێت هیچ کەسێك دڵگرانی خۆی لەبەرامبەر مردنی هیچ کەسێکدا دەربڕێت، چونکە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت ڕێ لەمەرگ بگیرێت، هەرچەند لەدەستدانی خۆشەویستانمان بەلامانەوە سەختە، بەڵام پەسەندکردنی ئەم ڕاستیە لەتوانای کەسانی بەهێزدایە، ڕۆژێك دەمرین، بگرە هەمووومان لەسەرڕێی مەرگداین، کەمێك درەنگ بڕۆین یان زوو ئەم ڕێگایەمان هەر بەمەرگ کۆتایی دێت، کاتێك مەرگ لەسەرڕێی هەموومان‌دا بێت، چیتر ڕەوا نیە بۆ لەدەستدانی کەسانی

خۆشەویستمان بگرین. مانگ هەڵهات و هەردوو چاوەکان بۆ مانگیان ڕوانی. موسا زۆر بەقوڵی ڕۆچووە بیر و هزری خۆیەوە و بێدەنگ بوو.

ئامو تپ وتی: بیر لەچی دەکەیتەوە بۆ قسە ناکەیت؟

موسا وتی: خەمی ئەوە دایگرتوم کە دایکم ویستی نهێنیەکم بۆ ئاشکرا بکات و زۆریش بەلامەوە گرنگ بوو، بەڵام نەیتوانی، خۆزگە پێداگریم لێ بکردایە بۆئەوەی باسی ئەو نهێنیەی بۆ بکردایەم، ئێستاش دەمامکی لەخاك داپۆشراوی ئەو نهێنیەی لەگەڵ خۆیدا ناشت و منیش لەبێئاگایی ئەو نهێنیە زۆر دڵگرانم.

ئامون تپ وتی: خەم مەخۆ من ئاگاداری ئەو نهێنیەم و هەر ئەمشەویش بۆتی باس دەکەم بۆئەوەی کەمێك خەیاڵ ئاسودە بیت. یەکەم دایکت لەبەرئەوە تەنها ناوی"موسا"ی لێنایت بۆئەوەی بتوانی ناوی"ئاتون موسا"لەخۆت بنێیت، بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەشەوە ئەگەر ناوت"ئامون موسا"بوایە و بتویستیایە ناوت بگۆڕیت یەکسەر دەیانکوشتی، هێنانە زمانی ناوی"ئاتون"لەمیسردا سزاکەی مەرگە.

موسا وتی: لێرەوە ئەوەم بۆ دەردەکەوێت کە دایکم لەپیرەوانی"ئاتون"بووە.

کاهینی مەزن وتی: بەڵێ.

موسا وتی: دەمزانی کە دایکم پلەوپایەیەکی مەزنی لەهزریدا بۆ من لەبەرچاو گرتبوو، بەڵام چۆن بتوانم بۆنمونە بگەمە پەلەوپایەیەکی مەزن لەکاتێکدا نازانم خەڵکی کوێم.

کاهینی مەزن وتی: وایە تۆ هێشتا نازانی خەڵکی کوێیت و ئەوە هەمان ئەو نهێنیەیە کە بەدوایدا دەگەڕێیت. یەکەم تۆ خەڵکی میسر نیت.

موسا وتی: خۆشم هەستم بەوە دەکرد، چونکە قەد و باڵا و ڕوکاری دەرەوەم بەو شێوەی لێی وردبومەتەوە زیاتر لەخەڵکی"کوش"دەچێت نەك خەڵکی میسر.

کاهینی مەزن وتی: خۆشبەختانە تۆ لەفێرگەی مێژوو خوێندوتە و زۆر بەباشی شارەزای مێژووی میسری، تۆ دەبێت ئەوەت خوێندبێتەوە دوای ئەوەی بانگەشە بۆ خودای ئاتون کرا هەراوهوریاو و کوشت و کوشتارێك لەمیسردا ڕویدا، لەهەمووی گرنگتر کاهینەکانی"ئامون"لەدەرامەت و گەنجینەی با هاوردەی

پەرستگاکان بێبەش بون و ئەم بێبەش بونەش بو بەهۆی ئەوەی خەڵکی بەگژ یەکتردا هان بدەن، دوای ئەو شەڕە ناوخۆییە میسر گەڕایەوە بۆ خودای ئامون کە باسکردنی زۆر دەکێشێت. فیرعەون"هورم هب"کە جێنشینی"ئەخناتون" بوو لایەنگری"ئاتون"ی دەکرد و کوڕەکەشی بەسەختی"ئامون"ی بوو، ئەو ناوی لە"ست هوس"ەوە بۆ"وەرزای داگیرکەر"بەسەرهاتی پێشینەی باوکی دەگەڕێتەوە بۆ پیش"ئاتون" کوڕی"هورم هب"بەواتا"ست هوس"–وەرزای داگیرکەر– ژنێکی زۆری هەبوو، بەڵام"ئنخاس ئامون"یشی زۆر خۆشدەویست، ئەم شازادەیە سەرەتا"ئنخاس ئاتون"بوو، بەڵام بەناچاری گۆڕی بە"ئنخاس ئامون"، ئەو لەهەرەتی لاویەتیدا بو بەهاوسەری"وەرزای داگیرکەر"، بەڵام بەداخەوە لەدواییدا پەیی بەوە برد کە ژنێکی نەزۆکە. نەزۆکی لەبارەگای فیرعەوندا کارەساتە. بۆیە فیرعەون ماوەیەك چاوەڕێی کرد، بەڵام کاتێك بینی"ئنخاس ئامون"منداڵی نابێت دەستی کرد بەژن هێنان و وەك خۆت دەبینی منداڵێکی زۆری هەیە. منیش سەردەمانێك ئاشنایەتیم لەگەڵ"ئنخاس ئامون"دا پەیدا کرد کە لەدەردی نەزۆکی ئازاری دەکێشا و هەمان ئەو ئازارە بوبەهۆی ئەوەی توشی سەرئێشە و خەمۆکی ببێت. ئەم ژنە بەهۆی ئەم بێتاقەتی و بێزاریەی حەزی دەکرد کۆچ بکات، ئێمەشی لەکاتی ئەم گەشتەیدا لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆئەوەی کەمێك لەئازاری تەنهایی کەم بکاتەوە. ئەو شوێنەی حەزی دەکرد گەشتی بۆ بکات ئەو ڕوبارە لاوەکیانە بوو کە دەڕژانە ڕوباری نیلەوە، لەیەکێك لەگەشتەکانیدا ڕۆشتین بۆیەکێك لەو ڕوبارانەی دەڕژایە ڕوباری نیلەوە، ڕوباری نیل کەمێك تەنگتر بویەوە و سەوڵ لێدەرەکانیش ناچار کەمێك لەسەرخۆتر سەوڵ لێبدەن. ئێمەش چەند "گەمی"ەکمان هەبوو و پاسەوانەکان لەهەردوو لاوە یان لەدواوە یان لەپێشەوە دەڕۆشتن، گەمێکەی ئێمە گەشتە شوێنێك چیتر نەدەتوانرا بە گەمیّ بڕۆیت، دایکت لەناوەڕاستی بەلەمەکەدا دانیشتبوو و گوێی لەگۆرانی یەکێك لەژنەکان دەگرت، کاتێك ئاگاداری ئەوە بوو کە چیتر لەوە زیاتر ناتوانێت بەرەوپێشتر بڕوات، لەسەر"گەمی"کە هەستایە سەرپێ و تەماشای چواردەوری کرد و چاوی بە سەبەتەیەك کەوت کەبەگژوگیای کەناری ئەو ڕوبارەدا گیری کردبوو، "ئنخاس ئامون"هەر بەوشێوەی کە ڕاوەستابوو تەماشای

ناو سەبەتەکەی کرد و منداڵێکی تێدا بینی، بەلەمەکە کەمێك کەنارگیری کرد و"ئنخاس ئامون"منداڵی لەناو سەبەتەکەدا دەرهێنا و بردیە ناو "گەمی"کەی خۆیەوە، منداڵ دەگریا.

موسا پرسی: ئەو منداڵە تەمەنی چەنێك بوو؟

کاهینی مەزن وتی: وا بزانم کاتێك دایکت لەناو سەبەتەکەدا دەریهێنایت تەمەنت دە ڕۆژێك دەبوو، دیاربوو کە ماوەیەکی زۆر نیە داوبویتیان بەدەم ئاوەوە. برسیت بوو و ئەمەش خۆی بۆخۆی گرفت بوو، دەبوو کەسێکمان پەیدا بکردایە بۆئەوەی شیرت پێبدات، پەیدا کردنی کەسێك کە بتوانێت شیرت پێ بدات بەوشێوەیەش کارێکی ئاسان نەبوو. خۆم تۆم لەباوەشگرت و چومە ناو لیتاوێکەوە، وام دەزانی ئێستا دەچەقمە ناو ئەو قوڕاوەوە، بەڵام دوای سەد هەنگاوێك لەژێر پێمدا هەستم بەزەویەکی ڕەق کرد و لەدورەوە چاوم بەکۆمەڵێك خەڵك کەوت پێنج سەد کەسێك دەبوو ئاگرێکیان کردبویەوە و بەچواردەوری ئاگرەکەدا دانیشتبوون. بەڕاستی بەبینینیان زۆر خۆشحاڵ بوم و زانیم ئەم منداڵە دەبێت هی یەکێك لەم ژنانە بێت. کاتێك لێیان نزیك بومەوە هەڵهاتن، بەڵام سنوقێکیان لێ بەجێما، هەموشیان دەیانزانی چی لەو سنوقە دەکەم. هاوارم کرد بۆچی لێم هەڵدێن، هیچ کارێکم پێتانەوە نیە، هاتوم بۆ لاتان بۆئەوەی یارمەتیم بدەن، من کاهینێکی میسریم و دژایەتیتان ناکەم، وەرن و سنوقەکەتان بەرنەوە. ئەو کۆمەڵە خەڵکە کاتێك زانیان کاهینم وردە وردە گەڕانەوە و بەرەو سنوقەکە ڕۆشتن. لەناو سنوقەکەدا مارێکی ڕەش لولی خواردبوو. تێگەشتم کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە مار دەپەرستن! ئەو مارە، ڕەش مارێکی ئاوی بێ زیان بوو.

موسا پرسی: نەتزانی ئەو کۆمەڵە خەڵکی کوێ بون.

کاهینی مەزن وتی: با زانیم، ئەوانە خەڵکی"کوش"بون، پێش ئەوەی بێن بۆ"کوش"لە"کەنعان"و وڵاتی"سینا"دا دەژیان، وشکەساڵی ناچاری کردبون بۆ ئەم ناوچەیە کۆچ بکەن. دوای ئەوە فیرعەون-ست هوس- ئەمانەی وەك کۆیلەیەك لەم ناوچەیەدا پەسەند کرد و کاری پێدەکردن. ئەمانە دەیانوت لەخێڵی"ئسرائیل"یەکانن و لەنەوەی"لوی"ن، "لوی"کوڕی ئیسرائیل بوو. ئەمانە

بۆ قوربانی کردن کۆبوبونەوە، دەیانویست قوربانی پێشکەشی مار بکەن، بۆئەوەی لەم نەگبەتیە ڕزگاریان ببێت! لەو سەردەمانەدا-ست هوس-ی فیرعەون زۆر بەسەختی ئازاری ئەم خەڵکەی دەدا، بگرە فەرمانی دابوو منداڵەکانیان لەدایك و باوکیان جیا بکەنەوە. بێگومان بوم لەوەی دایکی ئەم منداڵە لەنێو ئەم کۆمەڵەدایە و دایك و باوکی بۆئەوەی لەئازاری فیرعەون ڕزگاری بکەن پێشتر خستویانەتە ناو ئەم سەبەتەیە و دابێتیان بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە.

موسا پرسی: لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە من کۆیلە زادەم؟

کاهینی مەزن وتی: ئەم تێڕوانینە لەهزرت پاك بکەرەوە، تۆ لەقوتابخانەدا خوێندوتە و لەباشترین شوێن و لەژێر دەستی باشترین مامۆستادا وانەت خوێندووە و لەباوەشی شازادە"ئنخاس ئامون"دا پەروەردە کراویت، هەر لەبەرئەوەش بەشازادەیەك لەقەڵەم دەدرێیت، سەرەڕای ئەوەی لەڕوباری نیل دا لەناو سەبەتەیەکدا تۆیان گرتبێتەوە.

موسا پرسی: دوای ئەوە چی ڕویدا؟

کاهینی مەزن وتی: ئەها! بەڵێ من بەو کۆمەڵە خەڵکەم وت ئەم منداڵە برسیەتی، پێویستم بەکەسێکە شیری پێبدات.

وتیان: منداڵی تازە لەدایك بوو شیری هەموو ژنێك ناخوات، تەنها مەمکی دایکی خۆی دەگرێت.

تکای ئەوەم لێکردن ئەگەر دایکی لەنێو ئێوەدایە بێت و شیر بەمنداڵەکەی بدات... هیچ وەڵامێك نەبوو، بەڵام دواجار بینیم بەزمانی خۆش ناگەم بەهیچ ئەنجامێك، بۆیە زمانی هەڕەشەم بەکار هێنا و هاوارم کرد: ئەم منداڵە لەلاتان بەجێ دەهێڵم و دوای ماوەیەك دەگەڕێمەوە بۆ لاتان، ئەگەر کەسێك لەنێو ئێوەدا پەیدا بوو شیر بەو منداڵە بدات باشە، ئەگینا هەمووتان سواری کەشتیەك دەکەم و دەتانبەمە شوێنێك کە بەقامچی لێتا بدات بۆئەوەی دان بەوەدا بنێت کێ دایکی ئەم منداڵەیە. ئەم پێشەکیە کاریگەری خۆی هەبوو و دایکی ڕاستەقینەت مەمکی خستە ناو دەمت و شیری پێدایت.....

موسا لەم کاتەدا قسەی بەکابرای کاهین بڕی و لێی پرسی: لەمحاڵەتە بۆم دەردەکەوێت کە تۆ چاوت بەدایکی ڕاستەقینەم کەوتووە؟..... دوای ئەوەش موسا لێی پرسی: ئەگەر ئەمانە میسری نەبوون، تۆ بەچ زمانێك قسەت لەگەڵدا دەکردن؟

ئامون تپ وتی: ئەمانە لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر لەمیسردا بون دەیانزانی باسی چی دەکەم و لەبەرامبەریشدا وەڵامیان دەدامەوە. یەکێك لەپیاوەکانی کۆش پرسی: بۆچی دەتەوێت پشکنین بۆ ژنەکانمان بکەیت، بۆئەوەی دایکی ڕاستەقینەی ئەم منداڵە بدۆزیتەوە؟

منیش پێم وتن: مەگەر نابینن ئەم منداڵە لەبرساندا چۆن هاوار دەکات. هاوکاریم بکەن بەزەییتان بێت بۆئەوەی شایستەی سۆز و بەزەیی بن. من هاوکاریتان دەکەم...

دوای ئەوە کاهینی مەزن وتی: تۆ دەبێت"ئنخاس ئامون"بەدایکی ڕاستەقینە خۆت بزانی، چونکە تا دواین ساتی ژیانی هەوڵی بۆ داویت، بەڵام دایکە ڕاستەقینەکەت سەرەڕای ئەوەی دەیبینی دەگریت و هاوار دەکەیت و لەوانەیە لەبرساندا بمریت نەهاتە پێشەوە بۆئەوەی شیرت پێبدات، هەڵبەت دواجار بەهەڕەشە شکستم بە دانبەخۆداگریان هێنا. "ئنخاس ئامون"زۆر بەتوندی بەتۆوە پەیوەست بوو و دایکت بۆماوەیەك شیری پێدایت، بەڵام بەفەرمانی فیرعەون و بەتکای"ئنخاس ئامون"هەموو ئەو کەسانەی ئەو ڕۆژە بینەری پەیدابونی تۆ بون ڕەوانەی شوێنێکی دور کران.

موسا پرسی: چی بەسەر دایکمدا هات؟

کاهینی مەزن وتی: ئنخاس ئامون بۆماوەیەك لەوێدا چادری هەڵدا و نەیبردیتەوە بۆ کۆشك، بەڵام لەبەرئەوەی شیری هیچ کەسێکی ترت نەدەخوارد، تا ئەوکاتەی سەردەمی شیرخواردنت تێپەڕاند دایکت لەلات مایەوە، دوای ئەوە گەڕاندیانەوە بۆلای خێڵەکەی خۆی لەبەرئەوەی نەیدەویست خەڵکی بزانن ژنێکی ئیسرائیلی دایکی تۆیە، بەڵکو دەیویست وا خەڵکی تێکەیەنێت کە تۆ کوڕی ئەویت! تۆ نابێت هیچ ڕەخنەیەك لە"ئنخاس ئامون"بگریت، لەبەرئەوەی ئەگەر تۆی لەڕوباری نیل نەگرتایەتەوە بێگومان دەبویتە نێچیری تیمساحەکان.

# داگیرکەری"ترۆی" و شنار لەپلانگێڕیدا

"منلائـوس"لەهــەموو میوانداریــەکی کۆشــکی میــسردا بــەمیوانێکی شایــستە لەقەڵـەم دەدرا و بەشـداری هـەموو ئاهەنگـەکانی دەکـرد، پەیوەنـدی"منلائـوس" و "هلنـە"بـەهۆی ئـەم هاونـشینیە ناچاریەوە لـە شـەڕ و دەمـەقرەوە گـۆڕا بەسـازش و پەیوەست بون، بەڵام"ڕامسیس"وەك پێشوو بۆچونی لەبەرامبەر پادشـای پێشوودا نـەگۆڕا، لەبەرامبەریـشدا"شـنار"ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ تـا دەهـات لـەمنلائوس نـزیکتر دەبویـەوە. نـەبونی"ڕامـسیس"لەتەنیـشت فیرعەونـدا لـە"ئابیـدوس" ئـەو هەلـەی ڕەخـساند کـە شـنار لەگـەڵ"منلائـوس"دا نەخـشە و ئـەو پلانانـەی کـە دەیانـەوێت تاوتوێ بکەن بێئەوەی"ڕامسیس" یان فیرعـەون لـەم سەکۆیەدا بونیـان هـەبێت. ئەو دوانـە ڕێکـەوتن لەسـەر ئـەوەی دەبێـت"ڕامـسیس"بەهێرشـێك لـەناوی ببـەن، بگـرە نەخـشەی شـێوازی هێرشەکەشـیان کێـشا، دوو ئەفـسەری یۆنـانی لـەنێو هێـزی پاراســتنی ئاسایــشی کۆشــك کــە پاســەوانی کۆشــکیان لەئەســتۆدابوو، ئــەم پێـشنیارەیان پەسـەند کـرد، چـەند بـەکرێگیراوێکی تریـشیان لەچـەند شـوێنێکی جیاوازدا دەستنیشان کردبوو کە لەکاتی جێبەجێ کردنـی پلانـی کوشتنەکەدا بێنـە ناو سەکۆی ئەم نەخشەوە و هاوکاری جێبەجێکەرانی ئەم پلانە بکەن. "شـنار"یـش بــەڵێنی دا ســود لەهەنــدێ خــەڵك دژی ڕامــسیس وەرگرێــت. لەســەرەتای هـاتنی"منلائـوس" بـاری تەندروسـتی فیرعـەون بـاش نـەبوو و "شـنار"یش هەوڵیـدا زانیاریەك لەبارەی تەندروستی باوکی بەدەست بهێنێت، فیرعەون نەخۆش بوو بـەڵام بەڕوکەش وا دەرنەدەکەوت کە نـەخۆش بێت. شـنار نەیدەویـست بـاوکی بمرێـت بـۆ گەشـتن بەپلـەی فیرعــەون بـون پێویـستی بـەباوکی بـوو، بـەڵام لەبەرنامەیـدا بـوو

كە"ڕامسیس"بكوژێت، شنار لەنەبونی"ڕامسیس"دا پەنای بۆ هەموو هەوڵ و پلانێك دەبرد، بگرە داوای هاوكاری لە"دولانت"ی خوشكیشی كرد و بەڵێنی پێدا كاتێك بوو بە فیرعەون پلەوپایەیەكی باش بدات بە"ساری"هاوسەری، ئەمەش دەقاودەق لەكاتێكدا بوو كە ساری و دولانت-زاوا و كچی فیرعەون-بەفەرمانی ڕامسیس بەهۆی ئەوەی داوایەكی نابەجێیان لێكردبوو لەشاری"تبس"دەركرابون.

دولانت بەدەم گریانەوە وتی: ئێمە چیتر لەشاردا نین، لەبەرئەوەی دەركراوین.

شنار پرسی: بۆچی دەریانكردون؟

"دولانت"ی خوشكی شنار وتی: "ئامنی"نوسەر و بەڕێوبەری كارەكانی"ڕامسیس"ئەو تاوانەی خستە پاڵمان كە ئێمە پلانگێڕیمان دژی ڕامسیس كردووە؟

شنار پرسی: ئایا بەبەڵگەوە ئەم تاوانەیان دایە پاڵتان یان ئەم تاوانەیان بۆ هەڵبەستن؟

دولانت بۆماوەیەك بێدەنگ بوو و دوای ئەوە وتی: هەڵبەت بەبەڵگەوە، هەڵبەستراو نیە.

شنار وتی: بەدڵنیاییەوە ئەم بابەتە ڕاستە ئەگینا هیچ كەسێك ناتوانێت بەو سادەییە تاوانێكی ئاوا بداتە پاڵ هیچ كەسێك بۆئەوەی تاوانباری بكات!

دولانت وتی: تۆ دڵگرانی ئەم بابەتەیت.

شنار وتی: بەبیستنی ئەم بابەتە بەداخم.

دولانت وتی: بۆچی؟

شنار وتی: چونكە ئەگەر ئەم هەوڵەتان پلانگێڕی بوبێت بێئەنجام بووە!

دولانت وتی: كەواتە تۆش دەتەوێت دژی پلانگێڕی بكەیت... ئایا من و هاوسەرەكەم دەتوانین لەگەڵ تۆدا دژ ڕامسیس ڕاوەستین؟

شنار وتی: هەر لەبەرئەوەش ویستم چاوم پێت بكەوێت، خۆم ویستم ئەم پێشنیارەت لێ بكەم. من ئێوە لەشوێنێكدا جێگیر دەكەم، پێویست بەوە ناكات خۆتان دەربخەن، بەڵام پرسیارێك: ئەم پلانگێڕیە لەبەرژەوەندی كێدایە؟ ئایا لەبەرئەوەی كچی فیرعەونیت دەتویست بەكوشتنی ڕامسیس دەستەڵاتێك

ببەخشیت بە ساری هاوسەرت؟ دوای ئەوە وتی: لەم هاوپەیمانیەدا دەبێت ئەم جۆرە بیرۆکانە لەمێشکت پاك بکەیتەوە، ئەم پلانگێڕیە دەبێت لەبەرژەوەندی مندا کۆتایی بێت، ئەویش ئەوەیە من ببمە فیرعەونی میسر. ئەوە منم کە دەبێت ببمە پادشای میسر.

شنار دوای"دولانت" هەوڵیدا پزیشکە تایبەتەکانی فیرعەونیش بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و لەمبوارەدا هەوڵێکی زۆری دا، بەڵام تیرەکەی ئامانجی خۆی نەپێکا، بۆیە ڕێگایەکی تری گرتەبەر ئەویش ئاشکراکردنی شوێنی دروستکردنی دەرمانی پزیشکانە لەیەکێك لەتاقیگاکانی پەرستگا، تەنها ئەوە بۆ شنار بەس بوو کە ناوی ئەو پەرستگایە ئاشکرا بکات، شنار هەموو هەوڵێکی بۆ ئەو مەبەستە خستە گەڕ تا زانی پەرستگا"سخمت"شوێنی ئامادەکردنی دەرمانەکانی فیرعەونە. ئێستاش نۆرە ئەوەیە چۆن بچێتە ناو دەرمانخانەکەوە و بەچ شێوەیەك بەڕێوبەری ئەو تاقیگایە بکاتە هاوڕێ و هاوپەیمانی خۆی، بۆئەوەی دەستکاری جۆری دەرمانەکان بکات. بەڕێوبەری تاقیگاکە پیاوێکی تەمەن چل ساڵەیە کە ژنێکی جوانی هەبوو، ژنەکەی هەمیشە گلەیی لەکەمی موچەکەی دەکرد و شنار بەکەمێك تێڕامان پەیی بەهەموو ئەم لایەنانە برد و خاڵی لاوازی لایەنی ئابوریانی کردە ئامانجی خۆی و بەم شێوەیە نێچیر زۆر بەئاسانی دەخاتە داوەوە. بەپێی گوزارشتی پزیشکەکان فیرعەون توشی نەخۆشیەك بووە کە زۆر لەسەر خۆ بەرەوپێش دەڕوات، بەڵام هەڕەشەئامێز و کوشندەیە. بۆیە تەختی فیرعەون دوای ماوەیەکی تر بێ فیرعەون دەمێنێتەوە.

ساری زاوای فیرعەون و هاوسەرەکەی"دولانت"بەپێی فەرمانەکانی شنار لەشوێنێکی پارێزراودا جێگیربون، بۆئەوەی هەم لەسەرکەوتنەکەیدا بەشداربن و هەم تۆڵەی خۆیان لە"ڕامسیس"بکەنەوە، دولانت ڕۆشت بۆ پەرستگای مەزنی"کرنك"و دەیوت: لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ڕۆشتووە بۆئەوەی لەوێ دەست لەژیان هەڵگرن و گۆشەگیربن، هەرئەوەی لەپەرستگای"کرنك"گۆشەگیر بون کچ و زاوای فیرعەون دەستیان بەپلانگێڕیەکانیان کرد. "دولانت"لەنێو هاوڕێی و کەسە نزیکەکانیدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوختانی بۆ ڕامسیس دروست دەکرد، ئەو

تەنها کەسێك بوو کە دەیتوانی دەستی بگەیەنێتە نهێنیە تایبەتەکانی ڕامسیسی براى. ئەو بەگوتەکانی ڕوخسارێکی نەفرەتئامێز و دزێوی بۆ ڕامسیس دروست کردبوو و ساری هاوسەریشی کە ڕۆڵی کاهینێکی گۆشەگیر و تۆبەکاری دەبینی و پێشتر سەرپەرشتی قوتابخانەی"کەپ"بوو، بەناونیشانی مامۆستایەکی ئاسایی لەبۆنە جۆراوجۆرەکانی"کەپ"دا کاری گوڵخستنە ناو گۆزەی لەئەستۆ گرتووبوو و گسکی میحرابیشی دەدا، لێبوردەیی ئەو بووە مایەی سەرنج ڕاکێشانی ئەندامانی دەستەڵات و هەرئەوەش بووە هۆی ئەوەی بانگێشتی سەر سفرەکانیان بکەن و"ساری"ش لەم جۆرە دانیشتانەدا دژی ڕامسیس قسەی دەکرد...

# نفر تاری و"ڕامسیس"ی جێنشین

ڕەفتاری"نفر تاری"لەبەرامبەر"ستەهوس"ی شاژنی میسر بەناونیشانی خزمەتکار شایستە و شایەنی دەست خۆشی بوو، لەسەرخۆ و هاوسەنگ و دانبەخۆداگر بوو، شاژن زۆر "نفرتاری"لا پەسەند بوو. "ڕامسیس"یش هەر لەیەکەمین چاوپێکەوتن پێیەوە پەیوەست بوو بوو، هەروەها ستایشی دایکی لەبەرامبەر ڕەفتارەکانی "نفرتاری"دا ئەوەندەی تر پەیوەست بونەکەی زیاد کرد و گەشتە ئەو بڕوایەی ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنێت، بەڵام ژنێکی تر لەژیانی"ڕامسیس"دا هەبوو ئەو ژنەش"ئیزت"بوو کە پەردەی کچێنی خۆی پێشکەشی ڕامسیس کردبوو و چیتر دوای ئەوەش بەبەشێك لەژیانی ڕامسیس لەقەڵەم دەدرا و لەکۆتاییشدا ناچار داوای کرد و ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێکهێنا، بەڵام فرە ژنی لەخانەدانی فیرعەوندا بەکارێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدرا، فیرعەون زیاد لە سەد منداڵ و ژنی هەبووە. ڕامسیس لەگەڵ خۆیدا"نفرتاری"برد بۆ پەرستگای"ئابیدو" بۆئەوەی زیاتر ئاشنای خوڕەویشتی ببێت... و سبەی ئەو ڕۆژە"ستەهوس"ی شاژن دەسبەندێکی زێڕی پێشکەشی"نفرتاری"کرد بۆئەوەی لەوەودوا لەبۆنەو یادە ئاینیەکاندا لەدەستی بکات. "نفرتاری"ش ئەم هەڵبژاردنە زۆر کاری تێکرد و دەستی کرد بەگریان، ئەو دەبووە هاوسەری ئایندەی فیرعەون، پلەوپایەیەك کە هەر بەبیریشیدا نەدەهات... . دوای ماوەیەك"نفرتاری"سکی پڕبوو و منداڵێکی بۆ ڕامسیس هێنایە دنیاوە، بەڵام ئەو منداڵە تازە لەدایك بووە دوای دوو مانگ کۆچی دوایی کرد، نفرتاری بەهۆی لەدەستدانی ئەو منداڵە تازە لەدایك بووەی توشی خەمۆکی بوو، بەهۆی ئەم خەمۆکیەوە بەسەختی نەخۆش کەوت. ڕامسیس زۆر بە"نفرتاری"ەوە پەیوەست بوو و هیچ کاتێك بەتەنها جێی نەدەهێلا.

هەر لەبەرئەوەش"ئزیت"لەکۆشکی فەرمانڕەوابیدا دەستەڵات و کەسایەتیەکی تایبەتی بۆ خۆی پێکهێنا.

گوندی بچوکی کەنار ڕوباری نیل بینەری چالاکی پیاوانی بێگانەی دوێنێ و ئاشنایانی پڕهەوڵ و کۆششی ئەمڕۆ بوون کە بەزمانێکی تایبەت کە تەنها لەنێو خۆیاندا باوبوو لەگەڵ یەکتردا دەدوان. سەربازە میسریەکان لەسەر تەپۆڵکەکان بڵاو بوبونەوە و ژمارەیان لەڕێژەی دانیشتوان زیاتر دەهاتە بەرچاو. ڕامسیس بەسەرکەشیەکەوە لەبارەی ئەمانەوە پرسی: ئەمانە دەیانەوێت تاکەی لێرەدا بمێننەوە؟

سەرۆکی پاسەوانەکان وتی: بەڕوکەش زۆر ئارامن بەڵام جێی متمانە نین، سکاڵایەکی زۆری خەڵکی ئەم ناوچەیە دژی ئەم یۆنانیانە بەرزکراوەتەوە، بگرە کوێخای ئەم گوندەش سکاڵایەکی زۆری لێیان هەیە.

ڕامسیس کە زۆر توڕە بوبو وتی: هێرشیان بۆ بەرن و بگرە یەك دانەشیان بەزیندوویی نەهێڵنەوە!

لەناکاو فەرماندەی یۆنانیەکان هاتەپێشەوە و وتی: ئێمە میوانین، ئێوە میوانداری ئێمەتان پەسەند کردووە، لەهەمان کاتدا هیچ تاوانێکمان نەکردووە کە ببێتە هۆی ئەوەی شایستەی مەرگ بین، ئەگەر دەتانەوێت بمانکوژن ئەوا تا دوا دڵۆپی خوێنمان لەگەڵتاندا دەجەنگین، سەرەڕای ئەوەی دەزانین هەموومان لەم جەنگەدا لەناودەچین.

ڕامسیس لە لەناوبردنیان دودڵ بوو، لەهەمان کاتدا دوو بنکەی تر دەبێت ڕەزامەندی خۆیان لەبارەی جەنگ دژی ئەم بێگانانە بخەنە ڕوو ئەو بنکەیەش"کاهینەکان و دەستەڵاتدارانی میسر"بوون! بەڵام ڕامسیس لەڕێی سیخوڕەکانیەوە هەواڵی پلانگێڕ دژی خۆی لەلایەن"منلائوس و شنار"ی برایەوە پێگەشتبوو، بۆیە بەو سادەییە دەستبەرداریان نابێت، دەیزانی گرنگترین هەل ئەوەیە سەرەتا ئەو دەستی خۆی بوەشێنێت و ئەم پلانگێڕیەیان دەبێت هەر بەکۆرپەیی لەبار ببرێت. ڕامسیس بەرپرسیاریەتیەکی مەزنی لەئەستۆدابوو و بەوەی پلەی جێنشینی پێبەخشرابوو لەگەڵ ئەو متمانە و کەسایەتیەی لەنێو

هاوڕێیانیدا هەیبوو لەناوبردنی"شنار و منلائوس و ساری و دولانت"کە پەیی بە پلانەکەیان بردبوو بەچەند سەرکردەیەك سپارد بۆئەوەی بەتاوانی خیانەت لەهەلێکی گونجاودا بەسزای خۆیان بگەیەنن و خۆی گەڕایەوە بۆ کۆشك بۆئەوەی ئاگاداری کاروبارەکان بێت...

# ئەو دیمەنەی "موسا"ی ڕاوەشاند

موسا تایبەیانی بگرە بۆ ساتێکیش هێور نەبویەوە، جارناجارێك لەجێی خۆی هەڵدەستایە سەرپێ و دەڕۆشتە ژورەکەی دایکی و زۆر بەوردی تەماشای ڕوخساری دایکی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کە ئەو ژنە دایکی ڕاستەقینەی نیە، بەڵام وەفای ئەو دڵسۆزیەی وای لێ دەکرد وەك دایکێك تەماشای بکات. ئەگەر"ئنخاس ئامون"نەبوایە و موسا لەڕوباری نیل هەڵنەگرتایەتەوە و نەیناردایە بۆ قوتابخانە، بێگومان لە ڕوباری نیلدا لەناو دەچوو. بگرە ئەگەر فڕێیان نەدایا ڕوبار"نیل"یش لەلای دایکە ڕاستەقینەکەی بمایاتەوە، ئەوا جگە لەنۆکەر و نۆکەر زادەیەك هیچی تری لێ دەرنەدەچوو و ناچار جگە لەهەڵگرتنی خشت و بەرد و قوڕ پیشەیەکی تری شك نەدەبرد. گەرچی"ئنخاس ئامون" موسای لەدایکی جیا کردەوە، بەڵام لەزۆر لایەنەوە بووە هۆی بەرزبونەوەی ئاستی گەشەی. موسا دەیزانی دایکی بەواتا- ئنخاس ئامون-هەوڵی دەدا ناسنامەی بەنهێنی بهێڵێتەوە و هیچ کەسێك پەی بەوە نەبات کە"موسا"یان لەڕوباری نیل گرتووەتەوە، چونکە جارناجارێك ئەم بابەتەیان لەبۆنە و شوێنە جیاوازەکاندا دەیاندایەوە بەڕویدا. "موسا"ش جگە لە بێدەنگی هیچ ڕێگەچارەیەکی تری بەدەستەوە نەبوو. خاڵێکی تر کە موسا زۆر جەختی لەسەر دەکرد و"ئامون تپ"یشی لێئاگادار کردەوە ئەوە بوو کەچی بووە هۆی ئەوەی "ئنخاس ئامون" موسا لەلای خۆی بهێڵێتەوە و پەروەردەی بکات، چونکە ئنخاس ئامون مەبەستێکی تایبەتی لەم میهرەبانیەیدا هەبوو و کاتێك کاهینی مەزن دایکی ڕاستەقینەی موسای لەنێو دانیشتوانی"کوش"دا دۆزیەوە و ئەو ژنەش شیری دا بەکوڕەکەی خۆی، "ئنخاس

ئامون"بێبەزەییانە دایکی نەدەنارده ناوچەیەکی دورەوە، بەڵکو بەزۆری سامان و پارە دایکی موسای دەنارده شوێنێك بژیت کە دەستی کاربەدەستانی فیرعەون نەکەوێت، تەنها بۆئەوەی بڵێن کوڕێکی هەیە موسای لەلای خۆی پاراست. سەرەڕای ئەوەش پەیوەندی دولایەنە، دایك و کوڕی بێ ناونیشان هاتەبون. موسا هەستی بەسۆزی هەمە لایەنەی"ئنخاس ئامون"دەکرد و دەیبینی کە بەشێوەیەکی هەڵەشانە لەبەرامبەر فیرعەوندا بەرگری لێدەکات و نەیدەهێڵا فیرعەون بیکوژێت. ئەم خۆشەویستی و لەخۆبردووییە گیانی موسای لەمەرگ ڕزگار کرد. هۆکارێکی تر ڕەفتار و هەستێك بوو کە"ئنخاس ئامون"لەبەرامبەر موسادا دەریدەبڕی، هەستی دایکایەتی و دڵسۆزانەی لێوانلێوی سۆز بوو. ئنخاس ئامون نەیدەهێڵا بەهیچ شێوەیەك سەختی بکێشێت، لەو شەوەدا تەواوی ڕەفتارەکانی سەردەمی ڕابردووی ئەو ژنە هێنایەوە یاد و زۆریش دڵی بۆی تەنگ بوو. هەر لەبەرئەوەش موسا دەبێت وەك دایکێکی ڕاستەقینە تەماشای بکات، چونکە بێ لەبابەتی لەدایك بونی لەڕوی دایکایەتیەوە هەموو کارێکی بۆ ئەنجام دابوو. تەواوی ئەم بیر و ڕەفتار و یادگاریەکانی ئەو شەوە کە چەند جارێك موسا سەردانی ژورەکەی دایکی کردبوو هێنایەوە یاد خۆی. بەهەڵهاتنی سپێدەی بەرەبەیان بەفەرمانی فیرعەون بوق و دەهۆڵەکان لە"تبس"دا لێدران بۆئەوەی خەڵکی بزانن ڕۆژی ماتەمینیە. بەکۆتایی هاتنی وەرزی بەهار و هاتنی وەرزی هاوین هەوای"تبس"زۆر گەرم بوو، فیرعەون و ڕامسیس لەپایتەختەوە ڕێی باشوریان گرتەبەر و تاکۆتایی هاوین لەهاوینەهەواری فەرمانڕەواییدا مانەوە. دە ڕۆژ پێش کۆچکردنی فیرعەون بەرەو هاوینەهەوار، موساش"تبس"ی بەجێهێشت و ڕۆشت بۆ میسری سەرو بۆئەوەی سەردانی تەلارە دروستکراوەکان بکات. موسا ڕۆشتە"کرنك" و تەماشای کرێکارەکانی دەکرد کە سەرقاڵی دروست کردنی تەلاری خواستراوی فیرعەون بون و ماوەیەك لەوێ لەبارەی شێوازی کارکردن پرسیاری لەکرێکارەکان دەکرد و لەکۆتایی هاویندا بەفەرمانی فیرعەون چەند سەربازێك چاودێری ئەو تەلارەیان گرتە ئەستۆ و پاسەوانی ئەو تەلارەیان دەکرد. دوای تێپەڕبونی وەرزی هاوین فیرعەون لەمیسری سەروەوە گەڕایەوە بۆ باکور، بەڵام موسا پانزە ڕۆژی تری لە

میسری سەرودا بەسەر برد بۆئەوە بەتەواوی لەوە دڵنیا بێت کە سەربازەکانی لەکاری پاسەوانیدا کات و زانیاریەکی تەواویان هەیە و شەو و ڕۆژ ئێشکگری و پاسەوانی ئەو تەلارە بکەن، دوای ئەوەی دڵنیا بوو گەڕایەوە بۆ پایتەخت و ڕاستەوخۆ ڕۆشت بۆ کۆشك و چووە شوێنی تایبەتی خۆی، بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەك لەژوورەکەیدا دانیشت، نۆکەرێك بێ هیچ پێشەکیەك و سەراسیمە خۆی کرد بەژوورەکەیدا و سەبەتەیەکی لەژوورەکەیدا دانا. موسا دەمودەست نۆکەرەکەی ناسیەوە، ئەو کەسە نۆکەری"ئامون تپ"ی کاهینی مەزنی فەرمانڕەوایی بوو. موسا لەترس و نیگەرانی و بێدەنگی کابرای نۆکەر سەری سوڕما و پرسی: کاهینی مەزن لەکوێیە؟ ، نۆکەریش بێئەوەی وشەیەك بهێنێتە زمان سەبەتەکەی کە سەرپۆشێکی زیوینی بەسەرەوە بوو لەبەردەم موسادا دانا و سەرپۆشەکەی لەسەر سەبەتەکە لابرد و سەری مرۆڤێکی لەناو سەبەتەکەدا بینی و بەترس و تۆقانەوە پرسی: ئەمە سەری کێیە؟

کابرای نۆکەر وتی: تۆ چۆن سەری "ئامون تپ" کاهینی مەزن ناناسیتەوە؟

موسا بەنیگەرانی و دڵگرانیەکەوە وتی: ئایا ئەمە سەری"ئامون تپ"ە؟.....

دوای ئەوە سەری بڕاوی کاهینی مەزنی کۆشکی فەرمانڕەوایی لەناو سەبەتەکەدا دەرهێنا و لەبەرامبەر ڕوخساری خۆیدا ڕایگرت. چاوەکانی ئامون تپ هێشتا دانەخرابوون، چونکە هیچ کەسێك لەوانەی سەریان بڕیوە چاوەکانی دانەخستووە بۆئەوەی بەزمانێکی بێزمان پەیامێك بەموسا بگەیەنێت، ئەو پەیامەش ئەوەیە لەلای فیرعەوندا وەفاداری خۆی لەبەرامبەر خودای"ئاتون"دا نیشان دابوو! موسا بەبینینی ئەو دیمەنە پەیی بەوە برد کە"ئامون تپ"سەری لەپێناو بیروباوەڕیدا لەدەستت داوە و بەهۆی ئەوەی باوەڕی بەخودای"ئاتون"بووە فیرعەون فەرمانی داوە سەری ببڕن. ئەم تاوانە ڕادەی ڕق و دژایەتی فیرعەون لەبەرامبەر خودای ئاتون و لایەنگرانی بەڕونی ئاشکرا دەکات، چونکە لەناوبردنی کاهینی مەزنی کۆشك بەوشێوە دڕندانەیە تائەو کاتە کۆشکی فەرمانڕەوایی پێشینەی وای بەخۆیەوە نەبینیوە. کوشتنی کاهینی مەزن-سەرپەرشتی کاهینەکانی کۆشکی فەرمانڕەوایی- کەسێك کە گرنگترین ئەرکی لەئەستۆ گرتبوو بەئاگاهێنانەوە و

ئاگاداریـــەکی ڕاوەشـــێن بـــوو بـــۆ موســـا، لەهەمانکاتـــدا بـــۆ ئـــەو پـــەیامێکی هەڕەشەئامێزیش بوو. موسا سەرەڕای ئەوە لەهەڕەتی لاویەتیدا بوو دەیتوانی پەی بەوە ببات کە کوشتنی"ئامون تپ"نەدەکرا بەئاسانی ئەنجام بدرێت، بێگومان کاهینەکان ئاگاداری بیروباوەڕی بون و فیرعەونیان لێ ئاگادار کردووەتەوە، ئەویش بەناونیشانی بڕیارێکی یەکلایی کەرەوە سەری کاهینی نارد بۆ موسا و پێی ڕاگەیاندووە کە دەرئەنجامی ئاتون پەرستی ئەوەیە کە دەیبینی. ئەوەی بو بەمایەی نیگەرانی کاهینەکانی ئامون پەرست خودی"ئاتون"بوو. هیچ کاتێك ئەوەیان فەرامۆش نەدەکرد کە سەردەمی فەرمانڕەوایی"ئاتون" کە بەهۆی ئەو فەرمانڕەواییەوە دەستەڵاتی پەرستگای میسری لێ سەندبونەوە و هەژاری خستن، بەجۆرێك کە هەندێك لەکاهینەکان دەستیان بۆ سوالْ درێژکرد. هەرلەبەرئەوەش ناوی"ئاتون"بەلایانەوە یەکسان بوو بەدەرکەوتنی هەژاری و بەدبەختی. بۆیە هەمویان بەپێویستیان زانی بڕیاری کوشتنی کاهینی مەزن دەربکەن. موسا زۆر بەدڵگرانیەوە ئەم تێڕوانینانەی بۆ نۆکەرەکەی کاهینی مەزن دەگێڕایەوە و بەدەم ئەم قسەکردنانەوە دەگریا. "ئامون تپ"دوای "ئنخاس ئامون"نزیك ترین کەسی موسا بوو و"موسا"ش هەموو نهێنیەکی خۆیی بۆ دەگێڕایەوە، هەروەها هەردوکیان وەك دوو هاوڕێی دڵسۆزی یەکتر نهێنیەکانیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. موسا دوای سەرسوڕمان و خەمێکی زۆر سەری"ئامون تپ"ی خستەوە جێگەکەی خۆی و لەناو کۆشکدا بەدوای نۆکەری کاهینی مەزندا گەڕا تا دۆزیەوە کە ئارام لەگۆشەیەکدا ڕاوەستابوو و لێی پرسی: بۆچی سەری کاهینی مەزنت هێنا بۆ ژورەکەم؟

نۆکەر وەڵامی دایەوە: "ئامون تپ"ی خاوەنم پێش مەرگی پێی وتم دوای ئەوەی سەریان بڕیم بیهێنم بۆت، منیش دوای مەرگی سەریم هەڵگرت تا ئەو کاتەی لەگەشتەکەت گەڕایتەوە و منیش ڕاسپاردەی خاوەنەکەم بەجێ هێنا.

موسا پرسی: ئایا خاوەنەکەت پێی نەوتی بۆچی ئەم سەرە براوە دەنێری بۆم؟

نوکەر وتی: خاوەنەکەم لەو بارەیەوە هیچ ڕونکردنەوەیەکی پێ نەدام، لەوانەیە لەوە دڵنیابوبێت کە تۆ ئاگاداری ئەم ڕوداوەیت بۆیە هیچی پێ نەوتم.

موسا وتی: تۆ ڕاست دەکەیت من زۆر باش ئاگاداری هۆکاری ئەم لەناوچونەم، دوای ئەوە پرسیاری لاشەی کاهینی لێکرد کە چی لێکردووە؟

نۆکەر وتی: لاشەکەی لەهەمان شوێنی لەسێدارەداندا فڕێدراوە.

موسا وتی: بۆچی لاشەکەیت لەشوێنێکی تایبەتدا هەڵنەگرت.

نوکەر وتی: ئەو فەرمانێکی وای پێ نەدابوم، چونکە هیچ شوێنێکی ئەوتۆم شك نەدەبرد تا لاشەکەی بەهەڵنەوەشاوی تێدا هەڵگرم، بەچ شێوەیەك دەمتوانی لاشەیەکی ئاوا ببمەوە بۆ کۆشك و لەشوێنێکی سارددا هەڵیگرم، بگرە ئەم سەرەشم بەدەردیسەریەکی زۆرەوە توانیم تا ئەو کاتەی تۆ بێیتەوە لەشوێنێکی سارد دا بۆئەوەی بۆگەن نەکات بپارێزم، ئەگەر ئەمڕۆش نەهاتاییتەوە ناچار بوم شتێکی لێ بکەم.

موسا وتی: تۆ نۆکەرێکی هۆشیاریت... دوای ئەوە خۆی بۆ مۆمیاکردنی سەری"ئامون تپ"ڕێگای مردوخانەی گرتەبەر. شەوانە موسا دەڕۆشت بۆ مردووخانە، کاتێك ئەو سەبەتەیەی کە سەری"ئامون تپ"ی تێدابوو هەڵگرت بەئاگاییەکی زۆرەوە ڕێگای مردووخانەی گرتەبەر. مردوخانە بەڕۆژدا قێزۆون و ئازاربەخش بوو، چ بگات بەشەوی کە هەندێك ئەندێشە و خەیاڵی ترسناکیشی بۆ زیاد دەکرا، بەڵام موسا سەرەڕای ئەوەی زۆر رقی لە مردووخانە بوو و نەیدەتوانی بەڕۆژدا بەرگەی ئەو بارودۆخە بگرێت. جارێکیان لەگەڵ گروپێك خوێنددکاردا ڕۆشتبوو بۆ سەردانی ئەو شوێنە، بەڵام نەیتوانی سەردانی بەش بەشی ئەو شوێنە بکات، بەڵام ئەو شەوە بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و بوێری بەخۆی بەخشی و لەپێناو"ئامون تپ"دا بەرگەی ئەو شوێنە قێزۆونە بگرێت.

بەڕێوەبەری ئەو شوێنە کاتێك چەند جارێك گوێی لەلێدانی دەرگای ئەو مردوخانە بوو وتی: کێیە؟

موسا وتی: بیکەرەوە، کارم هەیە.

وەستاکارەکە وتی: شەو کاتی سەردان نیە، بڕۆ و سبەی بەیانی وەرەوە.

موسا وتی: بەرۆژدا ماوەم نیە، سبەی ناتوانم، بەڵام لەئێستادا ئەنگوستیلەیەکی باشت پێ ببەخشم..... کاتێك گوێ لەئەنگوستیلەی دڵخواز بوو دەرگای کردەوە و

وەستاکار کە نیوە سەرخۆش بوو بەلۆنگەلۆنگەوە چووە کەنارەوە و وتی: کوڕی لاو چیت دەوێت و چەنێکم دەدەیتێ؟

موسا بۆی ڕونکردەوە و وەستای مردووخانەکە وتی: سەرەتا با لەئەنگوستیلەکەوە دەستپێکەین ئەوکات دێینە سەر کارەکە... موسا دوو ئەنگوستیلەی زیوی پێدا و وەستاکەش بەم دوو پارچە کانزایە ڕازی بوو. دوای ئەوە موسای بردە ناو یەکێك لەو ژوورانەی مومیای تێدا دەکەن، لەو ژوورەدا چەند کەسێك لەکرێکارەکانی ئەو مردووخانەیە خەریکی خواردنەوەی ئاوجۆبون-چونکە ئاوجۆ هەرزانترین خواردنەوە بوو- موسا بینی هەموویان مەستن. وەستاکەش ڕوناکی چراکەی دا بەسەروچاوی موسادا و وتی: ئەی مەزن زادە بۆچی بەم شەوە درەنگە هاتویت بۆئێرە و چیت پێیە؟

موسا سەبەتەکەی لەبەردەمیدا دانا و سەرپۆشە مسینەکەی سەری لابرد: دەمەوێت ئەم سەرەم بۆ مۆمیا بکەیت.

وەستاکەش لێی پرسی: ئەی لاشەی لەکوێیە؟

موسا وتی: لەشوێنی لەسێدارەدانەکەدا فڕێ دراوە، بەیانی دەتوانی دوان لەکرێکارەکانت بنێری بۆئەوەی لاشەکەشی بهێنن... دوای ئەوەش چەند ئەنگوستیلەیەکی زیوینی تری خستە ناومشتی ئەو پیاوە... موسا لەوشوێنەدا چاوی بەلاشەی چەند ژنێکی لاو کەوت و سەری لەوە سوڕما کە جەستەی ئەم ژنانە لێرەدا چی دەکەن؟ بەڵام لەناکاو ئەوەی هاتەوە یاد، ئەوەی لەبارەی هەندێك ڕەفتاری ناشایست و وروژێنەری ئەم کرێکارانە لەگەڵ ژنە مردووەکاندا بیستبوی ڕاستە، لەوکاتەدا موسا زۆر دڵگران و نیگەران ئەو ژوورەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ کۆشك.

# فیرعەونی نوێ

فیرعەون بەهۆی گەشتە دورودرێژەکەی ماندو و شەکەت گەڕایەوە و یەکەمین کار کە ئەنجامی دا کوشتنی کاهینی مەزن بوو، بەڵام بێئاگا لەوەی خۆی هەموو بەیانیەك ڕوخساری تاریکتر و قەد و باڵای سیستر و چەماوەتر دەبێت، فیرعەون باسی"مات"ی یەزدانی دادپەروەری بۆ ڕامسیس دەکرد!!مات کە شێوەی ژنێکی بەڕوکەش تێکشکاو بوو، "پردوم"یش ئاڕاستەی فڕینی دەکرد. فیرعەون دەیوت: "مات"دەبێت فەرمانڕەوایی بکات بۆئەوەی خۆگونجاندنی بونەوەرەکان بەپارێزراوی بمێنێتەوە. بەبۆچونی"مات" دەبێت ڕێز لە یاسا یەزدانیەکان بگیرێت کە خۆر هەمیشە تیشکێکی دەرەوشاوە و ڕوناکی هەبێت و گەشەی گەنمی لاوازیش بەتواناتر بێت. ئەرکی فیرعەون بوو باسی"مات" بکات و یاسا یەزدانیەکان جێبەجێ بکات، لەهەمان ئەو کاتەی باسی ئەمانەی بۆ ڕامسیس دەکرد خۆی دەستی لەخوێنینترین تاواندا ئاڵاندبوو.

ڕامسیس گوێی لێدەگرت، بەڵام نەیدەوێرا پرسیاری باری تەندروستی باوکی بکات. "ستە هوس"هاوسەری فیرعەون دەیزانی نەخۆشی هاوسەرەکەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەتینتر دەبێت، ئەم هەواڵە وردە وردە لەناو کۆشکدا بڵاو بویەوە تا گەشتە گوێی کاهینەکان. کزی ڕوناکی باوك چرای دەستەڵات و فەرمانڕەوایی کوڕەکەی بەتینتر و درەوشاوەتر دەکرد. سەربازە یۆنانیەکانی"منلائوس"کە چیتر بوبون بەبەشێك لەکۆمەڵگای میسر، لەجلوبەرگی بازرگانی و کارەکانی تریاندا تا دەهات چەکەکانیان تیژتر دەکردەوە بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا فریای فەرمانەکانی پادشای"ئسپارت"بکەون. "ستە هوس"تەنها بیروهۆشی لەلای فیرعەون بووکە

لەناکاو دوچاری لاوازی و ئازارێکی سەخت بوو بوو، ئەمەش گەشتە ڕادەیەك کە چیتر نەیدەتوانی پێشوازی لەهیچ کەسێك بکات.

ستە هوس لەوەڵامی "ڕامسیس"دا کە هاتبوو بۆئەوەی چاوی بەباوکی بکەوێت وتی: ئەمڕۆ باوکت ناتوێت چاوی پێت بکەوێت.

ڕامسیس هۆکارەکەی لێ پرسی و ستە هوس وتی: بگرە پزیشکیش نەشتەرگەریەکەی بۆ ناکات، بەڵکو تەنها بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی جۆرێك دەرمانی بۆ دەستنیشان کردووە. چیتر هیچ ئومێدێك لەمانەوەیدا نیە...

"ڕامسیس"یش کە فرمێسك لەچاوانید قەتیس مابوو، کاتێك فیرعەون گوێی لەدەنگی بوو کورەکەی بانگ کرد: کوڕم دەبێت ئامادە بیت. دەبێت هەتا ئەو ڕۆژەی لەژیانـدا مـاویـت نـاوی باوکـت بەزینـدویی بهێڵیتـەوە... فیرعـەون بەسـەر تەختەخـەوێکی داریـن و ڕوپۆشـی زێـردا ڕاکـشابوو و لەتەنیـشت پەنجەرەکـەوە تەماشـای خۆرئـاوابونی دەکـرد: مـن مـەرگم زۆر نزیـك دەبیـنم، ڕوخساری خـودای وڵاتـی خورئـاوا دەبیـنم، بـەم زوانـە گەشـتێك دەکـەم، گەشـتێکی هـەتا هـەتایی.....

دەنگـی فیرعـەون وردە وردە کـز بـوو و چـاوەکانی دوای کاتـژمێرێك داخـران و جەسـتەی لەجوڵـە کـەوت. مەراسـیمی بـەخاك سـپاردنی لەکـەنار خۆرئـاوای نیلـدا بـەئامادەبونی کەسـە مەزنـەکان بـەپێی بنـەماو و نەریتـە سـەرەکیەکان بـەڕێ خـرا، کوڕەکـانی فیرعـەون بـۆ دوایـین ماڵئـاوایی لەوێـدا ئامـادە بـون و فیرعـەونی پیریـش جێگای خۆی دا بەفیرعەونێکی نوێ.

# جەنگی شمشێر و گۆچان

ژیانی فەرمانڕەوایی و سیاسی میسر لەوەرزی پایز دوای گەڕانەوە لەهاوینە هەوارەوە بۆ پایتەخت دەست پێدەکات. بەدرێژایی وەرزی هاوین پایتەخت چۆڵ دەبوو، خەڵکی بەرگەی گەرمی هاوینی"تبس"یان نەدەگرت. بەدرێژایی هاوین هیچ گەشتیارێك لەولاتی بێگانەوە نەدەهات بۆ"تبس"، سەرپەرشتیاران و کەسایەتیە سیاسیەکانیش بەشێوەیەك بەرنامەیان بۆخۆیان داڕشتبوو کە لەوەرزی"پایز"دا ڕێ بەخەڵکی بدەن چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکەن. هاوینان وەرزی نۆژەنکردنەوەی کۆشك بوو، چونکە کۆمەڵێك خەڵکی زۆر لەوێدا ژیانیان بەسەر دەبرد، هەڵبەت بێ لەخزمەتکارەکان. پایتەختی میسر یەکێك بوو لەنێوەندە چالاکەکانی ئەو سەردەمە و هیچ ولاتێك نەیدەتوانی بانگەشەی ئەوە بکات کە شارستانیەتێکی ئاوا درەوشاوەی وەك میسر هەبێت. بەشە جیاوازەکانی میسر بۆ چەند مەبەستێکی جۆراوجۆر سەردانی پایتەختیان دەکرد و ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ کۆشك و کاربەدەستانی دەوڵەتەدا هەبوو بەبینینی"موسا"ی کەڵەگەت و ڕوخسار بەرجەستە زۆر کاریگەردەبوون، چونکە موسا لاوێکی ڕوخۆش و سەرنج ڕاکێش و بالایەکی بەرز و تایبەتمەندی پاڵەوان و قارەمانی هەبوو. بەهۆی ئەم کاریگەریەی کە دەیکردە سەر میوانە دەرەکیەکان، شازادەکانی تر ئیرەییان پێدەبرد، چونکە زۆر دڵگرانی ئەوە دەبوون کە دەیانبینی لەلایەن میوانە دەرەکیەکانەوە گرنگیەکی زۆری پێدەدرێت. لەم نێوەندەدا یەکێك لەکوڕەکانی فیرعەون کە زیاد لەوانی تر ئیرەیی پێدەبرد ناوی"ستی ستی"بوو. دەزانین کە ست بەواتای ئەهریمەن و ستی بەواتای ئەهریمەنی و ستی ستی بەواتای ئەهریمەنی ئەهریمەنی دێت، بۆیە ئەم ناوە سەلمێنەری شەڕەنگێزی و ئەهریمەنی ئەو کوڕە دەسەلمێنێت. ئەم"ستی ستی"ە

چەندجارێك بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ سوکایەتی بە"موسا"کردبوو، بەڵام موسا لەئاستێکدا نەبوو کە گرنگی بەگوتەی سەرزارەکی و توانجی"ستی ستی"بدات، تا دوای کۆچی دوایی کردنی"ئنخاس ئامون" کە موسای کەمێك بێتاقەت و تووڕە و دڵتەنگ کردبوو و ئەو موسا خۆپاریزەی جاران نەبوو، ڕووبەڕوی"ستی ستی"بویەوە، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە بیانیەکان باسی"موسا"یان دەکرد. کوڕی فیرعەون بۆسەیەکی بۆ دانا تا ئەوکاتەی دەرکەوت و بەشمشێر پەلاماری"موسا"ی دا و هاواری کرد: ڕۆژێك دێت ئەم شمشێرە دەکەم بەورگتدا؟ و بێ ڕیخۆڵە ڕەوانەی مردوخانەت دەکەم، تۆ خۆت بەچی دەزانی؟ تۆ خۆ شازادە نیت، بگرە ناوەکەشت نیوەیە، پێم بڵێ موسا واتای چی دەگەیەنێت؟ دیار نیە لەچ شتێکەوە وەرگیراوە!

موسا چیتر نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت و ڕۆشتە پێشەوە بۆی و پێی وت: بەچ شێوەیەك باسی دایکمت کرد؟

ستی ستی وتی: لەوبارەوە باسی دایکتم کرد، ئەگەر ئەو تۆ لەڕووبار نەگرتایەتەوە ئێستا ئێمە دوچار و گرفتاری تۆ نەدەبوین.

موسا وتی: ئایا دەزانی باسی کۆچکردووەکان بێ ڕەوشتیە.

ستی ستی وتی: کەسێك کە دایکی تۆ بێت نابێت ڕێزی لێ بگیرێت... ستی ستی لەپاڵ برا و شازادەکانی تردا بەدەنگێکی بەرز قسەی دەکرد. یەکێك لەبراکانی"ستی ستی"لاوێکی باڵا کورت و ڕەشپێست و دایکیشی لەژنە کەنیزەکان بوو، ئەو کەنیزەیە لە"لیبیا"وە هێنابویان بۆ میسر و لەشەوێکدا کەزۆر مەست بوو لەگەڵیدا دەخەوێت و سکی پڕ دەکات، ئەو کوڕە باڵاکورتێکی ناشیرین و قەد و باڵایەکی ناشیرینی هەبوو. لەهەمان کاتدا ڕوخسارێکی زۆر ناشیرینی هەبوو و بەڕەفتارەکانی دڵی خەڵکی دەڕەنجاند. موسا سەرەڕای ئەوەی لەڕوی دەرونیەوە زۆر دڵگران بوو، بەڵام کاتێك بینی ئەو کەنیزە زادەیە بەوشێوەیە بانگەشە بۆخۆی دەکات بەدەنگێکی بەرز قاقا پێکەنی و سەرنجی چواردەوری بەلای خۆیدا ڕاکێشا. "ستی ستی"یش لەڕادەبەدەر تووڕەبوو و بەدەم هاوارەوە وتی: قسەیەکی پێکەناویت بیست؟

موسا وتی: ئەو قسەیەی کە کردت لەدەمت گەورەتر بوو.

ستی ستی وتی: ئەی لاوی نیوە ناو و بێناو ئەم پێکەنینەت دەگۆڕم بەشیوەن وگریانێکی بەرز.

"موسا"ش کە لەڕاستیدا تووڕەیی لەشێوەی پێکەنینێکدا خستە ڕوو، بەسەرخۆیدا زاڵ بوو و وتی: لەڕاستیدا زۆر حەز دەکەم بگریم، ئەگەر بتوانی هاوکاریم بکەیت بەوشێوەی خۆت وتت دەست بەشیوەن و گریان بکەم زۆر سوپاسگوزارت دەبم.

ستی ستی وتی: لەپاڵ قوچەکیەکانی میسر لەکەنار چڕە خورماکاندا یەك دەبینینەوە.

موسا پرسی: کەی لەوێ ئامادە بم؟

ستی ستی وەڵامی دایەوە: لەکاتی هەڵهاتنی مانگدا... کەنیزە زادەی بالاکورت بەمشێوەیە بەردەوامی دا بەقسەکانی: لەکاتی هەڵهاتنی مانگدا لەکەنار چڕە خورماکاندا چاوەڕێتم و پێم بڵێ بەچ چەکێك ڕاهاتویت؟ پێم بڵێ! دەتوانی هەر چەکێك کە خۆت حەزی لێدەکەیت هەڵی بژێریت... دوای ئەم قسەیە ستی ستی و ئەوانەی لەگەڵیدا بون ڕۆشتن.

موسا دوای ماوەیەك گەشتە لای درەختێکی هەنجیری پیر و لەژێر سێبەرەکەیدا دانیشت. لەهەمان ئەو ساتەدا چاوی بەپیاوێك کەوت کە لەژێر گەرمای خۆردا دانیشتبوو، زۆر سەری لەم پیاوە سوڕما. بەلام کاتێك باش لێی وردبویەوە مامۆستای تیر و کەوانەکەی خۆی ناسیەوە و وتی: ستی هوپ!. ستی هوپ بەمامۆستای تیروکەوانی تەواوی شازادەکان لەقەڵەم دەدرا. موسا لەسەردەمی لاویەتیدا یەکەمین ساڵی خوێندنی مەشقی لەسەر تیرهاویشتن کردبوو و دوای ئەوە چیتر چاوی بە"ستی هوپ"نەکەوتبوو، بەلام سەرەڕای ئەوەش کاتێك بینی یەکسەر ناسیەوە: بەهۆی ئەو خودە جەنگیەی کە لەسەری دەکرد و سینەیەکی پان و ماسولکەیەکی لول و ئەندامێکی بەرجەستەی هەبوو، لەهەرشوێنێك ببینرایە یەکسەر دەناسرایەوە. موسا ڕێزێکی زۆری لە"ستی هوپ"دەگرت و هەمیشە ئەوی وەك قارەمانێك لێك دەدایەوە. سەیر لەوەدا بوو کە"ستی هوپ"یش یەکسەر

موسای ناسیەوە و وتی: سڵاو لەموسا، زۆر خۆشحاڵم بەوەی دوای ئەو هەموو ساڵە دوبارە چاوم پێت کەوتەوە، پیاوێکی تەواوت لێ دەرچووە.

موسا بەڕێزەوە لێی پرسی: مامۆستا بۆچی لەژێر تیشکی خۆردا دانیشتویت؟

ستی هوپ بەدەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە: ئازاری نێوەندی ئێسقانەکان"مفاصل"و ئازاری پیری کە دوای تێپەڕبونی وەرزی هاوین هێرشت بۆ دەبات، چارەسەرەکەشی خۆرە.

موسا وتی: بەڕاستی زۆر دڵگرانم بەوەی دەبیستم پێی مامۆستای قارەمانم ئازاری هەیە.

ستی هوپ بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: بەڵام من زۆر خۆشحاڵم بەوەی دەبینم بەلایەنی کەم یەکێك لەشازادەکانی دانیشتوی کۆشك بەوشێوەی ئارەزوی دەکەم خەم و پێزانینی خۆیم بۆ دەردەبڕێت، ئەم جۆرە مامەڵانەم زۆر پێجوانە، وام دەزانی هیچ گرنگیەکم پێ نادەیت.

موسا وتی: من لەوجۆرە کەسانە نیم کە گوێ بەمامۆستایەکی وەك تۆ نەدەم، من هەمیشە تۆم بەپارێزەر و دۆستی خۆم زانیوە و ئێستاش بەڕاستی بەبینینت زۆر خۆشحاڵ بوم.

مامۆستای تیروکەوانیش وتی: من لەودورەوە تۆم ناسیەوە و هەستم بەوە کرد کە کەمێك نگەران و دڵگران دیاری.

موسا وتی: هەست و گومانەکەت لەجێی خۆیدایەتی، دڵگرانی من بەهۆی کۆچی دوایی کردنی دایکمەوەیە، بەڵام پێش کەمێك یەکێك لەکەنیزەکانی کۆشك سوکایەتی پێکرد و زۆر توڕە و دڵگرانی کردم.

مامۆستاکەی لێی پرسی: شەڕت کردووە.

موسا وتی: شەڕم نەکردووە بەڵام ئەمشەو لەکاتی هەڵهاتنی مانگدا لەگەڵ یەکدا بەشەڕ دێین.

مامۆستاکەی وتی: تا ئەو شوێنەی تۆ بناسم تۆ کوڕی شەڕ و شۆڕ نەبویت.

موسا وتی: شەڕ ناکەین بەڵام بڕیارە ڕوبەڕوی یەك ببینەوە و هەڵبژاردنی جۆری چەکەکەش لەدەستی خۆمدایە، چونکە ئەو بڕیاری دا ڕوبەڕوی یەکتر ببینەوە.

ستی هوپ وتی: ناکرێت چاوپۆشی لەم ڕووبەڕووبونەوەیە بکەیت؟

موسا وەڵامی دایەوە: ئەگەر چاوپۆشی لەم ڕووبەڕووبونەوەیە بکەم چیتر لێرەدا چاوەڕێم نەدەکرد، ئەوان وا دەزانن لێیان ترساوم، ئەو لەبەردەم خەڵکانی تردا سوکایەتی بەدایکم کردووە، دەبێت سزای گوفتارەکانی خۆی وەرگرێت.

ستی هوپ وتی: بەڵام ئەگەر بیشی کوژێ ئەوا دەرئەنجامێکی خراپ چاوەڕێت دەکات، بەهەرحاڵ ئەم کەنیزەك زادەیە، فیرعەون زادەشە.

موسا وتی: هەوڵی کوشتنی نادەم.

مامۆستاکەی وتی: لەم حاڵەتەدا ئەو هەوڵی کوشتنی تۆ دەدات، ئەمەش یاسای جەنگ و ڕووبەڕووبونەوەکانە.

موسا وتی: ئەو توانایەی نیە، بەڵام ئەگەر بیشکوژرێم لەگەڵیدا دەجەنگێم.

مامۆستای تیرهاویشتن پرسی: دەتەوێت بەچ چەکێك لەگەڵیداً بەشەر بێیت؟

موسا وتی: بەهەر چەکێك پێویست بکات، بەڵام لەوباوەڕەدام ئەو شمشێر هەڵبژێرێت، بەڵام من دارێك بۆ ئەم جەنگە هەڵدەبژێرم!

مامۆستاکەی وتی: بێگومان دەزانی کە شمشێرەکەی لەو شمشێرانەیە کە لەوڵاتی"هاتی"دا بەئاسن دروست دەکرێت و زۆریش بەهێزە. تۆش دەبێت زۆر ورد بیتەوە لەجۆری هەڵبژاردنی دارەکەت، چونکە ئەو شمشێرەی ئەو هەیەتی هەموو دارێك بەیەك لێدان دەکات بەدوو کەرتەوە و لەم حاڵەتەشدا مەرگت مسۆگەرە. ئایا بیرت لەجۆری هەڵبژاردنی ئەو دارە کردووەتەوە.

موسا وتی: نەخێر بیرم لەهەڵبژاردنی جۆری دارەکە نەکردووەتەوە.

ستی هوپ وتی: من دارێکت پێ دەدەم کە لەبەرامبەر لێدانی شمشێردا لەت نەبێت.

موسا وتی: ئەوە چ جۆر دارێکە؟

مامۆستاکەی پێی وت: ئەو دارەی بۆتی دەهێنم بۆئەوەی لەگەڵ "ستی ستی"دا پێی بەشەڕ بێیت لەجۆری داری"ئبنوس[25]"ە. ئەو دارەی پێتی دەدەم نە

---

[25] ئبنوس: لەوشەی یۆنانی"ئبنوس"Ebnus وە وەرگیراوە، درەختێکە کە لەهندستان و حەبەشەدا دەڕوێت و وەك درەختی گوێز گەورە و ئەستور دەبێت، بەرەکەی وەك بەری ترێ وایە و ڕەنگی زەردەباوە، گەڵاکەشی وەك گەڵای

بەشمشێر کەرت دەبێت و نە دەشکێت. "موسا"سوپاسی مامۆستاکەی کرد و خۆی بۆ ئەو ڕوبەڕوبونەوەیە ئامادە کرد. کاتێك مانگ تریفە زیوینی بەئاسماندا بڵاوکردەوە، فیرعەون زادە و لەپێشیانەوە ستی ستی لەکەنار باخە خورماکەدا لەنزیك قوچەکیەکاندا کۆبونەوە و لەگەڵ یەکدا دەستیان کرد بەقسەکردن تا ئەو ساتەی کاتی ڕوبەڕوبونەوەکە هاتە پێش. ئەمانە جۆرەها خواردنەوە و خوادەمەنیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، وەك بڵێی بۆ تەماشاکردنی نمایشێکی تایبەت هاتبن. موسا بەوەرگرتنی ئەو دارە تاقی کردەوە دوای ئەوە بەمتمانە بەخۆبونێکی تەواوەوە پێی نایە گۆڕەپانەکەوە، لەتەنیشت موساوە کەسێکی تر بەدی دەکرا ئەو کەسەش"ستی هوپ"ی مامۆستای تیروکەوانی قوتابخانەی کوڕەکانی فیرعەون بوو. "ستی هوپ"تەماشایەکی ئەوانی کرد و بەموسای وت: ئەمانە هاتون بۆئەوەی کاتی خۆش بەسەر بەرن، لەوانەشە هاتون تا هاوکاری براکەیان بکەن!دەبێت ئاگات لەخۆت بێت نەوەکو کەسێك لەمانە لەکاتی جەنگەکەدا هاوکاری براکەی بکات. "ستی هوپ"لەئەسپەکەی دابەزی و هەوساری ئەسپەکەی"موسا"شی گرت بەدەستەوە و بەدارخورمایەکەوە بەستنیەوە. موسا ئارام و لەسەرخۆ بەرەو ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە هەنگاوی نا، شازادە و شازادە خانمەکان چاوەڕێی ئەو جەنگەیان دەکرد و بەدەم هاوارەوە دەیانوت مەرگ بۆ موسا، حەزیان دەکرد لەم ڕوبەڕوبونەوەیەدا بکوژرێت. "ستی ستی"خودەیەکی کردبووە سەری و زرێپۆشیشی لەبەرکردبوو، بەڵام قوڵی قەڵخانی پارێزەری پێوە نەبوو و بەشمشێرێکی درێژ بەدەستەوە ڕۆشت بۆ ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە. "موسا"ش نە قەڵخانی بەدەستەوە بوو نە زریٚ پۆش و خودەی بەسەرەوە بوو، هەر ئەو بار سوکیە دەبووە هۆی ئەوەی خێرا و چوست و چالاك بێت، لەکاتێك بونی خودە و زریٚ پۆش کە لە"مەفرەغ"دروست دەکرێن"ستی ستی"خاوتر و قورستر کردبوو. "ستی هوپ"دوای بەستنی ئەسپەکان بەدارخوماکەوە ڕۆشتە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە و مەشخەڵەکانی داگیرساند، تا ئەو ساتە وایان دەزانی موسا

---

سنۆبەر وایە و گوڵەکانیشی وەك گوڵی خەنە، دارەکەشی قورس و بتەو و پەڵەپەڵەی ڕەشی پێوەیە... سەرچاوە ﴿فەرهەنگی عەمید﴾ وەرگێڕ.

ئەفسەرێکی سەربازی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، بەلاّم ڕوناکی مەشخەڵ ڕوخساری "ستی هوپ"ی مامۆستای ئاشکراکرد و سەرکردەی بەناوبانگی جەنگەکان مامۆستای تیر و کەوان"ست هوپ"ە. سەرکردەی پیر بەدەنگێکی بەرز وتی: ئەی شازادەکانی میسر بێگومان هەموتان دەمناسن، هەمووتان بۆماوەیەك لەلای من مەشقی تیرئەندازی کردووە، من پێش ئەوەی لەدایك بن، باوکتانم فێری ئەوە کردووە کە بەچ شێوەیەك شمشێر بەدەستەوە بگرێت و خودی فیرعەون یەکەمین جار بەهاوکاری من سواری گالیسکە بوو، ئەویش وەکو ئێوە مەشقی لەسەر تیرئەندازی کردووە، ئەمانەم بۆ مەبەستێك بۆ گێڕانەوە، باش گوێم لێبگرن، ئێمە ئەمشەو بۆ ڕوبەڕوبونەوەیەك لێرەدا کۆبوینەتەوە، ڕوبەڕوبونەوەیەك کە لەوانەیە یەکێکیان یان هەردوکیان لەناو بچن و هەردوکیشیان شازادەن، سەرەتا داوا لەو دوانە دەکەم دەست لەم ڕوبەڕوبونەوەیە هەڵگرن بۆئەوەی خوێنی یەکێکیان نەڕژێتە سەر زەوی. بێدەنگی باڵی بەسەر هەمواندا کێشا و هەمووان چاویان بڕیە موسا و ڕکابەرەکەی"ستی ستی"

دوای ئەوە ستی هوپ وتی: من بەفیکەیەك ئاماژە بەئامادەبونی ئەم ڕوبەڕوبونەوەیە دەکەم، فیکەی دووەم لێدەدەم ئەگەر ویستیان دەست لەم ڕوبەڕوبونەوەیە هەڵگرن ئەوا دەتوانن لەفیکەی دووەمدا هەلوێستی خۆیان وەرگرن، ئەگەر هەردولا لەوکارەیان پاشگەز نەبونەوە ئەوا لەمحاڵەتەدا فیکەی دەستپێکردنی ئەم ڕوبەڕوبونەوەیە لێدەدەم..... دوای ئەوە ڕویکردە موسا و ستی ستی و وتی: تێگەشتن؟. هەردوکیان بەهێمای بەڵێ سەریان ڕاوەشاند، دوای ئەوە مامۆستای تیرئەندازی فیکەیەکی درێژی لێدا، هیچ کامیان لەجێی خۆی نەجولاّیەوە، فیکەی دووەمیش هەر بەوشێوەیە لەجێی خۆیان تەکانیان نەخوارد و لەسێیەمین فیکەدا بوو کە شمشێر لەلایەك و دار"ئبنوس"لەلاکەی تر کە شەش هەنگاو لەیەکتر دوربون هێرشیان برد بۆ یەکتری. شازادە خانمەکان کە پێشتر دانیشتبون هەستانە سەرپێ بۆئەوەی جوانتر بەسەر ئەو گۆڕەپانەدا زاڵ بن. "ستی ستی" کە قەلاّخنێکیشی بەدەستی چەپیەوە گرتبوو شمشێرەکەی سوڕاندەوە و ڕۆشتە پێشترەوە، قەڵخانەکەی لەپێش دەموچاویەوە گرت و بەرەو ورگی موسای

وەشاند، بەڵام یەکسەر شمشێرەکەی کێشایە دواوە و بەرزی کردەوە بۆئەوەی بیکێشێت بەنێوچاوانی موسادا! لەناکاو لەکاتی وەشاندنی شمشێرەکەیدا بەر دار"ئبنوس"ەکەی موسا کە بەخێرایی بەلاسەریەوە ڕایگرتبوو کەوت و شمشێری دەستی ستی ستی لەناکاو بەهۆی ئەو کاردانەوە بەهێزەوە ڕاوەشا و فشار و ئازارێکی زۆری خستە سەر دەست و قۆڵی"ستی ستی" سەرەڕای ئەوەی شمشێرەکەی ستی ستی لەئاسن دروست کرابوو بەڵام نەیتوانی دار"ئبنوس"ەکە بکات بەدوو کەرتەوە و تێکی بشکێنێت، ستی ستی خۆی بۆ هێرشێکی تر ئامادە کرد، بەڵام ئەمجارەیان پەلاماری نێوچەوانی موسای نەدا چونکە ستی ستی پەیی بەوە برد کە دار"ئبنوس"ەکە بەو شمشێرە تێکناشکێت، بۆیە ڕاستەوخۆ بۆ ناوکی موسای وەشاند، هەر لەم ماوە کەمەدا کە ستی ستی دەستی بۆ دواوە کێشایەوە تا بدات لەموسا، بەڵام موسا بەهۆشیاری و ئاگاییەکەوە مەچەکی ستی ستی کردە ئامانجی خۆی و بەهەموو توانایەکی دار دەستەکەی کێشا بەمەچەکی"ستی ستی"دا. ئەو لێدانەی بەڕادەیەك بەهێز و ئازاربەخش بوو کە نەك تەنها شمشێرەکەی لەدەستی ستی ستی کەوتە خوارەوە، بەڵکو خۆشی لەئازاردا کەوتە سەر زەوی و بەدەستەکەی تری کە قەڵخانەکەی فڕێدابوو مەچەکی خۆی گرت و هاواری کرد. "ستی هوپ"فێکەیەکی زۆر بەهێزی لێدا و کۆتایی ئەم ڕووبەڕووبونەوەیەی ڕاگەیاند، بەڵام لەناکاو یەکێك لەبراکانی"ستی ستی"بەناوی"روم ئوپت"بەشمشێرێکەوە پەلاماری موسای دا بۆئەوەی لەپشتەوە بیکوژێت. "موسا"ش دوای ئەوەی مامۆستاکەی لەم هێرشە لەناکاوە ئاگاداری کردەوە خۆی بۆ ئەو هێرەشە ئامادەکرد و پێش لێدانی شمشێری"روم ئوپت" دار"ئبنوس"ەکەی بەخێرایی کێشا بەبازوی هێرشبەردا. لێدانی بەهێزی دارەکە"روم ئوپت"ی تەختی زەوی کرد. ستی هوپ لەم دەست تێوەردانە زۆر دڵگران و نیگەران بوو، بۆیە چەقۆکەی دەرهێنا و بەدەسکی چەقۆکەی چەند دانەیەکی کێشا بەسەری هێرش بەردا و وتی: من پێم ڕاگەیاندن هەرکەسێك دەست لەم ڕووبەڕووبونەوەیە بگلێنێت، بەدەستی خۆم تەمێی دەکەم. ئێستا ئەم ڕووبەڕووبونەوەیە کۆتایی پێهاتووە، ئێستا هەمووتان بگەڕێنەوە. دوای ئەوە بەخێرایی هەوساری ئەسپەکانی کردەوە و

بەئاماژەیەك موسای لەوە تێگەیاند كە سواری ئەسپەكەی ببێت و بەخێرایی ئێرە بەجێ بهێڵن.

موسا وتی: ئەگەر دەستیم بۆ نەشكاندایە بەدڵنیاییەوە دەیكوشتم.

مامۆستای تیرئەندازیش لایەنگری كرد و وتی: ئەو دەیتوانی تۆ بكوژێت، ئەگەر ئەویش نەیكوشتایەیت ئەوانی تر دەیانكوشتی، من زۆرباش ئاگاداری ئەوەم، چونكە بەهیچ شێوەیەك بیرت لەم هەڕەشە نەكردبویەوە، من ئەمشەو ئەوەم بۆ دەركەوت كە هەموویان ڕقیان لێتە.

موسا وتی: باش لێیان تێگەشتویت بەڵام"نف"! "نف"ی تەلارساز وەك تۆ هاوڕێمە و بەس ئیتر هیچ كەسێكی تر شك نابەم كە دڵسۆزی من بێت.

ستی هوپ وتی: كابرای تەلارساز هاوڕێی منیشە، بەڵام ئێستا ئەو كۆچی كردووە و لەكۆشكدا كەسێك شك نابەیت دڵسۆزی تۆ بێت، لەمەودواش كینە هاوكات لەگەڵ ترسدا هەڕەشەگەلێكی جدیتر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنێت. تۆ دەبێت زۆر لەجاران ئاگات لەخۆت بێت، بێگومان دایك و برا و خوشكەكانیان دژت هان دەدەن.

# موسا دور دەخرێتەوە

موسا پەیی بەوە برد کە هەڵبـژاردنی ئەو بۆ سەرۆکی لێخوڕانی گالیسکەی جەنگی بەناونیشانی فەرمانده‌یەك جگە لەبیانویەك هیچی تر نیە، بۆئەوەی ئەو لەپایتەخت و کۆشك دور بخەنەوە. لەمیسردا کەسانێکی زۆر هەن ساڵانێکی زۆر ئەزمونی کرداریان لەسەر لێخوڕینی گالیسکە هەبووە و بەشداری جەنگەکانیان کردووە و مەشقیان لەسەر ئەم هونەرە سەربازیە کردووە و شایستەی ئەوە بون بکرێنە بەرپرس و سەرکردەی ئەم جۆرە بوارانە، بەڵام موسا بگرە نەیدەتوانی لێشی بخوڕێت... بۆئەوەی پەیوەندی بەگروپی گالیسکەوانی جەنگیەوە بکەیت پێویستی بەوە دەکرد لەپایتەخت بڕۆیتە دەرەوە، شاری"تانیس"چەق و نێوەندی گالیسکەوانانی میسر بوو. تەواوی بارەگا و تەویلەخانەی مەزنی ئەسپە بەهێز و تواناکان و شوێنی ڕاگرتنی گالیسکە و بەشەکانی تری ئەم بوارە هەموو لە"تانیس"کۆکرابویەوە، ئاشکرابوو فەرماندەی گالیسکەوانەکانیش بەفەرمانی فیرعەون دەبێت لەبارەگای فەرماندەییدا جێگیر ببێت. موسا بەهەر شێوەیەك بوو بەناونیشانی فەرماندە بەباشترین شێوە و پۆشاك دەرکەوت، هێما و نیشانەی فەرماندەیی بەسینەیەوە هەڵواسیوو و بەزۆر و ناچاری بوبە فەرماندە. ڕۆشتنی موسا بۆ ناو گۆڕەپان سەرنجی هەموانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا: ژنان و پیاوان بەملاولای ڕێگەکەیدا لەحاڵەتی ڕێزگرتندا بۆی ڕادەوەستان، منداڵ و نێوجەوانەکان و بەتەمەنەکان بەبینینی ئەو هەموو زاق و بریقە بەجلەکانیەوە کە لەژێر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە وەك فەرماندەیەك لێی ڕامابون، خودەی سەری موسا کە ئەوی شکۆمەندتر نیشان دەدا، کەسایەتی و فەرماندەیەکی ڕەسمی و جدی

پیشانی خەڵکی دەدا. لەناوەڕاستی گۆڕەپاندا چەند گالیسکەیەك لەدوایەوە ڕێیان دەکرد، لەدوای ئەو چەند گالیسکەیەشەوە سەد گالیسکە هاوکات بەیەك ڕیز ڕێیان دەکرد. دەنگی بەرکەوتنی سمی ئەسپەکان بەسەر زەوی هاوکات لەگەڵ حیلەحیل و هات و هاواری گالیسکەوانەکان لەگەڵ دەنگی چەرخی گالیسەکاندا پێکەوە دەنگێکی گوێ هەژێنی دروست دەکرد لەهەمان کاتدا سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. گۆڕەپانی گالیسکەوانی لەماوەیەکی کورتدا گۆڕا بەگۆڕەپانی جەنگ. ئەو تەپ و تۆزەی گالیسکەکان لەکاتی ڕۆشتنندا دروستیان دەکرد تەواوی چوارەدەوری داپۆشی، هەموو گالیسکەکان بەیەك ئاڕاستەدا دەڕۆشتن، بەرەو ڕوی یەك فەرماندەی گالیسکەوان دەڕۆشتن کە بەناو"ستی کف" ستی کف کابرایەکی بالاّ کورت و قەڵەو و سەرێکی کەچەڵ و جلێکی تابلێی سادەی لەبەردا بوو. ئەفسەرەکانی ژێردەستیشی بەحاڵەتی ڕێزگرتن لەهەردوولادا بۆی ڕاوەستابون. موسا بەبینینی پێی پەتی سەربازەکان زۆر سەری سوڕما، چ فەرماندە"ستی کف"و چ ئەفسەرەکانی ژێردەستی یەك شێوە جلیان لەبەردابوو ئەویش تەنها پارچەیەك قوماشیان لەکەمریان و پێی پەتی! فەرماندە"ستی کف"بچوکترین هێمای فەرماندەیی بەخۆیەوە هەڵنەواسیبوو، بەواتا لەڕاستیدا شوێنێکی بۆ ئەو هێمایانە شك نەدەبرد. ئەم ئەفسەرە گالیسکە سوارانە ڕوخسارێکی سوتاویان بەهۆی گەرمی خۆرەوە هەبوو و هەر لەسەرتای پەیوەندیان بەهێزی سەربازی گالیسکەوانیەوە خزمەتیان کردووە. خەڵکی لەبارەی خودی"ستی کف"ەوە دەیانوت لەسەردەمی نێوجەوانیەوە پەیوەندی بە هێزی گالیسکەوانیەوە کردووە. "ستی کف" بەبینینی موسا بەو جلە زاق و بریقەوە زۆر سەری سوڕما و بەرەو موسا ڕۆشت کاتێك لێی نزیك بویەوە لێی پرسی: ئەی فەرماندەی گالیسکەوانان ئایا ئەوە بەڕێزتان داوای بینینی منتان کردبوو؟. دوای ئەوە زۆر کەمتەرخەمانە وتی: بیستومە تۆ دەبیتە فەرماندەی گالیسکەوانەکان؟ لەپایتەختەوە هاتویت؟... موسا بەهۆی ئەو ڕەفتارەی نواندی کەمێك ڕەشداگەڕای و دڵگرانی و شڵەژاویەوە وەڵامی بەڵێی دایەوە.

دوای ئەوە ستی کف لێی پرسی: مەبەستتان لەچاوپێکەوتنی من چیە؟

موسا وتی: بەفەرمانی فیرعەون هاتوم بۆ ئێرە، بەفەرمانی فیرعەون فەرمانڕەوایی گالیسکەوانانی جەنگی ئەم ناوچەیە دەکەم.

ستی کف وتی: فەرمان و جێبەجێکردنی فەرمانەکان ئەرکی هەموو سەربازێکە.

موسا وتی: پێشتر دەبێت ئاگاداریان کردبیت، چونکە فیرعەون پێی وتبوم فەرماندەی ئەوێم بەڕۆشتنت ئاگادار کردووە.

فەرماندە ستی کف وتی: بەڵێ من لەهاتنت ئاگاداریان کردومەتەوە، تۆ ئێستا بەفەرمانی فیرعەون فەرماندەی گالیسکەوانە جەنگیەکانی و هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە شارەزاییەکی تەواوت لەبواری گالیسکەوانی و شێوەی بەکارهێنانی لە گۆڕەپانی جەنگدا هەیە، چونکە تۆ فەرماندەی گالیسکەوانە جەنگیەکانی!

موسا وتی: جەنابی فەرماندە"ستی کف"تائێستا بگرە گالیسکەیەکیشم بەدەستم نەگرتووە.

ستی کف تەماشایەکی موسای کرد و وتی: کەواتە بەچ شێوەیەك دەتەوێت ڕابەرایەتی ئەو هەموو هێز گالیسکەوانیە جەنگیە بکەیت؟... ستی کف بێئەوەی بەردەوامی بەقسەکان بدات ڕۆشت و ئەفسەرێکی تر لەموسا نزیك بویەوە: ئەو کەسە بەپێچەوانەی"ستی کف" بالآیەکی بەرزی هەبوو، و خۆشڕوو دەهاتە بەرچاو، لەلایەکی ڕوخساریدا جێگەی ڕوشانێکی پێوە دیاربوو، ئەم ڕوشانە لەناوچەوانیەوە تا گۆشەی لێوی شۆڕ دەبویەوە.

جێگری فەرماندە لە موسا نزیك بویەوە و سلاوی سەربازی بۆکرد و وتی: ناوم"هتپ رە"یە، فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکانم و لەژێردەستی"ستی کەف"دا خزمەت دەکەم، فەرمانیان پێداوم ملکەچی فەرمانەکانت بم. یەکەمین پرسیاری موسا لەباری شێوازی پۆشینی جلوبەرگی فەرماندەی گالیسکەوانەکان بوو کە بۆچی وەك باربەر و کۆڵبەرەکانی لەنگەرگا تەنها پارچە قوماشێك لەکەمەریانەوە دەپێچن؟

"هتپ رە"کە لەئەفسەرە کۆنەکان لەقەڵەم دەدرا بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: گالیسکەوانەکان بارودۆخی داراییان باش نیە، بەچاوی خۆت دەبینی کە پێخاوسیشن. نامەوێت زیادەڕۆییت بۆ بکەم و پێت بڵێم ئەم جۆرە پۆشاکانە

لەفیداکاری و گەرمی ئاو و هەوا و نەریتێکی کۆنەوە سەرچاوە دەگرێت، نەخێر وانیە، ئەگەر دەستەڵاتمان ببوایە وەکوو تۆ پۆشاکمان لەبەردەکرد.

موسا وتی: وام دەزانی بەهۆی ئەوەی بەردەوام بەشداری لەجەنگەکاندا دەکەن و پێشەنگی هەموو جەنگێك دەکەن باری داراییتان لەئاستێکی باشدایە.

"هتپ رە"وتی: ئەی فەرماندەی لاو و نوێ، ئێمە بەچ شێوەیەك دەتوانین خاوەنی بارودۆخێکی دارایی باش بین، لەکاتێك بەردەوامی ئێمە کەمێك لەسەربازەکانی تر زیاترە، ئێستاش بۆئەوەی بزانی بەردەوامی ئێمە چەنێکە بەکرداری پێت نیشان دەدەم...

"هتپ رە"فەرماندە پەنجەی خستە سەر یەکێك لە هێماکانی سەرجلەکەی موسا و وتی: بەهای هێمای ئەم پلەیە زۆر زیاترە لەو کۆمەڵە موچەیەی کە یەك فەرماندەی گالیسکەوان لەماوەی ساڵێکدا وەریدەگرێت. بابەتی دەستەکەوتەکانی جەنگیش دەنگی دەهۆڵی دورە، من لەتەواو جەنگەکاندا هیچ دەستکەوتێکم بەدەست نەهێناوە، چونکە هەموو جەنگێك دەستکەوتی تێدا نیە، لەهەندێك وڵاتدا دوای ئەوەی بەسەریاندا سەرکەوتین و خۆمان دەکەین بەماڵەکانیاندا بەزییمان پێیان دێتەوە، تەواوی کەلوپەل و کەرەستەکانی ناوماڵیان بەسەر یەکەوە بریتیە لەچەند گۆزە و کەرەستەیەکی بێنرخ، بگرە شەوانەش نانیان نیە بیخۆن چ بگات بە بەدەستکەوتی سەربازە داگیرکەرەکان. لەهەندێك شوێنیشدا کەوا هەست دەکەین شتێکمان دەست دەکەوێت، دەبینین زێڕ و زیو پێش ئەوەی ئێمە بگەینە ئەوێ هەڵهاتووە و خۆیی لێمان شاردراوەتەوە، ئاسایی ئەو شتانەی هەڵناگیرێن زیاتر بەرچاومان دەکەوێت، لەکاتێك ئێمە بەدوای شتومەکی سوك و گرانبەهادا دەگەڕێین. "هتپ رە"بەم شێوەیە بەردەوام بوو: لەو شوێنانەش کە دەستکەوتێکی تێدا دابەشبکرێت، هیچ شتێك لەو دەستکەوتانە ڕەوانەی میسر ناکرێن، چونکە هەریەك لەو سەربازانەی کە دەیانبینی بەهیوای ئەوە نین بەیانی زیندو بن یان نە، لەبەرئەوە دەیەوێت هەر ئێستا ژیانێکی خۆش تێپەڕێنێت، لەبەرئەوەی تۆ بارودۆخی فەرماندەیەکی گالیسکەوانی جەنگیت لەزمانی کۆنە فەرماندەیەك بیست. "هتپ رە" لەبەرئەوەی"موسا"ی بەبێدەنگی بینی زانی ئەم بابەتە بەلایەوە

سەرنج ڕاکێش نیە، بۆیە بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی، مەبەستم ئەوەیە دوای ئەوەی کوڕی فیرعەون بوبە جێنشینی باوکی نێوان ڕامسیس و ستی کف بەناونیشانی فەرماندەی گالیسکەوانی دەرگیری و تێکچونێك دروست دەبێت، چونکە"ستی کف"فەرماندەیەکی وردبینە و لەبەرامبەر کارەکانیدا زۆر هەستیارە، بۆیە داوام لێکرا پلەوپایەکەم بەدەم بە"موسا" کە جەنابتی. سەرەڕای ئەوەش ئەوەی لەم بوارەدا شارەزام فێری تۆی دەکەم، بەواتا لەڕاستیدا بۆماوەیەك خۆم سەرپەرشتی گالیسکە جەنگیەکان دەکەم تا ئەوکاتەی ئەزمونێکی باش لەم هونەرەدا بەدەست دەهێنیت، ئەمەیان ویستی خۆمە و هیچ کەسێك ناتوانێت ناچارم بکات کارێکی وا بۆ هیچ کەسێك ئەنجام بدەم و فێری هونەری گالیسکەوانی جەنگی بکەم.

موسا پرسی: تۆ کە بەردەوام لەبیابانەکاندا سەرقاڵی جەنگیت لەکوێوە ئاگاداری کۆشك و باری دەرونی کاربەدەستانی ئەوێی، سەرەڕای ئەوەی لەپایتەختەوە زۆر دوری، لەکوێوە زانیت فیرعەون خۆشی لەمن نایەت و لێم توڕەیە؟

هتپ رە وەڵامی دایەوە: لەوەوە زانیم کە فیرعەون بۆ ماوەی سێ ساڵ تۆی بۆ ئێرە دور خستووەتەوە و چیتر نایەوێت چاوی پێت بکەوێت، ئێستاش دەمەوێت ڕاسپاردەیەکی دڵسۆزانە و خێرخوایانەت پێ بسپێرم، ئەو ڕاسپاردەیەش ئەوەیە فەرماندەی کالیسکەوان گوتەی سوکایەتی ئامێز بەهەموو ئەو کەسانەی کە نازانن گالیسکەوانی بکەن دەڵێت، چ بگات بەوەی ئەو کەسە فەرماندەی گالیسکەوانان بێت، فیرعەون ویستویەتی بەم شێوەیە سوکایەتیت پێ بکات بۆئەوەی کەسانی تر تۆ بکەنە گاڵتەجاڕی خۆیان، من هەموو هەوڵێکی خۆم دەخەمەگەڕ تا ئەوەی پێویستە فێرتی بکەم و تا ئەوکاتەی زاڵ نەبیت بەسەر بەڕێوەبردنی گالیسکە جەنگیەکاندا، خۆم بەرپرسیاریەتی بەڕێوبردنی گالیسکە جەنگیەکان لەئەستۆ دەگرم بۆئەوەی هەستی بەهیچ بۆشاییەك لەبەڕێوبردنی فەرماندەیی تۆدا بەدی نەکرێت. تەنها لەوانەیە تکای ئەوەت لێ بکەم بڕێك زێڕم پێ بدەیت.

موسا وتی: چەنێك زێڕت دەوێت؟

فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکان وتی: بڕی بیست ئەنگوستیلەی گەورە زێڕم پێویستە.

موسا وتی: بەخۆشحاڵیەوە ئەو بڕە زێڕەت پێدەدەم.

"هتپ رە"بەسوپاسگوزاریەوە پێی وت: لەمەودوا لەخزمەتی تۆدا دەبم و تۆ بەم بڕە زێڕە منت بۆ خۆت کڕیوە و وەك نۆکەرێکی بەوەفا خزمەتت دەکەم، ئێستاش بڕۆین و چەند پێکێك شەراب بەیەکەوە بخۆینەوە. لەبەشی کۆتایی تەویلەخانەکەدا گالیسکەوانەکان لەمیوانخانەی هەمیشە قەرەباڵغ و پڕبوو لەئەفسەر و سەرباز، کاتێك موسا خۆی کرد بەو میوانخانەیەدا و چاوی بەو بارودۆخە کەوت پێی قەڵس و بێتاقەت بوو.

"هتپ رە"کاتێك زانی خۆشی لەم جۆرە شوێنانە نایەت بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: بەئەنقەست تۆ هێنایە ئێرە بۆئەوەی لەنزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانێکی جیاواز هاوکات لەگەڵ گالیسکەوانە جەنگیەکاندا بەرقەرار بکەیت و زیاتر پێیان ئاشنا بیت و بۆماوەی کاتژمێرێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەیت، ئەمەیان بەشداریەکی ناچاری و خەڵکناسی پێدەوترێت، چونکە ئەگەر تۆ ئاگادار و ئاشنا باری دەرونی ئەم دەستیە نەبیت، ئەوا ناشتوانی بەڕێوەیان ببەیت. ئەفسەر و سەرباز هەردوکیان وەك یەك لەگۆڕەپانی جەنگدا یەك ژیان و چارەنوسیان هەیە ئەویش یان دەکوژرێن یان دەکوژن، ئەمانە ژەمی خواردنیان ئەوەی لەگۆڕەپانی جەنگدا بەدەستی دەهێنن لەم مەیخانەدا خەرجی دەکەن. زۆرێك لەمەیخانەکان دەرامەتیان پەیوەست دەکرێت بەم جۆرە کەسانەوە. هیچ کاتێك پێت نالێم تۆش وەك ئەوان کاتەکانت بەخۆشی تێپەڕێنە، بەڵام لەوە ئاگادارت دەکەمەوە کە هیچ کاتێك ڕێ لەخۆشگوزەرانیان نەگریت، چونکە تەنها بەو ئومێدەوە دەژین و زیندون.

موسا ڕۆشتە فەزای کراوەی میوانخانەکە و لەتەنیشت درەختێکەوە ڕاوەستا "هتپ رە"فەرمانی دا ئاوجۆیان بۆ بهێنن و هەرئەوەی سەری گەرم بوو بە"موسا"ی وت: ئێمە دەڕۆین بۆ وڵاتی "کوش"، شوێنێك کە خەڵکەکەی دڕەندە و جەنگاوەرێکی ترسناکن، تائێستا لەجەنگاوەرانی "کوش"ترسناکتر و تۆقێنەرترم نەبینیوە، بگرە ناتوانی جەنگاوەرانی وڵاتی "هاتی" لەگەڵ جەنگاوەرانی وڵاتی "کوش"دا بەراورد بکەیت.

موسا پرسی: بۆچی شایەنی ئەو نین لەگەڵ ئەواندا بەراورد بکرێن.

هتپ ڕە بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: لەبەرئەوەی جەنگاوەرانی "هاتی" پەیڕەوی شێواز و پابەندی سەربازی شێوازەکانی جەنگ دەکەن، لەکاتێکدا جەنگاوەرانی "کوش" تەنها دەیانەوێت بکوژن، ئەمانە وەك گیانەوەرە دڕەندەکان هێرش دەکەن و لەمەرگیش ناترسن.

موسا وتی: تائێستا بەشداری هیچ جەنگێکم نەکردووە و نازانم هەلومەرج و بارودۆخی جەنگ بەچ شێوەیەکە.

هتپ ڕە لەموسای پرسی: ئایا خوێندەواریت هەیە؟

موسا وتی: هەر لەمنداڵیەوە ناردومیان بۆ قوتابخانە و بەو هۆیەوە کەسێکی خوێندەوارم لێ دەرچووە.

کاتێك "هتپ ڕە" زانی موسا خوێندەواری هەیە بەڕێزەوە بۆ دەڕوانی و پێی وت: لەجەنگدا بەشداری نەکردن بەو واتایە دێت کە لەهەلومەرجی جەنگ بێئاگایت، بەڵام خوێندەواری قەرەبوی ئەم کەمایەتیە دەداتەوە، تۆ لەمن کە فەرماندەیەکی کۆنم پێشەنگتر و مەزنتری، تۆ وەك من پێویستت بەوە نیە بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانت بەشداری جەنگەکان بکەیت، بەڵکو بەناونیشانی فەرماندەیەکی تێگەشتو و خوێندەوار دەتوانی لەهەموو شوێنێکدا بەپشت بەستن بەم خوێندەواریەت بەئاسانی ژیانێك بۆخۆت دابین بکەیت، هیچ نەبێ بەلایەنی کەم دەتوانی ببیتە نوسەری بارەگایەك کەلەمیسردا بەباشترین کار لەقەڵەم دەدرێت. لەمکاتەدا چەند سەربازێك تەماشای جلوبەرگی پڕ زاق و بریقی "موسا"یان دەکرد کاتێك گوێیان لەقیڕەی بەهێزی "هتپ ڕە" بوو و دەنگدانەوەیی بەهێزی لەو ناوچەیەدا دروست کرد سەربازەکان بەترس و تۆقانێکەوە لەچواردەوری بڵاوەیان لێ کرد.

"هتپ ڕە" بەموسای وت: فەرماندە دەبێت توندوتیژ و سروشتێکی زبری هەبێت، بۆئەوەی سەربازەکانی هەمیشە گوێڕایەڵ و لێی بترسن.

بەڵام موسا زیاتر حەزی بە بیستنی شیکاریەکانی جەنگ و جەنگاوەرانی جۆراوجۆر بوو بۆیە پێی وت: تۆ وتت سەرباز و جەنگاوەرانی "کوش" دڕندەن و هیچ ڕەوشتێکی مرۆییان تێدا بەدی ناکرێت؟

"هتپ رە"وتی: بەڵێ، بەڵام پیاوانی"کوش"خاڵی لاوازیشیان هەیە، ئەو خاڵەش ئەوەیە کە گالیسکەی جەنگیان نیە، خاڵێك لەوە گرنگتر ئەوەیە جەنگاوەرانی کوش بێئاگان لەوەی چەکێك هەیە لەئاسن دروست کراوە، چەکی جەنگاوەرانی وڵاتی "کوش"یش لە"مس"دروست دەکرێت، بەڵام خەڵکی کوش زێڕێکی زۆریان هەیە. دەبێت باسی خاڵێکی تری جەنگاوەرانی کوش بکەم و ئەو خاڵەش ئەوەیە کە هەر یەکێك لە جەنگاوەرانی"کوش" سەربەخۆ شەڕ دەکەن، ئەمانە یەکڕیزی و یەکانگیریان لەکاتی هێرش بردندا نیە، ئەم پەرتەوازەییە لەگۆڕەپانی جەنگدا دەبێتە هۆی لاوازیان لەکاتی هێرشبردندا، سەرەڕای ئەوەش چاونەترسیان هەموو جۆرە بەرگریکاریەك تێکدەشکێنێت. خاڵێکی تر لەبارەی تۆوە کە فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکانی نابێت لەتۆ بشاردرێتەوە، جیاوازی تۆیە لەگەڵ من و "ستی کف"ی فەرماندەی گشتیدا، تۆ لەهەردوکمان لەڕوی خوێندن و نوسینەوە پێشەنگتری، لەکاتێك"ستی کف"یش وەك من نەخوێندەوارە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەم هەلومەرجە، ئەو کە فەرماندەی لەشکرە دەڕوات بۆ"کوش"، بەتایبەت دوای ئەوەی لە"کوش"جێگیر بوو"ستی کف"دەتوانێت فەرمانت بۆ دەربکات و تۆش دەبێت فەرمانەکانی جێبەجێ بکەیت، ئایا تۆ پەیڕەوی لەفەرمانەکانی"ستی کف"دەکەیت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی پلەی فەرماندەیی و سەروتری هەیە ناچارم فەرمانەکانی جێبەجێ بکەم.

"هتپ رە"وتی: کاری ڕاست و دروستیش هەر ئەوەیە، هەوڵ بدە لە"کوش"دا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی"ستی کف"بیت، چونکە ئەگەر سەرپێچی لەفەرمانەکانی بکەیت"ستی کف" ئەو دەستەڵاتەی هەیە کە فەرمانی کوشتنت بۆ دەربکات.

موسا وتی: خەیاڵ ئاسودەبە لەوەی سەرپێچی لەفەرمانەکانی ناکەم.

دوای ئەوە"هتپ رە" لێی پرسی: تائێستا چەند جار سواری گالیسکە بویت؟

موسا وتی: چەند جارێك ئەویش بۆ تاقیکردنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی جدی هیچ جارێك سواری گالیسکە نەبوم!

"هتـپ رە وتـی: بەبیـستنی ئـەم قـسانە زۆر خۆشـحاڵم، چـونکە هەرچـی زیـاتر زانیاریت لەبارەیەوە کەمتر بێت باشترە، ئێستا بەخەیاڵ ئاسودەتر دەتوانم دەست بەمەشـقکردن و فێرکاریـەکانی گالیـسکە سـواری بکـەم... دوای ئـەوە دوبـاری پرسی: ئایا تۆ گالیسکەیەکی تایبەت بەخۆت هەیە؟

موسا وتی: نەخێر.

"هتپ رە" پرسی: ئەی ئەسپی تایبەت بەخۆت هەیە؟

دوبارە موسا وەڵامی نەخێری دایەوە.

"هتـپ رە"وتـی: بـۆ سـواربونی گالیـسکەیەك دەبێـت دو ئەسـپ و دوو گـوریس پەیدا بکەیت.

موسا پرسی: مەبەستت لەگوریس چیە؟

"هتپ رە"وتی: گالیسکەوانەکان چەمکێکی تایبەتیان هەیە کە بەگوریس بانگ دەکرێت، لەڕاستیدا کاتێك بەچوار ئەسپ گالیسکەیەك لێدەخوڕن پێی دەڵێن یەك گوریس، گوریسێکی تـر بـۆ ئەسپی یەدەکـە، بـەواتا چـوار ئەسپی یـەدەك لەگـەڵ خۆتدا ببە بۆ کوش، ئەگەر ئەسپی یەدەك لەگەڵ خۆتدا نەبەیت لەکاتی لەدەستدانی یـەکێك لەئەسـپەکان، چـیتر تـۆ گالیـسکەوان نیـت و گالیـسکەکەت ڕادەوەسـتێت، چونکە لە"کوش"دا ئەسپ دەست ناکەوێت و نیە و هیچ کەسێکیش ئەسپ بەوانی تر نافرۆشێت.

موسـا وتـی: دەتـوانی گالیـسکەیەکی بـاش و هەشـت ئەسـپی دەسـتبژێرم بـۆ بکڕیت؟

"هتـپ رە"وەڵامـی دایـەوە: سـەرەڕای ئـەوەی دەزانم تـۆ دەسـتەڵاتی کڕینـی گالیسکە و ئەسپگەلێکی وات هەیـە، بـەڵام نرخـی ئەمانـە زۆر لـەوە گـرانترە کـە تـۆ لەبەرچاوت گرتووە.

موسا وتی: تۆ لەڕوی داراییەوە نیگەران مەبە، چونکە ئەوەنـدە سامانم هەیـە کـە مەزەندە ناکرێت.

"هتـپ رە"وتـی: سـەرەڕای ئـەوەی لـەڕوی داراییـەوە زۆر لاوازم، بـەڵام حـەزم لەدۆڵەمەنـدی و سـەرمایەداریە، چـونکە سـەروەت و سـامان پایـە و سـتونی

دەستەڵاتە و هیچ گومانێکم لەم بۆچونەمدا نیە، ئەوانەی سەرمایەدارن دەتوانن ببنە کەسێکی دەستەڵاتدار و بەهێزیش.

موسا وتی: سەرپەرشتی سەروەت و سامانەکەشم هەمان ئەم قسانەی تۆ دەکرد و دەیوت: هەرکەسێك سەرمایەدار بێت هەمیشە لەلای خەڵکی جێگای ڕێزە.

"هتپ رە"پرسی: دەمویست ئەوەت لێ بپرسم ئایا سەرمایەدار و دۆڵەمەندەکان لەبەرامبەر هەژارەکاندا کەمتەرخەم نین.

موسا وەڵامی دایەوە: ئەوە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە.

"هتپ رە"وتی: بەڵام بەلای منەوە ئەوانەی زانا و خوێندەوارن لەکەسە دۆڵەمەندەکان زیاتر جێگای ڕێز و ستایشن، سەرەڕای ئەوەی لەبەر چەند هۆیەك لەسەردەمی منداڵیدا لەخوێندن بێبەش بوم، بەڵام وەك خۆم بەهایەکی زۆر بۆ خوێندن و خوێنەدواری دادەنێم و ئێستاش کەدەبینم سەرگەورەکەم لەهەمان کاتدا هەم دۆڵەمەند و هەم خوێندەوار و هەم هاوسۆزی کەسە لاواز و کەمدەستەکانە و گرنگیەکی زۆریان پێدەدات، هەر بەو بۆنەیەشەوە جوتێك ئەسپی باشی بۆ دەکڕم کە لەتەواوی میسردا دەگمەن بن.

موسا وتی: کەواتە پەیوەندی من و تۆ لەم ساتە بەدواوە پەیوەندی دوو هاوڕێی دڵسۆزی یەکترە دوای ئەوە لە"هتپ رە"ی پرسی: ئایا تۆ دوای ئەوەی بڕێك زێڕم پێ بەخشیت بۆچونت لەبەرامبەر مندا نەگۆڕا، دەتوانم بەبەخشینی زێڕ فەرمانەدەکانی تر بکەم بەهاوڕێی خۆم. ئایا دەتوانین بەهاوکاری یەکتر لەگەڵ تەواوی ئەم ئەفسەرانەدا بەهێزێکی ئامادە لەمیسرەوە کۆچ بکەین بۆ"کوش"؟

"هتپ رە" پێی وت: گەورەم جگە لەو زێڕە داوای هیچ شتێکی ترت لێناکەم.

موسا وتی: ئەمشەو وەرە بۆ لام بۆئەوەی ئەو بڕە زێڕەی داوات کردبوو پێتی بدەم و تۆش ئەسپ و گالیسکەکەم بۆ بکڕە... ئەو شەوە لەکاتی دیاری کراودا"هتپ رە"ڕۆشت بۆ لای موسا بۆئەوەی ئەو بڕە زێڕە دیاری کراوەی لێ وەرگرێت. سبەی ئەو شەوە موسا وەکوو جاران بۆ تەماشاکردنی دیمەنی خۆرئاوابون ڕۆشتە کەنار ڕوباری"نیل"ەوە و بەڕێکەوت چاوی بە"نف"ی تەلارساز کەوت، بەڵام"نف"نوقمی بیر و هزری خۆی بوو و لەوکاتەدا ئاگای لەموسا نەبوو.

"موسا"ش لەکابرای تەلارساز نزیك بویەوە و سلاو و ریزی خوی پێنیشان دا، کابرای تەلارسازیش کە هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە لەوناوچەیەدا کەسێك بەناوی خوی بانگی بکات ڕوی کردە ئەو کەسەی بانگی کرد و یەکسەر"موسا"ی ناسیەوە و بەگەرمیەکەوە چوّن و چاکی لەگەڵدا کرد.

موسا وتی: من بەفەرمانی فیرعەون بەرپرسیاریەتیەکم پێ بەخشراوە و بەپێی ئەو ئەو فەرمانەش لەم شارەدام، بەڵام هاتم بوئێرە بوئەوەی تەماشای خوّرئاوابون بکەم و توّم بینی نوقمی بیروهزری خوّت بوبویت، لەدڵی خوّمدا وتم لەوانەیە نزا بخوێنێت.

"نف"ی تەلارساز وتی: هەرکەسێك نزا بکات دەبێت پێشەکیەکانی نزا خوێندنیش جێبەجێ بکات، بوّنمونە دەبێت بخورد داگیرسێنێت، دەرمانی بوّندار هەڵداتە ناو ئاگرەوە، بەشێك لەکتێبی"مردووەکان" بخوێنێتەوە و چەند کەرەستەیەکی تر کە من هیچکامیانم نیە، سەرەڕای ئەوەی لەسەردەمی منداڵیدا کەمێکم لە کتێبی مردووکانم لەبەرکردبوو، بەڵام لەدواییدا هەمویم لەبیرچویەوە، لەبەرئەوە ئەگەر لەپەرستگاشدا بم و بخورد بسوتێنن ئەو نزایانەی کە لەبەربوم هەمویانم لەبیر چووەتەوە.

موسا وتی: بوّ وتنەوەی نزا پێویست بە داگیرساندنی بخورد ناکات، لەهەر کوێ بیت تەنها بیرت لەلای خودا بێت بەسە، ئاوابون و خوّر کە دیمەنی خودایە ئەوم بەبیر دەهێنێتەوە.

"نف"ی تەلارساز وتی: تاڕادەیەك ئەم بوّچونەت بەدروست دێتە بەرچاو، چونکە خوّر کاتێك لەبارەگای خوّرئاوابوندا نیشتەجێ بوو، لەدڵی خوّمدا وتم: خوّزگەم بەخوّر.

موسا پرسی: بوّچی خوّزگەت پێ خواست؟

"نف"تەلارساز وتی: چونکە خوّی دەشارێتەوە و چیتر چاوی بەخەڵکی دو ڕوو ناکەوێت.

موسا لێی پرسی: دیارە ئەم بابەتە زوّر ئازاری داویت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: بابەتێکی تازە نیە، زۆربەی خەڵکی پابەند نین بەبەڵێن و گوتەکانیانەوە، وەفای ڕاستەقینە بونی نیە، ئەوانەی وا خۆیان دەنوێنن کە بیروباوەڕێکی تایبەتیان هەیە، تەنها بۆمەبەستێکی تایبەت و فریودانی خەڵکی وا دەڵێن. دوای ئەوە بەدەنگێکی زۆر نزم بەگوێی موسادا چپاندی و وتی: بگرە فیرعەونیش کە وا خۆی نیشان دەدات باوەڕی بەخودای"ئامون"ە و دەڵێت هەرکەسێك فلان کار و فلان کار بکات ئەوا بەسزای فلان کار لەسێدارە دەدرێت! خۆشی لەبەرامبەر بیروباوەڕەکانیدا سست و خاڵیە، بەڕاستی بیروباوەڕێکی خۆنوێنی "ڕیایی"هەیە.

موسا وتی: تۆ بەچ شێوەیەك پەیت بەم نهێنیە بردووە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: مەزنترین یادگاری مێژووی میسر قوچەکیەکانە، هەر بەردێکی ئەم قوچەکیە لەناونەچو و وێران نەبووە بەناوی"ئامون"لەسەر یەك هەڵچنیوە.

موسا وتی: هیچ کەسێك گومانی لەوەدا نیە.

"نف"ی تەلارساز وتی: من تەلارسازم و دەزانم دوای ئەوە هیچ کۆشك و تەلار و منارەیەك بەمەزنی قوچەکیەکان دروست ناکرێت.

موسا وتی: منیش کە کەمێك شارەزای بواری تەلارسازیم هەمان بیروباوەڕم هەیە.

"نف"ی تەلارساز وتی: بەهەرحاڵ!ئێستا دەمەوێت ئەو نهێنیە شاراوەیەی ئاشکرام کردووە بۆتی بگێڕمەوە، بەڵام بەمەرجێك لەهەمان ئەم شوێنەدا دەبێت بینێژیت و باسی نەکەیت بۆ هیچ کەسێك.

موسا وتی: دڵنیابە.

دوای ئەوە "نف"ی تەلارساز بەمشێوەیە بۆی ڕونکردەوە: ڕۆژێکیان فیرعەون بانگی کردم، دروست دوای چەند ڕۆژێك لەوەرگرتنی ئەو پلەوپایەیەی، زۆر بەسادەیی پێی وتم"نف"دەمەوێت ئەم قوچەکیە مەزنانە وێران بکرێن!

موسا بەبیستنی ڕاوەشا و وتی: دڵنیایت کە بەهەڵە گوێت لێی نەبووە، ئایا بەڕاستی ئەم قسانەت لەدەمی فیرعەونەوە بیست؟

"نف"ی تەلارساز وتی: بەڵێ ئەو ئەم داوایەی دوپات کردەوە.

موسا پرسی: ئەی تۆ چ وەڵامێکت دایەوە؟

نف وتی: منیش بەفیرعەونم وت، ئەی فیرعەون لەچ ڕویەکەوە ئەم فەرمانە دەردەکەیت؟ بێ لەبەرچاوگرتنی وێرانکردنی یادگاری تەلارێکی ئاوا، تەنها بۆ وێران کردنی پێوستمان بەچەند مانگێك دەبێت. سەرەڕای ئەوەش هیچ کرێکارێکی میسری چەکوش و نوێڵی خۆی بۆ وێرانکردنی ماڵی خودا بەکارناهێنێت، چونکە"ئامون"بەمەزنترین خودای خۆیان لەقەڵەم دەدەن.

فیرعەون وتی: تا بڵێی کرێکاری وێرانکەرمان هەیە، تۆ وا دەزانی دیلەکانی جەنگمان بۆ چ مەبەستێك لەم وڵاتەدا ڕاگرتون؟

منیش پێم وت: بەڵام قوچەکیەکان لەڕوی هونەریەوە بەیەکێك لەشانازیە هونەریە مەزنەکانی میسر لەقەڵەم دەدرێن، قوچەکی میسر تەنها دەستەڵات و سامانی دەستەڵاتدارانی میسر نەیانهێنایە بون، بەڵکو بیروباوەڕی میسریەکان کە باوەڕێکی تەواویان بە"ئامون"هەبوو و دەیانزانی ئەم تەلارە بۆ"ئامون"بنیات دەنرێت، بە بەردگەلێکی گران کە هەر یەکێکیان بەئەندازەی کێوێك دەبون و هەر یەکێکیشیان لەکاتی هەڵچنینیان لەسەر بەردەکانی تردا ئەگەر لەناکاو بخزایە و بکەوتایەتە خوار هەزاران کرێکاری میسری لەدوای خۆیەوە دەکوشت، بەڵام ئەم جۆرە کارەساتانە بگرە بچوکترین دودڵی بۆ دروست کردنی ئەم قوچەکیانە نەخستە نێو کرێکارەکانەوە و هەر بەردەوام بون. بۆیە نامەوێت فیرعەون بەهۆی ئەم هەڵە گەورەوە زیان بەخۆی بگەیەنێت و بەڕاستی تکات لێدەکەم دەست لەم خواستەت هەڵگرە. هەروەها دەبێت ئەوەش بڵێم کاتێك فیرعەون سەرەتا پێشنیاری وێرانکردنی قوچەکیەکانی لێ کردم، بۆساتێك لەدڵی خۆمدا بیرم لێکردەوە تۆ بڵێی فیرعەون بیەوێت تاقیم بکاتەوە و بیروباوەڕم هەڵسەنگێنێ، بۆئەوەی ئەگەر باوەڕم بە"ئامون"نەبێت بڕیاری لەسێدارەدانم بۆ دەربکات، بەڵام بەپێی گوتەکانی فیرعەون تێگەشتم کە بەڕاستی دەیەوێت قوچەکیەکان وێران بکات.

چیتر دوای ئەو قسانەی بێگومان بوم لەوەی بەڕاستی دەیەوێت وێرانیان بکات کە وتی: من ئیرەیی بەم قوچەکیانە دەبەم، ناتوانم ببینم تەلارێك بەو بەرزیە پێش لەدایك بونم دروست کرابێت و نەتوانم هاوشێوەی ئەو تەلارە بنیات بنێم.

دوای ئەوەی لێم پرسی: گریمان ئەم قوچەکیانەمان وێران کرد، چی لەبەردەکانیان بکەین.

فیرعەون وتی: بەردەکانیان فڕێ بدەینە ناو ڕوباری نیل یان دەریاوە!

منیش وتم: ئەگەر ئەم کارە بکەین چیتر کەشتیەکان ناتوانن هاتوچۆی خۆیان بکەن، چونکە قەبارەی مەزنی بەردەکان کێوێکی مەزن دروست دەکەن.

فیرعەون پرسی: ئەی چەنێکمان پێ دەچێت ئەگەر بەردەکان فڕێبدەینە بیابانێکی دورە دەستەوە.

وتم: ئەگەر بتوانین ئەم کارەش بکەین ئەوا دوای تێپەڕبونی هەزاران ساڵ خەڵکی چەند ئەوەندە لەم قوچەکیانە مەزنتر لەهزری خۆیاندا بنیات دەنێن و ئەمەش پێچەوانەی ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانەوێت ئەنجامی بدەین، بەلام ئەوەی پێویستمان بەچەنێك ماوەیە تا بەردی قوچەکیەکان بۆ بیابانێکی دور بگوازینەوە، ئەگەر تەواوی بارودۆخەکان بەخواستی ئێمە بێت و وەستانێك لەکارەکەماندا دروست نەبێت و فیرعەون بەواتا تۆ تەمەنێکی درێژخایەنت هەبێت، جێبەجێکردنی ئەم بەردانە بەگەشبینیەکەوە پێویستی بەپەنجا ساڵە، لەوانەشە پێویستی بەسەد ساڵ بێت!

کاتێك فیرعەون بیری لەم ماوەیە کردەوە وتی: دیار نیە تا ئەو ماوەیە بمێنیم یان نە، دەبێت بیر لەشتێکی تر بکەینەوە.

موسا پرسی: سەرئەنجام چاوپۆشی لێکرد یان لەسەر قسەکەی خۆی سور بوو.

"نف"ی تەلارساز وتی: بەدودڵیەکەوە بەڵێ، بەلام بەشێوەیەکی ڕەها و دەقاودەق هەرگیز..... دوای ئەوە ڕونیکردەوە: لەبەرئەوەی ئەم فیرعەونە تازەیە خۆی بە بنیاتنەری تەلارە بەردینەکان لەقەڵەم دەدات، ناتوانێت بەرگەی بونی تەلارێکی وەك قوچەکیەکان بگرێت، سەرەڕای ئەوەی گەر ئەو تەلارەشیان بۆ"ئامون"بنیات نابێت.

موسا وتی: لەبەرئەوەش ئێستا زۆر بەباشی پەی بەوە دەبەم کە فەرمانڕەوا پێشینەکان دور ئەندێش بون و بیریان لەسەد سالی دوای خۆیان کردووەتەوە، بۆیە تەلارێکی ئاوا جێگر و وێران نەبویان دروست کردووە... دوای ئەوە موسا لە"نف"ی تەلارسازی پرسی: ئایا تۆ کە تەلارسازێکی مەزنی ناوی ئەو کەسەی ئەم قوچەکیانەی دروست کردووە نازانیت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: ئەم پرسیارە ڕستەیەکی فیرعەونی هێنامەوە یاد کە ماوەیەك لەوەوپێش هەمان پرسیاری لێکردم و وتی، دەمەوێت ئەو پیاوەتیەم لەگەڵدا بکەیت!! بیّ لەبەرچاوگرتنی دژایەتی شاهانەکان، دەربارەی تەلارسازی ئەم قوچەکیە مەزنە، ئەوەی لێی دڵنیام ئەوەیە ناوی لەشێوێنکی ئەم قوچەکیەدا هەڵکۆڵراوە، چونکە مەحاڵە تەلارسازێك تەلارێك دروست بکات، بەڵام ناوی خۆی لەسەر هەڵنەکۆڵێت. تەلارسازێك کە تەلارێکی ئاوا مەزنی دروست کردووە، بێگومان ناوی لەشوێنێکی ئەم تەلارەدا دەبێت تۆمار کرابێت.

موسا وتی: ئەگەر فیرعەون وێران کردنی قوچەکیەکان بەتەلارسازێکی تر بسپێرێت، لەم کاتەدا تۆ چ کاردانەوەیەك لەخۆت نیشان دەدەیت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: ویست و خواستی ژێردەستەکان ناتوانن خۆیان لەبەرامبەر بڕیاری پادشاکاندا بەرنگاری بکەن.

موسا وتی: وام دەزانی کاریگەریت بەسەر فیرعەونەوە هەیە بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت وانیە.

"نف"ی تەلارساز وتی: ئەو لەبارەی کاروباری تەلارسازیەوە گویّ لەقسەم دەگیرێت و کاریگەری تایبەتیم لەسەری هەیە، بەڵام دەربارەی بڕیار و سەلیقەکانی ئەو کەسایەتیەکی ئەو تۆم نیە کە کاریگەریم بەسەریەوە هەبێت، هیچ کەس بگرە هاوسەرەکەشی ناتوانێت دەست لەحەز و بڕیار و خواستەکانی فیرعەونەوە بدات چ بگات بەکەسێکی وەك من، بگرە ناشتوانم ڕەخنە لەم جۆرە بڕیارانەی فیرعەونیش بگرم.

موسا وتی: بەچ شێوەیەك تۆ لەپلەوپایەی تەلارسازێکدا ناتوانی ڕەخنە لەبڕیارەکانی فیرعەون بگریت و سەرزەنشتی بکەیت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: هەموو کەسێك لەهەر هەلومەرجێكدا بێت هەستی پێشەنگی و پلەوپایەخوازی کە سروشت و تایبەتمەندی مرۆڤە هانی دەدات و وای لێدەکات نەتوانێت هیچ کەسێك لەخۆ بەرزتر ببینێت، فیرعەونیش لەخەڵکی باشتر دەزانێت کە ناتوانێت پاشماوە و کاریگەری پێشینان هەرس بکات.

"نف"ی تەلارسازی بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: سەرەڕای ئەوەی لەپایتەختەوە دور بوم، بەڵام بیستومە فیرعەون پەلەوپایەی فەرماندەییەکی مەزنی پێ بەخشیوی، ئایا تۆ خۆشحاڵ بویت بەوەی ئەم پلەوپایەت پێ بەخشرا؟

موسا وتی: ئەگەر لەگۆشەنیگای هەڵسەنگاندنەوە بۆی بڕوانین، دەبێت زۆریش خۆشحاڵ بم، چونکە لەوباوەڕەدام ئەگەر پەسەندم نەکردایە، دڵنیابوم لەوەی فیرعەون لەباتی ئەوە مەرگی بۆ هەڵدەبژاردم!

نف لێی پرسی: ئایا فیرعەون بەڕاستی فەرمانی کوشتنی بۆ دەردەکردی؟

موسا وەڵامی دایەوە: لەمبارەیەوە بچوکترین گومانم نیە.

"نف"ی تەلارساز وتی: وابزانم ئەوە تۆ بویت پێت وتم دایکت کاتێك هێشتا لەژیاندا بوو بەڵێنی لەفیرعەون وەرگرتووە کە هەرگیز فەرمانی کوشتنت بۆ دەرنەکات، وانیە؟

موسا وتی: ئەوە نیوەی ئەو بەڵێنەبوو. ئەویش بەمەرجێك ئەم بەڵێنەی پێدا: ئەگەر دوچاری هیچ هەڵەیەك نەبم... . ئەم دوچاربون بەهەڵە و هەڵەکردنە چەندها لێکدانەوەی بۆ دەکرێت.

"نف"ی تەلارساز پرسی: مەگەر تۆ چیت کردووە؟

موسا وتی: لەگەڵ یەکێك لەشازادەکان،کەلەڕاستیدا کەنیزە زادەیەکی کۆشکی فەرمانڕەوایی سوکایەتی بەدایکم کرد، دایکێك کە چیتر لەژیاندا نەمابوو، منیش لەبەرامبەردا بەهای ئەو گوتانەیم خستە ناو مشتی.

تەلارساز وتی: ئەوە چ جۆر ڕوبەڕوبونەوەیەك بوو؟

موسا وتی: ئەو داوای لێکردم ڕوبەڕوی یەکتری ببینەوە، ئەو شمشێری پێبوو و منیش دارێك و شکستم پێهێنا، بگرە دەشمتوانی بیکوژم، بەڵام نەمکوشت، بەدڵنیاییەوە ئەگەر بەسەر مندا سەربکەوتایە دەیکوشتم.

"نف"ی تەلارساز وتی: بەڕاستی زۆر نیگەرانم بەوەی لەپایتەختدا چاوم پێت ناکەوێت ، بەهیوا ئەوەم بەم زوانە لەپایتەختدا چاوم پێت بکەوێت.

موسا وتی: ئەم ئومێدەی تۆ وەك نائومێدی وایە، چونکە هەرگیز لەپایتەختدا نامبینیتەوە، بەلایەنی کەم بەفەرمانی فیرعەون بۆماوەی سێ ساڵ دورخراومەتەوە، دوای ئەوەش نازانم بۆ کوێم دەنێرێت.

"نف"ی تەلارساز بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: سێ ساڵ دور خراویتەتەوە؟

موسا وتی: بەڵێ لەئێستادا بۆ ماوەی سێ ساڵ دور خراومەتەوە.

"نف"ی تەلارساز وتی: ئەگەر نەتبینم زۆر بەداخ دەبم بۆت.

موسا پرسی: تۆ واهەست دەکەیت لەجەنگدا دەکوژرێم؟

"نف"ی تەلارساز وتی: نەخێر، لەبەرئەوەی تۆ ئەفسەر و لەهەمان کاتدا فەرماندەی و ئەفسەرەکانیش بەدەگمەن لەجەنگەکاندا دەکوژرێن، بەهیوا ئەوەم تا ئەو کاتەی ماوەی ئەم دورخستنەوەیەت تەواو دەبێت زیندوو بم و جارێکی تر چاوم پێت بکەوێت.

موسا وتی: تۆ بەو ڕادەیەش بەتەمەن نیت کە بەهیوا ئەوەوە نەبیت لەژیاندا بمێنیتەوە، بەدڵنیاییەوە چاومان بەیەکتری دەکەوێتەوە.

نف وتی: کەسە بەتەمەنەکان هەندێك هێما دەدۆزنەوە کە هێمای کۆتایی ژیانیانە، ئایا تائێستا ناوی"هوم ستی"مامۆستای "ماڵی ژیان"ت بیستووە؟

موسا وتی: ناوی ئەو پزیشکەم لەماڵی ژیاندا بیستووە، بەڵام لەبیرم چووەتەوە بەچ شێوەیەك باسی ئەم هێمایانەی کردووە.

نف ڕونی کردەوە: "هوم ستی"مامۆستا پیرەکانی لەوە ئاگادارکردەوە کە ئاگایان لەگوێیان بێت، و ئەو دەنگانە بەرگوێیان نەکەوێت کە هێما خراپەکان لەخۆ دەگرێت هەروەها ئاگاداری لەنێوەندی ئێسقانیەکانیان"مفاصل"بێت بۆئەوەی بەباشی لەکاتی جێبەجێکردن و جوڵاندا بەرگەی جەستەیان بگرێت، بەڵام هەر ئەمڕۆ گوێم لەچەند دەنگێك بوو، نێوەندی ئێسقانەکانی پێ و دەستم ئازاریان دەکرد، لەکاتی ڕۆشتنیشدا ئەژنۆکانم دەلەرزین و لەژێر فەرمانی خۆمدا نەبوو،

هەموو ئەمانە هەمان ئەو شتانەن کە"هوم ستی"مامۆستا ئێمەی لێ ئاگادار کردەوە.

موسا وتی: من پزیشك نیم، بەڵام لەوباوەڕەدام هێمای تەندروستی ڕەنگی پێستی و ڕوخسارە، چونکە ڕوخسارت ئەوەم پێ نیشان دەدات کە تۆ تەمەنێکی درێژت دەبێت.

نف وتی: تۆ ڕوداوگەلێکی زۆرت لەپێشە، جەنگەکان، ڕاوکردنی گیانەوەرە کەتەو و زلەکان.

موسا وتی: بگرە لەکاتی ڕاویشدا لەبیرت ناکەم چونکە لەپایتەختدا هاوڕێی لەتۆ دڵسۆزتر شك نابەم.

"نف"ی تەلارساز وتی: لەبەرئەوەی دەبێت لەیەك جیا ببینەوە، حەز دەکەم ئەگەر کارێك بەمن دەکرێت بۆتی ئەنجام بدەم.

موسا وتی: لەبەرئەوەی گالیسکە و ئەسپ دەکڕم پێویستم بە نۆکەرێکە، نۆکەرێك کە توانای لێخوڕینی گالیسکەی هەبێت، پێم بڵێ بەچ شێوەیەك نۆکەرێکی ئاوا بەدەست بهێنم؟

نف وتی: من کەسێك لەوانەی لەبیاباندا نیشتەجێن پێدەسپێرم، ئەم بیابان نشینانە ماندونەناس و سەخت کۆشن، ئەگەر دەتەوێت لەنێو ئەمانەدا نۆکەرێکت بۆ بکڕم..... ماوەیەك هەوا تاریك بووە و موسا و"نف"ی تەلارسازیش ئاگاداری تێپەڕبونی کات نین. بۆماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ئەم دوانەدا کێشا و دوای ئەوە موسا وتی: پرسیارێکم لێت هەبوو، دەمویست ڕاستیەکەیم پێ بڵێیت.

نف وتی: بەڵێنت پێدەدەم ڕاستیەکەیت پێ بڵێم.

موسا لێی پرسی: بەبۆچونی تۆ ئایا خودای تاك و تەنها بونی هەیە؟ تۆ بەچ شێوەیەك بیر لەخودا ئاتون دەکەیتەوە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: دەبێت خودای ئاتون لەڕەگ و ڕیشەوە بناسی، تۆ کە لەکۆشکی پادشاییدا بویت و ئێستاش هەر هەیت دەبێت لەنێو کۆشکنشینەکانی فیرعەوندا ناوی"باکتامون"و"ئەخناتون"و"فر تی تی"و کاهینی"ئامی"ت بیستبێت...

دوای ئــەوە موســا پرســی: ئــەم ناوانــەی باســت کــردن چ پەیوەندیــەکیان بەخودای"ئاتون"ەوە هەیە؟

"نـف"ی تەلارسـاز وتـی: لەوانەیـە تـۆ کـەمێك درەنـگ لـەدایك بوبیـت و لـەبونی لـەناکاوی خـودای نـەبینراو بـەواتا"ئـاتون"و ئـەو کارەسـاتانەی ئـەم خودایـە لەگـەڵ خۆیـدا هێنـای کـە دروسـتکراوی بـاوك و کـچەکەیەتی بێئاگایـت، دایەگـەورەی ئـەم فیرعەونە"نفر تی تی"و باوکی کە کاهینی مەزنی فەرمانڕەوایی بوو بۆ دەرکردنـی کاهینــەکانی ئــامون و دەســت بەســەراگرتنی خەزێنــەکانی پەرســتگا خودایــەکی نــەبینراویان خوڵقانـد، فیرعــەونی نێوجەوانیـشیان فریـودا و بـەم کارەیـان ئاگریـان بەردایــە"تــبس"و میــسر، دوای ئــەوە نــاوی"ئــاتون"یــان وەك درێــوترین و نەفرەتئامێزترین شت دەهێنایە زمان، ئامون و پەرستگاکان دوبارە هـەمان بـەرەی خودایـانی بـەردین و داریـن کـە دروسـت کـراوی دەسـتی مـرۆڤ بـون ڕاخـست و فەرمانڕەوایی مرۆڤیان پێدەکردن، "ئامی و نفر تـی تـی"یـش خـودای خۆیـان ڕەت کردەوە کە هەموی دروستکراوی مرۆڤ بوون.

موسا وتی: کەواتە تۆ لەوباوەڕەدا نیت کە خۆر ڕوکاری خودایە.

"نـف"ی تەلارسـاز وتـی: موسـا تـۆ هـزرت هـەڵگری هەنـدێك بیروبـاوەڕە کـە مـن ناتوانم بەئاسـانی پاکیـان بکەمـەوە، ئێـستا تـۆ چ کارێـك بـەخودای نـەبینرا و خـودا جیاوازەکان هەیە، مەگەر تائێستا مـرۆڤ کـە بـێ خـودای نـەبینراو ژیاون بوەتـە هـۆی ئەوەی چەرخی ڕۆژگـار بـۆ سـاتێکیش بوەسـتێت، تـۆ تـەنها ڕێـز لەبیروبۆچونەکانی خۆت دەگریت، هەوڵ مەدە بیسەپێنیت بەسەر خەڵکانی تردا.

موسا وتی: بەڕاستی سەرنج ڕاکێشە.

"هتپ رە"ی فەرماندەش وتـی: هـەوڵ نـەدەیت ڕێ لەخۆشـگوزەرانی سـەربازەکان بگریـت، وازیـان لـێ بهێنـە ئـەوەی خۆیـان حـەزی پێدەکـەن ئـەنجامی بدەن، گاڵتـەش بەخوشگوزەرانیەکانیان مەکە. ئێستا ئەگـەر دەتـەوێت خـۆر بە بەئاتون و ئـاتونیش بە ڕێبەری خۆت لەقەڵەم بدەیت، ئازادیت لـەوەی کە بیروبۆچونەکانت مـەزن ڕاگری بـێ ئـەوەی هـیچ کەسـێك ببێتـە ڕێگـرت، بـەڵام کاهینـەکانی لایـەنگرانی ئـاتون و ئامونەکان بۆخۆیان دەقۆزنەوە و لەڕێی ئەمانەوە خەڵکی پێ فریو دەدەن.

موسا پرسی: ئایا کاهینەکانی ئاینی"ئاتون"یش وەك کاهینەکانی ئامون تەنها بیریان لەبەرژەوەندی خۆیان کردووەتەوە؟

"نف"ی تەلارساز بۆیەکەمین جار پێکەنی و وتی: تا ئەو ڕۆژەی کاهین و کاهینەکان لەجیهانەدا هەناسە بدەن ، سودێکی بێپایانی مفتخۆری و هەزاران کارەسات بەدەستی ئەمانە بەناوی ئامون و ئاتون ئەنجام دەدرێت و بەداخەوە بەگشتی نەزانی خەڵکی کە هیچ سنورێك ناناسێت هاوکاری ئەم فریودەر و فێڵبازانە دەکەن، و لەوەتەی ئەم جیهانە بووە و هەیە هەرچەند خەڵکی لەڕوی خوێندەواری و تەلارسازی و هونەرەکانی تردا پێش بکەون و بەپلەی والا بگەن، بەڵام گەمژەییان وەك خۆی دەمێنێتەوە و لەناو ناچێت، بەڵکو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو زیاد بون دەڕوات.

کاتێك گفتوگۆکانیان گەشتە ئەم ئاستە"نف"ی تەلارساز وتی: من بەدڵگرانی و نیگەرانیەوە دەمەوێت لەتۆ جیا ببمەوە، هیوادارم دوبارت بتوانم چاوم پێت بکەوێتەوە.

## موسا لەشار و بازاڕدا

ئاسایی میسریەکان بەیانی زوو هەڵدەستن و سەرقاڵی کارەکانی خۆیان دەبن، هەڵبەت پێویست بەوە ناکات باسی ئەوە بکەین کە شار و ماڵەکان لەکەنار ڕووباری نیل دا بنیات نراون و هەمیشە پەیوەندیان لەگەڵ دەریادا هەبووە. بەشێوەیەکی سەرەکی بازرگانی چالاکی سەرەکی خەڵکی میسر بووە، بەلایەنی کەم هەموو خەڵکی میسر بەجۆرێك کڕین و فرۆشتنەوە بژێوی ژیانیان دابین دەکرد. لەوڵاتی "چین"ەوە کاروانگەلێکی مەزن لەڕێگایەکی دوورەوە دوای چەند مانگێك گەشتکردن دەهاتن بۆ کەنار دەریای ناوەڕاست و بەشێوەیەك خۆیان دەگەیاندە میسر. کەشتیەکان دوای ئەوەی بەدەریای ناوەڕاستدا تێپەڕین بەنێوەندی دەربەنی "هرکول[26]" ڕێگای ئەورووپا دەگرنە بەر. زۆرێك لەم کەشتیانەش لە"بفار دار دانل و بوسفور"ەوە دەڕۆن بۆ دەریای ڕەش. ئەم هاتوچۆیە هەمووی بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی و مامەڵەی جۆراوجۆر بووە. بەڕادەیەك ئەم بازاڕە گەرم و بەپەلە بوو کە هێشتا خەڵکی بیریان لەوە نەکردبوویەوە کە جۆرێك سکەی پارە بۆ ئەم مامەڵەیە دروست بکەن و تەواوی مامەڵەکان بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکردن ئەنجام دەدرا، هەموو وڵاتێك کەرەستەیەکی تایبەت بەوڵاتەکەی وەك پارە بەکار دەهێنا بۆ کڕینی شتومەکی وڵاتانی تر، بۆنموونە ڕوسیا ئەمڕۆ لەباتی پارە پێستی گیانەوەرەکانی وەك پێوەری کڕینی شتومەك بەکار دەهێنا، وڵاتانی کەناری دەریای ناوەڕاستیش بۆنموونە سوریا و لوبنانی ئەمڕۆ مرواریان لەباتی پارەدا بەکار

---

[26] هرکول: "جبل طارق"ی ئێستا.

دەهێنا، وڵاتی "هاتی"[27] ئاسنیان لەباتی پارەدا بەکار هێناوە، دەبێت بزانین ئاست لەو سەردەمانەدا لەئاڵتون گرانتر و بەهاداتر بووە و لایەنێکی نێونەتەوەیی هەبوو. هیچ وڵاتێك بێ ئاسن نەبووە چونکە وەك پارە ئاڵوگۆڕێی پێدەکرا، هەرئەوەش بەهای ئاسنمان بۆ دەردەخات، بۆنمونە ڕوسیار زێڕی وەرنەدەگرت، بەڵام بەگەرمیەکەوە لەئاڵوگۆڕکردنەکانیدا پێشوازی لەئاسن دەکرد. بێ لەڕوسیا، وڵاتانی جیهان زێڕی میسریان لەشێوەی ئەنگوستیلە لەباتی پارەدا وەردەگرت، لەدوای ئاسن و زێڕ، مس و زیو ڕەواجی هەبوو. "تانیس"لەشارە کۆنەکانی میسر وەك تەواوی شارەکانی تری کەنار ڕوباری نیل ناسرابوو، شارێك بوو کە نێوەندی بازرگانیەك بوو کە زیاتر مامەڵەی کەنیز و کۆیلەی تێدا دەکرا. بازاڕی کۆیلە فرۆشی لە"تانیس"دا کەمێك لەڕوباری"نیل"ەوە دور بوو، مەودای نێوان شار و کەنار ڕوبار زیاتر وەك بازاڕی کۆیلە فرۆشی بەکار دەهێنرا، چونکە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکان دەبێت بازاڕێکی سەربەخۆی و دور لەخاڵە بازرگانیەکانی تر بێت. ئەم دوری و دورەپەرێزیە لەبەرئەوە بوو بۆئەوەی ئەوانەی کاریان بەبازاڕی کۆیلە و کەنیزە فرۆشەکانەوە نیە گوێیان لەگریان و ناڵەی کۆیلەکان نەبێت، بازاڕی کۆیلە فرۆشانی شاری"تانیس"شوێنێك بوو کە بەدیوارێك چواردەوری گیرابوو و هیچ کەپر و شوێنی دانیشتنێك لەو چواردەورەدا بەدی نەدەکرا. لەبازاڕی کۆیلە فرۆشی"تانیس"دا سێ جۆر کۆیلەی تێدا دەفرۆشرا، جۆرێکیان دیلەکانی جەنگ بوون کەتەنها فیرعەون دەیتوانی بیانفرۆشێت بۆخۆی، جۆرێکی تریان کۆیلە و ئەو کەنیزانە بوون کە لەوڵاتانی تر وەك کاڵایەك دەیانهێنان بۆ میسر بۆئەوەی بیانفرۆشن، جۆری سێیەمیان نە دیلی جەنگی و نەکەنیز و نۆکەرانی وڵاتانی تر بون، بەڵکو ئەو میسریانە بوون کە لەوانەیە ڕۆژانێك خۆشیان خاوەنی کەنیزەك و کۆیلە بوبێتن، بەڵام بەهۆی قەرزەوە ناچار خۆیان وەك کۆیلەیەك فرۆشتبێت و خاوەنی ئەم جۆرە کۆیلانە سەرەتا ئەوانە بون کە قەرزیان بەلایانەوە بوو. فرۆشتنی کۆیلە لەمیسردا تایبەت بوو و تەنها ڕێژەی چل خێزان مۆڵەتی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەیان هەبوو، ئەم یاسایە بەشێوەیەکی گشتی لەمیسری خواروو باو بووە و

---

[27] هاتی: تورکیای ئەمڕۆ.

چاودێریشی لیٚ دەکرا، بیٚ ئەندامانی ئەم چل خێزانە هیچ کەسێکی تر مافی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەی نەبووە. دیمەنی کۆیلە فرۆشی و شێوازی نمایشکردنی کۆیلەکان لەبازاڕدا زۆر دڵهەژێن و شەرمهێنەر بوو، نۆکەر و کەنیزەك و منداڵەکانیان بەزنجیر دەبەستەوە، منداڵەکان تواناى ئەوەیان نەبوو ئەو زنجیرەی کە لەدەستیان بەستبوو هەڵیگرن و بەدواى خۆیاندا بیکێشن. ئەرکی خورد و خۆراکی ئەو کۆیلانە لەماوەی نمایشکردنیان لەبازاڕدا لەئەستۆی خاوەن کۆیلەکاندا بوو، تیکەیەك نانی وشك، پارچەیەك ماسی سوێر کە بەهەرزانترین خۆراك لەقەڵەم دەدران ژەمی خواردنی کۆیلەکان بوو. خزمەتکارانی کۆیلە فرۆشان لەسەرەتای ڕۆژدا نۆکەر و کەنزیەکانیان لەڕوباری نیل هەڵدەکێشا بۆئەوەی پاکیان بکەنەوە و پاك و خاوێن بێنە بەرچاوی کڕیارەکان. لەنێوا نۆکەر و کەنیزەکانیشدا یاسای دارستان فەرمانڕەوا بوو، چونکە لەکاتی دابەشکردنی خواردندا، زۆردار و بەهێزترەکان لاواز و بێتواناکانیان دەخستە ئەملاولای خۆیانەوە بۆئەوەی خۆیان بەشێکی زیاتریان بکەوێت، لەبەرئەوە کاتێك ڕاوچیانی ڕوباری نیل دەیانویست ناوسکی ماسی بدەن بە کۆیلەکان، بێتوانا و لاوازەکان هاواریان لیٚ هەڵدەستا و دەیانویت ڕاستەوخۆ خواردنەکە بدەن بەدەستی خۆمانەوە، چونکە بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەوە بەهیچ شێوەیەك لەو بەشە خواردنەمان بەر ناکەوێت. ئەم ژەمە خواردنە نەگونجاوە بەتایبەت ڕیخۆڵە و ناوسکی ماسی دوچاری نەخۆشی جۆراوجۆری دەکردن و نۆکەر و کەنیزەکانیش لەبەرئەوەی چارەسەر نەدەکران بەردەوام لەئازاردا دەتلانەوە و هاواریان دەکرد. کۆیلەکانی تریش بەبینینی گریان و هاواری ئەمانە خۆشیان دەستیان بەگریان دەکرد و دیمەنێکی دڵتەزێنیان دروست دەکرد. خاوەنی کۆیلەکانیش کە ڕەفتاری خواستراویان تەنها قامچی وەشاندن بوو پەییان بەئازارەکانیان نەدەبرد و بەردەوام قامچیان لێدەدان بۆئەوەی بێدەنگیان بکەن. لەوانەیە لەمڕۆدا ئەم جۆرە ڕەفتارە لەبەرامبەر کۆیلەکاندا دڕەندانە بێتەبەرچاو، بەڵام لەو سەردەمەدا ئەم جۆرە ڕەفتارانە زۆر ئاسایی بوو. لەبەرچاوی میسریەکاندا کۆیلەکان بەجۆرێك ئاژەڵ و گیانەوەر لەقەڵەم دەدران نەك مرۆڤ، ڕفتاری میسریەك لەبەرامبەر کۆیلەیەکدا وەك رفتاری دارتاش و ئاسنگەر و

درومانێك وایە لەبەرامبەر تەختە و ئاسن و پارچە قوماشێکدا، هەروەك چۆن هیچ کاتێك دارتاشێك لەبڕین و تاشین و سواقدانی دارێك بێزار و ماندوو نابێت، بەهەمان شێوە میسریەکیش لەلێدان و سوکایەتکردنی کۆیلەیەك بێزار و ماندوو نابێت.

لەنێو میسریەکاندا"موسا"کە خۆی کوڕی یەکێك لەکۆیلە ئیسرائیلەکان بوو، کاتێك پەیی بەم خاڵە برد کە باوکی دوچاری چ ئازار و ئەشکەنجەیەك بووە، تێڕوانینی لەگەڵ میسریەکانی تردا زۆر جیاواز بوو. کاتێك"موسا"خۆی کرد بەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا خەڵکی ئەو دەوروبەرە ناسیانەوە و زانیان کە یەکێکە لەکوڕەکانی فیرعەون، لەبەرئەوەی کۆیلە فرۆشەکان لەناسینی خواستی کڕیار زۆر شارەزا بوون و بەپێی هەڵسەنگاندنی سەلیقەی چ جۆر کۆیلەیەکی دەوێت، بۆیە زانیان موسا چ جۆر کۆیلەیەك دەخوازێت. فرۆشیارانی سەرشناس زۆر زوو ئاگاداری خواستی کڕیارەکان دەبون. ڕۆژی پێشوو لەچونی موسا بۆ بازاڕی کۆیلە فرۆشەکان"هتپ رە"ڕۆشت بۆ بازاڕی کۆیلە فرۆشەکان و زانیاری ئەوەی دا بە بازرگان و دەڵاڵە سەرەکیەکانی بازاڕی کۆیلە فرۆشان کە موسا کۆیلەیەکی دەوێت بتوانێت گالیسکە لێبخوڕێت، هەرلەبەرئەوەش ئاگاداری ئەوەبون کە موسا بەئامانجی چ شتێك دێتە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکانەوە. لەسەرەتای چونی موسا بۆ ناو بازاڕی کۆیلە فرۆشان چاوی کەوت بەژنێك کە دوو منداڵ لەتەنیشتیەوە دانیشتبون و دەگریان. ئەو ژنە دەیویست خۆی بفرۆشێت بۆئەوەی بتوانێت منداڵەکانی تێر بکات-هەڵبەت ئەم نمونەیان جیاواز بوو لەسێ جۆر کۆیلەکانی تر، چونکە نە نۆکەر و نە کەنیزەك و نە قەرزار و نە دیلی جەنگ بوو، بەڵکو کەسێکی برسی و دەستەپاچە بوو- موسا تەماشایەکی ئەو سیانەی کرد و بەبینینی باڵا و سینە و شانە و ڕوخسار جوان و قژی بێوێنەی سەری سوڕما. لەم ساتەدا یەکێك لە سەوداگەرانی بەناوبانگی بازاڕی کۆیلە فرۆشان بەناوی"کتوفار" هات بۆ لای موسا و لەبەردەمیدا کوڕنوشی بۆ برد.

موسا وتی: سەرت بەرز بکەرەوە بۆئەوەی بزانم تۆ کێیت و چیت دەوێت!

"کوتوفار"هەستایە سەرپێ و وتی: خاوەن شکۆ ڕێم پێبدە کچێکی جوانت پێنیشان بدەم کە نەتوانی چاوی لێ هەڵبڕی.

موسا وتی: بۆ کڕینی کەنیزەك نەهاتوم، بەڵکو هاتوم کۆیلەیەك بکڕم کە بتوانێت گالیسکە لێ بخوڕێت.

لەوکاتەدا"کوتوفار"خۆی پێناساند و وتی: من لەپێناو ڕازیکردنی تۆدا هەرچیم پێ بڵێیت بۆتی ئەنجام دەدەم، ئێستا لەگەڵم وەرە بۆئەوەی بڕۆین بۆ بەشێکی ئەم بازاڕە کە نۆکەرێکی ئاوای تێدا بەدەست دێت. تۆ چ بەختێکی باشت هەیە بەم تازەییانە نۆکەرێکی ئاوایان هێناوەتە بازاڕەوە کە خەڵکی وڵاتی"هاتی"ە. بێگومان ئەو دەتوانێت مەبەستەکانت بەجێ بهێنێت. هەردوکیان خۆیان گەیاندە بەشێکی ئەو بازاڕەوە کە نیوە تاریك بوو."کوتوفار"فەرمانی بەیەکێك لەخزمەتکارەکانی خۆی دا کە نۆکەرە"هاتی"ەکەی بۆ بهێنن، خزمەتکاریش ڕۆشت و پیاوی بەزنجیر بەستراوی بۆ موسا هێنا. ئەو پیاوە ماوەیەکی زۆر لەناو تاریکیدا هێڵابویانەوە، هەر لەبەرئەوەش کاتێك هاتە ناو ڕوناکیەوە چاوەکانی بەتوندی داخست. "کوتوفار"یش دەستی بەباسکردنی هونەر و لایەنە چاکەکانی کابرای نۆکەر کرد.

"موسا"ش چاوەڕێی کرد تا کۆتایی بەقسە و پێدا هەڵدانی"کوتوفار"هات، ئەوکات وتی: ئەم پیاوە بەکەڵکی من نایەت.

کوتوفار وتی: ئەم پیاوە گالیسکەوانێکی زۆر بەهێزە کە دەتوانێت گالیسکەیەکی چوار ئەسپیت بۆ لێ بخوڕێت.

موسا وتی: ئەم پیاوە جەستەیەکی بەهێزی هەیە بەڵام بەهۆی کۆیلایەتیەوە بوێری و ئازایەتی لەناو چووە گۆڕاوە بەکەسێکی ترسنۆك و لاواز، من پێویستم بەلاوێکی بەتوانا و بوێرە، گۆڕەپانی جەنگ پیاوی جەنگاوەر و بوێری دەوێت.

"کوتوفار"یش بە بێشەرمیەکەوە چەند نۆکەرێکی خەڵکی هاتی بەچەند پێناسە و تایبەتمەندیەکی جیاواز و سەیرەوە هێنا بۆ موسا. بەڵام موسا پێی وت: من گالیسکەوانێکی بیابان نشینم دەوێت، لەبەرئەوە بێهودە کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە! ئەگەر کۆیلەیەکی وا شك دەبەیت بۆم بهێنە، ئەگەر نیتە ئەوا بێهودە خۆت ماندوو مەکە.

کوتوفار دەستێکی بۆ کرێکارەکانی ڕاوەشاندن و وتی: ئەو کابرایەم بۆ بهێنن.

ئەوانیش دوای ماوەیەك بەگومانەوە لێیان پرسی: ئایا ئازادە؟

"کوتوفار"یش وتی: مەترسن بەستویانەتەوە...

دوای ماوەیەك کرێکارەکان لاوێکی بالا بەرز و کەتە و زۆر هار و نەگبەتیان هێنا و "کوتوفار"وتی: هەرچی قامچی لیَ بدەیت نابینیت نێچەوانی بدات بەیەکدا و ئازار و دلگرانی خۆی پیشان بدات.

ئەو لاوەیان بەشێوەیەك بەزنجیر بەستبویەوە کە تەنها دەیتوانی ڕێ بکات، کابرای دیلیان لەبەرامبەر موسادا ڕاگرت، موسا بینی بگرە دەستەکانیشیان بەزنجیر بەستبویەوە، جێگا قامچیەکان بەلاشەیەوە ئەوەی دەسەلماند کە چەنێك ئازاری بەدەستیانەوە کێشاوە.

نۆکەری"هاتی"ڕوی کردە موسا و وتی: نەکەی بتەوێت بمکڕیت چونکە لەدواییدا پەشیمان دەبیتەوە.

"کوتوفار"وتی: دەمت داخە، ئەم کوڕە لاوە کەسێکی ئاسایی نیە، بەڵکو شازادەیە، تۆ بەختێکی زۆر مەزنت هەیە کە شازادەیەك کڕیاری تۆیە.

دوای ئەوە ڕویکردە موسا و وتی: ئەمە هەمان ئەو نۆکەرەیە کە تۆ داوات دەکرد بەهەموو ئەو تایبەتمەندیانەی کە باست کرد. هەروەها دەبێت بڵێم ئەم کوڕە لاوە کەسێکی نائارامە و شارەزایی لەهیچ بوارێکدا نیە، تەمیَ و لێدانیش بەهیچ شێوەیەك کاری تێناکات.

موسا پرسی: تەمەنی چەنێکە؟

کابرای بازرگانیش وتی: نازانم چونکە وەلامی هیچ پرسیارێکمان ناداتەوە، بەلام لەوانەیە دوو دەیە لەتەمەنی تێنەپەڕیبیَ.

موسا پرسی: پێی نەوتون ناویشی چیە؟

کابرای بازرگان وتی: ناوی"نون"ە.

موسا وتی: ئەم پیاوە خەڵکی"هاتی"یە لەکاتێکدا"نون"ناوێکی میسریە. بۆیە موسا ڕویکردە ئەو کوڕە لاوە و وتی: ئەی"نون"دەتوانی گالیسکە لێبخوڕیت؟

کوڕی لاویش وەڵامی دایەوە: مەبەستت ئەوەیە ببمە گالیسکەوانی کەسێکی تایبەت؟ ئەویش کەسێکی وەك تۆ؟

موسا بەبیستنی ئەو سوکایەتیەی کە پێی کرد توڕە بوو و وتی: ئایا دەزانی سوکایەتی کردن بەکوڕی پادشا سزاکەی مەرگە؟

کابرای نۆکەریش وتی: ئەوە بەکەسێك بڵێ کە لەمەرگ دەترسێت، لەبەرئەوەی ڕۆژێك دێت هەر دەبێت بمرم، چی لەوە باشتر کە زووتر بمرم، من سوکایەتیم بەتۆ نەکردووە، بەڵکو ئەگەر لێتەوە نزیکتر بومایە ئەوکات تفم بەسەروچاوتدا دەکرد بۆئەوەی بیسەلمێنم کە سوکایەتیم پێکردویت بۆئەوەی بیانوی سزای مەرگم باشتر بدەم بەدەستەوە.

کابرای بازرگانیش کاتێك بینی خەریکە بەهۆی بەدڕەفتار کۆیلەیەکەوە کڕیارێکی باش لەدەست دەدات بەسەختی توڕەبوو و فەرمانی دا بەکرێکارەکانی بەتێلا و قامچی بکەونە گیانی.

بەڵام موسا ڕێی لێگرتن وتی: لێی مەدەن، ئەگەر سوکایەتی بەمن کردبێت ئەوا تەنها بەخۆمەوە پەیوەستە نەك ئێوە. دوای ئەوە ڕوی کردە"نون"و لێی پرسی: ئەی "نون"! من دەمەوێت بڕۆم بۆ وڵاتی"کوش"و لەوێ بجەنگێم، لەبەرئەوەی فەرماندەی گالیسکەوانەکانم، بۆیە دەبێت گالیسکەوانێکی ئازا و دلێر گالیسکەکەم لێبخوڕێت. ئەگەر ئامادەیت لەگەڵم وەرە....

"نون" لەوکاتەدا تەنها بێدەنگی هەڵبژارد و موسا وتی: من ئەم نۆکەرەتان لێ دەکڕم، لەو کۆت و زنجیرە ئازادی بکەن.

"کوتوفار"یش بەهۆی سەرکەوتنی ئەم مامەڵەیە خۆشحاڵ بوو، چونکە دوای ئەوەی ئەو کوڕە لاوە کۆیلەیە سوکایەتی بە موسا کرد وای دەزانی چیتر موسا هیچ کۆیلەیەکیان لێ ناکڕێت، بۆیە بۆ جاری دووەم لێی پرسی: ئایا تۆ ئەم نۆکەرەت لا پەسەندە، دەستی بکەینەوە؟

موسا دوپاتی کردەوە: بەڵێی نرخەکەی چەندە؟

کاتێك"کوتوفار"بینی کابرای کڕیار بەتامەزرۆییەوە خوازیاری ئەو کۆیلەیە وتی: هێشتا هیچ نرخێکم لەسەر ئەم نۆکەرە دانەناوە.

موسا پرسی: بەلامەوە گرنگ نیە چ نرخێکی لەسەر دادەنێیت، سەرپەرشتی سامانەکەم ئەو برە پارەیەت پێدەدات کە تۆ داوای دەکەیت، سەردانی کەسێك بەناوی"ستی موسا"بکە و بەهای نۆکەرەتی لێ وەرگرە.

کابرای بازرگانیش بە"نونی"وت: لەم ساتە بەدەواوە تۆ لەژێر رکێفی"موسا"دایت، بەلام هێشتا دەستی"نون"یان نەکردبویەوە.

"موسا"ش بە کابرای بازرگانی وت: دەستی بکەنەوە.

"کوتوفار"یش دەستی کابرای کۆیلەی کردەوە. هەر ئەوکاتەی دەستی"نون"ئازاد بوو، سەرەڕای ئەوەی هێشتا پێی بەزنجیر بەسترابویەوە پەلاماری"کوتوفار"ی دا و قورگی گرت و زۆری لێکرد بۆئەوەی بیخنکێنێ، "کوتوفار"لەوکاتەدا کەوتە سەرزەوی و هاوار لەخزمەتکارەکانی"کوتوفار"بەرز بویەوە و داوای هاوکاری لەرێبوارەکان دەکرد، بەلام پێش ئەوەی رێبوارەکان بێن بەهانای"کوتوفار"موسا بەپەلە خۆی گەیاندە"نون" کە خەریك بوو"کوتوفار"بخنکێنێ و"کوتوفار"یش ڕوخساری ڕەش داگەرا و هەردوو چاوی دەرپەڕیبون. موسا قورگی"نون"ی گرت و بەهەموو هێزێکی ڕایوەشاند بۆئەوەی ناچاری بکات کابرای بازرگان بەرەلا بکات. خزمەتکارەکانیش بەتێلاو و قامچییەوە دەوریان دا بۆئەوەی لێی بدەن، بەلام موسا ڕێی لێگرتن و پێی وتن: ئەم پیاوە چیتر لەمەو دوا کۆیلەی منە ڕێی بەهیچ کەسێك نادەم ئازاری پێ بگەیەنێت.

"نون"لەوکاتەدا وازی لە"کوتوفار"هێنا و پەلاماری موسای دا، بەلام موسا لەو کوڕە لاوە بالابەرزتر بوو و لەڕوی کەتەییەوە لەئاستی یەکدا بوون، نۆکەر پەلاماری دا و"موسا"ش دەستی خۆی پێش ئەوەی مشتی ئەو کوڕە لاوە لێی بدات پێشخست و مشتێکی دەدات لەڕوخساری ئەو کوڕە لاوە و خوێن لەدەم و لوتی دێتە دەرەوە، بەلام سەرەڕای ئەوەش واز لەپەلامارەکانی ناهێنێت. بۆیە موسا ناچار بوو ئەو کوڕە لاوە بدات بەزەویدا. کوڕی لاویش پێی دەلێت: تۆ لەمن بەهێزتری و هێور بویەوە و دەستی لەشەڕ و پەلاماردان هەلگرت..... دوای ئەوە خوێنی سەروچاوی کوڕی لاویان پاك کردەوە.

"موسا"ش بە"کوتوفار"ی خاوەنی نۆکەرەکانی وت: بۆچی زنجیری پێی نۆکەرەکەم ناکەیتەوە؟

کوتوفار وتی: ئەم کارە خۆیی بۆخۆی کەمتەرخەمیە و هەڕەشەیەك لەدوای خۆیەوە دەهێنێت.

بەلام موسا فەرمانی دا زنجیری پێی ئەو کوڕە نۆکەرە بکەنەوە، دوای ئەوە"نون"ی تێگەیاند کە لەگەڵ ئەودا بڕوات. "نون"یش بێ ئەملاولا کەوتە دوای موسا.

موسا جێگا و شوێنێکی پاکی پێدا بۆئەوەی تێیدا بحەوێتەوە و وتی: تۆ لێرەدا بحەوێرەوە تا ئەو ڕۆژەی بەرەو ولاتی"کوش"دەکەوینە ڕێ.

***

موسا"نون"دەبات بۆ گۆڕەپانی گالیسکەوانی بۆئەوەی فێری لێخوڕینی گالیسکە ببێت. کاتێك ئەو دوانە گەشتنە گۆڕەپانی گالیسکەوانی"ستی کف"فەرماندەی هێزی سەربازی"کوش"لەگەڵ چەند ئەفسەرێکدا سەرقاڵی گفتوگۆ بوو، بەلام هەرئەوەی چاوی بە موسا کەوت دێت بەپیریەوە و بەشێوەیەك کە"نون"گوێی لێ نەبێت وتی: دەمەوێت بەتایبەت قسەت لەگەڵدا بکەم. ئەو نۆکەرەی کە لەگەڵتدایە بنێرە بۆ شوێنێکی تر.

"موسا"ش بە"نون"ی وت: تۆ بڕۆرە ناو تەویلە خانەکە... نونیش بێ ئەملاولا ڕۆشت.

"ستی کف"بەموسای وت: تۆ کوڕی پادشا و لەنەوەی خودایانیت، بەلام من لادێییەکی میسری سادەم، سەرەڕای ئەوەش بەهۆی توانای داهێنانەکانمەوە خۆم گەیاندە والاترین پلەوپایەی ئەم ناوچەیە.

موسا لێی پرسی: مەبەستت لەم پێشەکی قسانەت چیە؟

ستی کف وتی: دەمویست ئەو خاڵە بهێنمەوە بیرت کاتێك گەشتینە ولاتی"کوش"، چیتر ولاتی کوش گۆڕەپانی جەنگ و ڕوبەڕوبونەوەیە، ئەگەر نەکوژی ئەوا ئەوان دەتکوژن، لەبەرئەوە گۆڕەپانی جەنگ لەخودی"قەسابخانە"خراپترە، بەواتا هەر لەیەکەمین جەنگ کە لەسەر ڕوی زەوی

دەستی پێکردووە قەسابخانە و پێست کەندن لەنێو مرۆڤەکاندا باو بووە، دڵنیاش بە لەوەی تا مرۆڤ لەسەر زەوی بژیت، ئەوا جەنگیش لەگەڵ مرۆڤدا دەژیت و بونی دەبێت. لەبەرئەوە دەبێت لە"کوش"دا سەرکەوتن بەدەست بهێنین، چونکە لەمیسردا ئەگەر فەرماندەی جەنگ دوچاری شکست ببێتەوە، چیتر نایینێرنە هیچ جەنگێکەوە و فەرماندەیەکیش نەینێرنە هیچ جەنگێکەوە ئەوا لەبرساندا دەمرێت. وڵاتی میسر لەدوو چین پێك دێت: چینی واڵا و چینی خوار، بێگومان تۆ لەچینی واڵایت، ئەگەر کەسێك لەمیسردا لەچینی واڵا نەبێت، بێگومان لەچینی خوارەوەیە، چینی خوارەوەش بەدڵنیاییەوە چینی کرێکار و جوتیارە، کرێکار و جوتیاریش هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ کۆیلەدا نیە. هەڵبەت لەچینی واڵشدا هەموویان یەکسان و وەکو یەك نین: لە کاهین، نوسەر و سەرپەرشتیاران، دوای ئەوانیش سەربازەکان پێك دێن، کاهین و سەرپەرشتیارەکان بەهۆی خوێندەواریانەوە کارێکی باشیان پێ دەسپێردرێت، ئەگەر نەبنە کاهین، ئەوا دەبنە کاربەدەستی شوێنێك، ئەگەر نەشیان توانی بخوێنن و بنوسنەوە، ئەوا لەم حاڵەتەدا دەبنە سەرباز، باشترین نمونەش، خۆم لەبەرئەوەی نەمتوانی بخوێنم و بنوسم بومە بەسەرباز و ئێستاش وەك خۆت دەبینی پلەم بەرزبووەتەوە و بومەتە فەرماندە. بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی تۆوە لەبازاڕی کۆیلەفرۆشەکاندا بەمن گەشتووە، پەیم بەوە بردووە کە تۆ لاوێکی پڕ جوڵە و ئازایت، لەوباوەڕەدام"هتپ رە"ئەو سەردارەی کە بووەتە هاوڕێت، دڵنیام ئەوەی دەیزانێت فێرت دەکات، ئەو بەخۆڕایی فێری تەواوی هونەرەکانی گالیسکەوانیت دەکات، هەروەها کابرایەکی زۆر بەئاگایە لەبەرئەوە تاڕادەیەك فێری هونەری گالیسکەوانیت دەکات کە هەرەشە لەبەرژەوەندیەکانی نەکات.

موسا پرسی: لەکورتی بیبڕەرەوە.

ستی کف وتی: دەبێت زۆرباش بجەنگی، فەرماندەیەکی باش بیت بۆ سەربازەکانت و لەگۆڕەپانی جەنگدا بێهودە گیانی خۆت و سەربازەکانت بەفیڕۆ نەدەیت.

موسا وتی: من بۆ هەمان ئەو مەبەستە هاتومەتە ڕیزی سەربازیەوە.

ستی کف وتی: من باش ئاگاداری ئەوەم کە فیرعەون لەبەرئەوە تۆی بۆ فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکان هەڵبژاردووە بۆئەوەی تۆ لەمیسر دور بخاتەوە، چونکە خودی خۆشی زۆرباش دەزانێت بگرە بۆ جارێکیش گالیسکەت لێنەخوڕیوە.

موسا لێی پرسی: بەبۆچونی تۆ کە فەرماندەیەکی جەنگی بەئەزمونی ئایا من پیاوێکی جەنگیم و دەتوانم بجەنگێم؟

ستی کف وتی: بەدڵنیاییەوە تۆ پیاوێکی بوێر و ئازا و بەتوانایت، چونکە دوێنێ لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا ئەوەت سەلماند، ئەوێش لەئاستێکی بچوکدا وەك گۆڕەپانی جەنگ وایە. ئێستا لەوە زیاتر قسەت بۆ ناکەم لەبەرئەوەی دەبینم هاتویت نۆکەرەکەت فێری گالیسکەوانی بکەیت.

# ڕۆشتن بەرەو"کوش"

هێـزی سـەربازی دە هـەزار کەسـی میـسر لـە"کـەرەنك" دابـەش کـران بـۆ چـەند یەکەیەکی سەد کەسی، ئەم یەکانە بەپێی چەمکی سەربازی میسری ئەو سەردەمە پێیـان دەوتـن"حوسـت بـر زون جـوت" لەوانەیـە یەکـە سـەد کەسـیەکانیان زیـاد بکرایـەن بـۆ سێـسەد کەسـیش، بـەڵام هـەر"حوسـت"یـان پـێ دەوتـن. هـەموو "حوسـت"ێکـیش فەرماندەیـەکی هـەبوو هـەموو"حوسـت"ەکـانیش یـەك فەرمانـدەی"حوسـت"فـەرمانڕەوایی دەکـرد. میـسر کەدابەشـی میـسری خـوار و میسری سەرو دەکرێت مەودا و بۆشاییەکی زۆر لەنێوان ئەم دوومیسرەدا هەبوو و ڕەشپێستەکانی وڵاتی"کوش"سودیان لەو بۆشاییە وەردەگرت و هێرشیان دەکرد بۆ هـەمان ئەو بۆشاییە، لەبەرئـەوە بـۆ ڕێگـرتن لـەم هێرشـکردنە فیرعـەون هێزێکـی هەمیـشە ئامـادەی دەنـاردە ئـەو ناوچـەیەوە بۆئـەوەی ڕێ لەهـەموو هەڕەشـەیەك بگرێـت، هـەروەها دەوروبـەری سنوری خاوەنـدار و زەویـدارەکانی ئـەو ناوچـەیەش یارمـەتی ئـەم هێزەیـان دەدا و هەریـەك لەمانـە بـۆ بـەرگری کـردن لـەخۆی هێزێکـی بەرگری بۆ خۆی دروست کردبوو، لەبەرئەوەی ئەم هێزە خۆماڵیە بۆ بەهێزکردنی هێزی ناوەندی دەوڵەت کاری دەکرد فیرعەون ڕێی لەپێکهێنانی ئەم جۆرە هێزانە نەدەگرت. ئەو هێزەی بەرەو وڵاتی"کوش"دەڕۆشت، هێزێکی یەك دەستی میسری نـەبوو، بـەڵکو لەبەرئـەوەی بـەکرێگرتنی سـەربازی بـەکرێگیراوانی جـەنگ لـەو ناوچـانەدا کـارێکی ئاسـایی بـوو، نزیکـەی چـوار هـەزار کەسـیان بێگانـە بـون. دامەزرانـدنی هێـزی دەرەکـی لـەناو هێـزە سـەربازیەکانی کۆنـدا بـاو بـووە. فیرعـەون لەبـەر دوو هـۆ ڕێـی دەدا ئـەم بیانیانە بێنـە نـاو هێـزی سـەربازی میسرەوە، یەکـەم:

لەبەرئەوەی ئەمانە لەڕوی هونەری سەربازیەوە لێهاتوو و بەئەزمون و شارەزا بون، دووەم: لەبەرئەوەی وەرزی گشتوکاڵدا جوتیاری میسری دەبێت بۆ بەدەست هێنانی ئارد و گەنم و کەرەستە خواردەمەنیەکانی تر کاری لەسەر زەویە کێڵگەییەکانی بکردایە، هیچ کەسێکیش دەستی لەزەوی و کاری جوتیاری خۆی هەڵنەدەگرت بۆئەوەی بۆ بێگاری کردن پەیوەندی بەهێزی سەربازیەوە نەکات. ڕوباری"نیل"یش هەمیشە ڕەوتێکی دیاری کراو و یەك شێوەی نەبوو، هەندێك ساڵ ڕێژەی ئاو کەم دەبویەوە و هەندێك ساڵیش بەڕادەیەك زۆر دەبوو کە سنوری لێوارەکانی ڕوباری نیلی دەبەزاند و تەواوی زەویەکانی دەوروبەری تێرئاو دەکرد. لەم جۆرە ساڵانەدا بەرهەمی زیادەکەیان هەڵدەگرت بۆئەوەی لەوشکە ساڵیەکەدا قەرەبوی پێ بکەنەوە. لەهەمان ئەو کاتەی موسا بەرەو وڵاتی"کوش" دەڕۆشت لەساڵە پڕ بەر و بومەکان بوو، لەبەرئەوەش جوتیارەکان دەیانویست لەسەر زەویەکانیان بەچڕ و پڕی کار بکەن بۆئەوەی بەروبومێکی باش بەدەست بهێنن هەر لەبەرئەوەش بگرە تاکە جوتیارێکیش پەیوەندی بەهێزی سەربازیەوە نەکرد. ماوەیەك دوای بەڕێکەوتنیان، هێزی سەربازی میسر گەشتە ناوچەی"کەرەنك"و "ستی کف"چەند کەسێکی بۆئامادەکردنی خواردەمەنی ناردە ئەوێ. "ستی کف"بەهیچ شێوەیەك نیگەرانی ئاو نەبوو، چونکە وڵاتی"کوش"پڕ بوو لەسەرچاوە ئاویەکان هەروەها ڕوباری نیلیش بەنێوەندی ئەو وڵاتەدا تێدەپەڕی، بەڵام کەرەستە گواستنەوەکانی ڕوباری نیل زۆر پێویست بون، سەرەتا "گەمیٚ" وەك پەڕینەوە لەڕوباری نیل بەکەرەستەیەکی پێویست لەقەڵەم دەدرا. بونی تاڤگەگەلێکی زۆر لەمیسری خوارو دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی جۆری"گەمیٚ"کانی سەخت دەکرد. تاڤگە لەسەرەڕێی هێزی سەربازی لەنزیك ناوچەی"کەرەنك"دا بوو، هێزی سەربازی لەو ناوچەیەدا نابێت ڕوبەڕوی تاڤگە نەبێتەوە و لەو ناوچەیەدا "کەمیٚ"ی باربەرە سوکەکانیان هەڵدەبژارد و لەهەندێك شوێنیشدا کاتێك تاڤگەیەك دەهاتە بەر ڕێیان لەڕێی وشکانیەوە دەڕۆشتنە ئەودیو تاڤگەکەوە بۆئەوەی بتوانن بە "گەمیٚ" بپەڕنەوە بۆ ئەوبەری ڕوبارەکەوە. "ستی کف" لێپرسراو و فەرماندەی هێزی سەربازی ڕۆشتن بەرەو کوش ئاشنای کێشمە کێشەکانی سەر ڕێی

وڵاتــی"کــوش" هــەروەها زۆربــاش ئاگــاداری ئــەوە بــوو دوای داگیرکردنـــی وڵاتــی"کــوش"لەسەرتاســەری میــسردا دەیــانوت فیرعــەون لــەلای خوداکــان خۆشەویست و بەڕێزە و هەر ئەویش بوو بەهۆی ئەوەی لەشکری میسر سەرکەوتن بەدەست بهێنن. بگرە هیچ کەسێکیش باسی زیرەکی و ئازایەتی"ستی کف"ی فەرماندە هێزی سەربازی میسری نەدەکرد، هەروەها گرفتاری و تاڵی و هەموو خۆبەختیەکان بەشانازیەکانی فیرعەون تۆمار دەکران، بەڵام ئەگەر شکستیان بهێنایە هەمویان پێکەوە دەیانوت: ستی کف شکستی هێناوە!!!

هەموو شتێکیان بۆ هاوکاری کردنی گالیسکەکان ئامادە کردبوو، میسریەکان لەدروست کردنی گالیسکە و ئەو هونەرانەی بەمەوە پەیوەست دەکرێت زانیاریەکی ئەوتۆیان نەبوو، ئەوە"هاتی"ەکان بون گالیسکەیان بە میسریەکان ناساند و وردە وردە گالیسکەیەکی باش و بەهێزیان هێنایە ئاراوە. یەکەمین جار کە میسریەکان ڕوبەڕوی هێرشی گالیسکەکانی"هاتی"بونەوە و لەماوەیەکی کەمدا شیرازەی هێزەکەیانی پەخش و پەڵا کردبوو، بەڵام میسریەکان بێ هیچ زیانێك بەشێوەی سیستەمی سەربازی لەنێوەندی ئەو گۆڕەپانەی کە داگیریان کردبوو ڕاوەستان. لەپێش هەر گالیسکەیەکەوە داسێکی تیژ بەدی دەکرا، ئەم داسە بەوردبینیەکی زۆر بەستراوبویەوە بەو گالیسکەوە، ئەویش بەشێوەیەك کە ڕێ لەڕەوتی ئەسپەکان نەگرێت. کاتێك گالیسکەکان دەکەوتنە جوڵە داسی پێش گالیسکەکە زۆر هەڕەشە ئامێز و کارا دەبوو، بەشێوەیەك کە هەموو ئامانجێکی لەناو دەبرد. ئەم جۆرە گالیسکانە لە"هاتی"ەوە بۆ میسر دوای ئەوە لەمیسرەوە گواسترایەوە بۆ وڵاتانی تر و یۆنان و ڕۆم لەدوای هاتی و میسرەوە بونە خاوەنی گالیسکە.

گەرچی موسا لەو ڕۆژەوەی لەدایك بوو و خۆی ناسی بێ لەمیسریەکان مامەڵە و تێکەڵاوی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەی بیروباوەڕی زۆر جیاواز بوو لەمیسریەکان، بۆ نمونە مۆمیاکردنی بەلاوە پەسەند نەبوو، بەشێوەیەکی گشتی زۆرێك لەبیروباوەڕەکانی میسری پەسەند نەدەکرد و لەژیانی ڕۆژانەشیدا کرداری نەدەکردن. سەرەڕای ئەوەش زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی لەگەڵ لەشکری میسردا بەرەو وڵاتی"کوش"دەڕۆشت. ئەوەی بوو بە مایەی خۆشحاڵی

موسا لەئەستۆ گرتنی ئەرکێك بوو کە سیستەم و ئەرکێکی بەژیانی بەخشیبوو، لەبەرئەوەی هەستی بە بەرپرسیاریەتی دەکرد. چونکە لەسەردەمی منداڵیەوە تا ئەو کاتەی چووە ناو قۆناخی پیاوەتیەوە هیچ کارێکی گرنگ و سیستەماتیکی ئەنجام نەدابوو، بەناونیشانی شازادەیەك بۆ بەسەربردنی بژێوی ژیانی پێویستی بەهەوڵ و کۆشش نەبوو، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی هیچ پاڵنەر و بزاوتێك لەژیانیدا دروست نەبێت بۆئەوەی هەنگاوێکی جێگیر بەرەوپێش بنێت. موسا بگرە چێژی لەگەشت و گەڕانەکانی وەرنەدەگرت، چونکە گەشت و کۆچکردن بەلای ئەوەوە وەك حەوانەوە لەقەڵەم دەدرا، موسا هیچ کارێکی بەدەستەوە نەبوو ئەنجامی بدات بۆئەوەی هەست بەماندویەتی بکات، ئەو لەکۆشکدا تەنها هاتوچۆی دەکرد و ئەمەش سەخترین کار بوو کە لەژیانی ڕژانەیدا ئەنجامی دەدا، بەڵام دوای ئەوەی ئەو بەرپرسیاریەتیەی لەلایەن فیرعەونەوە پێ سپێردرا، موسا لەحاڵەتی جێگیری و مت بون هاتە دەرەوە، کاتێکیش لەگەڵ هێزی سەربازی میسردا ڕێگای وڵاتی "کوش"ی گرتە بەر، دەیزانی کە پیاوێکی گرنگ و کاریگەری لێ دەرچووە و دەبێت بەپێی ئەو بەرنامە دیارەی بۆیان داڕێژاوە ڕۆژی بکات بەشەو، نەك لەکۆشکەکەیدا شەو و ڕۆژ پیاسە بکات، هەموو ڕۆژێك بینەری خۆرئاوا بون بێت، دوای ئەوە بڕواتە جێگە خەوەکەیەوە و بۆ سبەینێ پێشوازی لەڕۆژێکی نوێ بکات. خاڵی گرنگتر لەم بابەتانەدا ناسنامەی ڕاستەقینەی موسا و کاریگەری لەسەر هاوڕێکانی بوو، موسا دەیزانی هەر ئەو کاتەی سەربازەکانی بزانن ئەو فیرعەون نیە، بەڵکو کوڕی کەنیزەیەکی ئیسرائیلیە بگرە گەردێك لە بەهاکەی کەم ناکاتەوە، ئەمەش لەحاڵەتێکدا بوو کە تەواوی سەربازەکان موسایان بەکوڕی فیرعەون لەقەڵەم دەدا، ئەگەر پەی بەڕەچەڵك و ڕەسەنایەتیشی ببەن بگرە بەئەندازەی گەردێکیش لەڕێزی کەم ناکاتەوە. هێزی نێردراو ڕۆژێك پێش بەڕێکەوتنیان لەشاری "تانیس" بەڕێژەی دوو هەزار و چوارسەد گالیسکەی جەنگی لەبیست و چوار "حوست"-کە هەر "حوست"ێك لەسەد سەرباز پێك دێت-ڕۆشتن و نمایشی سەربازیان پێ ئەنجام دان. موسا لەگالیسکەیەکی شکۆمەند و قورسدا کە نون-نوکەری هاتی- لەپێش ئەو هێزەوە ڕێی دەکرد. هەر "حوست"ێك ڕنگێکی تایبەت

بەخۆی هەبوو، "هتپ رە و ستی کف" لەبارەی ماڵی کردنی کابرای خەڵکی هاتی-نون- و توانایی موسا گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد. هەموو گالیسکەیەك بەچەند پەڕێکی ڕازاوە و لێخوڕانی شارەزا کە سەرپۆشێکی ڕەنگاوڕەنگیان بەسەریانەوە بەستبویەوە بۆئەوەی لەهەڵکردنی بای لەناکاو پارێزراو بن، دیمەنێکی جوانیان بەڕێکردنە سەربازیەکانیان بەخشی. گۆڕەپانی ڕێکردنی سەربازی زەویەکی بەرفراوان بوو کە لەبەشی خۆرئاوای نیلدا کە زۆر تەخت بوو ڕێکخرا. لەم گۆڕەپانەدا گالیسکەکان دەبێت بەپەلە خۆیان بگەیەننە قەراخ ڕوباری نیلەوە. موسا لەپێش هەموویانەوە چاودێری ئەم مەراسیمەی دەکرد. خەڵکی"تانیس" کە خۆیان ئامادەی نمایش و ڕێکردنێکی سەربازی ئاوا مەزن کردبوو، لەهەردوو لای ڕێڕەوەکەدا زۆر بەچڕی ڕاوەستابون بۆئەوەی تەماشای تێپەڕبونی گالیسکەکان بکەن. فەرمانی ڕۆشتن و ڕێکردنیان دەبێت موسا دەری بکات، هێمای بەڕێکەوتنی سەربازەکان قەڵخانێکی بریسکەدار بوو کاتێك بەلاسەری"حوست"ەکاندا ڕایان بوەشاندایە دوای ئەوە دەستیان دەکرد بەڕێکردن. دەنگی ژەنینی جۆرێك مارشی جەنگی هاوکات لەگەڵ جولانی گالیسکەکاندا "نون"ی -کە گالیسکەیەکی چوار ئەسپی لێدەخوڕی- خۆشحاڵ کرد: جولانی لەناکاو و بەیەکجار ڕێژەی دو هەزار و چوارسەد گالیسکەی جەنگی بەڕادەیەك وروژێنەر بوو کە تەماشاچیەکانی لەخۆشیاندا وایان لێهات کە ناچاربن دەست بەهاوار بکەن، ژنەکان دەیانقیژاند و منداڵەکانیش هەلهەلەیان لێدەدا و پیاوانیش دەیانقیراند. مەبەستی ڕۆشتنیان بۆ کەناری ڕوباری نیل بوو، دوای ئەوە گالیسکەکان دوبارە دەگەڕانەوە و چیتر هیچ کەسێك گالیسکە و گالیسکەوانی نەدەبینی، چونکە بەو ڕۆشتنە خێرایە بەڕادەیەك تەپ و تۆزی بەئاسماندا بەرز کردەوە کە چیتر چاو نەیدەتوانی چاوی بەهیچ شتێك بکەویت، موسا لەپێش ئەو لەشکرەوە بەئاشکرا ڕێی دەکرد و گالیسکەوانەکەشی زۆر بەجوانی گالیسکەکەی لێدەخوڕی. ڕۆژێك دوای ئەو ڕێکردنە سەربازیە"ستی کف" فەرماندەی ئەو هێزە سەربازیەی کەڕەوانەی وڵاتی"کوش"دەکرا چەند کەسێکی بەچەند کەشتیەکی تایبەتی سەبازی لەگەڵ سەوڵ لێدەرێکی زۆردا ڕەوانەی باشوری وڵات کرد.

ڕێکخستنی سەربازی و ئاسنین بەهەموو مەوداکانیەوە گۆشەیەکی ئەو هێزەی ڕەوانە دەکرا لەڕێی سیاسەت و ئاگایی"ستی کف"ەوە بەڕێوە دەبرا. لەچوارچێوەی سنوری دەستەڵات و خزمەتی"ستی کف"دا کەم کەسانێك دەیوێرا سەرپێچی لەدەستەڵات و فەرمانەکانی بکات، بگرە لەنێوەندی ڕێگاشدا کەمترین سەرپێچی و ئاژاوەگێڕی دەبووە هۆی ئەوەی کەسی تاوانبار بێهیچ دوا خستنێك بەسزای خۆی بگات. سزای سەرپێچیە ئاساییەکان لێدان بوو بەقامچی، ئەویش بەشێوەیەك کە کەسی سەرپێچی کەر بێئەملاولا لەسەر سەکۆی کەشتیەکە بەدەمدا ڕادەکشا، دوای ئەوە دەست و پێیان دەبەست، پانزە قامچیان بەپشتیدا دەکێشا، چونکە کەم کەسانێك بەرگەی بیست قامچی دەگرت. موسا بەتەماشاکردنی ئەو جۆرە تەمێیانە سەری سوڕ دەما.

بەڵام "هتب ره" پێی وت: ئەگەر سەرباز و گالیسکەوان و کارمەندەکانی تریش چاودێری یاساکان بکەن هیچ کەسێك ناتوانێت سزایان بدات، ئەوانە سەرەڕای ئەوەی ئاگاداری ئەم جۆرە سزایانەن هێشتا هەر سەرپێچی دەکەن، سەوڵ لێدەرەکان، سەرباز و هێزی پیادە و ئەوانی تر دەبێت چاودێر سیستەمی سەربازی بکەن بۆئەوەی بتوانرێت بەسەربازێکی سیستەماتیك بانگ بکرێن.

"ستی کف"بەم شێوەیە بەردەوامی دا بەم گفتوگۆیە: ئەم جۆرە کەسانە بێ پێشینەی پەروەردەیەکی تەندروست کەمترین بۆنیان لەیاسا و بڕیارەکانیان لەکاتی چونە ڕیزی هێزی سەربازیەوە نەکردووە. ئەمانە بگرە زۆر بەئاسانی دوچاری تاوان و کوشتنیش دەبن. ئەم جۆرە کەسانە لەو لاگوندانەوە دێن کە بێ لەزۆری کێرد و خەنجەر بۆ بەڕێوەبردنی ژیانیان ناناسن، تالانی و دەستدرێژیکردن بەشێکی جیانەکراوەی ژیانیانە، ئەم جۆرە کەسانە ژیانێکی شێوە گیانەوەرە دڕندە ئاساکانیان هەبووە، تێرکردنی ورگیان بەهەرشێوەیەك کە بۆیان بلوێت هەروەها هێورکردنەوەی غەریزەی سێکسیان بگرە بەزۆر و زۆرداری دادەمرکێننەوە. لەبەرئەوەش پەروەردەکردنی ئەم جۆرە کەسانە هەتا بڵێی کارێکی زۆر دژوارە. هیچ پەند و ئامۆژگاریەکی خوداکان، ئیتر چ ئامون بێت یان"ئوزیس" یان"ئوزیریس، یان "ست"یان "ره"لەگوێیاندا بێجگە لە دەنگێکی ئاسایی هیچی

تر نیە. تەنها ڕەفتارێکی کاریگەر کە زۆر بەجوانی لەزمانەکەی تێدەگەن زمانی قامچی و کوتەککاریە، ئەگەر تۆش لەجێی"ستی کف"دا بیت ناچار دەبیت زمانی قامچیان بۆ بەکار دەهێنیت. لەوکەشتیانەی ڕێگای باشوری وڵاتیان گرتبووە بەر چەند کەسانێك دەیانتوانی بەگفتوگۆ لەگەڵ یەکدا کاتی خۆش ڕاببوێرن، بەڵام قومار بازی قەدەغە بوو، ئەگەر کەسێك قوماری بکردایە هەردوو دەستیان دەبەستەوە و بەلێواری کەشتیەکەدا شۆڕیان دەکردەوە، ئەم سزایە بەڕادەیەك ئازار بەخش بوو کە کەسی تاوانبار دوای ئەو سزایە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك نەیدەتوانی دەستەکانی بجوڵێنێتەوە. هۆکاری قەدەغەکردنی یاری قومار ئەوەبوو کە دەرئەنجامی ئەو یاریە شەڕێکی خوێنینی لێدەبویەوە و ئەم جۆرە شەڕ و کێشمەکیشانە دەبووە هۆی ئەوەی هەیبەتی ڕێکخستنە سەربازیەکان کەمتر ببێتەوە و بەو ڕادەیەی ئێستا گوێی پێ نەدەن، لەبەرئەوەش هەر جۆرە بردنەوە و دۆڕاندنێك قەدەغە بوو. کاتێك کەشتیەکان دەگەشتنە ئاواییەك بۆ حەوانەوەی سەرنشینەکانی بۆماوەیەك ڕادەوەستان، سەربازەکانی لەکەشتیەکە دادەبەزین، بەڵام بێ فەرمانی فەرماندە"ستی کف" کەسانی وەك پاسەوانەکانی سەر قەڵای ئەم سەردەمە بەدرێژایی ئەو ماوەیە کە لەو ئاواییەدا دادەبەزن چاودێری ڕەفتار و کرداری سەربازەکان دەکەن بۆئەوەی نەوەك ڕەفتارێکی ناشایستیان لەبەرامبەر دانیشتوانی ئەو ئاواییەدا لێ بوەشێتەوە یان لەبەرامبەر بەهای ئەوشتەی لەخەڵکی ئەوشارەی دەکڕن نەیدەن بەخاوەنەکانیان، چونکە بەپێی بەڵگە و گەواهیەکان دەستی کابرا دوای لێسەندنەوەی ئەو شتومەکەی کە لەکابرای فرۆشیاری وەرگرتووە دەبەسترێتەوە و بەلێواری کەشتیەکەوە هەڵیدەواسن. موسا کە تا ئەو ڕۆژە ئاشنای ڕەفتار و نەریتی خەڵکی نەبووە لەبەرئەوەی لەکۆشکدا چاوی کردووەتەوە و تەنها مامەڵەی لەگەڵ کەسانی نیشتەجێ و خزمەتکارانی ئەو کۆشکەدا کردووە، بۆیە ئاگاداری ڕەوەندی کۆمەڵایەتی خەڵکی دەرەوەی کۆشك نەبوو، نەیدەزانی بەچ شێوەیەك لەبازاڕدا مامەڵەیەکی ئاسایی ئەنجام بدات یان دەستی پێ بکات، هەروەها بەلایەوە ئەو کەسەی کە شتێك دەکڕێت و نەیەوێت بەهاکەی بدات بەخاوەنەکەی دور بوو لەهزر و ژیری ئەو، لەوکاتانەدا تەنها

شارەزای ئەنجامدانی کارێك بوو ئەویش ناردنی ئەو سەربازانەی لەژێر دەستیدا بون بۆ گۆڕەپانی جەنگ، بەڵام بەدرێژایی ئەو گەشتەیان زۆر شت لەتەماشاکردنی ئەو جۆرە مامەڵانە فێر بوو و ئاگاداری هێما و نهێنی و ئاڵۆزیەکانی ژیانی ئاسایی و گشتی خەڵکی بوو. بێ لەکاروبارە سەربازیەکان موسا فێری شێوازی بەڕێوەبردن و مامەڵەکردن لەگەڵ کەسەکان هەروەها سیاسەتی هێزی سەربازی بوو و لە"ستی کف"ەوە ئەوە فێربوو بەچ شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ سەربازەکاندا بکات. لەم نێوەندەدا کاتێك هێزی نێردراو لەسەر ڕێی بۆ وڵاتی"کوش" گەشتە شارێك بەناوی"ئم ئاکد" لەوێدا ڕاوەستا. شاری"ئم ئاکد"پەرستگایەکی هەبوو بەناوی شاژن"موت"، خوداگەلێکی زۆری وەرزی کشتوکاڵ لەمیسری خوارودا پەرستگایان نەبووە لەبەرئەوەی کاهینەکانی میسر بەهۆی ئەوەی دەستەڵاتێکی تەواویان بەسەر میسری خوارودا هەبوو ڕێیان نەدەدا خوداکانی میسری خوارو پەرستگایان هەبێت، لەئەنجامدا دروست کردنی پەرستگا لەمیسری خوارودا بۆ خوداکان قەدەغە بوو، بەڵام لەمیسری سەرو بەپێی بنەما و نەریتی کۆن کاهینە میسریەکان لایەنگری خوداکان بون و دەستەڵاتدارەکانیان هان دەدا بۆئەوەی پەرستگا بۆ خوداکانیان دروست بکەن. "موت"لەشاری "ئم ئاکد"لەلای خەڵکەکەی پەرستگایەکی بەناوبانگ و باوەڕ پێکراو بوو. خەڵکی بۆ چارەسەرکردنی هەر سەختی و گرفتاریەکیان قوربانیان پێشکەشی خودای پەرستگای"موت" دەکرد، جوتیاران کە پێویستیەکی زۆریان بەئاوی"نیل"هەبوو بۆ گیرابوونی نزا و داواکەیان بەردەوام قوربانیان پێشکەشی خوداکەیان دەکرد، ئەگەر نیعمەت و بەروبومی ئەو ساڵەیان زۆر بوایە، دوبارە جوتیارەکان لەشێوەی سوپاسگوزاری بۆ خودای پەرستگاکەیان بەروبوم و دانەوێڵەیان پێشکەشی کاهینی پەرستگاکە دەکرد، کاهینەکانی پەرستگای"موت"بەو هۆیەوە لەهەموو بوار و هەلومەرجێکدا بازاڕیان گەرم بوو، چ لە وشکەساڵی و کەم ئاویدا یان لەساڵی زۆری بەروبوم و تەڕەساڵیدا، چونکە جوتیارەکان یان تکاو و نزایان بۆ خوداکەیان دەکرد یان لەڕێی نەزر و قوربانیەکانیانەوە سوپاسگوزاری خۆیان پێشکەشی خوداکەیان دەکرد کە لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئاینی خۆیان بۆ بەجێهێنانی پەیمانیان لەبەرامبەر

خوداكەیانـدا بـەجێ دەهێنـا و لـەم نێوەنـدەدا كاهینـەكان بـە بـەردەوامی سـودمەند دەبـون. ئەمانـە نەیانـدەزانی بەپێشكەشكردنی ئـەم دیاریانـەی كـە زۆر بەسـەختی بەدەسـت هـاتون تـەنها كاهینـەكان تـەماعتر و تەمـەڵتر دەكـات. یـەكێك لەتایبەتمەندیـەكانی پەرستگای"موت"، خـودای زیـادكردنی نیعمـەت و بەروبومـە، سـەمای مەراسـیمی تایبـەت بـەزیادكردنی ئـەم نیعەمـەت و بەروبومـە بـوو، لـەم مەراسیمەدا ژن و پیاو چەند جوڵەیەكی هاوسەنگیان پێكەوە ئەنجام دەدا. كاتێك كەشـتیە جەنگیـە نێردراوەكـانی میـسر گەشـتنە شـاری"ئـم ئاكـد" خـۆر لـەكاتی ئاوابونیدا بوو. كچان و كوڕان لەپەرستگای"موت"بەچەند جوڵەیەكی هاوسەنگ و بەكۆمەڵ هاوكات پێكەوە هاتنە دەرەوە و بەدەم گۆرانی و سرود خوێندنەوە ڕۆشتن بەرەو كەناری ڕوباری نیل. لاوەكان بەبینینی سەربازەكان داوایان لێكردن بڕۆنە ناو پەرستگاوە و قوربانی پێشكەشی خوداكەیان بكەن. چەند كاهینێكیش هاتن بۆ پێشوازیكردنی سـەربازەكان و داوایـان لەئەفسەرەكان كـرد بێنـە نـاو پەرستگاوە. سـەربازەكانیش لەكەشـتی دابـەزین. "موسـا"ش لەگەڵیانـدا پیـادە بـوو. چـیتر لەوكاتـەدا ئـاو و هـەوا بەتـەواوی تاریـك بـوو و بـۆ ڕونـاكردن مەشـخەڵەكانیان داگیرسان. هەر ئەوەی مەشخەڵەكان داگیرسان لاوەكان دەستیان بەسرود خوێندن و سەما كـرد. ئەوەنـدە مەشخەڵیان بەچواردەوری پەرستگادا داگیرسـاندبوو كـە وەك ڕۆژ ڕوناك بوبویەوە. موسا هەرگیز پەرستگایەكی بەو هـەموو ڕوناكیـەوە لـەتاریكی شـەودا نـەبینیوە. موسا لەوكاتـەدا گـوێی لەقسە و گفتوگـۆی ئـەوانی تـر دەگـرت و پەیی بەوە برد كـە سرود خوێندن و سەماكردنی ئەو لاوانە بەجۆرێك نزا لەقەڵـەم دەدرێت، چونكە خـەڵكی ئەو ناوچەیە لەوبارەدا بون خودای نیعمـەت و بەروبوم و دانەوێڵە حەز لەم جۆرە سەماكردنە هاوسەنگە دەكات و بەبینینی خۆشحاڵ دەبێت و ئـەم خۆشحاڵیەشی دەبێتـە هـۆی زۆربونی ڕوبـاری نیـل. موسا لـەكونجێكی ئـەو پەرسـتگایەدا دانیـشت و لـەكاتی خـواردنی نـانی ئێـوارەدا خـۆی بەتەماشـاكردنی سەمای لاوەكانەوە سەرقاڵ كرد، ئەو بەڕادەیەك چێژی لەسەما و سرود خوێندنی لاوەكان وەرگرت كە بووە هۆی ئەوەی چەپڵەیان بۆ لێبدات. سرودی لاوەكان سات لەدوای سات دەگەشتە دوا ترۆپكی خۆی و دواجاریش دەگەشتە نوشستی خۆی.

موسا کەوتە ژێر کاریگەری سرودەکانیانەوە کە بەشێوەیەکی بەردەوام دەخوێندرا، هەروەها جوڵەی بەردەوام و یەك شێوە و هەماهەنگی قسەکردنەکانیان بووە هۆی ئەوەی چەندجارێك لەو دورەوە دەستخۆشیان لێ بکات. ئەفسەرەکانیش بەهۆی ئەو وروژانەی هەیانبوو بەبەردەوامی ئاوجۆیان دەخواردەوە لە"موسا"یان دەپرسی تۆ بۆچی ئاوجۆ ناخۆیتەوە؟ ئەفسەرەکان پێداگریان لەوەدا کرد کە موسا ئاوجۆ بخواتەوە بۆئەوەی زیاتر چێژ لەم بۆنەیە وەرگرێت.

موسا وتی: من ئاوجۆ ناخۆمەوە و چێژی خۆشم وەردەگرم، لەهەمان کاتدا دەمەوێت ئاگام لەخۆم بێت، ئەگەر ئاوجۆ بخۆمەوە چیتر بەپێی پێویست ئاگام لەخۆم نابێت و ناتوانم بەباشی لەچواردەورم ورد ببمەوە. موسا ئاگاداری ئەوە بوو"هتپ رە"فەرماندەی پێشوی گالیسکەوانە جەنگیەکان کە دەیوت هیچ دەستکەوتێکی گۆڕەپانی جەنگ نابێتە بەشی ڕاستی کردووە چونکە ئەفسەرەکان هەرچی پارەیان پێ بوو هەمویان لەکڕینی ئاوجۆدا تەواو کرد و لەکۆتایی شەویشدا هەندێك لەوانە ئەوەندەیان پێنەمابوو کە پارەی خواردنەوەکەیانی پێ بدەن. زیادەڕەوی لەخواردنەوەی ئاوجۆدا وردە وردە ئەفسەرەکانی لەحاڵی ئاسایی و هاوسەنگی لادا و دیمەنەکان لەبەرچاویاندا لەخۆشیی و جوانییەوە گۆڕا بەناخۆشی و ناشیرینی. موسا کە بەرگەی ئەم جۆرە دیمەنەنانەی نەدەگرت لەوێوە گەڕایەوە بۆ ناو کەشتیەکە بۆئەوەی بحەوێتەوە. بەهۆی زیادەڕەوی لەخواردنەوەدا بەیانی ڕۆژی دوایی کاتی ڕۆشتن و دەرچونیان هێزی سەربازیەکەیان کەمێك دواکەوت، تەنها بەشی گالیسکەوانەکان هەموویان پێکەوە ئامادەی ڕۆشتن بون، هۆکارشی ئامادەبونی فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکان بوو بەواتا خودی"موسا"بوو و شەوی ڕابردوو بۆ حەوانەوە لەکاتی خۆیدا تەلاری مەیخانەی بەجێهێشت بۆئەوەی بەیانی زوو لەخەو هەستێت. موسا و نۆکەری گالیسکەوانەکەی"نون"پێش ئەوانی تر چاوەڕێی ئەوانی تریان دەکرد. "ستی کف"کە خودی خۆشی یەکێك بوو لەمەیخۆرەکان، بەڵام توانی بێنەوەی بۆماوەی چرکەیەکیش دوا بکەوێت خۆی بگەیەنێتە شوێنی مەبەست و ئەوانەی کە دوا کەوتن بەبینینی فەرماندەی هێزی سەربازی بێ ئەملاولا خۆیان ئامادەی سزای

سـەختی خۆیـان بـون کـە دەیـانزانی چ جـۆر سـزایەکیان دەدەن. ڕێکخـستن و بڕیارەکانی "ستی کف" لەهەموو هەلومەرجێکدا تەواوی ئەفسەرەکانیشی دەهێنایە لەرزین، چونکە دەیانزانی بەهیچ شێوەیەك لێبوردنی نیە. "ستی کف" ئەفسەرێکی نـارد بـەدوای "موسـا"دا بۆئـەوەی بێـت و گفتوگۆی لەگەڵدا بکات. کەشتی "ستی کـف" لەتـەواوی کەشـتیەکانی تـر گـەورە تـر بـوو هـەروەها سـەکۆیەکی پـان و بەرینیـشی هـەبوو. "سـتی کـف" لەسـەر ئـەو سـەکۆی فەرماندەییـە ڕادەوسـتا و چـاودێری تـەواوی کەشـتیەکانی تـری دەکـرد. موسـا هەرئـەوەی فـەرمانی ئـەوی پێگەشـت خـۆی گەیانـدە فەرمانـدەی گـشتی، لەهـەمان ئـەم کاتـەدا دەسـتیان کـرد بەڕۆشـتن. "سـتی کـف" لەبنەچـەوە فەرماندەیـەکی بـێ بـەزەیی بـوو. لەیـەکێك لەجەنگەکانیدا دوای بەدیلکردنی یـەکێك لەفەرمانـدە دوژمنـەکانی بەستی بەیەکێك لەگالیـسکە جەنگیەکانیـەوە و ئەوەنـدە بەدوای خۆیـدا ڕایکێـشا تـا ئەوکاتـەی ئـەو فەرماندەیـە بـەهۆی بـرین و خوێنرێژیـەکانی لەشیەوە بـەهۆی بەرکـەوتن و خشانی بەسـەر زەویـدا مـرد. "سـتی کـف" لەوڵاتـەکانی تریـشدا بـەناوبانگ بـوو، چـونکە لـەکاتی جـەنگی لەگـەڵ "فینیقـی"ەکانـدا پادشـای فینیقیـەکانی دەسـتگیر کـرد و بەدەستی خۆی بێ چەك ورگی هەڵدڕی! "ستی کف" لەڕوی پەروەردەییەوە دێهاتی بـوو، خوێندەواریـشی نـەبوو و پیاوێـك بـوو کـە سـەرەتا لەبەرامبـەر خوداکانـدا بیروبـاوەڕێکی جـێگیری هـەبوو، وەك تـەواوی دێهاتیـەکانی تـر، بـەڵام ورده ورده بەبینین و بیستنی زۆرێك لەئەفسانە و پێچەوانەی ئەفسانەکان وای کرد بیروباوەڕی کـەمێك سـست ببێتـەوە دوای ئـەوە بەتـەواوی لەناوچـوو و چیتر لـەوەودوا بـەهیچ شێوەیەك باوەڕی بەخودای بینراو و نەبینراو و دروستکراوی دەستی مرۆڤ نەبوو. "سـتی کـف" هـیچ کەسـێکی بـەهێز و دەسـتەڵاتداری بەپێـشەنگ نـەدەزانی، ئـەو بەڕادەیـەك دەسـتەڵاتدار و فەرمانـدە و پادشـای وڵاتـانی کوشـتبوو، بـو بـوە هـۆی ئەوەی "میر و فەرماندە و سەرباز" وەك مرۆڤێکی تەماشا بکات، بەڵام سەرەڕای ئەو هـەموو شـتانەش بـەبینینی موسـا و بیستنی سروشـتی ڕەفتـاری هـەروەها ڕوکـاری دەرەوەی ئەندامی لەسەر سەکۆی کەشتیەکەی بەرەوپیری ڕۆشت و ئەوی تا شوێنی دانیـشتن ڕێنمـایی کـرد. "سـتی کـف" وەك تـەواوی ئەفـسەرە میـسریەکانی تـر کـە

ناتوانن شەو بەبێ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و خواردنەوە تێپەڕێنێت ئاوجۆی خواردبویەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوانی تر ڕادەی هاوسەنگی خواردنەوەی ڕاگرتبوو بۆئەوەی لەبەیانی ڕۆژی دواییدا لەشی قورس نەبێت و لەکاتی خۆیدا بتوانێت هەستێت و هەست بەسەرخۆشی و بێتاقەتی نەکات. لەوکاتەدا ڕویکردە موسا و وتی: ئەی موسا، ئەی کوڕی فیرعەون!تۆ لەنەژادی خوداکانیت! خوێنی خودایان لەڕەگەکانتدا دەخرۆشێت، ئەو کەسانەی خوێنی خوداکان لەخوێنیاندا بخرۆشێت، لەکەسانی ئاسایی زیاتر حەزیان لەکاتی خۆش بەسەربردن و خۆشگوزەرانیە، لەبەرئەوەی هەمیشە ژیانیان لەخۆشگوزەرانیدا بەسەر بردووە، هەروەها هەرچیا بوێت لەبەردەستیاندایە، بگرە ساتێکیش بێ خۆشگوزەرانی تێناپەڕێنن. ئەوانەی کە شەوی ڕابردوو ئاوجۆیان خواردووەتەوە ماوەیەکیان دەوێت تا بێنەوە هۆش خۆیان، ئەوانە لەشیان هێشتا لەژێر فەرمانی خۆیاندا نیە و لەگۆڕەپانی جەنگدا سست و تەمەڵی دەکەن، هەروەها لەکاتی سەرخۆشیاندا گوتەگەلێك دەهێننە زمان کە لەکاتی بەهۆشهاتنەوەشیاندا مەحاڵە بتوانن بیهێننە زمان. من نامەوێت بەناونیشانی فەرماندەی هێزی سەربازی میسر گوتەگەلێکی پڕوپوچ بهێنمە زمان، بەخۆپاراستن لەخواردنەوەی لەڕادەبەدەر توانیم بەباشی پارێزگاری لەبیر و هەستەکانم بکەم و ئێستاش کە لەگەڵ تۆدام زۆر خۆشحاڵ و سروشتیم.

موسا وتی: من لایەنگری تەواوی گوتەکانت دەکەم، هەرلەبەرئەوەش خۆم لەخواردنەوەی ئاوجۆ دورەپەرێز کرد، سەرەڕای ئەوەش ژیان دەقاودەق لەخوادنەوەی مەی و ئاوجۆدا نیە.

ستی کف وتی: ئەم بۆچونەت لەسەردەمی لاویەتیدا دروستە، بەڵام کاتێك تەمەنت بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێت چێژ لەخواردنەوەدا سنوردار دەکرێت.

"موسا"ش وتی: من چێژ وەرگرتن لەخواردنەوەدا نابینم، بگرە لەو باوەڕەشدام لەسەردەمی لاویەتی و پیریشدا بێ ئاوجۆ و خواردنەوەکانی تر دەتوانرێت چێژ لەژیان وەرگریت. چێژ وەرگرتن بابەتێکی دیار و پێوەردار نیە، چێژی هەر کەسێك لەگەڵ ئەوەکەی تردا جیاوازە، بگرە زۆریش پێچەوانەی یەکترین، هەندێکەس چێژ

لەخواردنـــەوەی مـــەی و ئـــاوجۆدا وەردەگـــرن، هەنـــدێ کەســـیش لەپەرســـتگاکاندا گۆشەگیر دەبن و لەنەخواردنەوەی ئاوجۆ و مەی چێژ وەردەگرن. بەهەمان پێوەر و دیـدگاش زۆرێـك لەخـەڵکی چێژ لەکۆکردنـەوەی سـەرەوەت و سـامان وەردەگـرن، هەندێکەسیش چێژ لەبەخشین و سادە ژیـان وەردەگـرن. ئەفسەر و سـەربازەکانی میسر بۆیـە خۆشی و چێژ لەخواردنـەوەدا دەبیـنن لەبەرئـەوەی لـەو چوارچێوەیەدا پەروەردە کراون، ئەم نەریت و ڕەفتارە لەواندا تەلقین کراوە کە خواردنەوەی شەراب و ئاوجۆ خۆشیەکی لەڕادەبەدەرت پـێ دەبەخشێت. هەروەها بۆ ئـەم جـۆرە کەسـە ســـنوردار و کەمدەســـتانە ڕابـــواردن و خۆشـــگوزەرانیان تـــەنها لەخواردنـــەوەدا دەبیننـەوە. ئەگـەر هـەمان ئـەم سـەربازانە لـەخێزانێکی بازرگـانی مـەزن یـان لـەماڵی پادشـایەکدا لـەدایك بونایـە بەدڵنیاییـەوە شـێوازی ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانیان ئاڵوگۆڕی پێدەهات، لەوانەیە بەلایانەوە باشترین چێژ کۆکردنەوەی زێڕ و زیو بێت.

ستی کف وتـی: نـاتوانم پێچەوانەی گوتـەکانت بۆچونێکی تـر بخەمـە ڕوو، وایە ئەم سەربازانە بەپێی توانای دەرون و دەرەکیان چێژ وەردەگرن.

موسا وتی: دەبێت ئەوەش بەفەرماندە ڕاگەیەنم کە بەئەندازەی توانای دەرونـی و دەرەکیان چێژ لەژیان وەردەگرن بەلاّم!

ستی کف وتی: بەهەرحاڵ تاجارێکی تر کە چاومان بەیکتری کەوتەوە درێژە بـەم گفتوگۆیـەمان دەدەیـن بـەلاّم ئێـستا بگـەڕێرەوە نـاو کەشـتیەکەت و خـۆت ئامـادەی ڕۆشتن بکە.

لەکاروانی ئەو کەشتیانەی ڕێگا باشوریان گرتبـووە بـەر، یـەك دوو ڕۆژێـك پـێش ئـەوەی بکەونــە ڕێ چـەند بەســەرهاتێکی تــر بەســەر"موسـا"دا ڕویـدا، ئـەویش گۆڕانکـاری"نـون"ی کـابرای نۆکـەری "هـاتی"بـوو. ئـەم نۆکـەرە هـەرگیز قـسەی نـەدەکرد مەگـەر ئـەوەی زۆر پێویـست بوایـە، تـا ئەوکاتـەی موسـا پرسـیارێکی لە"نون"نەکردایە"نون"بەهیچ شێوەیەك قسەی نەدەکرد. موسا ئەگـەر فـەرمانێکی بە"نون"بدایە، "نون"بێ ئەملاولا و بێئەوەی گوتەیەك بهێنێتە زمـان ئـەنجامی دەدا، ئەم بێدەنگیە بووە هـۆی ئـەوەی موسـا دڵگران ببێـت و زۆریش لێـی ورد دەبویـەوە، کاتێك نیگانیان ڕوبەڕوی یەکتری دەبویەوە، موسا هەستی بـەوە دەکـرد کـە جۆرێك

هەرەشە لەچاوانی دەبارێت! لەبەرئەوەی ئەم جۆرە نیگایانە چەندجارێك دوبارە بویەوە و بە"نون"ی وت: ئایا نیگاکانت پەیامێکی دوژمنکارانەی هەیە یان من وا لێکی دەدەمەوە، بۆیە دەمەوێت ئەم بابەتەم بۆ ڕونبکەیتەوە.

نون وتی: نەخێر وانیە.

موسا لێی پرسی: تۆ واهەست دەکەیت کە من بەزنجیر تۆم بەستبێتەوە؟

نون وتی: نەخێر.

موسا وتی: ئایا من فەرمانم پێدان ئازارت بدەن و جل لەبەرتدا نەهێڵن؟

نون دوبارە وتی: نەخێر.

موسا لێی پرسی: ئایا خواردنی من جیاوازە لەخواردنی تۆ؟

نون وتی: نەخێر جیاواز نیە...

موسا پرسی: ئێستا بەرەو وڵاتی"کوش"دەڕۆین، کاتێك گەشتینە وڵاتی"کوش" لەگۆڕەپانی جەنگدا من و تۆ لەناو گالیسکەکەدا پێکەوە لەتەنیشت یەکەوە دەبین، ئەگەر بڕیار بێت بکوژرێیت ئەوا پێکەوە دەمرین.

"نون"تەنها "ئەگەر بڕیار بێت"ی دوبارە کردەوە، "موسا"ش بەم گوتەیەی ڕاوەشا. سەبەی ئەو ڕۆژە"هتپ رە"هات بۆلای موسا و بە"موسا"ی وت: چەند کەسێکی هێزی سەربازیەکەم چەند تێبینیەکیان لەسەر نۆکەرەکەت کە ناوی"نون"ە هەیە.

موسا لێی پرسی: چ سکاڵایەکیان لێی هەیە؟

"هتپ رە"وتی: ئێمە گەشتوینەتە ئەو دەرئەنجامەی کە بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆت چەقۆیەك بکە بەسینەی ئەم نۆکەرە هاتیەدا و ئێمەش هەڵیدەدەینە ناو ڕوباری نیلەوە دوای ئەوە چیتر تۆ خەیاڵ ئاسودە دەبیت... "هتپ رە" بەردەوامی بەقسەکانی دا و وتی: ئێمە بیرمان لەشتێکی تر کردووەتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر خۆت حەز بەئەنجامدانی کارێکی وا نەکەیت، ئەوا ئێمە لەڕێی کەسەکانمانەوە ئەمکارە ئەنجام دەدەین.

موسا پرسی: چی بووەتە هۆی ئەوەی بڕیارێکی ئاوا دەربکەن؟

"هتـپ ره" وتـی: هـەروەك چۆن ئـاوی ڕووبـاری نیـل بەبـەردەوامی دەڕوات و هـیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت نیل ئاوی تێدا نیە، لەبەرئەوەی ئێمە لەسەر ئاوی ڕووباری نیل ڕێ دەکەین، بۆیە نەپێویست بەبەڵگە هێنانەوە دەکات و نە سەلماندن، ئەم نۆکەرەش بەڕونی ڕووباری نیل ڕۆژێك دێت تۆ دەکوژێت، نە پێویست بەبەڵگە دەکات نە سەلماندن!

موسا وتی: منیش لەکانگای دڵمەوە هەمان هەستم هەیە بویە لایەنگری ئەم گوتەیەی تۆ دەکەم، چونکە دوێنێ بەشێوەیەك تەماشای کردم کە بووە هۆی ئەوەی لەرز بمگرێت دوای ئەوە چەند گفتوگۆیەك لەنێوانماندا ئاڵوگۆڕی پێکرا کە دواجار بەم گوتەیە کۆتایی پێهات: ئەگەر بریاروابێت پێکەوە بمرین. "نون"یش دوبارەی کردەوە: ئەگەر بڕیاربێت پێکەوە بمرین، بەڵام دەبینی ئێمە بەگالیسکەی جەنگی ڕێگای گۆڕەپانی جەنگمان گرتووەتەبەر، ئەگەر من"نون"لەدەست بدەم چ کەسێك گالیسکەکەم لێدەخوڕێت؟

هتپ رە وتی: ئەی موسا من خۆم بەقەرزاری تۆ دەزانم، تۆ چاکەیەکی زۆر و فەرامۆش نەکراوت لەگەڵ منـدا کـردووە، منیش گەردێك لەو خۆشەویستیەت بەفێرکردنی گالیسکەوانی وەڵامم داوەتەوە، ئەم خزمەتکارەت دەیان گالیسکەوانی شـارەزاتر لـە"نـون"پێشکەشی تـۆ دەکـات، ئەگـەر بڕیـار بێـت بەلـەناوبردنی گالیسکەوانی هەڕەشەئامێز ڕەوتـی هـەموو گالیسکەکانی تـر ڕاوەستێت، کەواتـە باشتر وایە هەر لێرە بگەڕێینەوە. تۆ بەهیچ شێوەیەك نیگەرانی گالیسکەوانی مەبە.

"موسا"ش لێی پرسی: کرێ و تێچونی فێرکردنی گالیسکەوانێکی تازە چەندە.

"هتپ رە"بەدڵگرانیەکەوە وتی: لەتۆ کە هەمیشە دۆستایەتی خۆت پیشانی خەڵکی دەدەیت چاوەڕێی قسەی وام لێ نەدەکردی، تۆ بەپێی پێویست منت قەرزارباری خۆت کردووە.

موسا وتی: لەوەیکە پیاوەتی کەسانی تر و بەتایبەت منت لەبیرە زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام دەزانم هەموو کارێك تێچونێکی تایبەت بەخۆی هەیە.

"هتپ ره"وتی: بڕیارم داوه خزمەتت بکەم، لەبەرئەوەش ناهێڵم بەدەستی ئەو نۆکەرەی کە لەبۆسەتدا دانیشتووە بکوژرێیت، تۆ مارێك لەقوڵی کراسەکەتدا بەخێو دەکەیت.

موسا وتی: چیتر لەمەو دوا زیاتر ئاگاداری خۆم دەبم.

"هتپ ره" وتی: تۆ بەچ شێوەیەك دەتوانی ئاگات لەخۆت بێت لەکاتێکدا لەنیوە شەودا بەخەنجەرێکەوە بەلاسەری سینەتەوە ڕاوەستاوە و بیەوێت ڕۆی بکاتە ناو سینەتەوە!

موسا وتی: هەرچەند ئەمە بەلامەوە سەختە، بەڵام لەکانگای دڵمەوە لایەنگری ئەم گوتەیەت دەکەم، دوبارەی دەکەمەوە، خۆشم پێشبینی ئەوەم کردبوو، سەرەڕای ئەوەش نامەوێت بیکوژم.

"هتپ ره"وتی: ئەم نۆکەرە لەبەرئەوەی بەوە ڕاهاتووە لەنیوە شەودا کەسانی تر ئازاری بدەن و بە بەردەوامی سوکایەتیان پێبکەن، تۆش لەنێو خەڵکیدا شکستت پێ هێناوە و سەریت بەزەویدا ماڵیوە، بۆیە بەدوای هەلێکدا دەگەڕێت تۆڵەی خۆیت لێ بکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی تۆ بەشێوەیەکی زۆر جوان ڕەفتارت لەگەڵیدا کردووە، خواردنی باش و کارێکی ورووژێنەر و لەهەموویان زیاتر ئەوت لەدەستی سەوداگەرەکان ڕزگار کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش کەسێك ڕەش پێست بێت بەشۆردن سپی نابێتە.

موسا وتی: لەئێستادا نامەوێت کارێکی وای لەگەڵدا بکەم.

"هتپ ره"دوای گوتنی لەکاتێکی تردا لەمبارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتردا دەکەین، موسا بەجێ دەهێڵێت. بەگەشتنی"ئابیدوس"کۆتایی بە گەشتی هێزی سەربازی نێردراو هات و ئەو کەشتیانەی سەرباز و گالیسکە جەنگیەکانی لەخۆ گرتبوو، گواسترایەوە بۆ ئۆردوگا سەربازی ئەو ناوچەیە دوای ئەوە گەشتی زەمینیان دەست پێکرد. ئەو کەسانەی لەکەشتیەکە دابەزین، هێزی پیادە و گالیسکە سوارەکان پێش دەستکردن بەڕۆشتنیان پشکنینێکی تەواویان بۆ چوارپێکان کرد، "ستی کف"بەبینینی ئەو هەموو کەس و گالیسکە و چوارپێیانە سەری سوڕما. هەندێك لەسەربازەکانی زۆر حەزیان دەکرد یەك دوو ڕۆژێك

لە"ئابیدوس"بمێننەوە، بۆئەوەی کەمێك بحەوێنەوە، بەلاّم"ستی کف"ڕازی نەبوو. ئەو بەو ئەفسەرەی کە نوێنەرایەتی ئەم داواکاریەی دەکرد وت: بەم بەشە دەڵێن میسری سەرو، بەلاّم زۆربەی سەربازەکانمان خەڵکی میسری خوارون، نێوان میسری سەرو و خوارو هەمیشە دژایەتی و کێشمەکێش هەبووە. سەربازەکانی ئاوایی خوارو دوای ئەوەی بەخواردنەوە سەریان گەرم کرد و پێیان نایە میسری سەرو دەبووە هۆی دروست بونی کێشمەکێش و ئاژاوە نانەوە، دوای ئەوەش شمشێر و چەقۆکان دەکەوتنە کار و خوێن لەنێوانیاندا دەڕێژرا. هەڵبەت سەربازەکانی ئەم هێزە، بەگشتی خەڵکی میسری خوار نین، لەنێو ئەم سەربازانەدا کەسانی بەکرێ گیراوی ولاّتی"هاتی و بابل و دورگەکانی دەریای ئاژە"و ولاّتانی تریش بەرچاو دەکەوێت کە هەمویان دژمنیایەتیکی زۆریان لەگەڵ میسری سەرودا هەبووە و لەوانەش بوو گۆمی خوێن لەنێوانیاندا هەڵسێت. پێش خۆرئاوا بون"موسا"لەناو ئۆردوگاکەدا دەستی کرد بەپیاسەکردن بۆئەوەی بەباشی چاوی بەهێزی سەربازی و بەرفراوانی کەرەستەی جەنگەکانی بکەوێت. ئەمە یەکەمین گەشتی جەنگ و سەربازی موسا بوو، بۆیە هەموو شتێك بەلایەوە تازە بوو. ئەو سەردانی هەموو بەشەکانی کرد کاتێکیش ئاو و هەوا بەتەواوی تاریك بوو گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. موسا چاوی بە"نون"ی نۆکەری کەوت کەخەریك بوو دەڕۆشت بۆ جێگە خەوەکەی بۆئەوەی بخەوێت و پێی وت: ئەمشەو بۆ ئالیکدان بەئەسپەکان لەخەو هەستە و سەریان لێ بدە. "نون"تەنها سەری بۆ ڕاوەشاند. بێدەنگی باڵی بەسەر ئۆردوگادا کێشابوو. موسا پارچە ژێرخەرێکی لەسەر زەویدا ڕاخست و خۆی بۆ خەوتن ئامادەکرد، بەلاّم خەوی لێ نەدەکەوت. نیوەشەو"هتپ ڕە"سەردانی بەش و شوێنی گالیسکە سەربازیەکانی کرد تا گەشتە لای موسا و بینی هێشتا نەخەوتووە!

لێی پرسی: ئەوە هێشتا نەخەوتویت؟

موسا وتی: خەوم لێناکەوێت.

"هتپ ڕە"وتی: ئایا دەنگە دەنگ بووەتە هۆی ئەوەی خەوت لێ نەکەوێت؟

موسا وەڵامی دایەوە: هەڵبەت لەوانەیە هەندێك دەنگە دەنگی لەناكاو خەڵكی لەخەو ڕاچڵەكێنێ، بەڵام ڕاستیەكەی ئەوەیە من هەر خەوم لێناكەوێت و دوچاری خەوزڕان بون.

"هتپ رە"وتی: ئەندێشە خراپەكان لەهزرت دەربكە، خەو بۆ سەرباز لە چەك گرنگترە، شەوێك خەو زڕان سەرباز لەگۆڕەپانی جەنگدا لەپێشەوە هەڵدەكێشێت، بێخەوی و كەم خەوی دوژمنی ژمارە یەكی سەربازی گۆڕەپانی جەنگە، دواجار بەگوتەی هەوڵ بدەیت خەوت لێ بكەوێت موسای بەجێهێشت، بەڵام موسا نەیتوانی خەوی لێبكەوێت و لەناكاو بینی"نون"لەپاڵ گالیسكەكاندا ئالیك دەدات بەئەسپەكان، ئەو لەوكاتەدا زۆر بەئاسانی دەیتوانی موسا بكوژێت، ئەوەندەی پێنەچوو بەڕوناك بونەوەی ئاسمان هێزی سەربازی نێردراو لەكەنار ڕوباری نیلدا كەوتە ڕێ، بەرواری ئەو بەڕێكەوتنە هاوكات بوو لەگەڵ هەڵچونی ڕوباری نیلدا و ئاو زۆربەی ڕێگاكانی داپۆشیبوو و بوبوە هۆی دروست بونی قوڕ و لیتەیەكی زۆر و لەئەنجامدا گرفتی بۆ جوڵانی گالیسكەكانی دروست كردبوو. لێخوڕانی گالیسكەكان لەگالیسكەكانیان دابەزین و بۆ دەركردنی گالیسكەكانیان لەنێو قوڕ و لیتەدا داوای هاوكاریان لەكەسانی تر دەكرد. گالیسكەكەی"موسا"ش وەك تەواو گالیسكەكانی تر لەقوڕدا چەقی بوو، بەڵام موسا بەپەلە لەگالیسكەكەی دابەزیە خوارەوە و بە"نون"ی وت: هاوار لەئەسپەكان بكە و لغاوەكەیان ڕاكێشە و خۆشی بەهەموو توانایەكیەوە گالیسكەكەی لەچەقین ڕزگار كرد. ئەوانیتریش بەچاولێكەری موسا هەوڵیان دا گالیسكەكانیان لەچەقین ڕزگار بكەن. هێزی سەربازی نێردراو دوای ئەوەی بەچەند ڕێگایەكی جیاوازدا تێپەڕین، لەدەشتێكی تەخت و فراوانەوە گەشتنە بەردەڵانێك، زەوی كێوەكان خراپترین ڕێگا بوو بۆ تێپەڕبونی گالیسكەكان، بەشێوەیەك كە هەندێكات ناچاربون زۆر لەسەرخۆ گالیسكەكانیان لێبخوڕن و ئەسپەكان لەگالیسكەكانیان بكەنەوە بۆئەوەی بێ گالیسكە خۆیان بگەیەننە شوێنێكی تەخت. هەندێكات ڕێگایەكی كورت و پێچاوپێچیان بەكاتژمێرێك دەبڕی، لەئەنجامدا هەندێكیان بریندار دەبون. "ستی كف"ئەو سەربازانەی بەهۆی برین و ماندویەتیانەوە لەپێكەوتون بەجێی دەهێشتن و فەرمانیان دەدا بەوانی تر

بەردەوامی بەکار و ڕۆشتنیان بدەن. لەم ڕووەوە ڕەفتاری"ستی کف"زۆر بێبەزەییانە و زبر بوو، چونکە بەجێهێشتنی سەربازە بریندار و لەپێکەوتووەکان بۆئەوەی لەداماوی و بێتواناییاندا بمرن، لەهزری"موسا"وە زۆر دور بوو. سەربازەکان لەسەرتاپای ئەو ڕۆژەدا بەو ئارەقە زۆرەی لە لەشیان دەچۆڕا پێویستیان بەقەرەبوکردنەوەی ئەو بڕە خوێیە بوو کە لە لەشیان دەهاتە دەرەوە بۆیە بەو ماسیە سوێرەی دەیانخوارد کەمێك قەرەبوی ئەو خوێیان دەدایەوە، هەروەها زۆری ڕوباری"نیل"یش هیچ کات نەیدەهێلا تینویان بکەوێت. لەم نێوەندەدا شێوازی ڕەفتاری سەربازە بەکرێگیراوەکان سەرنجی"موسا"ی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. ئەم بەکرێگیراوانە زۆر ئاگایانە ڕێیان دەکرد بۆئەوەی نەوەك بریندار بن و لەکاتی خواردنیشدا خۆیان لەزۆر خۆری دەپاراست، بۆئەوەی نەوەك بەهۆی زۆرخۆریەوە نەخۆش بکەون، چونکە لەو جۆرە هەلومەرجانەدا هیچ چارسەریەکیان بۆ نەدەکرا. ئەوانە تەنها بیریان لەدوو شت دەکردەوە، یەکەم بەدەست هێنانی زێڕ و زیو، دووەم: ئەوکاتانەش کە بێکارن بەخۆشحاڵیەوە تێیپەڕێنن. موسا لەخودی خۆیانی دەبیست کە ئامانجی سەرەکیان زێڕ و زیو و خۆشگوزەرانی و ڕابواردن بوو. ئەو شەوانەی موسا لەشوێن حەوانەوەکەی خۆیەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد، لەو شوێنەی خۆیەوە تا نیوە شەو بەمەشخەڵی داگیرساوەوە دەمایەوە، ئەو چادرەی کە هی"ستی کف"ی فەرماندەی هێزی سەربازی بوو کە تێیدا چاودێری کاروبارەکانی تێدا دەکرد یان تێیدا لەگەڵ فەرماندەی بەش و پۆلەکانی تردا دەربارەی هەندێك بابەتی جیاواز گفتوگۆی دەکرد.

دید و بۆچونی موسا لەبەرامبەر"ستی کف" لەماوەی ئەو گەشتەیدا بەتەواوی گۆڕابوو، ئەو لەسەرەتای هاتنە ناو ئەم هێزی سەربازیەوە، زۆر بەجدی و بەهادار نەدەهاتە بەرچاوی بەلام وردە وردە ئاگاداری ئەوە بوو کە کەسایەتی ڕاستەقینە"ستی کف"ناچاری کرد دید و بۆچونی لەبەرامبەریدا بگۆڕێت و لەناخەوە ڕێزێکی زۆری بۆ"ستی کف"دادەنا. ئەو پیاوێك بوو کە زۆر بەکەمی دەیخواردەوە و زیاتر خۆی بەکارەوە سەرقاڵ دەکرد و کارەکانیشی بەڕێك و پێکی ئەنجام دەدا، ئەوانەی لەژێردەستیدا کاریان دەکرد بەوردی گوێیان لەگوتەکانی

دەگـرت. موسـا ئاگـاداری ئـەوەبوو کـە"سـتی کـف"بـچوکترین بەشـی کاروبـاری سەربازی دەخاتە ژێـر چاودێریەوە، لـەبڕی ئالیکی ئەسپەکانەوە بیگرە تا دەگاتە ژەمە خواردنی سەربازەکان و کاتی لەخەو هەستان و نانی ئێوارە و پاکوخاوێنی و شێوازی رەفتار و مامەڵەی سەربازەکان، بەکورتیەکە هەموو ئەمانە وەك گوزارشت و راپۆرتێك دەهاتە بەردەستی و ئەویش متمانەیەکی تەواوی بەدەستیارەکانی هـەبوو و بگـرە متمانەشـی پێـدەدان و بـیٚ پشتگوێخـستن و دواخـستنیش لێپێـچینەوەی لەهەموو سەرپێچیەك دەکرد. موسا دەیبنی"ستی کف"خۆی بەتەنها ئەم کاروبارانە ئەنجام دەدات، بـەڵام زۆر بـەجوانی چـاودێری لەدانـە دانـەی سـەربازەکان دەکـرد و لەهـەموو شـوێنێکدا ئامـادە بـوو. لـەوەش گـرنگتر"سـتی کـف"تـا ئێـشتا هـیچ فێرکاریـەکی بەخۆیـەوە نـەبینیووە و لـەنزمترین پلـەوە خـۆی پێگەیانـدووە تـا گەشـتووەتە ئـەو پلەوپایەیـە، ئـەم هـەموو پلەوپایەیەشـی دەقـاودەق لەجدیـەت و توانـایی خۆیـەوە سەرچاوەی گرتبـوو. هەڵبـەت موسـا ئەوەشـی هێنایـەوە یـاد کـە چـەند تەلارسـازێکیش لەمیـسردا هـەن بـیٚ ئـەوەی خوێنـدەواریان هـەبێت باشـترین نەخشە دەکێشن، هەروەها چەند وەستایەکی دەستڕەنگینی ئاواش بەدی دەکرێـت کـە هـیچ خوێندەواریـەکیان نیـە، بـەڵام فەرمانـدەیی هێزێکـی سـەربازی بـەو هـەموو بابەتـە جیاوازانـەوە پێویـستی بەزانـست و زانـینی هەمـە لایەنەیـە، "سـتی کـف" سەرەڕای ئەوەی خوێندەواری نەبوو بەڵام زۆر بەباشی دەیتوانی لەگۆڕی ئەم کارانە بێت.

# بزیسکەیەك لەكۆتایی شەودا

کاتێك دەگەنە یەکەمین تاقگە"ستی کف"پەیامێکی بۆ موسا نارد و داوای لێکرد بێت بۆ لای. لەو ڕۆژەوەی"ستی کف"لەسەر سەکۆی کەشتیەکەدا لەیەکەمین چاوپێکەوتنیدا گفتوگۆ لەگەڵ "موسا"دا کرد یەکتریان نەبینیوە گەرچی موسا جارناجارێك"ستی کف"ی لەدورەوە دەبینی، بەڵام لەوکاتانەدا"ستی کف" بەڕادەیەك نوقمی کاروبارەکانی بوو هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسا قسە و گفتوگۆ و چاوپێکەوتن لەگەڵ موسادا بکات. ئەو ڕۆژە پەیامێکی لەلایەن"ستی کف"ەوە پێگەشت و زۆر خۆشحاڵ بوو، دوای ئەوە فەرمانی بە"نون"دا گالیسکەکە ئامادەی ڕۆشتن بکات دوای ئەوە بەخێرایی خۆی گەیاندە ستی کەف. "ستی کف"لەدورەوە چاوی بەهاتنی موسا کەوت و بەرەوپیری ڕۆشت بۆئەوەی پێشوازی لێبکات، ئەم هەلسوکەتەی ستی کەف کە بەخێرهاتنی لە"موسا"و یاوەرانی کرد زۆر خۆشحاڵی و ئەوەندەی ڕێزی لەلای موسا زیاترکرد. کاتێك هەردوو گالیسکەکە لەپاڵ یەکتردا ڕاوەستان هاواری کرد: سلاو لەشازادەی میسر!

"موسا"ش وتی: سلاو لەفەرماندەی گشتی.

ستی کف پرسی: ئەم گەشتە جەنگیە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

موسا وتی: فێری زۆر شتی جیاواز و هەمڕەنگت پێ نیشان دەدات و لەهەمان کاتدا کەسایەتی مرۆۋ دروست دەکات.

ستی کف وتی: خۆزگە فیرعەون لێرە بوایە و چاوی بەکوڕەکەی بکەوتایە! بۆئەوەی بیبینیایە کوڕی پادشا لەسەربازێکی بەئەزمون چالاکتر و دانبەخۆداگرترە، وەك بڵێی ئەم کوڕە لاوە کوڕی کۆشکی فەرمانڕەوایی نیە.

موسا وتی: هەر لەسەرەتاوە دەمزانی کە تۆ فەرماندەیەکی هۆشیاری، زۆر جوان ئاماژەت بەو بابەتە دا، بەڕاستی من کوڕی کۆشکی فەرمانڕەوایی نیم.

ستی کف بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە وتی: وەك بڵێی "ستی کف"کابرایەکی سەربازی نیە لەکاتێکدا هەموو تەمەنی لەسەربازیدا تێپەڕاندووە، ئێستا بەچ شێوەیەك دەبێت تۆ کوڕی پادشای و کۆشکی فەرمانڕەوایی نەبیت.

موسا وتی: لەبەرئەوەی من شازادە نیم!

ستی کف وتی: جەنابی فەرماندە هەناسە براومان مەکە، ئێستا بابڕۆین لەبەرئەوەی گفتوگۆ لەوە گرنگترمان بەدەستەوەیە. دوای ئەوە ستی کف پرسیاری لەبارەی"نون"نۆکەری موسا وە کرد و وتی: ئایا ئەو پیاوەی کە گالیسکەوانی تایبەتی تۆیە ڕیشت بۆ دەتاشێت؟

موسا لەو پرسارە لەناکاوە ڕاوەشا و وتی: بۆچی پرسیاری وا دەکەیت؟

ستی کف وتی: چونکە لەنێو سەربازەکاندا تەنها تۆ ڕیشت نیە، ئەگەر ئەم پیاوە بەباشی بتوانێت گالیسکەکەت بۆ لێبخورێت ئەوا بەدڵنیاییەوە ڕیشیشت بەجوانی بۆ دەتاشێت.

موسا وتی: لەگالیسکەوانیەکەی ڕازیم.

ستی کف بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: تۆ بەناونیشانی فەرماندەی گالیسکە جەنگیەکان دەبێت ئەوە بۆ گالیسکەوانەکان دوپات بکەیتەوە کەهەموو ڕۆژێك چەندجارێك چەرخی گالیسکەکان چەور بکەن لەهەمان کاتدا هەموو ڕۆژێك ڕۆژی چەندجارێك ئاو بەچەرخی گالیسکەکاندا بکەن... موسا کە سەری لەم بەشە هونەریانە دەرنەدەکرد بەسەرسوڕمانەوە تەماشای"ستی کف"ی دەکرد و ئەویش هەر بەوشێوەیە بەردەوامی دا بەقسەکانی: ئەگەر تەلی چواردەوری چەرخەکە لەئاسن بوایە ئەوا پێویستی بەوە نەدەکرد بەبەردەوامی تەڕی بکەیت، بەلام لەمیسردا تەلی چواردەوری گالیسکەکان لەمەفرەغ دروست دەکرێن، لەوڵاتی"هاتی" لەئاسن دروستیان کردووە. چەرخە ئاسنینەکان بەهیچ شێوەیەك خراپ نابێت و هەمیشە دڵنیابەخش و لێی دڵنیایت، لەکاتێکدا تەلە مەفرەغیەکان لەخۆیانەوە شەق و شل دەبن و دەشکێن، چیتر دوای ئەو شکانە گالیسکە توانای

ڕۆشتنی نامێنێت. بۆ ڕێگرتن لەخراپ بون دەبێت ئەو چەرخانەی لەدار دروست کراون بەبەردەوامی تەڕیان بکەیت بۆئەوەی بئاوسێن و تەلەکان بەتوندی بهێڵێتەوە و نەهێڵێت شەق ببێت. موسا زۆر بەوردی گوێ لەگوتەی"ستی کف"دەگرت و "ستی کف"یش بەش بەشی ئەندامی ئەو گالیسکەیەی بۆ موسا شی دەکردەوە. خڕی و بازنەی چەرخی گالیسکەکان وەك دەست و پێی ئەسپ وایە، بۆیە دەبێت زۆر ئاگات لێیان بێت. گەرچی دەڵێن خوداکان سات و شوێنی مەرگی هەموو کەسێکی دیاری کردووە و هەموو کەسێك لەو کاتژمێرەی بۆ دیاری کراوە دەبێت بمرێت، بەڵام بەپێی بنەمای ئەزمونی لایەنی کار و سەربازی گەشتومەتە ئەو دەرئەنجامەی ئەگەر مرۆڤ ماڵداربێت و باش بیری لێبکاتەوە و دوچاری هیچ هەڵەیەك نەبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دوچاری مەرگی لەناکاو نابێت. دوای ئەوە"ستی کف"بێدەنگ بوو، موساش بێدەنگ بوو، بەڵام دوای چەند ساتێك"ستی کف"وتی: من بانگم نەکردویت بۆئەوەی لێرەدا فێری ئەوەت بکەم لەم جۆرە هەلومەرجانەدا بەچ شێوەیەك پارێزگاری لە گالیسکەکەت بکەیت.

موسا وتی: بەهەرحاڵ دەبوو کەسێك فێری ئەم بابەتانەم بکات.

ستی کف وتی: لەبەرئەوە تۆم بانگی ئێرەکرد بۆئەوەی پێکەوە بڕۆین بۆ ماڵی پیاوێك کە لەنزیك تاقگەکەوە نیشتەجێیە، من لەوباوەڕدابوم ئەگەر ئەو بزانێت کوڕی فیرعەون لای داوەتە ئێرە و سەردانی ئەوی نەکردووە دەبێتە مایەی سەرشۆڕی ئەو.

موسا وتی: بۆچی دەبێتە مایەی سەرشۆڕی ئەو؟

ستی کف وتی: لەبەرئەوەی تۆ شازادە و کوڕی فیرعەونیت و خوێنی خودایان لەخوێنبەرەکانتدا دەخرۆشێت، لەم حاڵەتەدا تۆ بەیەکێك لەسەرکردەکانی من لەقەڵەم دەدرێیت، ئەگەر پێکەوە سەردانی ماڵەکەی نەکەین، والێکی دەداتەوە کە ئێمە هیچ گرنگیەك بەو نادەین، بەڵام بونی تۆ دەبێتە مایەی خۆشبەختی ئەو.

موسا وتی: بەڵام من ئەم پیاوە ناناسم بگرە تائێستاش ناویم نەبیستووە!

ستی کف وتی: ئەو پیاوە پزیشکە.

موسا وتی: بێگومان لەگەڕەکێکی قەرەباڵغ و مەزندا نیشتەجێیە؟

ستی کف وتی: نەخێر، بەپێچەوانەوە، ئەم پزیشکە لەبنی تەپۆڵکەیەکدا لەکەنار تاڤگەکەدا کە جێگایەکی زۆر خەڵوەت و شاعیرانەیە نیشتەجێ بووە.

موسا پرسی: بەچ شێوەیەك پیاوێك لەشوێنێکی ئاوا دورەدەستەدا دەژیت؟

ستی کف وتی: من نەموت ئەو پزیشکە بەتەنهایی دەژیت، بەڵکو خێزانەکەشی لەگەڵدایە، ئەو هاوسەر و کچێکی هەیە و بەمەزنترین پزیشکی میسریش لەقەڵەم دەدرێت.

موسا وتی: مەزنترین پزیشکی میسر دەبێت لەشوێنێکدا بژیت کە بتوانێت بەئاسانی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تر دا بەرقەرار بکات، بەڵام ئەو شوێنەی تۆ باستکرد، لەبن تەپۆڵکە و کەنار تاڤگەیەکدایە بەشوێنێکی دورە دەست دێتەبەرچاو.

ستی کف وتی: ئەو پرسیارەی کە کردت پێویستی بەڕونکردنەوەیە و کەمێکیش نهێنی ئامێزە، بەڵام بۆتی باسدەکەم. ئەو پزیشکە پێشتر لە"کرنك"دەژیا و خەڵکی نەخۆش لەهەموو شوێنێکەوە دەهاتن بۆلای بۆئەوەی چارەسەریان بکات.

موسا وتی: لەڕاستیدا منیش ماوەیەك لە"کرنك"دا لەپەرستگایەکدا کارم دەکرد، ئاگاداری ئەوە بوم کە خەڵکی دەوروبەرم باسی پزیشکێکی زیرەکیان دەکرد، بگرە ناویشیم دەزانی.

ستی کف وتی: تۆ چۆن ناو ئەم پزیشکە دەزانیت؟

موسا وتی: هەمان ناوی منی هەیە بەڵام پاشگرێکی لەگەڵدایە.

ستی کف وتی: چ پاشگرێك؟

موسا وتی: موسا ئاتون!

ستی کف وتی: بەڵی وایە، بەڵام پاشگری"ئاتون"دەردیسەری بۆ ئەم پزیشکە دروست کرد، باوکی"موسا ئاتون"یش پزیشك بووە. بگرە پیشەی پزیشکی لەخێزانەکەیاندا میراتگریە، بگرە باوباپیرانیشی پیشەیان کاری پزیشکی بووە، باوکی"موسا ئاتون"پەیڕەوی ئاینێکی پوچ و وێرانکەری دەکرد و ناوی هەمان ئەو خودا وێرانکەرەی لەکوڕەکەی نا. ئەم پزیشکەش بەو هەموو ژیری و زانستەوە لای دا و ڕێگای هەڵەی گرتەبەر و بوبە لایەنگری ئاینی ئاتون.

موسا وتی: تۆ زۆر بەسەختی باوەڕت بەخودای "ئامون"ە، وانیە.

ستی کف وتی: من هەرگیز دەستبەرداری بیروباوەڕم نابم، بەئامونەوە لەدایك بوم و لەگەڵ ئامونیشدا دەمرم.

موسا وتی: بیستومە تۆ دوژمنی سەرسەختی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە"ئامون"ە.

ستی کف وتی: بەو ڕادەیەش نیە، چونکە هەلی ئەوەم بۆ نارەخسێت بیر لەم جۆرە بابەتانە بکەمەوە، جەنگەکان منیان لەکاروباری ئاینی دور خستووەتەوە، تەنها زەوی گۆڕەپانی جەنگ بۆ من بەسە کە لەپێناو کاهینەکان جەنگ لەگەڵ خوداکاندا بکەیت.

موسا پرسی: ئەگەر بەهەڵەدا نەچوبێتم ئەم پزیشکە لەبەر بیروباوەڕی بە"ئاتون" پەنای بۆ شوێنێکی ئاوا بردووە بۆئەوەی بێکێشە و لەئارامیدا بژیت.

ستی کف وتی: بگرە لەم شوێنە دورەدەستەشدا هەست بەئارامی ناکات، کاهینەکانی "ئامون"دەستبەرداری نین، چونکە ڕۆژێکیان دوو کەس لەکاهینەکانی پەرستگای "ئامون"هاتن بۆ لای "موسا ئاتون"ی پزیشك و پێیان وت، تەنها دوو ڕێگای لەبەردەمدایە، یەکەم: ناوی خۆی لە"موسا ئاتون"ەوە بگۆڕێت بۆ "موسا ئامون" دووەم: دەبێت گۆڕی باوکتمان پێ نیشان بدەیت تا لاشەی مۆمیاکراوی باوکت دەربهێنین و بیسوتێنین، بۆئەوەی تەمەنێکی جاویدانەی نەبێت.

موسا پرسی: وەڵامی "موسا ئاتون"ی پزیشك چی بوو؟

ستی کف وتی: "موسا ئاتون"ی پزیشك ڕاست وەستا و وتی بەبۆچونی من گەدەت نەخۆشە و دەبێت پشکنینێکی سەرتاپات بکەم، بۆئەوەی بزانم هەڵمی زیانبەخشی مێشکت زیانی پێ نەگەیاندویت! سەرەڕای ئەوەش لەچل ڕۆژ کەمتر دەژیت، ئەگەر من چارەسەریەکت بۆ نەدۆزمەوە. کاهینە گەمژەکانیش باوەڕیان بەقسەکانی کرد و زۆریش ترسان و داوایان لێکرد با چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی بۆ بکات. دوای ئەوە کاهینەکان بەترسەوە پزیشکیان ئازاد کرد. "موسا ئاتون"ی پزیشك دو دەیەیە لەم دورخراوە و گۆشەگیریەدا ژیان بەسەر دەبات و بەهۆی ئەو بیروباوەڕەیەوە لەجیهان بێبەش بووە! ئێستا بۆئەوەی ئێمە لەدیداری بێبەش نەبین

جلێکی جوان لەبەربکەین بۆئەوەی بەو شێوەی کە پێویست و شایستەی ئەوە ڕێزی لێ بگرین.

موسا هەمان ئەو کاتەی لە"ستی کف"جیابویەوە بۆچەند ساتێك گوتەکانی"ستی کف"ی لەبەرخۆیەوە وتەوە و زۆر بەوە سەری سوڕما کە"ستی کف" کەسایەتی"موسا ئاتون"ی مەزن ڕادەگرت، چونکە"ستی کف"بگرە بەوشێوەیەش ڕێز و باسی فیرعەونی نەدەکرد. موسا دوای خۆشۆردن و حەوانەوەیەکی کەم یەکێك لەجوانترین پۆشاکەکانی لەبەرکرد، ملوانکەیەکی گرانبەهای لەگەردن کرد و بەشکۆمەندی و مەزنیەکەوە گەڕایەوە بۆ لای"ستی کف"و سواری گالیسکەکەی بوو و گالیسکەوانەکەشی کوڕێك بوو بەناوی "سوکر موسا"  موسا لێی پرسی: ئایا هیچ سەربازێك لەگەڵماندا دێت.

ستی کف وتی: تەنها من و تۆ دەڕۆین بۆ لای"موسا ئاتون"ی پزیشك..... دوای ئەوە گالیسکەکە بەخێرایی بەرەو تاڤگەکە کەوتە ڕێ، دوای ماوەیەك تاڤگەکە کەدەکەوتە دامێنی کوێستانەکانەوە دەرکەوت. دوای ئەوەی"ستی کف"ماڵەکەی پێنیشان دا وتی: ئەوە ماڵی"موسا ئاتون"ی پزیشکە.

موسا وتی: تائێستا ماڵێکی ئەوەندە جوانم لەدورەوە نەبینیوە، بەڕاستی شوێنێکی زۆر دڵڕفێنی بۆخۆی هەڵبژاردووە، ماڵێکی خشتەکی و لەڕوی ئەندازیاریەوە زۆر بەورد و جوانی دروست کراوە. ئەو ماڵە هەیوانی نەبوو و لەپاڵ ئەو ماڵەشدا دوو خانوی تر بۆ خزمەتکارەکانی دروست کردبوو، تەویلەی ئاژەڵەکانیشی کەمێك لەو دورتر دروست کرابون. هەروەها باخێك لەبەردەم ماڵەکەدا بوو کە بەپلیکانەیەك کۆتایی دەهات، کاتێك ویستیان لەو پلیکانەیەوە سەربکەن ڕوباری نیلیان لێدەردەکەوێت و دەتوانن لەکەنار ڕوباری نیلدا بحەوێنەوە. گالیسکەکە لەبەردەم پلیکانەکاندا ڕاوەستا و خزمەتکارێکی میسر بالآکورت لێیان نزیك بویەوە و بەخێرهاتنی لێکردن: ئێمە ماوەیەك چاوەڕێی هاتنی ئێوەمان دەکرد. پاوێك و کچێك لەناو باخەکەدا پیاسەیان دەکرد.

ستی کف وتی: ئەوە"موسا"ی پزیشکە.

هاوسەرەکەشی کە ناوی"ستێپ ئاتون"بوو وتی: ئەم"ستی کف"ە هاوڕێی ئێمەیە... دوای ئەوە ڕویکردە کچەکەی و وتی: "مریت ئاتون"وەرە بۆئێرە خۆت بە"ستی کف"بناسێنە.

"ئاتون موسا"ش بە"ستی کف"ی وت: "مریت ئاتون"لەم دورخراوەیەدا باشترین دڵخۆشی و هیوای ژیان و هاودەمی ڕۆژەکانی تەنهایی ئێمەیە. دوای ئەوە وتی تۆ هێشتا هاوڕێکەی خۆتت پێنەناساندویت.

ستی کف وتی: ڕاست دەکەیت، ئەمە ناوی"موسا"ی فیرعەون زادەیە! بەڵام "ئاتون موسا"بەبیستی ناوی فیرعەون زادە بەشێوەیەك ڕاوەشا کە"ستی کف"ی بەوە ناچارکرد بڵێت: ئەی دۆستی لەگیان خۆشەویستتر نیگەران مەبە، کاتێك ویستم بەخزمەتی ئێوە بگەم و کاتێك زانیم کوڕی پادشاش لە ئوردوگاکەی مندایە حەزم کرد ئەویش لەگەڵ خۆمدا بهێنم و بەئێوەی بناسێنم بۆئەوەی واهەست بکەم مەرجی ڕێز و خۆشەویستی خۆم بۆ ئێوە بەجێ هێناوە. سەرەڕای ئەو ڕونکردنەوەیە"ئاتون موسا"بەبینینی موسا زۆر دڵگران بوو، چونکە هەموان دەیانزانی کە فیرعەون دوژمنی"ئاتون"ی خودای پێشوی میسرە و بچوکترین سۆز و بەزەیی خۆی لەبەرامبەر لایەنگرانی"ئاتون"دا پیشان نادات، بۆیە هەرئەوەی دەنگی کەسێك بەرگوێیان بکەوێت کە باوەڕێکی تەواوی بەخودای "ئاتون"ە بەدڵنیاییەوە یەکسەر لەناوی دەبەن، ئێستاش ئەگەر کەسێك کە ناوی خۆی"ئاتون موسا" و هاوسەرەکەی"تێپ ئاتون" و کچەکەی"مریت ئاتون"بێت بێگومان مەرگی فیرعەونی چاوەڕێیان دەکات.

"ستی کف"ئاگاداری نیگەرانیەکانی"ئاتون موسا"بوو، بۆیە هەوڵیدا لەو نیگەرانیە ڕزگار بکات و بۆی ڕنکردەوە: بێگومان هەندێك شتت لەبارەی شازادەکانی بارەگای پادشا بیستووە و وا هەست دەکەیت"موسا"ی هاوڕێشم یەکێکە لە فیرعەون زادەکان، لەکاتێکدا ئەگەر وابوایە، نە من لەگەڵیدا دەهاتم و نە ئەوم بەخزمەتی ئێوە دەگەیاند، چونکە ئەو لەشازادەکانی تر زۆر جیاواز ترە، ئەم"موسا"بەهەر هۆیەك بێت وەك تۆ دور خراوەتەوە، چونکە تورەیی فیرعەونی وروژاندووە و ئەم تورەییەشی گەشتووەتە سنوری مەرگ و لەناوبردن، بۆیە

لەڕوپەکەوە ئێوە هەردوکتان خالێکی هاوبەش کۆتاندەکاتەوە. بگرە"موسا"ش وەك تـۆ ناتوانێـت پـێ بنێتـە پایتـەختی میـسر، بەلایـەنی کـەم لەئێـستادا لەدورخراوەی"کوش"دا دەبێت ژیان بەسەر ببات، هەڵبەت ئەگەر لەو جەنگەی کە چاوەڕێمان دەکـات بەزینـدویی بگەڕێتـەوە. پـێش ئـەوەی بیهێنمـە لای ئێـوە زۆر بەجوانی لێکم داوەتەوە و زانیم کە بەدیدار و ئاشنایەتی ئەو زۆر خۆشحاڵ دەبن، ئەم لێکدانەوەیەی منیش لە ساڵها ئەزمونی تێکەڵاوی و ئاشنایەتیم لەگەڵ خەڵکی و مامەڵـەکردنم لەگەڵیانـدا سەرچـاوە دەگرێـت. مـن ڕەفتارگـەلێکی بـاش و پەسەندکراوم لـەودا بینیـوە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك پەشیمان نیم لـەهێنانی بۆ لای ئێوە.

تۆش ئەی"ئاتون موسا" دەزانی کاتێك فیرعەون زادەکات بۆ هەر شوێنێك گەشت بکەن، ژنانی جوان و نۆکەر و نوسەران و ژەنیار و کاهین و چێشت لێنەر و ئالەم جۆرە خزمەتکارانە لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن و بگەنە هەر شوێنێك سفرەی بادەنۆشی و ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانی پـان دەکەنـەوە، بـەلام موسـا تـەنها لەگـەڵ گالیسکەوانێکدا هاتووە بگرە ئاوجۆش ناخواتەوە، من تا ئێستا نەمبیستووە کە لەکەسێك تورە بووبێت یان سزای کەسێکی دابێت. ئەوانەی لەگەڵ ئەودان بەگوتەی خۆیـان زۆر لێـی ڕازیـن. سـەرەڕای ئـەوەش موسـا نەیـدەزانی کـە سـەردانی ئێـوە دەکـەین، مـن پێـداگریم لـەو کـرد بێـت لەگەڵمـدا و شـانازی خۆناسـینی ئێـوەی پێشکەش بکەم، ئەویش وەك تۆ ناوی"موسا"یە.

ئـاتون موسـا وتـی: مایـەی خۆشـبەختیمە کەلەنزیکـەوە ئاشـنایەتی لەگـەڵ شازادەیەکی ئاوادا پەیدا بکەم، ئەوە یەکەمین جارە کە یەکێك لەنەوەی کۆشکی فـەرمانڕەوایی هـەڵگری ئـەو تایبەتمەندیانـە بێـت. خـۆم و هاوسـەر و کـچەکەم لەکانگای دڵمانەوە بەخێرهاتنت دەکەین. وشەی"ئاتون موسا"کاریگەریەکی زۆری کـردە سـەر"موسـا" بۆیـە سـەری ڕێـزی بـۆ ئـاتون موسا و هاوسـەر و کـچەکەی دانەواند.

"ئـاتون موسـا"ش فـەرمانی دا بەنۆکـەرەکانی بەرنامەیـەکی جـوان بـۆ پێشوازیکردنی ئەمانـە ڕێك بخەن. لەبەرئـەوەی ئاو و هـەوا هێشتا تاریك نەبوو،

خانە خوێ میوانەکانی بردە ژێر کەپرێکی ناو باخەکەی بۆئەوەی لەسێبەرەکەیدا بحەوێنەوە. نۆکەرەکان بەئاو دەست و پێی میوانەکانیان شۆرد و چەند مێزێکیان بۆ پێشوازیکردنیان لەبەردەمیاندا دانا. میوەگەلێکی ڕەنگاوڕەنگ، هەنگور و هەنجیر و چەند خواردنەوەیەکی جۆراوجۆریان لەبەردەمیاندا دانا. ئەو کاسانەی ئاوجۆیان تێدەکرد کاسەیەکی بەرز و گەورە و چەند شێوەیەکی جۆراوجۆریان هەبوو. بۆ ئاسان خواردنەوەی قامیشیان دەخستە ناو کاسەکانیانەوە بۆئەوەی میوانەکان ناچار نەبن کاسەکان لەکاتی خواردنەوەدا بەرز بکەنەوە. موسا کاسەیەك شەربەتی خواردەوە و وتی: تائێستا شەربەتێکی ئاوام نەخواردووەتەوە کە ئەوەندە تامی خۆش بێت. دوای ئەوە وتی: دەزانم کە شەربەت هەڵگوشراوی میوەکانە بەڵام نازانم ئەم شەربەتە هی چ جۆر میوەیەکە.

دوای ئەوە میوانەکان بڕێك شەربەت و ئاوجۆیان خواردەوە و کاسەی خواردنگەلێکی جۆراوجۆریان لەبەردەمدا دانان، سەرەتا نانی گەرم و خۆشتامیان خستە ناو قاپێکی بەردەمیان. بەلایەنی کەم خواردنەکانی خانەخوێ بەلای"موسا"وە تازە بوو و هەموشیان بەلایەوە خۆش بون...

لەبەرئەوەی موسا لەوانی تر بەهێزتر بوو لەوان زیاتر نانی خوارد و وتی: پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە وام دەزانی کۆشکی فەرمانڕەوایی باشترین شوێنی جیهانە و لەهیچ شوێنێکدا جێگا و دیمەن و خواردنێکی ئاوا شکۆمەندی تێدا بەدی ناکرێت، بەڵام لێرەدا دەبینم هەموو شتێك زۆر لەکۆشکی فەرمانڕەوایی باشتر و سروشتیتر و ئاسودەترە، سەرەڕای ئەوەش لەڕوی هونەریەوە زۆر پێشکەوتووە.

"ئاتون موسا"وتی: مەبەستان لەلایەنی هونەری خواردن و شێوازی لێنانەکەی چیە؟

موسا وتی: لەکۆشکدا خواردنێکم دەخوارد کە لەشێوەی بەردی ئەو کرێکارانە دەچوو کە لەشێوەی خشتەکی یان خەشتەکی لاکێشە دەیانتاشی بۆئەوەی دیواری کۆشکەکانیان پێ هەڵچنن، ئەمە تاکە کار و توانای ئەو جۆرە کرێکارانە بوو، بەڵام ئەو خواردنانەی ئەمشەو لەماڵی ئێوە بینیم، دەقاودەق وەك ئەو بەردانە وابون کە وەستاکان لەدروستکردنی پەیکەری خوداکانی میسردا بەکاری دەهێنن،

بەردەکانیان ئەوەندە جوان و ناسك دەتاشی کە دەبووە هۆی ئەوەی سەرنجی هەموو بینەرێك بەلای خۆیاندا ڕابکێشێت. ئەو کەسانەی ئەم جۆرە خواردنەیان لێناوە کەسانێکی لێزان و پسپۆڕن و بەڕاستی هونەرمەندن.

دوای ئەوە موسا وتی: سەرەڕای ئەوەی تائێستا بەهیچ شێوەیەك لەچێشتخانەدا کارم نەکردووە، بەڵام دەتوانم بڵێم جیاوازیەکی زۆر لەنێوان چێشتێکی ئاسایی و چێشتێکی هونەریدا بەدی دەکرێت. بۆنموونە، موسا لەکۆشکی فەرمانڕەوایی میسردا نان ناخوات، چونکە نانی ئەوێ بەساردی لەخواردنەکەدا دەخورێت، یان شێوازی خواردنەوە و مەراسیمەکانی تریش زۆر وشك و بێتام بون، لەکاتێکدا لەماڵی"موسا"ی پزیشکدا هەموو شتێکی سرو شتی بوو. هەروەها خواردنەکانی کۆشکی فەرمانڕەوایی بەهیچ شێوەیەك تام و بۆنی خواردنی ماڵی"موسا"ی پزیشکیان نەدەدا، لەکۆشکدا ماسی و مراویەکی زۆر لێدەنرا، بەڵام شێوازی لێنانی ماڵی پزیشك زۆر جیاوازە. موسا بەشێوەیەك نانی دەخوارد کە نەیدەتوانی بەشداری لەگفتوگاکاندا بکات، بەڵام دەیبیست کە فەرماندەی هێزی سەربازی میسر ڕوداوی سیاسی و سەربازی چەند ساڵی ڕابردوی میسری بۆ خانەخوێ دەگێڕێتەوە.

ستی کف دەیوت: فیرعەون لەجەنگی ڕابردوی نێوان میسر و "هاتی"دا دوو ئامانجی لەبەرچاو گرتبوو، یەکەم دەست بەسەراگرتنی کانزای میسی"کەنعان" دووەم دەست بەسەراگرتنی کانی ئاسنی"لوبنان"دوای ئەوە"ستی کف"باسی جەنگی"کوشی بۆکرد و وتی: من بەفەرمانی فیرعەون هاتوم بۆئێرە بۆئەوەی شتێك بەگوێی خەڵکی"کوش"دا بچپێنین و وتی: خەڵکی"کوش"دەبێت بەهۆی دەستدرێژی کردنە سەر خاکی میسر تەمێ بکرێن.

خانە خوێش وتی: خەڵکی"کوش"بگرە ئەگەر دەستدرێژیەکی واشیان کردبێت نابێت بەوشێوەیە کوشت و کوشتار بکرێن، چونکە بڕێکی کەمی خەڵکی"کوش"بەشداریان لەم دەستدرێژیەدا کردووە، نەك تەواوی خەڵکی"کوش" ئەوانی تر هیچ تاوانێکیان نەکردووە، ئەمە پێچەوانەی ویژدان و دادپەروەریە

لەبەرئەوەی کۆمەڵێك ئەم تاوانەیان کردووە و دەبێت کۆمەڵێکی بێتاوان لەباتی ئەواندا بکوژێن.

*"ستی کف"قا قا پێکەنی دوای ئەوە بۆی ڕونکردەوە: ئەی"موسا ئاتون"ئەگەر فەرماندەیەك بیەوێت لەسەر بنەمای چەمکی"فەلسەفە و لۆجیك و ویژدان"بجەنگێت، ئەوا کەسێکی وەك من باشتر وایە لەباتی ئەوەی فەرماندەی هێزی سەربازی بێت بڕوات لە لادێکەی خۆیدا زەوی بکێڵێت.*

پزیشکی خانەخوێش وتی: من هۆکاری ناردنی ئەم هێزە لەلایەن فیرعەونەوە دەزانم؟ فیرعەون خوازیاری"زێڕە"، بەڵام هێرشکردنە سەر خەڵکی"کوش"ی کردووەتە بیانویەك بۆئەوەی دەست بەسەر کانەکانزاکانی"کوش"دا بگرێت. چەندینساڵ پێشتر کۆمەڵێك لە وڵاتی"لیبیا"کە دەکەوێتە باشوری میسر هێرشیان کردە سەر میسر و کۆمەڵێکیان لێکوشتن و سەروەت و سامانەکەشیان بردن هەروەها ئاواییەکانیشیان سوتاند، بەڵام فیرعەون کەمترین کاردانەوەی خۆی لەبەرامبەر ئەم هێرشەدا نیشان دا، بۆچی لەبەرئەوەی "لیبیا"وڵاتێکی هەژار و کەمدەست بوو، لەکاتێکدا دیار نیە ئایا بەڕاستی بۆ تەمێکردنی خەڵکی"کوش"هێرش دەکەنە سەر ئەو وڵاتە یان نە!

ستی کف وتی: جەنابی"ئاتون"ی پزیشك، ستی کف فەرماندەیەکە کە فەرمانەکانی سەروی خۆی جێبەجێ دەکات و هیچ دەستەڵاتێك لەدەستی خۆمدا نیە، من بەپێی فەرمانێکی سەروی خۆم ڕوم لەم وڵاتە کردووە، لایەنی تاوانبار و بێتاوان بەڕەوشتەوە پەیوەست دەکرێت نەك لایەنی سەربازی.

"ئاتون"ی پزیشك پرسی: ئایا تۆ واژەی"مکا"ت بەرگوێ کەوتووە؟

ستی کف وتی: بەڵێ واژەی"مکا"م بیستووە.

"موسا"ی پزیشکیش وتی: ئێمەی خەڵکی میسر هەزار ساڵە بانگەشەی ئەوە دەکەین"مکا"هی ئێمەیە و تەنها میسر"مکا"ی هەیە، لەبەرئەوەی ئێمە"مکا"مان هەیە سەروەری بونەوەرەکانی ئەم جیهانەین و هیچ خێڵ و نەتەوەیەکی ئەم جیهانە لەئاستی ئێمەدا نیە، سەرەڕای ئەوەش والێکی دەدەینەوە لەبەرئەوەی ئێمە"مکا"مان هەیە ئەوا ئاینەکەشمان لەئاینی میلەت و خێڵەکانی تر مەزنترە،

خوداکـانی ئێمـەش لـە خوداکـانی تـر مـەزنترن، بگـرە هـەموو شـتێکمان لەهـەموو شتێکی میلەتانی تر مەزنترە، ئەوە خوداکانی ئێمەیە کە مافی خودایەتیان هەیە، و ئەوانی تر بونەوەری کێوین و لەخوار ئێمەوەن و ئێمەش خۆمـان بەپێشەنگی ئەوان دەزانین و ئەوان بەئاژەڵی کێوی لەقەڵەم دەدەین.

کاتێك موسا گوێی لەم قسانە بوو تەماشایەکی"ستی کف"ی کرد کە وای دەزانی بەم تەماشاکردنە تورە و دڵگران دەبێت، بەڵام"ستی کف"تـەنها زەردەخەنەیـەکی بـۆ کـرد. دوایـی وتـی: بگـرە لایـەنی ئـازاییش یەکێکـە لەتایبەتمەندیـە بەرجەسـتەکانی خەڵکی میسر کە دەبێت بەبەشێك بە"مکا"لەقەڵەم بدرێت.

"موسـا"ی پزیـشك وتـی: ئـەو جـۆرە ئـازایی و دلێرەیـە کـە لـەگۆڕەپانی جەنگـدا بەدی دەکرێت، دلێری پێ ناڵێن، ئەم جۆرە ئازایی و دلێریە جۆرێك هێزی جەنگەڵ و دارسـتانیە، هەرکەسـێك زۆری لـەوی تـر زیـاتر بێـت! پێـی نـاڵێن ئازایـەتی..... ئەمجارەیان موسا دڵنیابوو لەوەی کە بێگومان"ستی کف" لەدەربڕینی ئـەم بۆچونە تازەیـەی لێـی تـورە دەبێـت، بـەڵام دوبـارە زەردەخەنەیـەکی بـۆکرد و بەهێمنیەکـەوە گویٚ لێگرت.

"ئاتون موسا"بەردەوامی دا بەقسەکانی و وتـی: بـەڵکو بەشـتێك دەڵێن ئازایـەتی کـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی خـەڵکی بەپێـچەوانەی ئـەوەی بکـوژرێن زینـدوو ببنـەوە و تەندروستیان بۆ بگەڕێتەوە، ئەگینا هەموو کەسێك دەتوانێت کەسانی تر بکوژێت.

ستی کف لێـی پرسـی: چ جـۆر ئازایەتیـەك دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـوژراو زینـدوو ببێتەوە؟

خانـە خـوێش بـۆی ڕونکـردەوە: مەبەسـتم ئازایـەتی گۆڕەپانـەکانی جـەنگ نیـە، چونکە ئازایەتی و دلێری و بێباکی لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا نابێتە هۆی زینـدوو بونەوەی هیچ کەسێك. بەڵکو مەبەسـتم ئازایـەتی و لـەخۆبردویی پزیـشکانە کە ڕێ لـەمرگی کەسـانی تـر دەگـرن، ئەگـەر ئازایـەتی پزیـشك نـەبێت کەسـی نـەخۆش دەمرێت، کەسە نەخۆشەکان لەئازاراندا کۆچی دوایی دەکەن.

ستی کف لەم کاتەدا لێی پرسی: بەڵام هێشتا چاوەڕێی ئەوە دەکەم بزانم"مکا"چییە، تۆ هێشتا پێناسەی مەکات بۆ نەکردوین! ئەوەی ئێستا بۆت ڕونکردینەوە پێناسەی"مکا"لەخۆ ناگرێت.

پزیشکی خانەخوێ وتی: چەمکی"مکا"کۆمەڵە شتێکی باشی نەتەوەیەك لەخۆ دەگرێت، هەرکاتێك خوداکان لەنەتەوەیەك تورە بن، یەکەمین شت کە لەو نەتەوەیە دەسەندرێتەوە چەمکی"مکا"یە. بۆنمونە یەکێك لەڕو وەرگێڕانی"مکا" لەکۆمەڵگایەك هەمان ناردنی ئەم لەشکرەی ئێوەیە بۆ وڵاتی کوش، کوشت و کوشتاری خەڵکی بێتاوان و بێ دەرەتان لەڕێی هێزێکی سەربازی گالیسکەدار و نێزە بەدەست، بەواتا ڕۆشتن و لەدەستدانی"مکا"یە، بێئاگا لەوەی ئەم سروشت خراپیە لەنەزانیەوە سەرچاوەی گرتووە، من نازانم ئایا فیرعەون ڕاوێژکار و وەزیر و کارشناسی نیە، بەچ شێوەیەك دەست لەکارێکی ئاواوە دەدات، لەوانەشە ویستبێتی ڕوانەی مەرگیان بکات.

ستی کف بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ لەلایەکەوە دەڵێیت خەڵکی بێتاوان و بێدەرەتان و لەلایەکی ترەوە دەڵێیت فیرعەون ئێمەی ڕەوانەی مەرگ کردووە، بەڕاستی کەموکورتیەك لەم گوتارانەتدا بەدی دەکرێت.

"موسا"ی پزیشك وتی: کەموکورتی لەکارەکانی فیرعەوندایە نەك لەگوتارەکانی مندا، چونکە ئەو بەتێڕوانینی خۆی ویستویەتی کوشت و کوشتار بخاتە نێو خەڵکیەوە، بۆئەوەی لەکۆڵی خۆیانی بکاتەوە و دەست بەسەر زێڕەکەیاندا بگرێت، لەکاتێکدا"کوش"جەنگاوەرانێکی هەیە کە بەهیچ شێوەیەك ئێوە ناتوانن ڕوبەڕویان ببنەوە، هەروەها چەك و ئەسپەکانتان لێ زەوت دەکەن و خۆشتان بەدیلی دەگرن و دەتانکەنە کۆیلەی خۆیان، ئێستا کەم و کورتی لەگوتەی کامماندایە، گوتاری من یان ڕەفتاری فیرعەون؟

لەکۆشکی موسا لەگەڵ "ئامون تپ" یان "نف"ی تەلارسازدا گفتوگۆی دەربارەی خودای نەبینراو کردووە و پێیان وتبوو لەباشوری"میسر" لەمیسری سەرو کەسانێك هەن کە باوەڕیان بەخودای"ئاتون"ە، لەم جۆرە گفتوگۆیانەدا دەربارەی خودای ئاتون"موسا و ئامون تپ و یان "نف"ی تەلارساز" بەچپەوە گفتوگۆیان

دەکرد بۆئەوەی نەوەك کەسێك گوێی لەگفتوگۆکەیان بێت... ئەویش لەو شەوەدا لەکاتی باسکردنی خودای نەبینراودا وەك ئەو بێدەنگیەی باڵی بەسەر ئەو کۆشکەدا کێشابوو زۆر لەسەرخۆ قسەی دەکرد، بەڵام لەناکاو ئاگاداری ئەوە بوو کە جگە لە"موسا"ی پزیشك و ستی کف هیچ کەسێکی تر لەو کۆشکەدا نیە، دوای ئەوەی ئاگاداری ئەم حاڵەتە بوو حاڵەتێکی ئاسایی لەخۆگرت، سەرەڕای ئەوەی باسی خودای نەبینراو نەکرا، بەڵام لەگفتوگۆکانیاندا مەبەستیان خودای "ئاتون"بوو. موسا لەسەرپێچی و دژایەتی کردنی"موسا"ی پزیشك لەبەرامبەر بۆچونەکانی"ستی کف"دا سەری سوڕما لەبەرئەوەی بەئاشکرا دژی فیرعەون قسەی دەکرد.

ستی کف لێی پرسی: کەواتە بەبۆچونی تۆ ڕەفتاری فیرعەون ئەوە دەسەلمێنێت کە خوداکان دەیانەوێت ئێمە لەناو ببەن؟

پزیشکی گۆشەگیر وەڵامی دایەوە: وتم هەرکاتێك خوداکان بیانەوێت نەتەوەیەك شکست پێ بهێنن"مکا"یان لێ دەسێنێتەوە، ئێستاش کاری فیرعەون یەکێکە لەم هێمایانە. ئیتر تۆ بەهەرشێوەیەك کە خۆت بتەوێت لێکدانەوەی بۆ بکە.

ستی کف وتی: کاتێك خوداکان"مکا"یان لێ سەندینەوە بەچ شێوەیەك لەناو دەچین؟

موسای پزیشك وتی: ئەوکات خۆمان بەدەستی خۆمان، خۆمان نابوت دەکەین.

ستی کف وتی: بەواتا بەچ شێوەیەك؟

خانەخوێ بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: کاتێك توانای دەستنیشانکردنی ڕەفتارەکانمان نەبێت ئەوا بەئاراستەی پێچەوانە و بەزیانی خۆمان هەنگاو دەنێین، چۆنایەتی ئەم نمونەیەش لەهاتنی ئێوە بۆ وڵاتی"کوش"شاردراوەتەوە، ئەم هاتنەی ئێوە بۆ کوش بەواتا هەنگاو نانە بەپێچەوانەی بەرژەوەندیەکانتان، هەنگاونانیش بەپێچەوانەی بەرژەوەندیەکانتان یەکسانە بەلەناوبردنی خۆتان بەدەستی خۆتان. مەگەر فیرعەون ڕاوێژکاری نیە بۆئەوەی لێیان بپرسێت ئایا"کوش"چ جۆر وڵاتێکە، مەگەر"کوش"شارە مرۆچەن تا ئێوە بتوانن هەمویان لەناو ببەن.

ستی کف وتی: کاتێك فیرعەون نەزانێت وڵاتی "کوش"چ جۆر شوێنێکە، ئەوا منیش کە تائێستا سەردانیم نەکردووە نازانم چۆنە، ئێمە پشت بەهێزی سەربازی خۆمان دەبەستین کە لەهەموو شوێنێکدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، لەڕاستیدا ئێمە هیچ گرنگیەکمان بەوڵاتی کوش نەداوە.

خانەخوێ وتی: تۆ ڕاست دەکەیت چونکە زۆربەی کات لەمیسری خوارویت و میسری سەرو و کوشی دراوسێ وڵاتی خۆتت بەهیچ شێوەیەك لەبەرچاو نەگرتووە، بەڵام وانیە. بەڵگەش بۆ ئەمە تۆ و زۆربەی ئەفسەر و سەربازەکانتان لەبەشی میسری خوارودا نیشتەجێن و میسری خوارو لەمیسری سەرو بەباشتر دەزانن، لەکاتێکدا فیرعەونەکانی ڕابردوو پێش ئەوەی لەمیسری سەرو نیشتەجێ بن و پایتەختەکەیان "تبس" بوو. ئەم فیرعەونە "تبس"ی بەجێ هێشت و باری کرد بۆ میسری خواروو.

موسای پزیشك وتی: هەڵبەت نابێت ئەوەش لەیاد بکەین لەبەر دوو هۆکار پایتەختی میسری گۆڕی، یەکەم لەبەرئەوەی "ڕامسیس" زۆر حەزی لەتەلارگەلی بەردینە، دووەم لەباکوری میسردا کرێکارگەلێکی زۆر هەن کە بەهەرزان کار دەکەن. فیرعەونیش بۆ دروست کردنی تەلارەکانی سودی لێ وەردەگرتن.

موسا لێی پرسی: مەبەستت لەکرێکاری هەرزان چیە؟

کابرای خانەخوێش وەڵامی دایەوە: مەبەستم نۆکەرەکانی وڵاتی "کوش"ە کە لە باکوری میسر و دەوروبەری "دلتا"دا نیشتەجێ بون و فیرعەونیش بەکرێیان دەگرێت بۆ ئەوەی تا ئەوکاتەی پەکیان دەکەوێت بێگاریان پێ بکات. دوای ئەوە کەوتە باسکردنی وڵاتی "کوش" و بەم شێوەیە ڕونی کردەوە: کوش بەلای فیرعەونەوە کە لەبەشی میسری خوارودا ژیان بەسەر دەبات نائاشنایە، فیرعەون وادەزانێت پارچە زەویەکە کە دەکەوێتە باشور و لەهەمان ئەو شوێنەدا سنوردار کراوە! لەکاتێکدا کوش بەواتا تەواوی هێڵی "ئەفریقا" کە دەکەوێتە باشوری میسرەوە.

ستی کف وتی: حەوت ساڵ لەوەوپێش من کۆمەڵێك خەڵکی "کوش"م لەدەوروبەری شەشەمین تاڤگەدا شکست پێهێنا و هەمویانم کوشت، بەڵام

لەوڵاتی "کوش"دا ڕەشپێستەکان زۆرن و لەڕێی کشتوکاڵیەوە بژێوی ژیانیان دابین دەکەن، هیچ کاتێك پەنا بۆ فەرهودی و جەنگ لەگەڵ وڵاتاندا نابەن.

کابرای خانەخوێ وتی: کەواتە بەپێی گوتەکانی خۆت، بۆچی کوشت و کوشتار دەخەیتە ناو خەڵکێکی ئاواوە، لەوانەیە بەهۆی شەڕەنگێزی چەند هەرزەکارێك و لەبەر چەند ڕوداوێکی بچوك دەتەوێت نەتەوەیەك لەناو ببەیت، هەڵبەت دەزانم ئەوە تەنها بەڵگەیەکە، کە ئامانجی سەرەکی دەست بەسەراگرتنی زێڕی ئەو وڵاتەیە نەهیچی تر.

ستی کف لێی پرسی: تۆ لەکوێوە پەیت بەم بابەتە بردووە؟

پزیشکی خانەخوێ وەڵامی دایەوە: لێرەدا باسی هەموو کەسێك و هەموو شتێك دەکرێت. سەرەڕای ئەوەش لەشوێنێك کە بەهیچ شێوەیەك تائێستا بیرت لێنەکردووەتەوە ناوی "ئاتون موسا"یان بیستووە و من باش دەناسن، ئەگەر بڵێم لەشوێنێکەوە کە نزیکەی سی تا چل ڕۆژ ڕێگا بەپێی دورە نەخۆشم بۆ دەهێنن بۆئەوەی بۆیان چارەسەر بکەم، باوەڕم پێناکەن.

موسا بە پزیشکی خانەخوێی وت: تۆ وتت لەشوێنێك کە سەد ڕۆژ بەپیادە دورە تۆ دەناسن؟

خانەخوێش وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

موسا وتی: لەورباوەڕەدا نەبووم شوێنێك لەمیسردا هەبێت بۆئەوەی بێت بۆ ئێرە دەبێت سەد ڕۆژ بەپێ ڕێ بکەن، بەڕاستی ڕێگایەکی سەیر و زۆر دورە؟

ستی کف لەباتی خانەخوێ وەڵامی دایەوە و وتی: بەڵێ شوێنێکی ئاوا هەیە، ئەوە هەمان ئەو ڕێگایە کە دەبێت ئێمە بیگرینە بەر و پێی بگەین. ئەگەر ناشزانی کاتێك ئەو ڕێگایەت گرتە بەر بۆت دەردەکەوێت کە چ جۆر شوێنێکە.

خانەخوێش بەموسای وت: ئێستا بێ ئەوەی خۆت خوازیاری بیت ئاگاداری دوری ڕێگاکەی خۆت بویت، هەروەها دەمەوێت پرسیاری بۆچونت لەبارەی وڵاتێکی دواکەوتووەوە لێ بکەم کە بەمیسری سەرو بانگ دەکرێت.

موسا وتی: ئەگەر مەبەستت لەمیسری سەرو هەمان ئەو شوێنانە بێت کە من چاوم پێیان کەوتووە، جگە لە جوانی و شکۆمەندی هیچی تری تێدا بەدی ناکرێت

و بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت پێی بوترێت دواکەوتوو، خۆرئاوابونێکی جوان، دیمەنگەلێکی ڕەنگاوڕەنگی سروشتی زیندووی هەیە.

"موسا"ی پزیشك وتی: بەپێی ئەو ئەزمونەی من لەژیانـدا فێـری بـوم ئـەو کەسانەی چاوم پێیان کەوتووە یان لەبیابان بێزارن یان تامەزرۆی بیابانن، تائێستا ڕووبەڕوی کەسێك نەبومەتەوە کە بۆچونێکی بێلایەنەی لەبارەی بیابانەوە هەبێت، بەلاّم دەبێت بڵێم کێو و بەردەلاّنی ئەم ناوچەیە لەهەندێك ساتەکانی ڕۆژدا، بۆنمونە لەسپێدە یان خۆرئاوابونـدا دیمـەنێکی دڵڕفێنیـان هەیـە کـە لەوانەیـە لەکـەمترین شوێنی ئەم جیهانەدا بتوانی دیمەنی ئاوا بەدەست بهێنیت.

موسا وتی: من ڕاهاتوم بەوەی تەماشا هەڵهاتن و ئاوابونی خۆر لەناو بەردەلاّن و کێوەکاندا بکەم.

خانەخوێ وتی: زۆر حەز دەکەم دیمەنی خۆرهەڵهاتن یان ئاوابونی ئێرە ببینیت بۆئەوەی بزانیت ئەو دیمەنەی لەبەرچاوتاندا دەردەکەوێت چەنێك ئەفسوناوی و دڵڕفێنـە، لەهـەمان کاتـدا لـەماوەی دوو ڕۆژی یـەك لـەدوای یەکـدا دوو دیمـەنی هاوشێوەی یـەکتری نابینیـت، چـونکە هـەموو ڕۆژێـك ئاسـۆ بەڕوخسارێکی نوێـوە نمایشی خۆی دەکات. ئێمە بەمنداڵەکانمان دەڵێین ئەو ڕەنگە جوانەی خۆرئاوابون بە خۆرهەلاّتی دەبەخشێت و لەسەر کێوەکاندا ڕەنگ دەداتەوە پۆشاکێکە کە ڕۆژانـە لـەکاتی دەرکـەوتنی خـۆردا لەلایـەن خـودی"مـوت" کراوەتـە بـەری کێوەکانـەوە بۆئەوەی کێوەکان لەشەودا لەکاتی ئاوابونی خۆردا سەرمایان نەبێت... ئاتون موسا، لەمکاتـەدا ڕویکردە"مریت ئاتون"ی کچی کە تا ئەوکاتە بێدەنگ گوێی لەگفتوگۆی باوك و میوانەکانی دەگرت و پێی وتی: "مریت ئاتون"تێڕوانینی تۆ لەمبارەیەوە چیە، ئایا تۆ پەیوەست نیت بە دیمەنی هەڵهاتن و ئاوابونی خۆرەوە؟

مریت ئاتون بەدەنگێی زۆر ناسك و دڵڕفێن وتی: وایە بابە گیان! کاتێك منداڵ بوم پێیان دەوتم کە ڕۆژانە پێش ئاوابونی خۆر خودای"موت"دێت و بالاپۆشێك دەدات بەسـەر کێوەکانـدا بۆئەوەی لـەکاتی شـەودا سـەرمایان نـەبێت، بـەلاّم هـیچ کەسێك پێی نەوتوم بەچ شێوەیەك بەرد سەرمای دەبێت، چونکە بەرد بێگیانە و بونەوەرە بێگیانەکان هەستیان نیە بۆئەوەی هەست بەسەرما بکەن، بگرە خودی

باوکیشم کە زانیاریەکی زۆری هەیە ئەم بابەتەی بۆ ڕون نەکردومەتەوە. "مریت ئاتون" بەزەردەخەنەکەی ئەوە نیشاندا مەبەستی لەم دەربڕینانەی تەنها گاڵتەکردن بووە لەگەڵ باوکیدا.

"موسا"ی پزیشك بە"موسا"ی وت: هەرچەند تۆ وا خۆت دەردەخەیت کە خۆشت لەدیمەنی ئەم ناوچەیە دێت، بەڵام دڵنیام ئەم شوێنە بەلای تۆوە زۆر سەرنج ڕاکێشە و هەموو شتێکی ئەم ناوچەیە بەلاتەوە سەرنج ڕاکێش دێتە بەرچاوت. ئایا ئێرە شکۆمەند و سەرنج ڕاکێش نایەتە بەرچاوت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی لەوکاتەوەی چاوم کردووەتەوە لەناو فیرعەوندا[28] بوم، ناتوانم بۆچونێکی تەواوی خۆم لەسەر کۆشك و تەلارەکان بخەمە ڕوو.

"ئاتون مریت"وتی: ئایا ئەو شوێنە خۆشیت پێ دەبەخشێت، ئایا مرۆڤ لەو شوێنەدا هەست بەخۆشبەختی دەکات یان نە؟

موسا وەڵامی دایەوە: بەهیچ شێوەیەك ناتوانی شوێنێك لەم جیهانەدا بەدی بکەیت کە بتوانێت بانگەشەی خۆشبەختی بکات، بەڵام دەربارەی ئەو شوێنەی تێیدا گەورە و پەروەردە کراوم، دەتوانم بڵێم شوێنێکی زۆر فراوانە و لەهەموو کۆشك و تەلارەکانی تر باشتر دروست کراوە، بەڵام لەهەمان کاتدا ماڵێکی هاخێنراوە لە ئەفسانەی ڕقەبەرایەتی و ئیرەیی و کورت بینی و بێبەزەیی و دەردیسەری.

ستی کف وتی: ئەمانەی کە باسی تایبەتمەندی کۆشکی فیرعەونیە و هەمیشە وابووە و وادەبێت.

"موسا"ی پزیشك وتی: بەتەواوی تایبەتمەندیەکانیەوە، بەڵام من بەم شێوەیە هەڵسەنگاندنی بۆ دەکەم کە لەوانەیە کۆشکێکی زۆر مەزن بێت.

موسا لە خانەخوێی پرسی: مەبەستت لە مەزنی چیە، زۆر حەز دەکەم بزانم بۆچونی تۆ لەمبارەیەوە چیە؟

"موسا"ی پزیشکیش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: من بۆ هەموو گوتەیەکم بەڵگەیەکی سەلمێنراوم هەیە، بەڵگەی سەلماندنەکانیشم هەمان ئەو کۆشکەیە کە

---

[28] لێرەدا مەبەستی کۆشك و تەلارەکانی فیرعەونە.

تۆ ئێستا پێناسەت کرد، چونکە ئەم تەلارە هەمان ئەو ئەندازیارە نەخشەی کێشا و دروستی کردووە کە کۆشکەکەی فیرعەونی بنیات نا، هەرلەبەرئەوەش دەبێت مەزن بێت.

موسا لێی پرسی: ئایا مەبەستان کۆشکی فیرعەون و ئەم تەلارە یەك تەلارساز نەخشەی کێشاوە و دروستی کردووە؟

"موسا"ی پزیشك وەڵامی دایەوە: بەڵێ. هەردوکیان یەك تەلارساز نەخشەی کێشاوە و دروستی کردووە. دوانزە ساڵ لەوەوپێش ئەو تەلارسازە لەگەڵ چەند هەزار نۆکەرێك هات بۆ ئێرە بۆئەوەی بەربەستێك لەسەر تاڤگەی یەکەمدا بۆ فیرعەون دروست بکەن. ئەو تەلارسازە پێی وتم بۆ دروست کردنی بەربەستێك پێویستمان بەبەرد دەبێت، ئەویش بەچ ڕادەیەك، هەڵبەت زیاد لەو بەردانەی کە لەقوچەکیەکانی میسردا بەکارهێنراون!! ئەو وتی ئەم کارە دەکرێت، بۆئەوەی لەدوای دروست کردنی سێ خەزێنەی مەزنەوە ئاوی تێدا کۆبکرێتەوە و میسر لەوشکەساڵیدا دوچاری کەمی ئاو نەبێت. من نەخشەی ئەو بەربەستەم بینی کە خودی تەلارساز پێی نیشان دام و زانیم چیتر هیچ لافاو و هەڵچونێکی ڕوباری نیل هەڕەشەئامێز نابێت، هەروەها چیتر ترسی وشکەساڵی نامێنێت، کۆکردنەوەی ئاو لەو پەنگاوانەدا دەتوانێت ئاوی میسر لەوشکەساڵیدا دابین بکات.

موسا لێی پرسی: باشە، ئەی دوای ئەوە؟ ئایا ئەو بەربەستە دروست کرا؟

پزیشکی فیرعەون وەڵامی دایەوە: بەداخەوە هەرئەوەی پێشەکی بەرنامەی ئامادەکاری سەرەتای دروستی کردنی ئەم بەربەستە فەراهەم کرا، لەناکاو سەر و کەلەی کاهینانەکان بەتۆمارێکەوە دەرکەوت، ئەوانە لەگەڵ کۆمەڵێك سەرباز و بڕیاری نوێی فیرعەونەوە چواردەوری تەلارسازیان گرت و فەرمانیان پێدا بەبڕیاری فەرمانڕەوا دروست کردنی ئەم بەربەستە ڕاوەستێنێت چونکە کاهینەکان لەوباوەڕەدان لەکاتی دروست کردنی ئەم بەربەستە دەست تێوەردان لەکاروباری نیلدا دروست دەبێت، ئەگەر دەست لەکاروباری نیلەوە بدەین، ئەوا نیل لێمان توڕە دەبێت و لەئەنجامیشدا خوداکانیش لێمان توڕە دەبن و دەبێتە هۆی ئەوەی سەرتاسەری میسر لەناکاو وێران ببێت.

"ستی کف"یش لایەنگری کرد و وتی: کاهینەکان ڕاستیان کردووە، بۆچی دەست لەکاروبار و سروشتی نیلەوە بدەین؟

خانەخوێ بەم شێوەیە بۆی ڕونکردنەوە: من و ئەندامانی خێزانەکەم، لەخانویەکدا دەژیاین کە لەخشت دروست کرابوو، تەلارساز دوای ئەوەی فیرعەون فەرمانی پێدا دەست لەدروستکردنی ئەو بەربەستە هەڵگرێت، ناچاربوو دەست لەو کارە هەڵگرێت و منیش لەو کاتەدا داوام لێکرد ئێستا هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساوە کە ماڵێك بۆمن دروست بکات، خۆشبەختانە تەلارساز ڕازی بوو بەوەی خانوویەك بۆمن دروست بکات، بۆیە نەخشەی ماڵەکەی کێشا و خودی خۆشی سەرپەرشتی دروستکردنی ئەو خانووەی لەنزیکەوە لەئەستۆگرت و هەمان ئەو خانوەی بۆ دروستکردم کە تۆ ئێستا تێیدا دانیشتویت. دوانزە ساڵ لەوەوپێش سەرەڕای ئەوەی لەدروستکردنی بەربەستێك بێبەش بوین، بەڵام لەبەرامبەردا خێزانەکەمان بو بە خاوەنی خانویەکی بێوێنە کە لەبەر دروست کراوە.

موسا وتی: ئەمە شکۆمەندترین ماڵە کە لەتەمەنمانها لەدوای کۆشکی فیرعەون چاوم پێی کەوتبێت، دەتوانی ناوی تەلارسازی ئەم ماڵەم پێ بڵێیت.

"ئاتون موسا"وتی: ئەم خانووە تەلارسازێك بەناوی!... پزیشك بۆماوەیەك بێدەنگ بوو...

موسا نەیهێڵا قسەکەی تەواو بکات و وتی: ناوی"نف"ی تەلارساز نەبوو؟

بریسکەیەك لەچاوانی پزیشکەوە دەرپەڕی و وتی: ئەوەی من لەهزرمدا بەدوایدا دەگەڕام و ماوەیەکە شەو و ڕۆژ پێکەوە لەپێناو دروستکردنی ئەم خانووەدا لەتەنیشت یەکترەوە دادەنیشتین، تۆ ناو دەزانی؟ بەڕاستی سەیرە تۆ لەکوێوە توانیت بزانی ناوی ئەو تەلاسازە مەزنە"نف"ە؟

موسا وتی: لەکۆشکی فەرمانڕەوایی میسردا"نف"ی تەلارساز نوسینگەیەکی تایبەتی هەبوو، بەواتا ئێستاش ئەو نوسینگەیەی هەیە. ئەو هەمیشە لەنوسینگەکەیدا سەرقاڵی نەخشەکێشانە، تەلارسازەکانی تر فێری شێوازی کێشانی نەخشەی تەلارسازی دەکات، نەخشە دەکێشێت و بەبەردەوامی کاردەکات، دوای ئەوە بێدەنگ بوو و ڕۆچووە هزری خۆیەوە، موسا ئەوەی هاتەوە یاد

ڕۆژێکیـان لـەکاتی گفتوگـۆکردن لەگـەڵ "نـف"ی تەلارسـازدا ئـەو پێـی وت کە"ئاتون"ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە.

دوای ئـەوە"موسـا"ش لێـی پرسـی: بـەچ شـێوەیەك"ئـاتون"ڕاسـتیەکی حاشاهەڵنەگرە، مەگەر تۆ باوەڕت بە"ئاتون"ە؟

"نـف"ی تەلارسـازیش پێـی دەڵێـت: "ئـاتون"یـەك نـاوە، ئێمـە لـەباتی ڕاسـتی ناوی"ئاتون"مـان لێنـا، لەوانەیە خەڵکانی تـریش نـاوێکی تریـان بۆ هەڵبـژاردبێت، بەڵام گرنگ نیە چ ناوێکی لێ دەنرێت، "ئاتون" ڕاستیە. موسا والێکی دایـەوە کە ماهیەتی ڕاستەقینەی خـودا بریتیـە لـە"ڕاسـتی" و لەبەرئـەوەی تـەنها یـەك ڕاسـتی هەیـە و نابێـت بـەدوو، کەواتـە خـوداش تـاك و تەنهایـە و دوو ڕاسـتی و دوو خـودا بونی دەرەکی نیە، ئیتر نـاوی ئەو خودایە بنێین"ئاتون"یـان هـەرناوێکی تـری لـێ بنـێین. کەواتـە خـودای تـەواوی بونـەوەری ئـەم سـەرزەویە تـەنها یەکێکـە ئەویش"ڕاستیە"

کاتێك"موسا"ی پزیشك ئاگاداری بێدەنگی و ڕۆچونی هزری"موسا"بوو، بۆئەوە بیهێنێتەوە قسەکردن لێی پرسی: پێم ناڵێیت تۆ بۆچی ناوت"موسا"یە، بۆچی تۆ ناوێکی تەواوت نیە و نیوە ناویان لێناویت؟

ئەم پرسیارەی پزیشك بوبە هۆی بچڕانی ڕۆچونی هزری موسا و وتـی: "ئنخـاس ئامون"ی دایکم ئەم نـاوەی لێنـام، لەبەرئـەوە نیـوە نـاوی لێنـاوم بۆئـەوەی لەدواییـدا تـەواوی بکـات، بـەڵام فیرعـەون کـە خـۆی بـەخاوەنی هـەموو شـتێك بگـرە نـاویش دەزانی، بۆیـە ئـەم نیـوە نـاوەی بۆ دەستنیـشان کـردم تـا لەدەواییـدا تـەواوی بکـات، هەرلەبەرئەوەش ناوم بەنیوە و ناتەواوی مایەوە.

ئەم گفتوگۆیە ئاوێکی ساردی بەسەر ئەو دانیشتنەدا ڕشـت، بگـرە خانـەخوێش قسەی نەکرد بۆئەوەی درێژە بەقسەکانیان نەدرێت.

دوای ماوەیـەك"سـتی کـف" وتـی: ئـەی شـازادە لـەم کۆبونەوەیـەدا، هـەموومان متمانەمان بەیەکتری هەیە و دەزانین ئەوەی لەم دانیشتنەدا باسکرا ناڕواتە دەرەوە، سەرەڕای ئەوەش هەندێك گوتەش هەیە باشتر وایە دەرنەبڕێت، بۆیە بەباشی دەزانم هەموو شتێك نەخەینە ڕوو، هیوادارم قسەکانم دڵگرانت نەکات.

کاتێك کۆتایی بەمگفتوگۆیە هات، "موسا"ی پزیشك خۆی هەڵدایە نێوەندی گفتوگۆکەیانەوە و بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و لەموسا پرسی: بەهەرحاڵ گوێمان لەوە بوو کە باست کرد، ئەی نیوە ناوەکەی تر چییە.

موسا وتی: لەبەرئەوەی دایکم سەرکەوتنی لەتەواوکردنی ناوەکەمدا نەهێنا بەباشی دەزانم هەر ئەوەبێت کە هەیە.

"ستپ ئاتون"کە تا ئەو ساتە گوێ لەگوتەکانی هاوسەری و میوانەکان دەگرت، هاتە گۆ و وتی: ئێمەی بەتەمەنەکان تەنها دەربارەی ئەو بابەتانە دەدوێین کە خۆمان حەزمان لێیەتی، لەکاتێکدا دوو کەس لەم کۆڕەدا لاون"موسا"ی میوانی خۆشەویست و کچەکەم"مریت ئاتون"یش لەم کۆڕەدا بەشدارن، با ڕێیان پێبدین ئەوانیش تێڕوانین و هەڵسەنگاندنەکانی خۆیان بخەنە ڕوو، بۆئەوەی ئێمەش باشتر ئاشنای تێڕوانین و شێوازی بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنەکانیان بین.

هاوسەری"ئاتون موسا"ڕوی کردە کوڕی لاو و وتی: ئەمشەو تریفەی مانگە، مانگ بەهەموو جوانیەکیەوە لەکێو و ڕوبارەوە هەڵدێت. "مریت ئاتون"ی کچیشم دەبێتە ڕێبەرت بۆئەوەی ئاشنای خانو و باخێك بیت کە"نف"ی تەلارساز بۆی دروست کردوین. هەروەها بۆئەوەی دیمەنی دڵڕفێن و لەیادنەچوی دەورووبەرمان لەژێر تریفەی مانگدا تەماشا بکەیت و لەهزری خۆتدا بەجوانی وێنەی بکێشیت.

"موسا"ش بەدەم سوپاسکردنەوە هەستایە سەرپێ و لەگەڵ"مریت ئاتون"ی کچی خانەخوێدا بۆ بینینی خانو و باخ ڕۆشتنە دەرەوە.

# کاتێك دوو نامۆ بەیەکتر ئاشنا دەبن

"مریت ئاتون"ی لاو"موسا"ی برد بۆ ناو باخ، گەشتە لای پلیکانەکە و موسا بردە بەشی خوارەوەی پلیکانەکە و وتی: لەم شوێنەوە هەروەك چۆن بەچاوی خۆت دەبینی ڕوباری نیل ئاشکرا و دیارە.

موسا لێی پرسی: بۆچی لێرەدا پلیکانەیان دروست کردووە؟

"مریت ئاتون"وتی: ئێستا تێدەگەیت، لەبەرئەوەی دەمەوێت لەم ڕێگایەوە بتبەمە شوێنێك کەبەلاتەوە زۆر سەیر بێت.

لەناکاو دیمەنی پەرستگایەکی پایەبەردینی ڕەش سەرنجی موسای بەلای خۆیدا ڕاکیشا و وتی: خۆ ئەوە پەرستگایە.

مریت ئاتون وتی: حەز دەکەیت بڕۆینە ناو ئەو پەرستگایەوە؟

موسا سەری بەهێمای بەڵێ ڕاوەشاند، دوای ئەوە پێکەوە ڕۆشتنە ناو پەرستگاکەوە. موسا تێگەشت کە پایەکانی پەرستگا هەمویان بەبەردی ڕەش دروست کراون، بەڵام زەوی ئەو پەرستگایە بەردی سپی تێدا بەکار هێنراوە و بنمیچەکەشی بونی دەرەکی نیە! بنمیچی پەرستگا وەکو ئاسمان درەوشاوە بوو کە مانگ لەناویدا خۆی دەنواند.

موسا لێی پرسی: بۆچی ئەم پەرستگایە بنمیچی نیە؟

"مریت ئاتون"وتی: ئەم پەرستگایەیان دەقاودەق وەك پەرستگاکانی ڕابردوو دروست کردووە، لەو سەردەمانەدا پەرستگاکانی میسر بەوشێوەیە بنمیچیان نەبوو.

موسا لێی پرسی: تۆ کە ناوت"مریت ئاتون"ە، ئایا تۆش خودا کۆنەکان دەپەرستی؟

"مریـت ئـاتون" کـه تـاو کاتـه لـه"موسـا"ڕانـەمابوو لەوکاتـەدا تەماشـایەکی سەرتاپای کرد و بۆماوەیەکیش بەوشێوەیە تەماشای کرد دوای ئەوە وتی: دودڵم لەوەی کە دەمەوێت پێتی بڵێم!

موسا لێی پرسی: بۆچی دودڵی؟وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە.

مریــت ئــاتون وتــی: تــۆ کەســێکی ئاســایی نیــت، لەبەرئــەوەی لەکۆشــکی فەرمانڕەواییەوە لەگەڵ هێزێکی سەربازی میسردا هاتویت بۆ ئێرە، بەڕوکەش وا دێتە بەرچاو کە تۆ شازادەی فیرعەونیت، سەرەڕای ئەوەی من تائێستا چاوەم بەشازادەیەك نەکەوتووە.

موسا پرسی: هەرئەوەش هۆکاری دودڵی تۆیە؟

مریت ئاتون وتی: بەڵێ.

موسا لەنێو پەرستگایەکی بێ بنمیچدا تەماشایەکی ئاسمانی کرد، ئاسمان سایەقەبوو و مانگیش بەپێی پێویست پەرستگای ڕوناك کردبویەوە. لەوکاتەدا موسا نۆقمی بیر و ئەندێشەکانی خۆی بوو، کاتێك"مریت ئاتون"ی ڕێبەری بانگی کرد ڕاوەشا و هاتەوە سەرخۆی.

مریــت ئــاتون پێــی وت: پــێش ئــەوەی پێکــەوە بڕۆینــە شــوێنەکانی تــرەوە بەئەنقەست تۆم هێنایە ناو ئەم پەرستگایەوە بۆئەوەی جوانترین شوێنت پێی نیشان بدەم، ئەم پەرستگایە بەپێی سەلیقە و داخوازیەکانی دایکم دروست کراوە. دایکم ژنێکی ئاینداره و حەزی دەکرد بۆ پەرستن پەرستگایەکی لێوە نزیك بێت بۆئەوەی نوێژی تێدا بکات.

موسا لێی پرسی: دایکت باوەڕی بەچ ئاینێکە کە ئەم پەرستگایەی بەم شێوەیە دروست کردووە.

مریـت ئـاتون وتـی: بیروبـاوەڕی دایکـم وەك ئەوانـەی ڕابـردووە و زۆر جیـاوازە لەبیروباوەڕی خەڵکی ئەم سەردەمە. ئێمە بیستومانە کە خوداکانی ئێوە لە میسری خوارو و ناوچەی"دەلتا"خوداکـانی ئێمـەیان شکست پێهێنـاوە، بـەڵام ئێمـە لـەم ناوچەیەدا نەمانهێڵا خوداکانمان کە لەناوچەکانی ئێوەدا شکستیان خواردووە، دەربکـرێن، بۆیـە ئێمـە هـەمان ئـەو خـودا شکـست خواردوانـەمان پاراسـتووە،

**لەبەرئەوەی دەمانزانی ئەم خودایانە جگە لەمیسری سەرو هێچ شوێنێکی تریان نیە بۆی بڕۆن. خوداکانی ئێمە لەبەرامبەر خوداکانی ئێوەدا شکستیان خوارد، ئەوە کارێکی ڕون و ئاشکرایە، بەلام هەمان ئەم خودا شکست خواردوانە خزمەتێکی زۆریان بەمیسر گەیاندووە و بونە هۆی سەرکەوتنی بەرەکەت و شانازی میسریەکان، هەر لەبەرئەوەش دەبێت بەرگریان لێ بکرێت.**

**موسا وتی: دایکت کە داوای کردووە ئەم پەرستگایەی بۆ دروست بکەن، بەدڵنیاییەوە بەڵگەیەکی بۆ بێ بنمیچی ئەم پەرستگایە هەبووە. وانیە؟**

**مریت ئاتون وتی: تەنها لاسایی کردنەوەی پەرستگا کۆنەکانە.**

**موسا لێی پرسی: تۆش وەکوو دایکت خودا کۆنەکان دەپەرستی؟**

**مریت ئاتون وتی: بەڵێ، منیش وەکوو دایك و باوکم خودا کۆنەکان دەپەرستم...**

**دوای ئەوەی مریت ئاتون بەردەوامی بەگوتارەکانی خۆی دا و وتی: هێزەکانی فیرعەون هاتن بۆ میسری سەرو و کوشت و کوشتاریان خستە نێو ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخوداکانی کۆن بووە، بەلایەنی کەم پێت بنایە بەهەرشوێنێکی ئەم زەویەدا پێت لەخوێنی خەڵکیەوە دەگەوزا، ژن، پیاو، منداڵ هەموویانیان بەشمشێر لەت و پەت کردبوو، بەشێوەیەك کاتێك سەربازەکان ئەو ناوچانەیان بەجێ هێشت ئەو ناوچەیە بێ دانیشتوان مایەوە و چوڵ بوو. کەواتە پێش هێرشی فیرعەون بۆ سەر ئەوانەی لەمیسر سەرو بەدرێژایی ڕوباری نیل خودا کۆنەکانیان دەپەرست کە سەدان گوند و ئاوایی و جوتیارانی چالاکی تێدا دەژیا، بەلام سەربازەکان گوندەکانیان وێران کرد و خەڵکەکانیان کوشتن و بەرهەمەکانیان بەتالانی بردن، ماڵەکان وێران بون و کێڵگەکان وشك بون و ئەو ناوچە دوورودرێژە گۆڕا بە بیابانێکی وشك. سەیر لەوەدایە دژمنایەتی فیرعەون لەبەرامبەر ئەم جۆرە خەڵکانەدا دژمنایەتیەکی بێ بنەما و کوێرانە بوو، بۆچی؟ لەبەرئەوەی بەلایەنی کەم دەیتوانی سود لەهێزی لاوەکانیان بۆ کارگەلێکی زۆر وەرگرێت بەتایبەت بۆ گواستنەوەی بەرد کە حەزی لەبنیات نانی کۆشکە بەردینەکان بوو. بەلام ئەمەشی لەبەرچاو نەگرت، بەڕاستی هزرێکی کوێری هەبوو و ئەوانیشی کوشت. ئێستا ئەی موسا تۆش لێم دەپرسی باوەڕم بەچ خودایەکە. من نەمدەویست بزانم تۆ باوەڕت**

بەچ خودایەکە، دەتەوێت بیانویەك بۆخۆت بدۆزیتەوە و بەناونیشانی کوڕی فیرعەون بمکوژیت.

موسا وتی: نەخێر وانیە، نەمدەویست بزانم تۆ چ بیروباوەڕێکت هەیە، هەروەها نەمدەویست لەڕێی ئەم پرسیارەمەوە هەندێك بەڵگەت لیّ بەدەست بهێنم. بەهیچ شێوەیەك وان نەبووە.

"مریت ئاتون"تەماشایەکی"موسا"ی کرد دوای ئەوە ڕوی لیّ وەرگێڕا.

موسا لێی پرسی: "مریت ئاتون"ئایا تۆ ڕقت لەمنە؟

مریت ئاتون وتی: بۆچی ڕقم لێت بێت، تۆ میوانی ئێمەیت و تائەوکاتەی میوانمان بیت بەڕێز و خۆشەویستیەوە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەین، بەڵام ئەوەش بزانە تائێستا ئەم جۆرە گفتوگۆیانەم لەگەڵ هیچ میوانێکدا نەکردووە، تۆ تاکە میوانێکیت کە لەگەڵ مندا تەنها بێتەدەرەوە و وەك کەسێکی نهێنی پارێز و خۆمانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. کاتێك تۆ گفتوگۆت لەگەڵ باوکمدا دەکرد وتت فیرعەون لەگەڵ تۆ و دایکتدا میهرەبان نەبوو و ئەوەش تاکە پاڵنەرێکە کەوای لەمن کرد ئەم جۆرە گفتوگۆیانەت لەگەڵدا بکەم و هۆکارەکەی بزانم. هەمان ئەم دژمنایەتیەی فیرعەون لەگەڵ دایکتدا ئەو بوێریەی بەمن بەخشی بەوشێوەیە لەگەڵ تۆدا دەربارەی هەندێك بابەتی تایبەت و دەرونی بدوێم.

موسا وتی: کەواتە بۆچی ناوی خوداکەی خۆتت لیّ شاردەوە و بەم بۆنەیەوە پەیڕەوی چ جۆر خودایەك دەکەیت؟

مریت ئاتون وەڵامی دایەوە: فیرعەون لەگەڵ دایکتدا ژیانی هاوسەری پێکهێنا و تۆش بەرهەمی ئەو ژیانی هاوسەریەتیەی و خوێنی فیرعەون لەخوێنبەرەکانتدا هاتوچۆ دەکات. بەڵام لەبەرئەوەی دەزانم فیرعەون چ تێڕوانینێکی لەبەرامبەر خوداکاندا هەیە، بۆیە ناچاربوم ناوی خوداکەمت پیّ نەڵێم، باوکت تەواوی خەڵکی ئەو ناوچەیەی کوشت. لەوانەیە ڕۆژێك بێت تۆش هەمان کار بکەیت.

موسا وتی: ڕاستیەکەی ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی من بەشازادە بانگ دەکەن، بەڵام کوڕی فیرعەون نیم!

مریت ئاتون وتی: تۆ کوڕی فیرعەون نیت؟

موسا بەسەری وەڵامی نەخێری دایەوە.

ئەمجارەیان"مریت ئاتون"بەشێوەیەکی تر هەمان پرسیاری لێکردەوە و وتی: مەگەر باوکت ژیانی هاوسەری لەگەڵ دایکتدا پێك نەهێناوە؟

موسا وتی: با، ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێکهێناوە!

مریت ئاتون وتی: کەواتە خوێنی فیرعەون لەخوێنبەرەکانتدا لەحاڵی خۆراشاندایە، وانیە.

موسا وتی: نەخێر، لەبەرئەوەی من کوڕی فیرعەون نیم!

مریت ئاتون وتی: ئەمڕۆ بەگوێکانی خۆم بیستم"ستی کف"فەرماندەی هێزی سەربازی وتی تۆ کوڕی فیرعەونیت.

موسا بۆی ڕونکردەوە: دڵنیابە لەوەی کە من کوڕی فیرعەون نیم، ئەمڕۆ زۆرباش دەتوانم پەی بەوە ببەم کە فیرعەون پێش ئەوەی بزانێت دایکم"ئاتون"پەرستە خۆشی ویستووە، دوای ئەوەی ئاگاداری ئەوە بوو کە دایکم ئاتون پەرستە کوشتی، بەڕاستی دایکم ئاتون پەرست بوو و دەیویست لەهەلێکی گونجاودا ناوی"ئاتون موسا"م لێ بنێت، بەڵام فیرعەون ڕێی پێ نەدا... "مریت ئاتون"لەوکاتەدا زۆر بەتێڕامانەوە گوێی لێگرتبوو و"موسا"ش بەردەوامی دا بەقسەکانی: لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا کاهینی مەزن کە ناوی"ئامون تپ"بوو ئەویش بەهەمان شێوە"ئاتون"پەرست بوو. کاهینی مەزن دەسەڵات و کاریگەریەکی تەواوی بەسەر کاهینەکانی تری کۆشکدا هەبوو، تا ئەوکاتەی پەییان بەوە برد کە ئەو"ئاتون"پەرستە و دوای ئەوەی فیرعەونیان بەگوزارشتێك لێ ئاگادار کردەوە، ئەویش درێخی نەکرد و سەری بڕاوی لەناو سەبەتیەکدا بۆ ناردم، بۆئەوەی تێمگەیەنێت هەرکەسێك"ئاتون"پەرست بێت ئەوە سزاکەیەتی.

دوای ئەوەی موسا دوپاتی کردەوە: تۆ وات دەزانی بۆئەوە هاتوم تا سیخوڕی بەسەر ئێوەدا بکەم! بەڵام ئێستا دڵنیابە لەوەی کە ئەوە تۆیت گیانی منی لەدەستدایە نەك من.

مریت ئاتون لێی پرسی: بەچ شێوەیەك من گیانی تۆم لەدەستدایە.

موسا وتی: ئەگەر تۆ بە"ستی کف"بڵێیت موسا"ئاتون"پەرستە و ئەوەی لەبارەی دایك و باوکم بۆم گێڕایتەوە کە زۆر نهێنی ئامێزە، ئەوی لێئاگادار بکەیتەوە، هەروەها ئەوەشی بۆ بگێڕیتەوە کە بڕیاربوو ناوی"ئاتون موسا"لەخۆم بنێم، دوای ئەوە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی فیرعەوندا دانیشم، بەدڵنیاییەوە"ستی کف"یەکسەر فەرمانی دەستگیرکردنم بۆ دەردەکات و ڕوانەی فیرعەونم دەکات، بۆئەوەی ئەو سزایەی پێی نیشان دام بەسەر منیشدا کرداری بکات.

مریت ئاتون لێی پرسی: ئەی موسا خۆت دەتزانی ئاشکراکردنی ئەم جۆرە نهێنیانە چ کێشمەکێشێك لەدوای خۆیانە دەهێنن، بۆچی منی لیّ ئاگادار دەکەیتەوە؟

موسا وتی: هەرئەوەی ئەمڕۆ چاوم بەتۆ کەوت هەستم بەوەکرد لەنێو ئەو هەموو کەسانەی تائەمڕۆ چاوم پێیان کەوتووە و مامەڵەم لەگەڵدا کردون، تۆ تەنها کەسێکیت کە دەتوانم متمانەی پیّ بکەم و دڵنیاشم لەوەی بۆ هیچ کەسێکی ناگێڕیتەوە.

مریت ئاتون بێدەنگ بوو.

"موسا"ش کەمێك لێی دور کەوتەوە و پێی وت: کەواتە بەبینینت جۆرێك هەستی نامۆ لەمندا وروژا، هەستێك کە زۆر خۆشحاڵی کردم.

مریت ئاتون وتی: لەوەیکە بومە هۆی ئەوەی نهێنیەکانی خۆتم بۆ بگێڕیتەوە داوای لێبوردنت لێدەکەم، بەڵام بە بینینت زۆر خۆشحاڵ بوم.

موسا وتی: ئەوە هەمان ئەو ڕستیە بوو کە دەمویست بیڵێم بەڵام بەنیوە چڵی هێڵامەوە.

مریت ئاتون وتی: ئێستاش کاتی ئەوەیە لەم پرستگایە بڕۆینە دەرەوە...

ئەو دوانە چونە سەر ترۆپکی بەرزاییەك کە ڕوباری نیل لەبەردەمیاندا خرۆشان ڕێگای خۆی گرتبووە بەر.

موسا تەماشایەکی"مریت ئاتون"ی کرد و وتی: لەو ساتەوەی تۆم لەو ژوورەدا بینی و باوکت تۆی پێناساندم، هەست دەکەم لەوساتە بەدەواوە هێزێک من بەئاڕاستەی تۆدا پەلکێش دەکات، حەز دەکەم جارێکی تر چاوم پێت بکەوێت.

مریت ئاتون وتی: ئەی موسا منیش هەمان هەستی تۆم هەیە، بەڕاستی هەستێکی هابەشی سەیر لەنێوانماندا هەیە.

موسا لێی پرسی: بۆچی سەیرە؟

مریت ئاتون وتی: سەردەمانێك چیرۆکێکیان بۆ گێڕامەوە، بیستم ڕۆژێکیان کوڕ و کچێك لەشوێنێکدا چاویان بەیەکتری دەکەوێت، ئەو دوانە بێئەوەی پێشوەخت ئاشنایەتیان لەگەڵ یەکتردا هەبێت ئاشقی یەکتری دەبن، من وەك ئەفسانەیەك گوێم لەم چیرۆکە دەگرت و هەرگیز لەوباوەڕەدا نەبوم دوو کەس بێئەوەی چەندجارێك چاوپێکەوتن لەگەڵ یەکتردا بکەن بتوانن بەوشێوەیە شەیدای یەکتری بن، بەڵام هەمان ئەو ئەفسانەیە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بەسەرخۆمدا ڕودەدات، بەڕاستی من خوازیاری تۆم. هەڵبەت بابەتێکی تریش هەیە، دایك و باوکیشم پێشتر یەکتریان نەبینیبوو، بەڵام دوای ئەوە ئاشقی یەکتری دەبن و زۆریش خۆشحاڵن، نازانم ئایا دایك و باوکم دەتوانن پەی بەوە ببەن کە چ هەستێك بەسەر من و تۆدا زاڵ بووە؟

موسا وتی: تۆ ڕاست دەکەیت ئەوان بێئاگان لەوهەستەی بەسەر من و تۆدا زاڵ بووە، بەڵام دەمەوێت بڵێم وەك بڵێی ساڵهایە تۆ دەناسم...

"مریت ئاتون"یش هەمان ڕستەی دوبارە کردەوە.

لەناکاو موسا بەترسەوە خۆی کێشایە دواوە و وتی: پێم بڵێ ئایا تۆ دەستگیرانی هیچ کەسێك نیت؟

مریت ئاتون وتی: نەخێر، بۆچی ئەم پرسیارەم لێ دەکەیت؟مەگەر نازانی لەسەرتاپای میسردا هیچ خێزانێك ئامادە نیە پەیوەندی خێزانی لەگەڵ "موسا ئاتون"ی پزیشك لەبەرهەمان زاراوەی"ئاتون"بەرقەرار بکات، هەرکەسێك ناوی"ئاتون"ببیستێت هەڵدێت چ بگات بەوەی کەسی خوازبێن کچی خێزانێکی"ئاتون"ی بێت!

موسا وتی: بەڵام من ئەو ناوەم خۆش دەوێت، بەلای منەوە باشترین ناو هاوشێوەی ناوی"ئاتون"ە.

مریت ئاتون لێی دەپرسێت: ئەی موسا کەسوکارەکەت ناڕازی نابن لەوەی پەیوەندی خێزانی لەگەڵ کچێکی"ئاتون"یدا پێك بهێنیت؟

موسا وتی: کەسوکارم لەژیاندا نین تا نەڕەزایی خۆیان لەمبارەیەوە دەربڕن، نە دایکم زیندووە و نە باوکم، لەبەرئەوەش هیچ ڕێگریەك لەبەردەم پێك هێنانی ژیانی هاوسەری من لەگەڵ تۆدا بەدی ناکرێت.

دوای ئەوە لە"مریت ئاتون"ی پرسی: ئایا ئامادەیت ژیانی هاوسەری لەگەڵ مندا پێك بهێنیت؟

مریت ئاتون سەری دانەواند و زەردەخەنەیەکی کرد.

موسا وتی: کەواتە لەم ساتە بەدواوە من و تۆ دەستگیرانی یەکترین، هەڵبەت بەمەرجێك دایك و باوکت ڕازی بن.

مریت ئاتون وتی: باوکم منی زۆر خۆشدەوێت و هەمیشە هەوڵ دەدات خۆشحاڵم بکات، بێگومان ئەویش بەم پەیوەندیەمان ڕازی دەبێت، چونکە بەپیاوێکی چاك هاتیتە بەرچاوم.

موسا وتی: ئەی"مریت"من پیاوێکی چاك نیم.

مریت ئاتون وتی: هیچ پیاوێك ناتوانێت پەی بەوە ببات کە ئایا پیاوێکی چاکە یان خراپ، بەڵکو ئەوە کەسانی ترن کە ڕەفتارەکانی هەڵدەسەنگێنن و پەی بەوە دەبەن کە مرۆڤێکی چاکە یان خراپ.

موسا لێی پرسی: ئایا کاتێك خۆم کرد بەماڵی ئێوەدا پەیت بەوە برد کە من پیاوێکی چاکم یان خراپ؟

مریت ئاتون وتی: بەڵێ.

موسا وتی: ئەی کەواتە بۆچی لەمن بەگومان بویت؟

مریت ئاتون وتی: لەبەرئەوەی ئەم دیدار و هەستە دوور شتی چاوەڕوان نەکراو و کوتوپڕ بوو، بۆیە کەمێك تێکی دابوم، وەك هەورە گرمە، وەك هەڵهاتنی خۆر، کاتێك کوڕی فیرعەونم لەماڵی خۆماندا بینی، هەموو ئەو کارەساتانەی بۆم باسکردی

هاتنەوە یادم، بەڵام کاتێك خۆتم بینی هەستێکی باش لەمندا دروست بوو، بەڵام نادیار و پرسیار وروژێن بوو کە بۆچی هاتووە بۆ ماڵی ئێمە؟ هەرکەسێکی تر لەباتی من بوایە هەمان تێڕوانینی لا دروست دەبوو، دوژمنایەتی فیرعەون لەگەڵ"ئاتون"پەرستەکاندا گەشتووەتە ڕادەیەك بگرە چوونی کوڕەکەی بۆ هەرشوێنێك ترس دروست دەکات... دوای ئەوە مریت ئاتون وتی: ناتەوێت باسی سەردەمی منداڵی خۆتم بۆ بکەیت؟ باسی"ئنخاس ئامون"ی دایکتم بۆ بکە.

موسا وتی: من تاکە ئیشق و هیوای دایکم بوم، کاتێك وردە وردە گەورە بوم و خۆمم ناسی"ئامون تپ"کاهینی مەزنم ناسی و زۆر پێیەوە پەیوەست بوم، ئەویش لەکانگای دڵیەوە منی خۆشدەویست، ڕۆژێکیان لەگەڵ تەلارسازی ماڵەکەی ئێوەدا"نف" لەکەنارە جوانەکەی ڕوباری نیلدا پیاسەمان دەکرد، کاتێك گەشتینە شوێنێکی دیاری کراو"نف"ی تەلارساز ڕاوەستا و نهێنیەکی زۆر مەزنی بۆ گێڕامەوە. دوای ئەوە لەشوێنێکدا لەگەڵ کوڕێکی فیرعەوندا بەشەڕ هاتم و بەدارێك شمشێرەکەم لێسەند! و دەستێکیم شکاند، فیرعەون بەم ڕەفتارەم زۆر تورە بوو و منی بەناوی فەرماندەی گالیسکەوانان، کە لەڕاستیدا بەناونیشان دورخستنەوەم لەکۆشك، ناردمی بۆ ئێرە و چیتر ڕێم پێنادرێت بگەڕێمەوە بۆ پایتەخت.

"مریت ئاتون"تەماشای ئاسمانی کرد و دەستی بۆمانگ ڕاکێشا و وتی: ئێستا کات گەشتووەتە نیوە شەو و چەند کاتژمێرێکی تر ڕۆژ دەبێتەوە، ئێستا چی بکەین؟

موسا وتی: تۆ بڵێ چی بکەین؟

مریت وتی: تۆ بڕۆ لەبارەی منەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکە.

موسا لێی پرسی: دەبێت سەرەتا دڵنیابم لەوەی ئایا بەڕاستی منت دەوێت، بۆئەوەی لەلای باوکت داوای دەستی تۆی لێبکەم؟

مریت ئاتون وتی: بەڵێ دڵم گەواهی ئەوەم بۆ دەدات کە تۆم دەوێت و لەتۆ باشتریشم دەست ناکەوێت.

موسا لێی پرسی: بەبۆچونی تۆ چ کاتێك دەتوانم لەبارەی تۆوە لەگەڵ باوکتدا گفتوگۆ بکەم؟

مریت ئاتون وتی: هەرئێستا.

موسا پرسی: مەگەر تا ئێستا نەخەوتووە؟

مریت ئاتون وتی: تا من نەگەڕێمەوە بۆلایان ناخەون، سەرەڕای ئەوەش باوکم لەگەڵ"ستی کف"دا ئەوەندە قسەی هەیە لەگەڵیدا بیکات کە بەم زوانە ماوەی ئەوەی نابێت بخەوێت، گەرچی ئەودوانە لەڕوی دەرونیەوە لەگەڵ یەکدا زۆر جیاواز و دژ بەیەکن، بەڵام لەهەندێك بابەتەدا ماوەیەکی زۆر درێژە دەکێشێت.

موسا پرسی: دوو کەس کە لەڕوی دەرونیەوە دژی یەکتر بن، بەچ شێوەیەك دەتوانن ئەو هەموو ماوەیە لەگەڵ یەکتردا بدوێن؟ ئەوە بەلاتەوە سەیر نیە؟

مریت ئاتون وتی: باوکم لەڕوی دەرونیەوە کەسێکی نەرمونیانە، ئەم نەرم و نیانیە لەپیشەی پزیشکیەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام"ستی کف"کەسێکی زبر و بێبەزەییە کە تائێستا سەدان کەسی بەدەستی خۆی کوشتووە بێئەوەی بەداخ بێت لەبەرامبەر ئەو ڕەفتارەی لەبەرامبەر مرۆڤدا دەینوێنێت، بەڵکو تاوانکردن بەبەشێك لەشانازیەکانی لەقەڵەم دەدرێت! مریت ئاتون دوای ئەوە وتی: بەڵام باوکم بەڕادەیەك بەبەزەیی و میهرەبانە کاتێك لەشوێنێکەوە تێدەپەڕێت جوان لەدەوروبەری خۆی ورد دەبێتەوە بۆئەوەی نەوەکوو مرۆچەیەك لەکاتی کێشانی خۆراکەکەیدا بشێلێت.

دوای ئەوە لەناکاو بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: خۆزگە بتتوانیایە لێرە بمێنیتەوە!

موسا وتی: سبەی لێرە دەڕۆم، بەڵام بەڵێنت پێدەدەم دەگەڕێمەوە و بگرە سوریشم لەسەر ئەوەی بگەڕێمەوە..... دوای ئەوە موسا ئەنگوستیلەیەکی لەپەنجەی خۆیدا دەرهێنا و وتی: مریت!ئەم ئەنگوستیلەیە بەلامەوە زۆر بەهادارە، بگرە بەلای منەوە بەهادارترین شتە، چونکە ساڵانێکە لەپەنجەی دایکمدا بووە و ئێستاش بەناونیشانی ئەنگوستیلەی دەستگیرانداری پێشکەشی تۆی دەکەم، بۆئەوەی بیکەیتە پەنجەتەوە.

مریت ئەنگوستیلەکەی ماچ کرد و وتی: سوپاست دەکەم، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە قسە لەگەڵ باوکمدا بکەیت... مریت کەوتە ڕێ و"موسا"ش ویستی لەگەڵ

ئەودا بڕوات، بەڵام"مریت"ڕێی پێنەدا و بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: باشتروایە بەتەنهایی بمبینن و تۆش بەتەنهایی بڕۆ. موسا چەند ساتێك دوای ئەوەی"مریت"کەوتە ڕێ، ئەویش ڕێگای ماڵی"ئاتون موسا"ی گرتەبەر، کاتێك لەماڵی"موسا"ی پزیشك نزیك بویەوە، دەنگی گفتوگۆی لەناو ماڵەکەدا بیست، "ستی کف" و "ئاتون موسا"ی پزیشك سەرقاڵی گفتوگۆ بون و دەنگیشیان زۆر ڕون و ئاشکرابوو، موسا لەهەمان ئەو شوێنەدا ڕاوەستا تا کۆتایی بەو گفتوگۆیە نەیەت، خۆی نەکات بەژوردا...

ستی کف دەیوت: ناتوانم لەبارەی شتێك بدوێم کە ئەزمونم تێیدا نەبێت، بەڵام ئەگەر لێم بپرسی چەند چەرخ لەژێر گالیسکەدایە و قەبارەیان چەنێکە، دەتوانم بۆماوەیەکی دورودرێژ لەبارەیەوە بدوێم، بەڵام ئەگەر سادەترین پرسیاری پزیشکیم لێ بکەیت، بێدەنگ دەبم.

ئاتون موسا وتی: زۆرجار ئارەزوی ئەوەم دەکرد تۆ پزیشك بویتایە، دۆستێکی کۆن و پزیشکێکی دودڵ!

ستی کف لێی پرسی: لەچ ڕویەکەوە ئەم ئارەزوەت بۆ خواستم؟

موسای پزیشك وتی: چونکە ئەو وردبینی و دودڵیەی هەتە بەکەڵکی پزیشکی دێت و دەبویتە یەکێك لەگرنگترین پزیشکەکان، منیش پشتگیری بیروبۆچونەکانتم دەکرد، هەروەها لەڕوی زانستی پزیشکیەوە پێشتر شکستت دەهێنا و لەخەو و خەیاڵدا نەدەمایتەوە.

ستی کف وتی: مەبەستت لەخەو و خەیاڵ چیە؟

ئاتون موسا وتی: مەبەستم ئەوەیە ئەوەندە دەورو و خولی ئەفسانەکانت نەدەدا، بەڵکو لەباتی ئەفسانە پەیت بەڕاستیەکان دەبرد و بەئاڕاستەی گەشە و پێگەشتن هەنگاوت دەنا، باوەڕهێنان بە ئەفسانەکان مرۆڤ بەرەو گەندەڵی و لەناوچون دەبات،

ستی کف وتی: پێم بڵێی بەچ شێوەیەك بیروبۆچونێك دەتوانێت مرۆڤێك لەناو ببات؟

"موسا"ی پزیشك وتی: نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە بۆئەوەی ئەم بابەتەت باشتر بۆ ڕون ببێتەوە، ئەم نمونەیە گریمانە نیە، بەڵکو ئەزمونی خودی خۆمە لەبارەی

پەیوەندی من لەگەڵ باوکمدا. باوکم و باپیرەم سەرقاڵی پیشەی پزیشکی بون، هەڵبەت ناتوانم بەتەواوی دیاری بکەم مێژوی وانەی زانستی پزیشکی لەمیسردا لەچ کاتێکەوە دەست پێدەکات، بەڵام دەزانم کە میسر یەکەمین وڵاتە زانیستی پزیشکی تێدا خوێنراوە، لەوانەیە ئەم دێرینیەی بگەڕێتەوە بۆ سێ تا چوار هەزار ساڵ لەوەوپێش، بەداخەوە ئەم سەرەتایە کەمێك ئاوێتەی ئەفسانە بووە، بۆنمونە دەیانوت ئەو دەنگەی کە لەسنگمانەوە دەردەچێت دەنگی "ئامون"ە! بەڵام هیچ کەسێك هەوڵی ئەوەی نەدا پەی بەوە ببات کە دەنگی ئێمە لەسینەی "ئامون"ەوە دەرناچێت، بەڵکو لەقوڕگ و دەزگای دەنگی خۆمانەوە سەرچاوە دەگرێت، دڵی ناو سینەمان بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بە دەنگ و دروستکردنی دەنگەوە نیە. بیهێنەرە بەرچاو خۆت ئەگەر بەدرێژایی ئەم چەند هەزار ساڵە هەربەوشێوەیە ئەفسانە ئاوێتەی زانستی پزیشکی نەبوایە و پزیشکەکانمان بەشێوەیەکی لۆژیکیانە لێکۆڵینەوەیان لەدڵ بکردایە لەئێستادا چ خزمەتێکی مەزنی بەمرۆڤ گەیاندبوو. ئەوکات ئەمڕۆ من کە پزیشکم ئاگاداری ئەوە دەبووم دڵ بۆچی و لەبەرچی لەناکاو دەوەستێت و مرۆڤ بۆچی دەمرێت، بەدڵنیاییەوە هۆکارەکەیم دەزانی و نەمدەهێشت کەسی نەخۆش بمرێت. بەدرێژایی ئەو ماوە کورتەی کە لێکۆڵینەوەم لەسەر دڵ کردووە، دەتوانم بەبیستنی ترپەی دڵی خەڵکی پەی بەهەندێك لەهۆکاری نەخۆشیەکانیان ببەم.

ستی کف وتی: لەبیرمە جارێکیان گوێت بەسینەمەوە چەسپاند، دوای ئەوەی چەند ڕاسپاردەیەکت لەبارەی دڵمەوە پێدام.

"ئاتون موسا" وتی: سڵاو لەفەرماندەی خۆشویست، لەبیرتە پێم وتی خۆت لەتوڕەیی و ماندویەتی و وروژانەکان دور پەرێز بکرە.

ستی کف وتی: من سەربازم و تەواوی ئەم بابەتە قەدەغەکراوانە بەشێکە لەبونایەتی هەموو سەربازێك، بێ ئەمانە سەربازەکان ناجوڵێن و گوێڕایەڵی فەرمانەکان نابن. جەنگ بەواتای وروژان و توڕەیی و جوڵە و بزاوت دێت.

"ئـاتون موسـا"وتـی: تـەواوی ئـەو شـتانەی بـۆم باسـکردی ئـیتر بەشـێك بێـت لەپیـشەی سـەربازی یـان نـە، زانـستی پزیـشکی دەڵێـت ئـەم جـۆرە شـتانە زیانـت پێدەگەیەنێت، لەگۆڕەپانی جەنگدا ورووژان لەناوت دەبات.

سـتی کـف وتـی: ئـەی سـەروەری پایەبـەرز، دەزانم، سـەرەڕای ئەمانـەش نـاتوانم دەست لەجەنگ هەڵگرم، من هەر لەسەرتاوە خۆم بۆ لەناوچون ئامادەکردووە، بگـرە گۆڕەکەشم کڕیـوە بۆئـەوەی کاتێك مـردم مۆمیـام بکـەن، بگـرە وەسـتای مۆمیاکەشـم دەستنیـشان کـردووە... دوای ئـەوە پرسـیارێکی کـرد: ئایـا وەك پزیـشکێك ژیـانی دوای مەرگ بەچ شێوەیەك لێك دەدەنەوە؟ ئایا دوای ئـەوەی مـردین زینـدوو دەبـین و دوبارە هەڵگری هەمان ئەم خواستانە دەبینەوە؟

دوای بیـستنی ئـەم پرسـیارە موسـا وردبویـەوە بۆئـەوەی بزانێـت وەڵام"ئـاتون موسـا"چـیە، "ئـاتون موسـا"ش بـەم شـێوەیە وەڵامـی دایـەوە: ئـەوە یەکێکـە لەنادیاریەکان، لەڕاستیدا وەڵامی ئەم پرسیارەم بەدەست نـەهێناوە و بـەردەوامیش هـەوڵی بەدەسـت هێنـانی دەدەم بۆئـەوەی بـزانم، ئـەوەی دەبێـت بیـزانم ئەوەیـە کـە دەبێـت هـەوڵی پاراسـتنی تەندروسـتی و بـەردەوامی ژیـان بـدەم. هـەروەها هـەوڵی ئـەوەش دەدەم خـەڵکی لـەو دەرد و ئـازارەی پێیـەوە دەنـاڵێنن ڕزگـار بکـەم، ئـەو پرسیارەی لێت کردم لەڕاستیدا لەڕیزی ئەو جۆرە پرسیارانەیە کە لەسـەروی توانـا و دەسـتەڵاتی ئێمەیـە و خۆشـت ئامـاژەت بـەوەدا کـە لـەدەرەوەی سـنوری زانیاریەکانتانەوەیە. من هەرکاتێك گوێ لەترپەی دڵی هەر کەسێك بگرم، ئەگـەر ئـەو کەسە نەخۆش بێـت، ئـەوا دوای ئـەوەی کۆچـی دوایـی کـرد کاتێـك لەمردووخانـەدا مومیـای دەکـەن دەڕۆم بۆئـەوەی بـزانم هۆکـاری نەخۆشـی دڵـی چـی بـوو. سـەرەڕای ئەوەش هەرکاتێك یەکێك لەخەڵکی"کوش"یان"لیبیا"کۆچی دوایی دەکات سینەیان لـەت دەکـەم و چـەند لێکۆڵینەوەیـەکی جۆراوجـۆر لەسـەر لاشـەیان ئـەنجام دەدەم، ئەوکات فەرمانیان پێدەدەم لەشەیان بەخاك بسپێرن، چونکە خـەڵکی ئـەم ناوچـەیە باوەڕیان بە"مومیا"نیە و مردوکانیان هەر بەوشێوەیە دەنێژن...

سـتی کـف وتـی: بەهـەرحاڵ لەبەرئـەوەی مـن پیـاوی گۆڕەپـان جەنگـەکانم و لەهەرسـاتێکدا لەوانەیـە بەتیرێك یـان نێـزە گیـان لەدەسـت بدەم، بۆیـە گـۆڕی خـۆمم

کریوه و ئامادەم کردووه، ئێستاش ئەگەر ڕێم پێبدەیت زۆر ماندوم و دەمەوێت بخەوم.

خانەخوێش وتی: ژوره تایبەتەکەت بۆ ئامادە کراوه، دەتوانی تا چەنێك خۆت بتەوێت تێیدا بخەویت، بەڵام مـن چاوەڕێ "مریت"ی کچم دەکەم کە لەگەڵ"موسا"دا ڕۆشتووه بۆ پیاسە بگەڕێتەوه دوای ئەوه دەخەوم.

"ستی کف"دوای گوتنی شەوێکی شاد ڕۆشتە ژورەکەی خۆی خەوت و"ئاتون موسا"ش لەبەردەم هەیوانەکەیدا بەدەم تەماشاکردنی ڕوباری نیل ڕاوەستا و گوێی لەدەنگێك بوو و دوای ئەوه بینی موسا خەریکە لێی نزیك دەبێتەوه.

"ئاتون موسا"هەر بەوشێوەی کە تەماشای ڕوباری"نیل"ی دەکرد وتی: هیوادارم ئەمشەوت بەخۆشی تێپەڕاندبێت.

موسا وتی: سوپاسگوزاری میوانداری و پێشوازیکردنەکەتم، بەهۆی ئەوەی تا ئێستا تۆم بەبێداری هێڵاوەتەوه داوای لێبوردنت لێدەکەم.

"ئاتون موسا"ش ڕویکردە موسا و وتی: میوان لەلای ئێمە خۆشەویست و بەڕێزە، ئێمە چێژ لەو ساتانە وەردەگرین کە دەبینین میوانەکانمان چێژ لە پێشوازی و میوانداریەکانمان وەردەگرێت.

موسا کە لەخانەخوێ نزیك بوبویەوه بەدودڵی و لەرزێکەوه دەیویست داوای دەستی"مریت"ی کچی بکات و بەهۆی نەشارەزایی و بێئەزمونیەوه، بێ هیچ پێشەکیەك وتی: من کچەکەی تۆم دەوێت، دەمەوێت بۆ هەمیشە لەگەڵ مندا بژیت!

موسا ئەم گوتانەی بەڕادەیەك توند و تێکەڵ و پێکەڵ و بەپەلە هێنایە زمان، کابرای خانەخوێ بەجوانی لەمەبەستی تێنەگەشت و"ئاتون موسا"ش بەهەڵە لەمەبەستەکەی تێگەشت و وتی: ئەوه پاداشتی میوانداری و پێشوازی من بوو، ئایا ئەوه نەریت و ڕەوشتی مرۆڤە تا تۆ بەوشێوەیە ڕەفتاری سوکایەتی ئامێز لەبەرامبەر کچەکەمدا بنوێنی؟

"موسا"ش لەدڵگرانی و نیگەرانیاندا کەوتە پاڕانەوە و وتی: داوای لێبوردنت لێدەکەم، من مەبەستم ئەوە نەبوو، بەهەڵە لێم تێمەگە، دەمەوێت داوا دەستی کچەکەتان لێ بکەم، بەڵام لەڕاستیدا نازانم بەچ شێوەیەك پێتان ڕاگەیەنم.

"ئاتون موسا"ش لەوکاتەدا هێور بویەوە. "موسا"ش کاتێك بینی باوکی"مریت"لەمەبەستی تێگەشت هاتەوە سەرخۆی.

"ئاتون موسا"وتی: لەوەیکە بەهەڵە لەمەبەستت تێگەشتم داوای لێبوردنت لێدەکەم، بەلاتەوە سەیر نەبێت چونکە هاتنی تۆ بۆ ناو ئەمماڵە ڕوداوێکی زۆر دەگمەن و چاوەڕوان نەکراو بوو، بەتایبەت بەو شێوەی تۆ لەکۆشکدا پەروەردە کراویت و بەپێی ئەو بێبەند و باریەی کە لەناو کۆشکدا باوە ئەکرێت چاوەڕێی هەموو شتێك لەتۆ بکرێت. منیش بەڕادەیەکی پێویست ئاشنای شێوازی ژیانی کۆشکی فەرمانڕەواییم، ڕەچاوی هەندێك ڕەفتار و بابەت ناکرێت، بۆیە منیش لەوباوەڕەدابوم تۆش بەهەمان ئەو ڕوانگەیەوە لەماڵەکەی مندا ڕەفتار دەکەیت و وامزانی شتێك ڕویداوە، هەمان ئەو ڕوداوانەی کە لەپایتەختی میسردا ڕودەدەن.

موسا وتی: سەرەڕای ئەوەی لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا گەورە بوم، بەڵام وەك شازادەکانی تر تەماشام مەکە. ئەم بابەتە لایەنە لاوەکیەکانی ئەم بابەتەیە، بەڵام سەرچاوە و ڕەگ و ڕیشەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە دەمەوێت ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچەکەتدا پێك بهێنم، لەبەرئەوەی زۆر خۆشم لەو دێت هەرلەبەرئەوەش هاتوم داوای دەستی"مریت"ت لێ بکەم.

"موسا"ی پزیشك لێی پرسی: چی ڕویداوە کە بووە هۆی ئەوەی لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا بەو شێوەیە ئاشقی بویت، ئەم هەموو پەیوەست بونەت لەماوەیەکی کەمدا نائاسایی دێتەبەرچاوم، پەیوەست و خۆشەویستی کارێکی تا بڵێی لەسەرخۆیە، نەك لەناکاو.

موسا وتی: لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بێت کەمن تا ئێستا ڕەفتاری لەوشێوەیەم لەگەڵ هیچ کچێکی تردا نەکردبێت، کچەکەت یەکەمین ئیشق خولقێنە لەژیانی مندا و زۆریش سەرنجی ڕاکێشاوم.

"موسا ئاتون" لێی پرسی: موسا تەمەنت چەندە؟

موسا وتی: تەمەنم نیوەی هەژدەساڵی تێپەڕاندووە و بەرەو نۆزدە دەڕوات.

"ئـاتون موسـا وتـی: بـەپێی نـەریتی شـازادەکانی کۆشـکی فـەرمانڕەوایی کوڕەکانیان لەو تەمەنەدا چارەنوسی ژیانی هاوسەریەتیان بەهەڵبژاردنی کچێکی شازادە تۆمار دەکرێت، تۆ دەستگیراندار نیت؟

موسـا وتـی: شـازادە"ئنخـاس"ی دایکـم حـەزی نـەدەکرد دەسـتگیرانێکم بـۆ دەستنیشان بکەن.

"ئاتون موسا"لێی پرسی: بەدڵنیاییەوە مەبەستێکی لەوکارەدا هەبووە!

موسا وتی: ئەم ناڕازی بونەی لەوەی کە من دەستگیراندار نەبم کە پێچەوانەی نەریتی کۆشکی فەرمانڕەوایی بوو بەدڵنیاییەوە بەڵگەیەکی لەپشتەوە هەیە، بەڵام لەئێستادا ناتوانم بۆتی بگێڕمەوە، چونکە لەمحاڵەتەدا ناچار دەبیت تا سپێدەی بەرەبەیان دوای ئەوەش تا ئاوابونی خۆر گوێم لێ بگریت، بەڵام هەم من دەبێت لێرە بڕۆم و هەم تۆش ماندویت و تاقەتی بیستنی ئەم جۆرە بابەتانەت نیە.

کابرای پزیشك وتی: پێویست بەوە ناکات هەموو لایەنێکی ئەم بابەتەم بۆ باس بکەیت، لەبەرئەوەی تۆ ئێستا داوای دەستی کچەکەمت کردووە و منیش دەبێت لەمبارەیەوە بڕیاری خۆم بدەم و دایکیشی ڕازی بکەم، کاتێك ئاشنای ڕابردوی تۆ نەبم، ئەویش ڕابردویەك بەو دوورودرێژەی خۆت باست کرد، بەچ شێوەیەك دەتەوێت بەدڵی تۆ وەڵامت بدەمەوە، لەبەرئەوە باشتر وایە بەکورتیەکەی من لەمبابەتە ئاگادار بکەیتەوە.

"موسا"ش بەمشێوەیە بۆی ڕونکردەوە: دوای کۆچی خێڵی"ئیسرائیل"بۆ وڵاتی"کوش" لەناوچەی"دلتا"، لەمیسردا ئەو بەسەرهاتە مێژوویانەی کە لەو سەردەمەدا ڕویاندا... دایکم و باوکیشم وەك تەواوی خێڵی ئیسرائیل لەوڵاتی کوشدا دەژیان و بەوشێوەی باسدەکرا کۆیلە بون، بەواتا لەڕاستیدا من کۆیلە زادەم نەك شازادەیەك، منیان لەترسی فیرعەون و کاربەدەستەکانی کە منداڵەکانیان دەفڕاند خستمیانە ناو سەبەتەیەکەوە و دامیان بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، شازادە"ئنخاس ئامون" کە وەجاخ کوێر بوو منی دۆزیەوە و وەك کوڕی خۆی منی

بە فیرعەون ناساند و موسا دوای ئەوە بەکورتی باسی ژیانی خۆی بۆ کرد، دوای ئەوە خۆر هەڵهات و رۆژ بویەوە.

دوای ئەوە موسا بەردەوامی بەقسەکانی خۆیدا و وتی: وابزانم ئێستا زانیت من کەنیز زادەیەکم نەك شازادەیەك، بەدڵنیاییەوە ڕازی نابیت کچەکەت شوم پێبکات.

ئاتون موسا وتی: کوڕە، تۆ نهێنیەکی زۆر مەزنت بۆ باسکردم، دڵنیابە لەوەی ئەم نهێنیە هەر لێرەدا دەنێژرێت و بێ لەخۆم هیچ کەسێکی تر ئاگاداری نابێت، بگرە بۆ ژنەکەم و "مریت ئاتون"ی کچیشمی لێ ئاگادار ناکەمەوە، تۆش بۆیان باس مەکە. نهێنی پارێزی بەشێکە لەپیشەی پزیشکی، هەموو پزیشکێك سینەیەکی لێوانلێو لە نهێنی هەیە و ئەم جۆرە نهێنیانە بەهیچ شێوەیەك ئاشکرا ناکرێن. ئەوەی گرنگە بزانی کچەکەم لەئێستا بەو لاوە هی تۆیە و دوای گەڕانەوەت لەوڵاتی "کوش"دەتوانی ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنی.

موسا وتی: بەدڵنیاییەوە واش دەبێت.

موسا بەسەر سوڕمانەوە لێی پرسی: ئایا ڕێ دەدەیت دوا گەڕانەوەم لە وڵاتی "کوش"لەگەڵ کچەکەتدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنم؟

"ئاتون موسا"ش وتی: بەدڵنیاییەوە.

موسا وتی: بەڵام گەڕانەوەم لەوڵاتی "کوش"لەوانەیە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، لەوانەشە چەند مانگێك درێژە بکێشێت، پێشتر پێم وتی دەبێت بۆ ماوەی سێ ساڵ لەدورخراوە بمێنمەوە.

ئاتون موسا وتی: درێژی ئەو ماوەیەش خۆی بۆخۆی ڕێکخەری ئەم کارەیە، بەهەرحاڵ ئەوە ئایندەی تۆیە ناتوانیت هیچ کارێك بکەیت، دەبێت دانبەخۆداگر بیت تا ئەو ماوەیە تێدەپەڕێت، منیش پابەندی بەڵێنەکەی خۆم دەبم.

موسا وتی: بۆچی ئێستا ناتوانم ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچەکەتدا پێك بهێنم؟

ئاتون موسا وتی: لەبەرئەوەی تۆ ئێستا دەڕۆیت بۆ وڵاتی کوش و ژیان لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا تێدەپەڕێنیت، ئایا تائێستا بینیوتە باوکێك کوڕەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ گۆڕەپانی جەنگ؟ چارەنوست نادیارە.

موسا وتی: ڕێم پێ دەدەیت پێش ئەوەی ڕێی وڵاتی "کوش"بگرمە بەر چاوم بەکچەکەت بکەوێت.

ئاتون موسا وتی: ئەوە بەباش دەزانم کە چاوت پێی نەکەوێت، چونکە ئەم دیدارە "ستی کف"دەخاتە گومانەوە و وا لێکی دەداتەوە بەپلان تۆم کردووە بەزاوای خۆم، ئەمەش بۆ خۆم و کچەکەم باش نیە.

موسا وتی: کەواتە ئێستا ماڵئاوا

"ئاتون موسا"ش وتی: بەئومێدی دیدار.

# موسا لە وڵاتی"کوش"دا

لەوکاتەوەی هێزی نێردراوی میسری سەرو ڕێی وڵاتی"کوش"ی گرتووەتە بەر تا ئەو کاتەی گەشتنە وڵاتی"کوش"دوچاری خۆرێکی سوتێنەر، هێرشی مێرولەکان، لەکارکەوتنی چەرخی گالسکەکان و چەقین لەقوڕ و لیتە بونەتەوە و بگرە شەوانیش ئارامیان نەبوو. بەڕۆژدا موسا دەبوو بەپێی ڕێی بکردایە و شەوانیش بەگەستنی مێش و مێرولەکان تێپەڕاندایە کە خەوی لەچاوی هەمویان زەوت کردبوو. هێزی ڕەوانەکراوی میسری سەرو هەرچی زیاتر بەرەو باشور پێشڕەویان بکردایە قوڕ و لیتەیەکی زیاتر ڕێگاکەیانی دژوارتر دەرکرد. دوای ئەوەی لەو قوڕ و لیتەیە ڕزگاریان بوو ڕێگاکەیان بو بە زەویەکی وشك و تۆزاوی، تەپ و تۆز لەباتی مێش و مەگەز سەربازەکانی تەنگەنەفەس کردبوو. ئەمجارەیان تەڕی و شێداری زەو لەشێوەی تەپ و تۆز خۆی نواند و بەڕادەیەك نەرم بوو کە لەهەموو گۆشە و کەنارێکەوە سەری دەردەهێنا، بەتایبەت لەهەمووی ئازاربەخشتر چاوی سەربازەکان بوو کە بەهۆی تەپ و تۆزەوە توانای بینینی پێش خۆیان نەبوون. بێ جیاوازی هەموو هێزەکە توشی کۆکەیەکی زۆر پیس بون و باری دەرونی هەمویانی تێکدا و گەشتە ڕادەیەك کە لەگیانی خۆیان بێزار بون. هێزی سەربازی نێردراوی میسر بەدەردیسەری و سەختیەکی زۆرەوە توانیان تاڤگەی دووەم تێپەڕێنن و خۆیان بگەیەننە تاڤگەی سێیەم. لەم شوێنەی کەنار ڕوباری نیلەدا کە لەمیسری خوارووا ڕوبارێکی ئاوا تێدەپەڕێت، وە هەژدیها بەدەم خرۆشانەوە دەینالاند و خێراییەکی سەرسوڕهێنەر و فشارێکی باوەڕپێنەکراوی بەڕادەیەك هەبوو کە قوچەکیەکانی میسریش نەیاندەتوانی لەبەردەمیدا خۆیان ڕاگرن. دەنگەدەنگی خرۆشانی ئاو بەڕادەیەك ترسی لەدڵدا دروست دەکرد کە مرۆڤ

وای دەزانی جیهان لەحاڵی وێرانبونندایە. دوای نزیك بونەوە لەهەر تاڤگەیەك، ئەوانەی "گەمیٚ"٢٩ی ڕوباریان هەبوو دەبوو کەلوپەلەکانیان لە"گەمیٚ"کانەوە بگواستایەتەوە بۆ وشکانی و لەوشکانیەکانیشەوە تێپەڕن و لەوبەری تاڤگەکەوە دابەزنە خوارەوە. ئەم جۆرە کارە بەلای سەربازە ماندو و دەستەپاچەکانەوە بەخراپترین ئەشکەنجە لەقەڵەم دەدرا، لەبەرئەوەی چیتر توانای ئەوەیان نەبوو بگرە هەنگاوێکیش ڕێ بکەن، چ بگات بەجێبەجێکردنی کەلوپەلە قورس و کەمەر شکێنەکانی هێزی سەربازی، سەربازەکان لەوکاتەدا بەدەم جنێودان و بۆڵەبۆڵەوە لەسەرخۆ خۆیان بەگواستنەوەی کەلوپەلەکانەوە سەرقاڵ دەکرد. دوای تێپەڕبون لەچەند تاڤگەیەك ئاو و هەوا لەڕادەبەدەر گەرم بوو، کەچیتر سەربازەکان نەیانتوانی بەڕۆژدا بگرە هەنگاوێك بەرەوپێش بنێن.

ستی کف فەرمانی حەوانەوەی بەڕۆژ و ڕێکردن لەشەودا دەرکرد. کاتێك موسا لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بوو بەدرێژایی مێژوو جەنگ لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا هەبووە، بەڵام هەرگیز تامی جەنگ و گرفتەکانی نەکردبوو، و نەیدەزانی ڕێگای بێزارکەر و بێخەوی کوشندە چیە. لەهەندێك شوێنی وشکدا سەرەڕای ئەوەی ڕوباری نیلی پێدا تێدەپەڕی بەڵام بیابانێکی ئەوەندە وشك بوو کە بگرە لەکەنار لێواری ڕوباری نیلدا چڵە گیایەکیشت نەدەبینی ڕوابێت. لەهەندێك شوێنی کوێستانیشدا کە ڕوباری"نیل"ی پێدا تێدەپەڕی بارودۆخی ڕێگاوبان بەڕادەیەك سەخت بوو کە لەڕۆژدا تەنها دەیانتوانی کەمێك بەرەو پێشەوە بڕۆن، کەلوپەل و کەرەستە سەربازیەکان، باری سەر چوارپێکانیش بەڕادەیەك قورس و دەستگیر بوو کە زۆر بەسەختی دەیانتوانی ڕێبکەن. بەتایبەت لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە دەبوو لەهەندێك شوێندا گالیسکەکانیان هەڵگرتایە، لەبەرئەوەی چەرخی گالیسکەکان لەناوچە کوێستانیەکاندا نەدەسوڕانەوە. لەڕۆژی بەڕێ کەوتندا ڕێژەی چل کاهینیش لەگەڵ هێزی سەربازیدا بەڕێ کوتن، بەڵام ئەم کاهینانە لەنیوە ڕێدا لەیەکێك لەپەرستگاکانی باشوردا ڕاوەستان و دەستیان لەڕێکردن هەڵگرت. هێزی ڕەوانەکراو بێ کاهینەکان وەك منداڵی بێ دایك و باوك دەهاتنە بەرچاو. سەربازە

[29] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٨"

بەکرێگیراوە بێگانەکان بارودۆخیان بگرە لەسەربازە میسریەك خراپتربوو. شەوانە لەو شوێنانەی کە لایان دەدا بەکۆمەڵ گۆرانیـان دەوت بۆئەوەی فشاری کاری رۆژانەیان لەڕویی دەرونیەوە کەمتر بکەنەوە. سەرەڕای بارودۆخی ناوچە وشك و گەرمەکان، ڕێگای دور و ماندوکەریان بەپێی بڕیبوو، ئەو ڕێگا دوورودرێژەی ماویانە وردە وردە دانبەخۆداگرترین سەربازی هێنابویە گریان و پاڕانەوە، ئەمانە نەفرەتیان لەزەوی و ئاسمان و بیابان دەکرد. سەربازەکانی"هاتی"سرودێکی خەمگینیان بەکۆمەڵ دەوتەوە، "موسا"ش حەزی دەکرد بزانێت شعری سرودەکەیان واتای چی دەگەیەنێت، بۆیە شەوێکیان داوای لەیەکێکیان کرد ئەو شیعرانەی بۆ وەربگێڕێت:

*ئەی مانگی بەرز کە چەند ئەستێرەیەك دوات کەوتون*

*دەتبینم هەموو شەوێك وەکوو من ڕێگایەکی دوورودرێژ دەبڕیت،*

*بەڵام من لەباتی ئەستێرە دڵ دوام کەوتووە.*

موسا دوای ئەوەی لەشیعرەکەیان تێگەشت، چیتر شەوانە بەبیستنی ئەو گۆرانیە دڵتەنگ دەبوو، چونکە ئەو شیعرە زمانحاڵی موسا بوو، دڵی پەیوەستی ئیشقێك بوو، لەهەمان کاتدا ڕێگایەکی دور چاوەڕێی دەکرد و دڵیشی پەیوەست بوو بەکچێکەوە کە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی ئایا ئەم دیدار و چاوپێکەوتنە ڕوودەدات یان نە. نۆکەرەکەی"نون" کە خەڵکی وڵاتی"هاتی"بوو زۆر بەکەمی قسەی دەکرد، بە بەرگەگرتنی ئازاری ڕێگا و دەردیسەری شەوانە بەتەواوی دەمی داخستبوو. ئەم بێدەنگیەی گەشتە ڕادەیەك کە وەڵامی بەڵێ و نەخێرەکانیشی بە هێمانی سەری بداتەوە. سەیر لەوەدابوو بەو نیگا قوڵەوە کە تەماشای موسای دەکرد، موسا وای تێگەیاندبوو کە"نون"هەوڵی کوشتنی دەدات. لەڕێگایەکدا بارودۆخ لەخراپ خراپتر بوو، چونکە تا ئەو شوێنە ڕوباری نیل بەلایەنی کەم ڕێگایەکی ڕێك و تەختی هەبوو، بەڵام دوای ئەوە جوڵەی مارپێچی ڕوباری نیل دەستی پێکرد، هێزی سەربازیش ناچاربون پەیڕەوی لەو ڕێگا پێچاوپێچ و تەواونەبووە بکەن، بەڵام دوای ئەوەی ئەو ڕێگا پێچاوپێچەی

ڕوباری"نیل"یان گرتە بەر ڕێگایەکی زۆر زیادەڕۆیان بڕی، ئەو ڕێگایەی لەڕۆژانی ئاساییدا لەماوەی یەك ڕۆژدا دەیانبڕی، هەندێکات بەچەند ڕۆژێك ئینجا دەیانتوانی ئەو ڕێگایە ببڕن. هێزی سەربازی نێردراو جگە لەکەناری ڕوباری نیل هیچ ڕێگایەکی تریان شك نەدەبرد، هەرئەوەی لەکەنار ڕوباری نیل دور بکەوتنایەتەوە، لەشکر لەتینوەتی و بێناویدا مرۆڤ و ئاژەڵەکانی لەناو دەبرد، چونکە جگە لەڕوباری"نیل"بەدرێژایی ئەو ڕێگایە بگرە نەیاندەتوانی تنۆکێك ئاو بەدەست بهێنن. لەو بیابانەدا هاوڕێی ئەو هێزە سەربازیە تیمساحی بیابانی و داڵەکەرخۆرەکان بو کە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد یەکێك لەسەربازەکان لەپێ بکەوێت بۆئەوەی لەچواردەوری کۆ ببنەوە و لەچاو تروکانێکدا جگە لەچەند پارچە ئێسقانێکی لێ نەهێڵنەوە. لەوکاتەوەی دەستیان بەم گەشتە کردووە تا ئەوکاتەی نیوەی ئەم ڕێگایەیان بڕیوە کەنارەکانی ڕوباری نیل چەند گۆڕانکاریەکی بەخۆیەوە بینیوە، لەدەشتەکاندا ئارام بوو، لەکاتی لافاویشدا کەف کەفانی دەکرد و لەتەنگەلان و بەردەلانەکاندا بەشێوەیەك دەینالاند کە وەك بڵێی چەند هەورە تریشقەیەك پێکەوە گرمیان بێت. بەدرێژایی ئەو ڕێگایە بەدەگمەن و لەوانەشە بەهیچ شێوەیەك ئاوایی لەسەر ڕێگاکەیاندا بەدی نەدەکرا، ئەم دیمەنە وشك و یەك شێوە و تەواو نەبووە هەموویانی بێزار و بێتاقەت دەکرد، تەنها لەهەندێك شوێندا جوتیارەکان کشتوکاڵیان دەکرد، کاتێك دەگەشتینە لای ئەم جوتیارانە بەرەو ڕویان دەڕۆشتن و داوای هەندێك کاڵایان لێ دەکردن، بەڵام ئەم کڕینە نەیدەتوانی جۆری ژەمی خواردنیان بگۆڕێت، ژەمی خواردنیان لەسەرتاوە تا کۆتایی ئەم ڕێگەیان گۆڕانکاری بەسەردا نەدەهات، چونکە خواردنەکەیان لەسەرەتاوە تا کۆتا یەکسان و سەربازی بوو. دوای بێزاری و چەند دەردیسەریەك لەشکر گەشتە شەشەمین تاڤگەی ڕوباری نیل، چوارپێکان بەهۆی گرانی ئالیکەکەیانەوە نیوەگیان بوبون، ئاژەڵەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لاوازتر دەبون و بەرگەی فشارێکی زیاتریان دەگرت. دوای تێپەڕبون لەشەشەمین تاڤگەی ڕوباری نیل"موسا"ڕوباری بەهەمان شێوەی ئەو ڕۆژە بینی کە لەمیسری خواروودا لەسەرخۆ و ئارام دەخرۆشا، خرۆشانی ڕوباری نیل خاو و لەسەرخۆ و ئارام بوو. لەوەو دوا گۆڕانکاری بەسەر زەویەکەشدا

هات و ڕەنگی خاك وردە وردە سەوزایی بەخۆوە دەبینی، دەشتەکانیش بەکۆڕەوی چەند ئاژەڵێکی کێوی جۆراوجۆر خۆی دەنواند کە بەبینینی ئەو هەموو خەڵکە زۆرە هەڵدەهاتن و ئەم هاڵهاتنەیان دەبووە مایەی خۆشحاڵی سەربازەکان.

لەم ناوچەیەدا"ستی کف"فەرماندەی هێزی سەربازی نێردراو "موسا"ی بانگ کرد و فەرمانی پێدا کە لێرە بەدواوە ئەو ببێتە فەرماندەی هێزی سەربازی. لەڕاستیدا"هتپ رە"دەبوو ببوایە بەفرماندەی هێزی سەربازی، بەڵام"ستی کف"ئەوەی بەباش زانی کە موسا ببێتە فەرماندەی ئەو هێزە. موسا بەدرێژایی ئەو ڕێگایە ئەزمونێکی باشی بەدەست هێناوە و بەرگەی دەریسەریەکی زۆری گرتووە و هاوشانی سەربازەکان تەواوی بیابان و کێو و ڕێگا بەردەڵانەکانی بەپێ بڕیوە و شەوانەش لەکەسانی تر درەنگتر دەخەوت، لەبەرئەوەی ناچاربوو سەردانی هەموو بەشە سەربازیەکان بکات، هەروەها بەیانیانیش زۆر زوو لەپێش هەموان لەخەو هەڵدەستا. ئەو هەموو ڕەفتار و کردارانەی موسا کەوتە بەرچاوی تیژی"ستی کف"هەر لەبەرئەوەش ئەوی بۆ فەرماندەیی دەستنیشان کرد. موسا و گالیسکەوانەکەی"نون" هەردوکیان لەتەمەنی لاویەتی و خۆشئەندامیدا دەژیان. ئەو دوانە بێ گلەیی و دەمەبۆڵەیەك ئەرکەکانیان ئەنجام دەدا. ئەو ڕۆژە"ستی کف" موسای بانگرد بۆئەوەی پلەی فەرماندەییەکەی پێ ڕاگەیەنێت، بۆیە لە"موسا"ی پرسی: چ جیاوازیەك لەنێوان ئەمڕۆ و ئەو ڕۆژەی کە وتت بەخۆشحاڵیەوە دەکەویتە ڕێ دەبینی؟

موسا وتی: بگرە ئێستاش خۆشحاڵم.

ستی کف چەند پرسیارێکی لە"موسا"کرد و لەکۆتاییدا دەوای هەڵسەنگاندنی ئامادەکاری و دەرونی بەرگریکار و تواناکانی ئەوی وەك فەرماندەیی هێزی سەربازی دەستنیشان کرد. موسا بەبیستنی هەڵبژاردنی بۆ ئەو پلەوپایەیە زۆر خۆشحاڵ و لەهەمان کاتدا شەرمەزار بوو و وتی: من شایستەی ئەم بەرپرسیاریەتیە نیم.

ستی کف وتی: بەپێی پێوەرەکانی من و لەسەر بنەما و چوارچێوەی هەڵسەنگاندنە سەربازیەکان تۆ زۆر شایستەی ئەم بەرپرسیاریەتیەیت. سبەی

دەگەینە شوێنێك كە سەوزاییەكی زۆر خۆشە، سێ ڕۆژ لەئۆردوگادا دەمێنینەوە بۆئەوەی بتوانین كەمێك چاكسازی لەگالیسكەكاندا بكەین. تۆ لەئێستە بەدواوە چاو و گوێی ئەم هێزەیت. موسا لەگەڵ چەند گالیسكەیەكدا پێشكەوت. ئەو دەبێت خۆی لەگەڵ چەند دەنگێكی جیاواز، و هێماگەلێكی تایبەت، دەنگی باڵندەكان، بەشێوە سروشتی و دروستكراوەكانیانەوە خۆی بگونجێنێت بۆئەوەی لەكاتی پێویستدا بتوانێت بڕیارگەلێكی كوتوپڕ بدات، چونكە خەڵكی وڵاتی كوش زۆر بەجوانی لاسایی دەنگی باڵندە و گیانەوەرەكان دەكەنەوە و لەڕێی ئەم دەنگانەوە پەیام بۆ یەكتری دەنێرن.

ستی كف بە"موسا"ی وت: لەوانەیە لەشەودا دەنگی چەقەڵ ببیستی، بەلاتەوە سەیر نەبێت، بەڵام بەڕۆژدا گوێت لەدەنگی چەقەڵ بوو، وەك زەنگێكی هەڕەشە لێكی بدەرەوە، چونكە چەقەڵەكان بەڕۆژدا نایەنە دەرەوە بۆئەوەی بقوزێنێت، بەڕۆژدا ئەو جۆرە دەنگانە بەدڵنیاییەوە دەنگی ئەو چەقەڵانەن كە لەبۆسەماندا دانیشتون كە چاودێری ڕەوتی هێزی سەربازیمان دەكەن یان لەكاتی شەودا ئاگاتان لە ژوژوە دروستكراوەكان بێت، نەوەكوو لەپێستی ئەو ژوژوانەدا دزە بكەنە ناو هێزەكانمانەوە. لەكاتی شەودا جوڵە و بەرپرسیاریەتی فەرمانڕەوایی لەڕۆژ سەخت ترە. لەتاریكیدا بۆسە، هێرش، تەڵە زۆر بەئاسانی ئەنجام دەدرێت. دوای ئەوەی ماوەیەك لەتاڤگەی شەشەم دوركەوتنەوە ڕۆشتن بەشەودا قەدەخە دەكەن و تەنها بەڕۆژدا دەكەونە ڕێ. شەوانەش ئەركی پاسەوانیان بە دوو دەستە لەسەربازەكان سپارد كە هەریەكێكیانیان بەدوری پێنج سەد هەنگاو لەویتر دادەنا. خۆپاریزی لەوكاتەوە دەستی پێكرد كە پێیان نایە وڵاتی كوشەوە، چونكە خەڵكی كوش لەوانەبوو لەهەر ساتێكدا كە خۆیان بیانەوێت هێرشیان بۆ بكەن. بەیانیەكیان موسا فەرمانی ڕۆشتنی دەركرد و لەناكاو چەند كەسێك لەسەربازە پێشەنگەكان كە چاودێری و پاسەوانی ڕەوتی پێشەوەی سەربازەكانیان دەكرد چەند هێمایەكی تایبەتیان لەخۆیان نیشان دا كە هێمای هەڕەشە بوو. موسا یەكسەر بەگالیسكەكەی ڕۆشتە پێشەوە بۆئەوەی بەباشی ئاگاداری بارودۆخ بێت،

ئاگاداری سەربازە پێشەنگەکان فەرمانی ئامادەباشیان بەتەواوی هێزەکە ڕاگەیاند، دوای ئەوە هەموو خۆیان لەحاڵەتی بەرگریکاریدا ئامادەکرد.

خودی"ستی کف"ڕۆشتە پێشەوە و بەیەك تەماشا وتی: ئەوە دوژمن نیە بەڵکو بارهەڵگەری دوژمنەکانمانن، پێشتریش چاوم بەجەنگاوەرانی"کوش"کەوتووە، ئەوانە سەرەتا بار و بنەیان دەنێرن ئەوکات خۆیان لەدوایانەوە دێن، ئەم جۆرە سیستەمە سەربازیە یەکێکە لەتایبەتمەندی جەنگاوەرانی وڵاتی"کوش" بەبۆچونی من ژمارەی بار هەڵگرەکانیان لەپەنجا کەس تێناپەڕێت، بەڵام ئەو هێزە سەربازیەی ئەم بار و بنەیە لەگەڵ خۆیدا دەبات، هێزێکی سەربازی مەزنە. "ستی کف"لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز کە زاڵبوو بەسەر هێزە سەربازیەکان"کوش"دا هاتە خوار و فەرمانی دا ڕێژەی پەنجا گالیسکە بەسەر هەردوو لادا جێگیر بێت و سەد گالیسکەش لەپێشەوەی سوپا خۆی ئامادەی هێرشکردن بکات.

ستی کف بەگالیسکەوانەکەی خۆی"سوکر موسا"ی وت: پەنجا کەس لەتیرهاوێژەکان بەکەمانی ئامادەیانەوە لەدواوە بەرگریمان لێ بکەن. سوپای"کوش" ئاوێتەیەك بوو لە ڕەشپێست و ئەوانەی بەپێستی گیانەوەرە کێویەکان خۆیان داپۆشبوو کە وەك ئاژەڵێك دێنە بەرچاومان. پێستی هەندێکیان خاڵخاڵین بوو، کاتێك دەهاتنە پێشەوە پێستی خاڵخاڵینی "یۆز پڵەنگ"ەکان بەجەوانی دەردەکەوت. ئەم ڕێژە ڕەش پێستانە کە"ستی کف" و سەربازە پێشەنگەکان چاویان پێیان کەوت بەرەوڕوی ئۆردوگای میسریەکان دەهاتن و بەپێچەوانەی ئەوەی ئەوان بینیبویان لەچەند کەسێك زیاتر نەبون، کەژاوەیەك و هەڵگرانی کەژاوەکە و دوو کەسیش لەملاولای کەژاوەکەوە ڕێیان دەکرد. موسا کەسێکی بەسەر کەژاوەکەوە بینی دانیشتبوو، کە ڕون و ئاشکرا نەبوو چ ڕەگەزێکە، لەوانەیە ژنێك یان پیاوێك یان منداڵێك بێت. لەدوای کەژاوەکەشەوە کۆمەڵێك ڕەشپێست بەچوار ڕیز بەدوای یەکدا دەهاتن و بارێکیان بەسەریانەوە هەڵگرتبوو، دیارنەبوو چ شتێك لەناو ئەو کۆڵەبارەیاندا هەڵگرتووە، بەڵام هەرچی بێت کەرەستەی جەنگ نەبوو، ڕەشپێستەکان زۆر لەسەرخۆ و ئارام لەگالیسکەکان نزیك بونەوە وەك بڵێی بۆ میوانی هاتبێتن. کەژاوەکە ڕاوەستاو و پیاوێکی پیری

سوار ئەو کەژاوەیە بوبو کەچوارمشقی دابوو و ملیوانکەیەکی ئاڵتونیشی لەملدابوو. لەهەردوو لای کەژاوەکەوە دوو لاو ڕاوەستابوو، ئەوانیش وەك پیاوی پیر ملوانکەیەکی ئاڵتونیان لەملدا بوو. لەدوری نزیکەی پەنجا پێیەکدا"ستی کف"فەرمانی پێدان ڕاوەستن، دوای ئەوە هەموویان ڕاوەستان. ئەو ڕەشپێستەی کە نێزەیەکی درێژی بەدەستەوە بوو فەرمانی دا بەوانی تر کە لەشێوەی ڕیزێك لەپاڵی یەکتردا ڕاوەستن، دوای ئەو فەرمانە ڕەشپێستەکانیش لەپاڵ یەکتردا ڕاوەستان. کابرای پیرەمێردیش تاجێکی لەتەنیشتیەوە هەڵگرت و لەسەری کرد، ئەو تاجەی یەك پارچە لەزێڕ دروست کرابوو. ڕەشپێستە بارهەڵگرەکان ئەوەی لەسەریان نابوو خستیانە سەر زەوی. دوای ئەوە لەپاڵ یەکدا ڕاوەستان. "موسا" نەیدەتوانی لەوە بگات کە چ باسە. دوو کەس لەڕەش پێستەکان مەچەکی پیرەمێردیان گرت و هاوکاریان کرد لەکەژاوەکە دابەزێتە خوارەوە. کابرای پیری زۆر بەسەختی دەیتوانی هەنگاو بنێت. موسا ئەوەی هاتەوە یاد کە کاهنی مەزنی کۆشکی"ئامون""هتپ رە" لەوە ئاگاداری کردبووەوە کە تەمەنی پیری تەمەنی ڕۆماتیسمە و ئازارەکانی ناهێڵێت کەسی توش بوو بەئاسانی و ئاسودەیی هەنگاوێك بنێت و ئەو پیرە تاج لەسەرەش هەمان گرفتی هەبوو. هەمویان لەدوری چەند هەنگاوێك دور لەهێزی سەربازی ڕاوەستان و پیرەمێردی تاج لەسەریش سەرەڕای ئەوەی دان لەدەمیدا نەمابوو هەوڵیدا زەردەخەنەیەکیان بۆ بکات. موسا نەیدەزانی ڕەشپێستەکان بەزمانێك دەدوێن و کاتێکیش دەستیان بەقسە کرد بگرە لە وشەیەکیشیان تێنەگەشت. دووان لەوکەسانەی کە لەگەڵ پیرەمێردا هاتبون گوتەی کابرای پیریان بەدەنگێکی بەرز وەرگێڕا.

-ئەم پیرەمێردەی کە ئێوە دەیبینن ناوی"ئیرگەباین"ە. "ئیرگەباین"پادشای وڵاتی کوشە و دەڵێت: سڵاوتان لێ بێت، ئاشتی و ئارامی ببێتە بەشتان و هەرگیز دوچاری ڕەنج و ناسۆریەکان نەبن. دوای ئەوەی خۆی پێناساندن:

-من کوڕی"ئیرگەباین" پادشای وڵاتی"کوش"م.

ستی کف دوای ئەوەی تێگەشت کابرای پیر چی وت، بەزبریەکی زۆر کە چاوەڕێ نەدەکرا بەسەریدا هاواری کرد و وتی: بیستم "ئیرگەباین"بەخێرهاتنما لێ دەکات،

مـن فەرمانـدەی هێـزی سـەربازی نێـردراوی میـسرم، بەفـەرمانی فیرعـەون ئامـادەی تـەمێکردنی تـۆم. کـابرای پیرەمێـردیش کـە بـەردەوام زەردەخەنـەی دەکـرد، دوای ئەوەی گوتەکانی "ستی کف"یان بۆ وەرگێڕا بەو ڕەشپێستانەی کە لەتەنیشتیەوە ڕاوەسـتابون چـەند گوتەیـەکی بەگوێیانـدا چرپاند و کـوڕێکی تریـان بـەم شـێوەیە گوتەکانی بۆ وەرگێڕان: سەرەڕای ئەوەی من ماوەیەکم لە"کرنگ"دا بەسـەر بـردووە و مامەڵـەم لەگـەڵ میـسریەکاندا کـردووە، بـەڵام هیـوادارم ئـەوەی بـاوکم بەگوێمـدا چرپاندی بـەجوانی بۆتـانی وەرگێـڕم. ئـەم باوکـەم کـە لەتەنیـشتمەوە دانیـشتووە دەڵێت: من کەپادشای وڵاتی "کوش"م ڕێزێکی زۆر بۆ پادشای برام و میسری مـەزن دادەنێم، من ناتوانم ئەو ناونیشانانەی کە شایستەی فیرعەونە بهێنمە زمان، گوتـە و دەربڕینێکم لەم بارەیەوە پێ نیە، لەبەرئەوە دەمەوێت بەزمانێکی سـادە و خۆمانـەن شتێکتان پێ بڵێم، ڕێم پێ دەدەن؟

ستی کف لەوەڵامدا پێی وت: ئەم کەسە لەبەرئەوەی خۆی وەك پادشایەك ناساند ئامـادە نـیم گفتوگـۆی لەگەڵـدا بکـەم، بـەڵام ئەگـەر وەك نۆکـەرێکی فیرعـەون هـەر قسەیەکی پێ بێت دەتوانێت دەریان ببڕێت. "سـتی کـف"بەورووژانێکەوە ئەو جۆرە قـسانەی دەهێنایـە زمـان کـە وەك بڵێـی دەیویـست لەگـەڵ خـودی وشەکانیـشدا بجەنگێت.

پادشـای "کـوش"یـش گـوێی لەپـەیامی "سـتی کـف" بـوو، زۆر لێبوردانـە سـەری دانەوانـد و بۆماوەیـەك لەگـەڵ کوڕەکەیـدا قسەی کـرد، دوای ئـەوە کوڕەکـەی سـەری بەرز کردەوە و گوتـەکانی بـەم شێوەیە بۆ وەرگێـڕان: بـاوکم دەڵێـت من وەك یـەکێك لەخزمـەتکارەکانی فیرعـەون گفتوگـۆت لەگەڵـدا دەکـەم، لەبەرئـەوەی نەبیـنم زۆر تـوڕەن، بـۆ هێورکردنـەوەی ئـەو توڕەییـەت بگـرە لەخزمـەتکارێکیش کـەمتر خـۆم لەبەردەمتدا نیشان دەدەم، بۆئەوەی لەو بارودۆخە ترسناك و فشارهێنەرە ڕزگـارت ببێت. باوکم دەڵێت بۆ هێورکردنـەوەی تـوڕەیی و ئەو شـەڕەنگێزیەی کە هـەڵگریتی ئامادەم سوجدەشت بۆ ببەم، تەنها لەپێناوی ئەوەی بتوانم گفتوگۆت لەگەڵدا بکەم، تەنها بۆ ئەوەی هیچ خوێنڕێژیەك لەنێوانماندا ڕونەدات، باوکم خوازیاری ئاشتیە و دژی جەنگـە. مـن کـە کـوڕی ئـەوم، نـاوم "پوریـا"یـە، پوریـا لـەزمانی "کـوش"

بەواتای"باوك" دێت، بەڵام باوكم دەڵێت، من چیتر وەك خۆر خەریكە ئاوا دەبم، بۆیە دەمەوێت نەتەوەی"كوش"لەئاشتی و ئاسایش و بێ خوێنڕێژی بژیت. ئێستاش ئەگەر چەند كەسێك لەتاوانباران كە خودی خۆشمان بەدوایاندا دەگەڕاین، دەستگیرمان كردن و بەسزای خۆیانمان گەیاندن، ئەمانە هەڵەیەكیان كردووە بەڵام لەبەر هەڵەی چەند نەزانێك نابێت نەتەوەیەك لەناو ببەیت، ئێمەش بۆ قەرەبوكردنەوەی ئەو هەڵەیە، بۆ پاككردنەوەی ئەم پەڵەی نەنگیە وەك خزمەتكارێكی پادشای میسر هاتوم پێتان بڵێم ئێوە لەگوناهی ئەم نەزانانە ببورن، هەڵبەت ئەم تكایەم لەترس و بێدەستەڵاتیەوە سەرچاوە ناگرێت، چونكە پیاوانی"كوش"لەجەنگدا مەردایەتی خۆیان سەلماندووە، بەڵام من لەكوشتنی منداڵ و ژنانی بێدەستەڵات دەترسم، وەرن با برایانە و لەڕێی گفتوگۆوە گرفتەكانمان چارەسەر بكەین، ئێوە بێهودە ئەم ڕێگایەتان بڕیوە بۆئەوەی لێرەدا خوێن بڕێژن، باش بیری لێ بكەنەوە، بۆتان دەردەكەوێت بێهودە خۆتان ئازار داوە، ئێستاش كە هاتون ناهێڵین بەدەستی خاڵی بگەڕێنەوە، لەلایەن خەڵكی "كوش"ەوە چەند دیاریەكمان بۆ پادشای میسر هێناوە كە دۆستایەتی و یەكێتی نێوان دوو وڵات دەسەلمێنێت، دوای ئەوە دەستی كرد بەژماردنی دیاریەكان: سەرەڕای ئەوەی ئێمە نەتەوەیەكین كە لەڕوی داراییەوە بگرە لەئاستی شارێكی میسریشدا نین، بەڵام چەند دیاریەكمان هێناوە كە شایستەی پادشای میسرە، دە هەزار پارچە بەردی زێڕ، هەڵبەت باشترین جۆری بەناوبانگی زێڕی وڵاتی كوش، بیست هەزار بەردی زیو، سەد هەزار بەردی عاج كەبەهای عاجی فیل لەئاستی بەهای زێڕدایە. لە"كوش"دا باڵندەگەلكی جۆراوجۆر دەژیت، ئێمە هەزار كیلۆ پەڕی جوانی باڵندەكانمان وەك دیاری بۆ هێناوە، پەنجا پارچە بەردی ئەڵماس، پێنج سەد بەردی یاقوت، هەزار بەردی مس، دوو هەزار كاسە و باشترین جۆری خوری مەڕ، پێنج سەد پێستی پڵنگ، هەزار پارچە پێستی ئاسك، پێنج هەزار شانەی هەنگوینی هەنگە كێویەكانی وڵاتی كوش، و دە هەزار پارچەی مرواری ڕەنگاوڕەنگمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە ئەم مرواریە لەلایەن كاهینەكانەوە لەپەرستگاكاندا كۆكراونەتەوە، بە بچوكترین پارچەی مرواری دەتوانی دەیان

کەنیزەك و چەند شمشێرێکی پیێ بکڕیت، ئەم مروارییانە گرانبەهاترین دیارین، چونکە بەدرێژاییی چەند ساڵێك کاهینەکان توانیان کۆی بکەنەوە و بیخەنە خەزێنەی پەرستگاکانیانەوە بۆئەوەی هیچ کەسێك سودیان لێ وەرنەگرێت، بەڵام هەموو ئەمانەمان پێشکەش کردن تەنها لەپێناوی ئەوەی بتوانین هاوڕێیەتیتان بکڕین.

موسا دوای تەماشاکردنی ئەو هەموو دیاریانە وتی: ئەم خەڵکە دەیانتوانی بەم دیاریانەیان باشترین کەسانێك بۆ خۆیان بکڕن، سەرەڕای ئەوەش ئەمانە لەنیشتمانی خۆیاندا دەجەنگن و ژمارەشیان چەند بەرامبەر لەمیسر زیاترە.

ستی کف دوای بێدەنگیەکی درێژ خایەن هاتە گۆ و وتی: ئەی ئیرگەبان! ئایا تۆ وا دەزانی دەتوانی فیرعەونی میسر بەبەرتیل و ئەو دیاریانەی کە واهەستێ دەکەیت زۆر مەزنن لەئامانجی خۆی لای بدەیت. تەواوی ئەو دیاریانەی تۆ هەتە لەئاستی گۆشەیەکی بێنرخی پاتەختی میسردا نیە، ئێمە بەم جۆرە شتانە بەو ئاسانیە لەمەبەستی خۆمان پاشگەز نابینەوە و تۆ و نەتەوەکەشت چارەنوسی لەناوچونە! من کەسێکی سەربازیم، ئەوەی بەلای منەوە گرنگە جێ بەجێکردنی دادپەروەری پادشای میسرە، ئێوە بە دیلی خۆمان لەقەڵەم دەدەین.

کوڕی پادشای"کوش"بەدڵگرانیەکەوە گوتەکانی"ستی کف"بۆ باوکی وەرگێڕا، بەڵام پێشتر وتی: ئەی فەرماندە باوکم پیر و لاواز بووە، تۆ ئەو بەدیلی مەگرە چونکە بەرگەی دیلیەتی ناگرێت، بەڵام من و براکەم بێ هیچ بەرگریکاریەك لەخزمەتی تۆدا دەبین، سەرەڕای ئەوەش لەبەرئەوەی ئەو بەو حاڵەوە هاتووە بۆئەوەی پیشوازیت لێبکات جوانمێری نیە کە بەوشێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

ستی کف وتی: بێدەنگ بە، دوای ئەوە بەهێمای دەستی فەرمانی دا بە گالیسکەوانەکەی"سوکر موسا" و"سوکر موسا"ش بەجوڵەیەکی لەناکاو کوڕی پادشای"کوش"ی کردە ئامانجی نێزەکەی، پیرەمێرد و کوڕەکەی تری لەهەمان ئەوکاتەدا کوشت و دیاریەکانیشیان هەڵگرتن بۆئەوەی بۆ فیرعەونی بنێرن. تەواوی ئەم ڕوداوانە لەماوەی چەند ساتێکی کورتدا ڕویاندا. دوای ئەوە"ستی کف"فەرمانی هێرش کردنە سەر وڵاتی"کوش"ی دەرکرد. کوشت و کوشتاری ئەو

وڵاتــە بەڕادەیــەك "موســا"ی دڵگـران و بێزارکـرد کـە وەك"نـون"ی گالیـسکەوان و نۆکەرەکەی خۆی بۆماوەیەك قسەی نەدەکرد.

# گــــەڕانەوە

موسا بەناونیشانی فەرماندەی لەشکر سەرەڕای ئەوەی دڵگرانبوو بەڵام هیچ دەستەڵاتێکیشی نەبوو، دەبوو ئەرکی خۆی بەجێ بهێنایە. ئەو جەنگەی کە دوێنێ بەچاوی خۆی بینی ترسناکترین دیمەن بوو کە بەبیریشیدا نەدەهات. موسا ئەو ڕۆژە پەیی بەو خاڵە برد کە: ترس و توڕەیی فەرمانڕەوایی جەنگ دەکات. جەنگ واتا شێتی پەسەند کراو دەگەیەنێت، شێتیەکی ئاژەڵانە، لەو ڕۆژەدا موسا بەچاوی خۆی بینی کە بەچ شێوەیەك مرۆڤ لەهەموو گیانەوەرێکی دڕندە ڕسواتر و بێبەزەییتر و بێ سۆزترە، مرۆڤێك کە تەنها بۆ کوشتن و وێرانکردن ئامادە کراوە. بەئازار و ناسۆری و دوری ڕێگا!!بەفەرمانی فیرعەون"موسا"سێ ساڵ دەبێت لەدورخراوەدا ژیان بەسەر ببات، بەڵام لەو کاتەوەی دورخرایەوە تا ئەو جەنگە چوار ساڵ تێپەڕیبوو و لەڕویی یاساییەوە کۆتایی بەماوەی دورخراوەییەکەی هاتبوو. موسا بەناونیشانی لاوێك کە تەنها دوو دەیە و چەند ساڵێك لەتەمەنی تێپەڕیبوو لەناکاو ئاگاداری ئەوە بوو تاڵی سپی لەقژیدا دەرکەوتووە کە لەڕەنج و دڵگرانییە دەرونیەکانی سەردەمی جەنگەوە سەرچاوە دەگرێت، جەنگێك کە چارەنوسی موسای گۆڕی.

موسا بەدرێژایی ئەو جەنگە بەسواری گالیسکە و ڕم بەدەست بەرگری لەخۆی دەکرد، بەڵام گالیسکەکەی موسا بەو شێوەیەش ڕێی پێ نەدەدرا لەدوژمن نزیك ببێتەوە. موسا لەو ڕۆژانەدا پەیی بە بەهای"نون"ی نۆکەر و گالیسکەوانەکەی خۆی برد، چونکە توانی چەند جارێك گیانی موسا لەمەرگ بپارێزێت. زەوی بەلاشەی جەنگاوەران داپۆشراو بوو. موسا لەناکاو"سوکر موسا"گالیسکەوانەکەی "ستی کف"ی فەرماندەی هێزی سەربازی ڕەوانەکراوی بینی بەرەو ڕوی دێت.

سوکەر موسا هاواری کرد: موسا لەگەڵم وەرە بۆئەوەی هەر ئێستا بڕۆین بۆ لای"ستی کف"

"موسا"ش فەرمانی دا بە"نون"ی نۆکەری دوای بکەوێت. سوکر موسا لەبەردەم چادری فەرماندەی هێزی نێردراودا ڕاوەستا و بە"موسا"ی وت: باری تەندروستی "ستی کف"زۆر خراپە!

موسا لێی پرسی: بریندار بووە؟

سوکر موسا وتی: فەرماندە زۆر لەوە ئازاترە کە لەجەنگدا بکوژرێت، بەڵام لەناکاو باری تەندروستی تێکچوو و لەهۆش خۆی چوو و کەوتە سەرزەوی، هۆکارەکەی نادیارە، دوای ئەوە ئەومان گواستەوە بۆ ئێرە، کاتێك هۆشی هاتەوە بەخۆیدا یەکەمین داواکاری بینینی تۆ بوو، ئێستاش لەسەرخۆ بڕۆرە ژورەوە!

چواردەوری جێگەخەوەکەی"ستی کف" ئەفسەرانی پلەبەرز چواردەوریان دابوو و هەموشیان نیگەرانی بوون. موسا پێش ئەوەی خۆی بکات بەناو چادرەکەدا بە"نون"ی نۆکەری وت: بانگێشت کراوم هەر لەبەرئەوەش دەبێت بڕۆمە ژورەوە تۆش هەر لێرە بمێنەرەوە تا ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە. ئەوەی لەفەرماندەدا تێبینی کرد کە دوای ساڵهایەکی درێژ لە"بەدڕەفتاری و ستەم"دەبینێت لەجێگە خەوەکەیدا لەحاڵی گیانەلاندایە.

"ستی کف"دەستێکی بۆ موسا ڕاوەشاند و پێی وت: کوڕم حەزم کرد تۆ لەحاڵی جەنگ و بەو بەژن و باڵایەوە ببینم. من دەبێت سەرەتا چاوم بەتۆ بکەوێت ئەوکات بمرم.

موسا شوێنەواری مەرگی لەڕوخساری"ستی کف"دا بەڕونی بینی، فەرماندەش لەوکاتەدا دەستی گوشی و وتی: تۆ وەکو کوڕی خۆم تەماشا دەکەم بەڕاستی شانازیت پێوە دەکەم، ئەمڕۆ هەواڵگەلێکم پێگەشت کە گوزارشت لە ڕابەرایەتی و ئاڕاستەکردنی ژیرانەی تۆ دەکات، بەڵام دەمویست ئەوە بزانم لەوکاتەی کە"ئیرگەبان"ی پادشای"کوش"م بەسزای خۆی گەیاند چاوم بەتۆ نەکەوتووە بۆچی. ئایا هۆکارێك لەپشت ئەم نەبینینەی تۆوە هەیە؟

موسا وتی: تۆ ستەم و دڵڕەقیت لەباتی دادوەری کردنی ئەو پیرەمێردەدا جێبەجێکرد.

ستی کف، وتی بە ئەفسەرەکانی تر بەتەنها بەجێیان بهێڵن و وتی: ئێستا ئەوەی لەدڵتدایە بەڕونی پێم بڵێ.

"موسا"ش وتی: تۆ بەچ شێوەیەك توانیت پیرەمێردێك لەبەردەمتدا تا ئاستی زەوی خۆی دانەوێنێت و بونایەتی خۆی و نیشتمانەکەی و ئەوەی لەپەرستگاکاندا بوو لەڕوی دڵپاکیەوە پێت ببەخشێت و داوای بەخشینی لێکردی، سەرەڕای ئەوەش لەباتی ئەوەی لەگەڵتدا بجەنگێت بەپێی خۆی هات بۆ پێشوازیت، زەردەخەنەی بۆ کردی، لەپێناوی ئەوەی ڕێز لەتۆ بگرێت بگرە سوکایەتی بەکوڕەکانیشی کرد و هەمویانی بەخزمەتکاری فیرعەون و فەرماندەی فیرعەون لەقەڵەم دا، بەڵام تۆ هەم دیاریەکانت لێ وەرگرتن و هەم ئەوانیشت بێ بەزەییانە کوشت، تۆ دەبێت ساتێك پێش کوشتنی پادشای"کوش"خۆت بخستایەتە جێی ئەو و بێتاوانی ئەوت لەبەرچاو بگرتایە. من توانای ئەوەم نەبوو تەماشای ئەو جۆرە دیمەنانە بکەم.

ستی کف وتی: لێبوردنی پادشای وڵاتی"کوش"لەدەستی مندا نەبوو، من فەرمانم پێکرابوو بڕۆم وڵاتی"کوش"داگیر بکەم، لایەنکانی تری ئەم جۆرە ڕوداوانە بەبەشێك لەسیستەم و ئەرکی سەربازی لەقەڵەم نادرێن، من تەنها ملکەچی فەرمانەکانی فیرعەونم.

موسا وتی: تۆ بێ کوشتنی ئەو، بێ کوشتنی ژن و منداڵەکانیش دەتتوانی فەرمانی فیرعەون جێبەجێ بکەیت، تۆ منت لەهەموو جۆرە جەنگێك بێزار و وەڕەس کرد، پلەوپایەی مرۆڤت لەبەرچاوی مندا کەمکردەوە ناتوانم ئەو هەموو شتە فەرامۆش بکەم، هێشتا ڕوخساری ئەو پیاوە کە بەدڵێکی پڕ لەئومێد تەنها لەپێناو نەتەوەکەیدا وتی لەبەردەمتدا چۆك دا دەدەم، بەڵام بەمەرجێك کارت بەژن و منداڵەکانەوە نەبێت، لەبەرچاوم ون نابێت.

ستی کف ناچاربوو بابەتی گفتوگۆکە بگۆڕێت و وتی: ئەی موسا دەمەوێت تا دواین هەناسەم لەتەنیشتمەوە بیت.

**موسا وتی: تا دوایین ساتی ژیانت لەلات دەمێنمەوە.**

**ستی کف وتی: سەرەڕای ئەوەی لەیەکەمین ڕۆژ کە پەیوەندیت بەهێزی سەربازی ئێمەوە کرد تێگەشتم کە تۆ نابێت کوڕی فیرعەون بیت، بەڵام ڕەوشت و ڕەفتارت سەرنجی منیان بەلای تۆدا ڕاکیشا، دەکرێت ناوی تەواوی خۆتم پێ بڵێیت.**

**موسا وتی: "ئاتون موسا!!"ئەوە ناوێکە کە دایکم بۆی هەڵبژاردوم، بەڵام هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسا لەڕۆژێکی تایبەتدا ئەو ناوەم لێ بنێت.**

**ستی کف وتی: ناوت دەقاودەق لەناوی پزیشکی هاوڕێم"ئاتون موسا"دەچێت، هەمان ئەو پزیشکەی کە ڕۆشتین بۆماڵیان و شەوێك لەوێ میوانیان بوین. ئایا تۆ باوەڕت بە"ئاتون"ە؟**

**موسا وتی: بەڵێ.**

**ستی کف وتی: من دوایین ساتەکانی ژیانم تێدەپەڕێنم، بەلامەوە گرنگ و جیاواز نیە سەربکەوم یان شکست بهێنم، بەڵام سەربازێك بووم کە بەپێی فەرمانەکان ژیاوم و نەدەبوو سنوری یاساکان ببەزێنم، ژیانی سەربازی هەمان ئەو شتەیە کە بەچاوی خۆت بینیت، بەڵام من لەسەردەمی لاویەتیەوە تا ئەم ساتە تان و پۆی ئەم جۆرە ژیانەم بەرجەستە کردووە. مردن و کوشتن و نابوتی لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا واتای جەنگ دەگەیەنێت، بەڵام بێ کوشتن و کوژران لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا دەستەواژەی خۆی لەدەست دەدات، من بێ لەجەنگ هەڵگری هیچ پیشەیەکی تر نەبوم، ئێستاش هەست دەکەم خەریکە دەمرم و واهەستیش دەکەم لەگەڵ مەرگدا لەحاڵی جەنگدام، بەڵام ئەمجارەیان ئەوە مەرگە لەم جەنگەدا سەردەکەوێت، دوای ئەوە یەکسەر وتی ئەفسەرەکانم بۆ بانگ بکە لەبەرئەوەی دەمەوێت قسەیان لەگەڵدا بکەم. موسا کاتێك لەحاڵی ئامادەباشیدا ڕاوەستابو فەرمانی پێدان بێنە ژورەوە و ئەوانیش یەکسەر لەچەواردەوری جێگەخەوەکەی"ستی کف"کۆبونەوە.**

**"ستی کف"ی فەرماندە لەکاتێکدا کە دەستی"موسا"ی گرتبوو وتی: هەموتان گەواهی ئەوە دەدەن کە موسا بەچ شێوەیەك بونایەتی خۆی لەم جەنگەدا سەلماند و گەوهەری فەرماندەیی خۆیی پێنیشان داین، لەبەرئەوەش موسا شایستەی ئەوەیە بکرێتە فەرماندەی ئەم لەشکرە، هەرلەبەرئەوەش ئەو لەجێگەی خۆمدا**

بەناونیشانی فەرماندەی هەموو هێزی سەربازی هەڵدەبژێرم، لەوانەیە لەنێو ئێوەدا کەسانێك هەبن کە لەڕوی ئەزمون و تەمەنەوە لەو شایستەتر بن، بەڵام ئەوەی لەم نێوەندەدا پێومرە ئەو تاقیکردنەوەیە کە ئەو لەگۆڕەپانی جەنگدا بەباشترین شێوە توانی ئەنجامی بدات. من دوای چەند ساتێکی تر چیتر بۆ هەمیشە ماڵئاواییتان لێدەکەم، دەمەوێت لاشەم بکەنە ناو سنوقێکەوە و بەپارێزراوی بیگەیەننە پایتەخت، کاتێك لاشەم بەپارێزراوی گەشتە شوێنی خۆی تەنها لەخاکی بسپێرن چونکە چیتر بەکەڵکی ئەوە نایەت مومیای بکەن، ستی کف کاتێك کۆتایی بەم قسانەی هات کۆچی دوایی کرد. موسا چیتر دوای مەرگی"ستی کف"لەچادرەکەی هاتەدەرەوە و ڕاستەخۆ بەرەو ڕوی"نون"ی نۆکەری ڕۆشت کە لەکەنار ڕوباری"نیل"دا بەدانیشتویی ڕۆچوبوە ناو هزری خۆیەوە.

موسا وتی: فەرماندە کۆچی دوایی کرد.

نون وتی: بەڕاستی سەربازێکی زۆر جدی و سەختگیر بوو.

موسا وتی: بەڵام من ناتوانم لایەنگری ڕەفتارەکانی بکەم، بەڕاستی ئەو ئاژەڵێکی زبردەست بوو کە تەنها چەند هەنگاوێك پێش خۆی دەبینی.

نون وتی: ئەگەر تۆش ڕۆژێك لەڕۆژان وەك ئەو ببیتە فەرماندە لەوانەیە کەسانی تر هەمان هەڵسەنگاندنیان بۆ ڕەفتارەکانی تۆش هەبێت.

موسا وتی: ئەی"نون"ئەو قسەیەی تۆ کردت تەنها کەسێك دەتوانێت بیهێنێتە زمان کە خۆی ڕۆژێك لەڕۆژان فەرماندە بوبێت، ئەرێ پێم بڵێ ئایا تۆ لەوڵاتی"هاتی"دا فەرماندە بویت؟... "نون"لەوکاتەدا تەنها بێدەنگی هەڵبژارد.

دوای کۆچی دوایی فەرماندەی هێزی سەربازی نێردراوی میسر موسا بەشێوەیەکی سەرەکی بو بەفەرماندە، بەڵام لەبەرئەوەی"سوکر موسا"کە لەدوای"ستی کف"بە دێرینترین و بەرجەستەترین کەس لەقەڵەم دەدرا، موسا بۆئەوەی هیچ ناکۆکیەك لەنێو هێزی سەربازیدا ڕونەدات پلەوپایەکەی خۆی بە"سوکر موسا"بەخشی. میسریەکان لەژێر فەرمانی"سوکەر موسا"دا هێرشیان بردە سەر پەرستگاکان و خوداکانیان لەناو بردن، پەیکەرەکانیان یان شکاند یان هەڵیاندانە ناو ڕوباری نیلەوە، سەربازەکانیش بێگوێدانە هیچ پیرۆزیەکی ئەو وڵاتە

پەرستگاکانیان وەك تەویلەیەك بەکار دەهێنا و لەهەمان ئەو شوێنەدا ئەسپەکانیان تێدا دەبەستەوە.

شەوێکیان"نون"ی نۆکەری موسا سەراسیمە لەخەو هەستا و بەترس و تۆقانێکەوە"موسا"ی لەخەو هەستاند و پێی وت: خەوێکی سەیرم بینی.

موسا وتی: چ خەوێکت بینی؟

نون وتی: لەخەومدا"ئیرگەباین"پادشای ولاتی"کوش"بەژنانی ئەو ولاتەی دەوت، ئەی ژنانی"کوش"بگرین لەبەرئەوەی ئێوە لەم ساتە بەدەواوە خوداتان نیە، چونکە خوداکانی ئێوەیان لەناو برد و پەرستگانیشیان کردووە بە گەوڕی ئەسپەکانیان، ئەی ژنانی کوش بگرین، چونکە فیرعەون لەڕێی هێزی سەربازیەکانیەوە دەستی بەسەر تەواوی دار و نەداری ئێوەدا گرتووە. ئێوە لەمڕۆدا لەهەر ڕۆژێکی تر زەبونتر و بێدەستەلات تر و کەمدەستترن، بۆیە لەمەودوا بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانتان دەستی سوالْ بۆ خەڵکی درێژ دەکەن. دوای ئەوە لەموسای پرسی، بۆچونی تۆ لەبارەی ئەم خەوم چیە.

موسا وتی: ئەو خودایانەی کە بەوشێوەیە بێدەستەلات بن و بەتەنها لێدانێك لەناو بچن، باشتر وایە هەر لەناو بچن. هەموو ئەم جۆرە گوتانە پوچ و بێبنەمان بۆ نمونە"خودای بەردین!خودای زێڕین!خودای زیوینی! بێگیان". ئێستاش ئاسودە بخەوە بۆئەوەی خەوێکی باشتر ببینی!

بەلام"نون"بەکونجکاویەکەوە لێی پرسی: تۆ دڵگرانی لەناوچونی ئەم خودایانە نیت؟

موسا وتی: ئەم پەیکەرە بەردین و بێگیانانە هەر لەسەرەتاوە دەستەپاچە و لەناوچوو بون، ئەو خودایەی کە بەدەستی مرۆڤ دروست دەکرێت خودا نیە.

نون وتی: کەواتە ئەوانەی بەدەستی هێزی سەربازی میسر لەناو چون خودا نەبون؟

موسا وتی: یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی خودا ئەوەیە کە هیچ کەسێك ناتوانێت چاوی پێی بکەوێت، بەلام هەموو ئەو خودایانە دەبینران.

نون وتی: تۆ کە بەوشێوەیە بیروباوەڕی خۆت لەبارەی خوداکانەوە دەخەیتە ڕوو، چ بەڵگەیەکت بۆ سەلماندنی ئەم گوتانەت بەدەستەوە؟

موسا وتی: بەڵگەم ئەوەیە کە دەتوانم بخوێنم و بنوسم و کتێبە کۆنەکانیش دەخوێنمەوە، و زۆر شتیش لەو کتێبانەوە فێربوم.

دوای زاڵبونی لەشکری میسر بەسەر وڵاتی "کوش"دا بەفەرمانی فەرماندە تەواوی ژنە ڕەشپێستەکانیان کۆکردەوە و بەسەر سەربازەکاندا دابەشیان کردن بۆئەوەی بەناونیشانی پاداشتێك لەبەرامبەر ئەرك وماندوبونیان پێیان ببەخشن و دوای ئەوە وەك کەنیزەیەك بیانفرۆشن. سەرەتا فەرماندە هەزار ژنی لێ هەڵبژاردن بۆئەوەی بەناونیشانی دەستکەوتی جەنگ بینێرێت بۆ فیرعەون. فەرماندەی هێزی نێردراوی میسر کچی پادشای کوش بەناوی"ئێرگا"ی نارد بۆماڵی"موسا"بۆئەوە لەوماڵەدا خزمەتی موسا بکات. هاوسەری"ئێرگە"چەند ساڵێك لەوەوپێش کۆچی دوایی کردبوو و"ئێرگا"تاکە پاشماوەی خێزانی پادشای کوش لەقەڵەم دەدرا کە زیندو بێت و ئێستاش بەدیلی گیراوە و وەك کەنیزەیەك پێشکەشی موسا کراوە. موسا سەرەتا حەزی نەکرد ئەو ژنە لەلای خۆی بهێڵێتەوە و داوای لەفەرماندە کرد کچی پادشا ببەخشێت بەکەسێکی تر.

فەرماندە بە"موسا"ی وت: ئەگەر"ئێرگا"ببەخشم بەهەرکەسێکی تر یەکسەر دەیبات بۆ بازاڕ و وەك کەنیزەیەك دەیفرۆشێت و منیش حەز ناکەم بەوشێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

"موسا"ش ناچاربوو"ئێرگا"وەك کەنیزەیەك لەلای خۆی بهێڵێتەوە، "ئێرگا"ش ژنێکی هۆشیار و چوست و چالاك بوو و زۆر زوو توانی زاڵ بێت بەسەرکاروباری ماڵی موسادا، هەروەها هەوڵی ئەوەشی دا سەرنجی موسا بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، بێئاگا لەوەی دڵی موسا ئاشقی کەسێکی تر بووە و زۆر گرنگی بە"ئێرگا"نەدەدا. بگرە موسا ئامادەش نەبوو قسە لەگەل"ئێرگا"دا بکات، سەرەڕای ئەوەش نەیدەتوانی بەزمانی کوش بدوێت. کاتێك"ئێرگا"دڵساردی و گرنگی نەدانی موسا بینی خۆشەویستیەکەی گۆڕا بەڕق و کینە، دوای ئەوە هەوڵی لەناوبردنی موسای دەدا و بەدوای هەلێکدا دەگەڕا کە پلانەکەی خۆی تێدا ئەنجام بدات، تا شەوێکیان

موسا وەك هەر شەوێكی تر ڕۆشت بۆ ژوری خەوتنەكەی بۆئەوەی بخەوێت و"ئێرگا"ش بەچەقۆیەكەوە خۆی كرد بەژورەكەیدا و بەلاسەریەوە ڕاوەستا بینی خەوی لێكەوتووە. لەوكاتەدا موسا هەستی كرد شتێك لەتەنیشتیەوە دەجوڵێتەوە، بۆیە بەخێراییەكی چاوەڕواننەكراو ڕاپەڕی و نوكی چەقۆكەی"ئێرگا"شانی موسا بریندارکرد، موسا هاواری كرد و"نون"ی نۆكەری بەسەر لێشواویەكەوە خۆی گەیاندە لای و بینی موسا شەڕ لەگەڵ"ئێرگا"دا دەكات. "نون"یەكسەر مەچەكی"ئێرگا"ی گرت و چەقۆكەی لەدەستی سەند، ئەو ژنەش بالایەكی كەتە و ئێسقانێكی ئەستور و بەتوانای هەبوو، بۆیە بەو ئاسانیە خۆی نەدەدا بەدەستەوە، ئەو ژنەش بەدەست و لەقە و گاز هەوڵیدەدا خۆی لەدەستی ڕزگار بكات، بەلام"نون" ئێرگای دا بەزەویدا و بەموسا وت: پەتێك بهێنە بۆئەوەی ئەم ژنەی پێ ببەستینەوە. دەستی كچی پادشایان بەستەوە و"موسا" چرایەكی هێنا و"نون"یش شانی برینداری موسا بەست و وتی: بەدڵنیاییەوە ئەم ژنە نیازی كوشتنی تۆی هەبووە، لەبەرئەوە دەبێت بیكوژین.

موسا وتی: نابێت بەهەڵەشەیی بڕیار بدەین، ئێستا كە زیندوم.

نۆكەرەكەی پێی وت: تۆ بێهودە كوشتنی ئەم ژنە دوا دەخەیت، ئەم ژنە زۆر هەڕەشە ئامێز و ترسناكە، ئەگەر كەمێك درەنگتر ڕاپەڕیایەیت بەدڵنیاییەوە ئێستا لەژیاندا نەمابویت.

موسا وتی: دەبێت بۆساتێك خۆمان لەجێی ئەودا دابنێین، ئەوە هەمان ئەو هێرشە بوو كە من بە"ستی كف"م وت بۆچی پێش كوشتنی باوكی ئەم كچە خۆی ناخاتە جێی ئەو.

ئەو كچە بەهیچ شێوەیەك لەگفتوگۆكانی ئەوان تێنەدەگەشت و نۆكەرەكەی"موسا"ش زمانی"كوش"ی نەدەزانی.

موسا وتی: ئەم كچە وا لێكی دەداتەوە كە ئێمە بكوژی باوك و براكانی ئەوین، لەكاتێكدا"سوكر موسا"و "ستی كف"پادشا و كوڕەكانی كوشت و منیش گلەیی ئەو ڕەفتارەم لێكردن. دوای ئەوە چەقۆی كچەكەی هەڵگرت و پەتەكەی دەستی پێی

بڕی و بەو ژنەی وت لێرە بڕوات. "ئیرگا"بۆماوەیەك بەدودڵی مایەوە، دوای ئەوە لەناکاو بەپەلە لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە.

بەم ڕەفتارەی تێڕوانینی "نون"ی لەبەرامبەر خۆیدا گۆڕی، بەڵام بەڕوکەش گۆڕانکاری بەسەر ڕەفتارەکانیدا نەهاتبوو. موسا لە"نون"ی پرسی: من چێژ لەسادەیی ژیانی تۆ وەردەگرم، ڕێزێکی زۆریشت لێدەگرم.

ڕۆژێکیان"نون"لەبەردەم کێوێکی بەرزدا لەموسای پرسی: ئەگەر بەسەر ئەم شاخەدا سەرکەوین و بڕۆینە ترۆپکی ئەم کێوە، دەتوانین لەسەر ترۆپکی ئەم شاخەوە تەماشای میسر بکەین.

موسا وتی: با سەرکەوین و تاقی بکەینەوە.

لەحاڵی سەرکەوتندا بوو نۆکەرەکەی دەستی گرت. موسا زۆر جدی بوو، وەك میسریەکان ئەفسانە پەرست نەبوو، بەڵام نون زۆر ئەفسانە پەرست بوو، بۆ هەموو جوڵە و شتێك ئەفسانەیەکی بۆ دەخوڵقاند، ئەو دەیوت: دەبێت هەموو کەسێك سود لە دوو ناو وەرگرێت. یەکێیان ناوی خۆی کە هەموو کەسێك بەوناوە بانگی دەکەن و ئەویتریان ناوێکی نهێنی بێت کە هیچ کەسێك نابێت بەو ناوەی بزانێت. چونکە هەرکەسێك ئاگاداری ناوی نهێنی هەر کەسێك بێت بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك دێت هەوڵی کوشتنی دەدات. ئەمە نمونەیەك بوو لەئەفسانە پەرستیەکانی"نون" ئەوەی بۆ موسا باسکرد کە پیشتر پەیڕەوی لەخودایەك کردووە کە ناوی"بعل"بووە، "بعل"نیوەی جەستەی وەك جەستەی ژن بووە و نیوەکەی تری وەك گیانەوەرێکی باڵدار بووە.

موسا وتی: ئەو تایبەتمەندیەکانی پەیکەری"ئەبولهول"ە کە ڕۆژانێك یەکێك بووە لەخودایانی میسر، بەڵام ئەمڕۆ چیتر لەناو چووە.

سەرەڕای ئەوەی"موسا و نون"هەوڵیان دا هیچ کەسێك ئاگاداری بەسەرهاتی "ئیرگا"نەبێت، بەڵام بۆچی لەناکاو"ئیرگا"هەموو خەڵکی بەڵکو خودی"سوکر موسا"ی لەم ڕوداوە ئاگادارکردەوە، بەڕاستی زۆر سەیرە.

"سوکر موسا"لە"موسا"ی پرسی: ئایا ڕاستە کە"ئیرگا"پەلاماری داویت؟

موسا وتی: بەڵێ.

"سوکر موسا" وتی: کەواتە دەبێت"ئیرگا"بکوژرێت.

موسا وتی: من بەخشیم و نامەوێت بکوژرێت.

فەرماندە وتی: بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئەم ژنە نەکوژرێت ئەوا ئەو تۆ دەکوژێت...

سوکر موسا کچی پادشای نارد بۆماڵی"هتپ رە"ی فەرماندەی ڕابردوو بۆئەوەی ئەم ئاژاوەیە لەنێوانیاندا لەناو ببات. "هتپ رە"ش کە بەردەوام دەیخواردەوە، لەبەرئەوەی سەرخۆش بوو داوای لە"ئیرگا"کرد لەگەڵیدا ڕابوێرێت و "ئیرگا"ش داواکەی ڕەت دەکاتەوە، "هتپ رە"ش لێی تووڕە دەبێت و بەچەقۆیەك پەلاماری دەدات و دەیکوژێت. دوای کوشتنی ئەو ژنە "هتپ رە"ی فەرماندەی کۆن ترسی لێ نیشت و بەسەربازەکانی دەوت لەکاتی شەودا لاشەکەی بەخاك بسپێرن. بەیانی هەمان ئەو شەوە ڕەشپێستەکانی"کوش"ئاگاداری بون کە کچی پادشایان کوشتووە، بۆیە هەوڵی تۆڵە سەندنەوەیان دەدا. سوکەر موسا بۆ وروژانی تووڕەیی ڕەشپێستەکان لەیەك ڕۆژدا هەزار پیاوی لێکوشتن. "هتپ رە"هەوڵی دا تاوانەکە بخاتە ئەستۆی"موسا". بەردەوام کەسانی تری دژی"موسا"هان دەدا، تا ئەوکاتەی کارگەشتە ئاستێك کە لەناو هەموو ئەفسەرەکاندا وتی: باشتر وایە"موسا" لەناو ببەین.

"نون"بەڕێکەوت لەوکاتەدا لەو نزیکانەدابوو و گوێی لەقسەکانی"هتپ رە"بوو، دوای ئەوە جوان گوێی لێگرت بۆئەوەی بزانێت باسی چی دەکات: ئەگەر موسا "ئیرگا"ی لەماڵی دەرنەکردایە، ئەوا من لەکاتی مەستیدا نەمدەکوشت، کەواتە تاوانباری یەکەم لەکوشتنی"ئیرگا"دا موسایە! "نون" کەئاگاداری ئەو بەسەرهاتە بوو دەیزانی"هتپ رە"درۆیان لەگەڵدا دەکات، بەتایبەت ئەوەی دوبارە و دوپات دەکردەوە: ئەگەر موسا بکوژین، هەموومان ئاسودە خەیاڵ دەبین، "نون"بەبیستنی ئەم گوتانە زۆر دڵگران بوو، بۆیە ڕۆشت موسای لەهەموو شتێك ئاگادار کردەوە؟

موسا وتی: ئەو کەسەی ئەم قسانەی بۆ گێڕاویتەتەوە بەدڵنیاییەوە ویستویەتی من دژی"هتپ رە"بوروژێنێت لەبەرئەوە نابێت باوەڕ بەم جۆرە قسانە بکەیت.

نۆکەرەکەی"موسا"ش وتی: کەواتە تۆ پێم دەڵێت چیتر نابێت متمانە بەگوێکانم بکەم، ئەوەی بۆم گێڕایتەوە بەگوێکانی خۆم بیستم.

موسا وتی: ناتوانم باوەڕ بەو قسانە بکەم.

نون وتی: ئەو هەوڵی کوشتنی تۆ دەدات، تۆ دەبێت دەستپێشخەری بکەیت.

موسا وتی: نامەوێت لەمبارەیەوە گوێم لەهیچ شتێکی تر بێت.

"نون"دوای ئەوە هیچی نەوت، بەڵام شەو و ڕۆژ"هتپ رە"ی خستبووە ژێری چاودێریەوە، بۆئەوەی بزانێت لەچ کات و لەچ شوێنێکدا نیشتەجێیە و لەچ کاتێکدا دەگەڕێتەوە بۆماڵی خۆی و لەچ کاتێکدا دێتە دەرەوە. دوای چەند ڕۆژێک ئێشککگری"نون"پەیی بەوە برد"هتپ رە"شەو درەنگانێك دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ و کاتێکیش دەگەڕێتەوە زۆر مەست و شل و شۆڵە کە ناتوانێت لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت. نۆکەرەکەی موسا"نون"چاوەڕێی کرد تا"هتپ رە" لەتەنیشتیەوە تێپەڕی و چەقۆ بەدەست لەدوایەوە کەوتە ڕێ و بەدوای هەلێکدا دەگەڕا کە لەگۆشەیەکی چۆڵدا لەناکاو سودی لەچۆڵ و هۆڵی ناوچەکە وەرگرت و چەقۆکەی خستە سەرملی"هتپ رە" و بەدەستەکەی تری بەتوندی دەمی گرت و بەهەموو توانایەکی فشاری خستە سەر چەقۆکەی و شاڕەگی خوێنی ملی"هتپ رە"ی بڕی، دوای ئەوە"نون"دەست بەرداری بوو، بەیانی هەمان ئەو شەوە جەستەی خوێنینی"هتپ رە"یان دۆزیەوە و وایان زانی کە ڕەشپێستەکان لەبەرامبەر ئەو تاوانانەی کە هێزی سەربازیەکانیان لەبەرامبەر خەڵکەکەیاندا ئەنجامیان داوە تۆڵەی خۆیان کردوەتەوە بەهۆی ئەم بیرکردنەوە هەڵەیانەوە بکوژی سەرکی ون بوو. "سوکەر موسا"ی فەرماندە سەرەتا گومانی لە"نون"ی نۆکەری موسا نەبوو، بگرە لەمبارەیەشەوە ناوی نەهێنا و وتی: بەدڵنیاییەوە"هتپ رە"سەرخۆش بووە و لەگەڵ کەسێکدا بەشەڕهاتووە و لەئەنجامی ئەم شەڕەیاندا ئەو بەکوشت دراوە. ڕەوشت و ڕەفتاری"هتپ رە" بەشێوەیەك بوو کە توانایەکی تەواوی بەم جۆرە ئەگەرانە دەبەخشی، چونکە ئەو لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەدەگونجا و دوژمنایەتی و شەڕی لەگەڵ زۆربەی ئەفسەرەکاندا کردووە،

موسا بەباسکردنی ئەم خاڵانە بە"نون"ی وت: سەرەڕای ئەوەش من بەکوشتنی"هتپ رە"ڕازی نیم و کوشتنی ئەو بەپێچەوانەی بنەما و یاساکان دەزانم.

لەمکاتەدا"سوکەر موسا"چەند پرسیارێکی لەموسا کرد چونکە زیاتر گومانی لە موسا هەبوو و پێی وت: تۆ ئاگاداری کوشتنی"هتپ رە"نەبویت؟

موسا وتی: لەکوێوە ئاگاداری کوشتنی"هتپ رە"بم؟

"هتپ رە"بەجێگرەکەی خۆی وت: من زانیاری ئەوەم پێگەشتووە کە"هتپ رە"هەڕەشەی کوشتنی لێ کردویت، لەبەرئەوە هەر ئەم خاڵە دەبێت بکرێتە پاڵنەرێك بۆ کوشتنی ئەو.

موسا وتی: کەسانی وەك"هتپ رە"بەد ڕەوشت و ناسازگارن و زۆریش باس و هەڕەشە لەم و لەو دەکەن، بەڵام بێ لەقسە هیچی تر نیە، لەبەرئەوەی ئەگەر بیویستایە ئەم قسانەی کرداری بکات، بەئاشکرا بۆ خەڵکی نەدەگێڕایەوە، لەبەرئەوە گوتەی کەسانی وەك ئەو بەهەڕەشە لێکنادەمەوە، سەرەڕای ئەوەی بەڕوکەش خۆی بەهاوڕێم نیشان دەدات، ئێستا بەچ شێوەیەك پرسیاری وام لێدەکەیت؟

سوکر موسا وتی: هەمان ئەم هەڵسەنگاندن و هەڵەتێگەشتنانە دەتوانێت هانی ئەوەت بدات تۆڵەی لێ بکەیتەوە.

موسا وتی: تۆ لەهەڵسەنگاندنەکانتدا بەهەڵەدا چویت، من لەپێنان چەند گوتەیەکی پڕوپوچدا هەوڵی کوشتنی هیچ کەسێك نادەم.

سوکر موسا وتی: بێ لەم بابەتی هەڕەشەیە، ئەو لەکاتێکدا تۆ لەو شوێنانەدا نەبویت باسی چەند بابەتێکی تر کردووە کە من زیاتر لەتۆ بەگومانتر دەکات.

پرسیاری ئەو بابەتەی لێکرد: ئەوە چ بابەتێکە کە بەو ڕادەیە بەلاتەوە گرنگ دێتە بەرچاو؟

سوکرموسا وتی: تەنها یەك کەس دەتوانێت بێ هیچ ترسێك"هتپ رە"بکوژێت ئەوکەسەش خودی تۆیە، لەبەرئەوەی ناتوانم بەهۆی تاوانی کوشتنی"هتپ رە"سزات بدەم، لەبەرئەوەی تۆ کوڕی فیرعەونیت.

موسا وتی: دڵنیابە لەوەی ئەگەر مەبەستێکی وام هەبوایە ئەوا بەئاشکرا بانگێشتی گۆڕەپانی جەنگم دەکرد و بەبەرچاو هەموو سەربازەکانەوە شەڕم

لەگەڵدا دەکرد، من هیچ دژمنایەتیەکم لەگەڵ"هتپ رە"دا نەبووە کە بەو شێوەیە بەنهێنی هەوڵی کوشتنی بدەم.

سوکر موسا وتی: ئێستاش کەوا دەڵێیت باوەڕت پێدەکەم، سەرەڕای ئەوەش فیرعەون پەیامێکی بۆ ناردوم کە پەیوەست دەکرێت بەتۆوە. سوکەر موسا بەمشێوەیە بۆی ڕونکردەوە: فیرعەون فەرمانی داوە گەڕانەوەت کەمێکی تر دوا بخات و ئەم دورخراوەییەی تۆ کەمێکی تر درێژە بکێشێت. هۆکارەکەشی خۆت دەزانی؟

موسا وتی: بەڵێ هۆکارەکەی باش دەزانم چیە.

سوکەر موسا وتی: ئەکرێت منیش بزانم؟

موسا وتی: ڕۆژێك دێت بۆ هەموو ئاشکرا دەبێت، لەئێستادا ئەم نهێنیە بەشاراوەیی بمێنێتەوە.

سوکر موسا وتی: فیرعەون باسی شتێکی تری کردووە.

موسا پرسی: ئەو شتە چیە؟

سوکەر موسا وتی: فیرعەون لەڕێژەی دەستکەوتەکان ناڕازیە و ئەوەی دوپات کردووەتەوە کە دەستکەوتەکان دەبێت زۆر لەوە زیاتر بن کە نێردراون، بەدڵنیاییەوە ئەو ئەفسارانە دەستیان لەو سامانە داوە کە نێردراوە بۆ فیرعەون، لەبەرئەوە دەبێت قەرەبوی بدەینەوە و بڕێك زیڕی تری بۆ بنێرین!!

موسا وتی: تۆ دەتەوێت چی بکەیت؟ خۆ ئێمە ناتوانین ئاڵتون دروست بکەین، زێر بەردی کێوەکان نیە تا بەئاسانی بەدەست بێت.

سوکر موسا وتی: وایە ئێمە توانای دروستکردنی زێڕمان نیە، بەڵام لەوانەیە ئەم ڕەشپێستانە بڕێکی تر زێڕیان هەبێت و لەئێمەیان شاردبێتەوە، دەبێت وایان لێ بکەین ئاڵتونە شاردراوەکانمان پێ بدەن بۆئەوەی فیرعەون لەخۆمان ڕازی بکەین.

موسا وتی: من بەدڵنیاییەوە پێت دەڵێم کە ئەم ڕەشپێستانە زێڕیان نیە و ئێمە بێهودە کاتی خۆمان لەئەشکەنجەدانیاندا بەفیڕۆ دەدەین، دەبێت بیر لەشتێکی تر بکەینەوە، چونکە زانیاری ئەوەم پێگەشتووە کە ئەم ڕەشپێستانە هیچ شتێکی

بەهادار شك نابەن لەبەرئەوەی ئەفسەرە میسریەکان هەموویانیان لێ سەندون، بگرە دەستیان بەسەر کاسەکانیشیاندا گرتووە چ بگات بەزێڕ و زیو.

سوکر موسا وتی: فیرعەون لەنامەکەیدا پێشنیارێکی تری کردووە.

موسا وتی: چ پێشنیارێك؟

سوکەر موسا وتی: فیرعەون ئاماژەی بەوە داوە کە لەباشوری وڵاتی "کوش"، شوێنێك کە ڕوباری نیل لەوێوە هەڵدەقوڵێت، سەرچاوەی باشترین زێڕی جیهانە، بیستومە کە دیواری شارەکانیشیان زێڕە! یان ڕوپۆشی زێڕە، پەیکەری خوداکانیان سەرتاپا لەزێڕ دروست کراوە کەهەریەك لەو پەیکەرانە بەئەندازەی سەد بەردی میسری قورسە.

موسا وتی: بێگومان ئەفسانەیەکیان بۆ فیرعەون گێڕاوەتەوە، ئەویش هەمان ئەو چیرۆکانەیە کە لەسەردەمی منداڵیدا بۆیان گێڕاوینەتەوە بۆئەوەی خەومان لێ بکەوێت، بەڵام فیرعەون لەبێداریدا باوەڕێی پێکردووە و دەیەوێت بێهودە توشی دەردیسەریمان بکات.

سوکەر موسا وتی: من هەمان دەستنوسی فیرعەونت بۆ دەخوێنمەوە بۆئەوەی بزانی بەڕاستیەتی، بڕۆن بۆ کۆتایی باشوری "کوش" و تەواوی زێڕی ئەو شارە باربکەن و بۆمی بنێرن.

موسا وتی: فیرعەون ئەم فەرمانەی بۆ کێ ناردووە؟

سوکەر موسا وتی: بەدڵنیاییەوە بۆ فەرماندەی هێزی سەربازی نێردراوی میسر.

موسا وتی: کەواتە ئاشکرایە بۆتۆی ناردووە، تۆ هێزی سەربازی ڕەوانەی شوێنی مەبەست بکە و هەموو زێڕی شاری ئەفسانەی بار بکە و بینێرە بۆ فیرعەون.

سوکەر موسا وتی: من لەم ڕۆشتنەم دەترسم.

موسا وتی: تائێستا لەم شوێنە و ئەم ڕێگا دورودرێژ و کوشندەیە نەترساوین، ئەم ڕێگایە لەچاو ڕێگای پێشوو زۆر درێژخایەن نیە، بۆچی لێی دەترسی؟

سوکەر موسا وتی: تا وڵاتی کوش ئێمە دوژمنمان لەپشتەوە نەبووە، بەڵام لەمەو دوا ئەم ڕەشپێستان بچوکترین هەل دەقۆزنەوە بۆئەوەی تۆڵەی خۆیانمان لێ بکەنەوە، دەتوانن بەئاسانترین شێوە تۆڵەمان لێ بکەنەوە و لەناومان ببەن و توانای

ئەنجامدانی ئەم کارەشیان هەیە، ئەویش بچڕانی پەیوەندی ئێمەیە لەگەڵ وڵاتی میسردا، ئەوکات ئێمە دەبینە دیلی دەستی بیابان و دواجاریش لەناو دەچین، ئەوانیش بەباشی شارەزای ئەم ناوچەیەن و زۆرباشیش دەزانن بەچ شێوەیەك گیرۆدەمان بکەن، سەرەڕای ئەوەش فەرمانی فیرعەون نابێت بەو شێوەیە بمێنێتەوە دەبێت شتێك بکەین.

موسا وتی: پێویست ناکات تۆ و تەواوی لەشکرەکە بڕۆن بۆ ئەو شارە ئەفسانەییە، دەتوانی بڕێکیان لێ بنێریت بۆ ئەو شارە بۆئەوەی هەم فەرمانەکانی فیرعەون جێبەجێ بکرێت، هەم خۆت دوچاری ئەو هەڕەشەیە نەکەیت.

سوکەر موسا وتی: سڵاوت لێ بێت، بەهیچ شێوەیەك بیرم لەم پلانە نەکردبووەوە، بەڕاستی بیرۆکەیەکی زۆر باشە، من کۆمەڵێکی پڕچەك بەچەند کەسێکی هەڵبژاردەیان دەسپێرم بۆئەوەی بڕۆن بۆ ئەوێ، لەبەرئەوەی تۆ لەهەموو ڕویەکەوە کەسێکی شایستەی، فەرماندەیی شاری زێڕ بەتۆ دەسپێرم.

موسا ماوەیەك بیری لێکردەوە و وتی: ئەگەر من ئەم پێشنیارەم بۆ نەکردایەیت ئەوکات تۆ دەتتوانی چی بکەیت، ئایا بیرت لەم بابەتە کردبویەوە؟

سوکەر موسا یەکسەر وتی: بەڵێ، هەمان ئەو پێشنیارەی تۆ کردت پێش تۆ بیرم لێکردبووەوە، بەڵام نەمتوانی بەو ئاسانیە دەریبڕم، تۆ فەرمانت پێ کراوە بڕۆیت بۆ شاری زێڕ، ئەمەیان خواست و فەرمانی من نیە.

موسا وتی: ئەگەر خواست و فەرمانی تۆ نیە، خواست فەرمانی کێیە؟

سوکەر موسا وتی: ئەوە خواست و فەرمانی فیرعەونە، دوای ئەوە موسا تێگەشت تەواوی ئەو نامە و زێڕ و شاری ئەفسانەیە تەنها بیانویەکە بۆ دورخستنەوەی ئەو لەمیسر، بۆیە ناچاربوو پەسەندی بکات.

موسا دەیزانی کە فیرعەون نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ پایتەخت، ئەمەش چەند ساڵێك درێژە دەکێشێت، لەوانەشە هەرگیز نەگەڕێتەوە. بۆیە وتی: دەمزانی کە فیرعەون بەو ڕادەیەش سادە و بێمێشك نیە کە نەتوانێت جیاوازی نێوان شاری ئەفسانە و وڵاتێکی ڕاستەقینە لەیەك جیا بکاتەوە، ئەو ژیرانە و بەبەرنامە ئەو

نامەیەی ناردووە بۆئەوەی من لەو دۆڵەدا بهێڵێتەوە، شاری زێڕ جگە لە ئەفسانە و خەیاڵ هیچ شتێکی تر نیە.

سوکەر موسا وتی: وانیە، سەردانی هەریەك لەو ئەفسارانە بکە کە زانیاری و ئەزمونیان لەو بارەیەوە هەیە ، دەبینی پێت دەڵێن کە شارێکی ئاوا لەڕاستیدا بونی هەیە، ئێستا ئامادەیت هەوڵی دۆزینەوەی بدەیت؟

موسا وتی: ناچارم بەناونیشانی فەرماندە و سەربازێك فەرمانی فەرماندە جێبەجێ بکەم، بەڵام دەزانم کە من بەدوای شارێکی ئەفسانەییدا دەنێرن.

سوکەر موسا وتی: هەرچەنێك سەرباز کە خۆت دەتەوێت بەهەموو پێداویستیەکەوە هەڵبژێرە و ڕێگای ئەو شارە بگرە بەر.

موسا لەپێش ئەو کەسانەی هەڵبژاردبون ڕێگای شاری ئەفسانەی گرتەبەر و لەئەنجامدا مەودای لەگەڵ سەربازەکاندا کەم بویەوە. درێژی ڕێگا، ڕێژەی کەمی سەربازەکان، ئامانجێکی نادیار هەموو ئەمانە بووە هۆی ئەوەی موسا و سەربازەکان زیاتر خوو بەیەکتریەوە بگرن و موسا بگرە گوێی لەگاڵتەی سەربازەکانیش دەگرت کە زۆر ڕەچاوی هەندێك بابەتی شاراوە و ناسکیشان نەدەکرد، سەرەڕای ئەوەی ئەم تێکەڵ بونەی کەمێك بەلایەوە سەخت بوو، بەڵام موسا دەبوو دانی بەخۆیدا بگرتایە.

"نون"لەسەرەتای ڕێکردنیاندا وتی: گەورەم، ئایا ئاگاداری ئەوەیت کە دەڕۆین بۆ ئەوپەڕی جیهان، و دەبینی کە لەو شوێنە نە کۆتایی جیهان و نە ئەو ئاگرەی کە بۆیان گێڕاویتەتەوە، دەبینی.

دوای ئەوە نون لێی پرسی: لیرەوە تا ئەو شوێنەی مەبەستمانە چەنێك ڕێگایە؟

موسا وتی: دەقاودەق نازانم، بەڵام بەپێی گوتەی"سوکەر موسا"بۆم دەرکەوت بەلایەنی کەم سەد ڕۆژ ڕێگایە.

"نون"وتی: ئەگەر دوای ئەو هەموو ڕۆژە شاری زێڕمان نەدۆزیەوە چی بکەین.

موسا وتی: دەگەڕێینەوە.

نون دوبارە لێی پرسی: ئەگەر شاری زێڕمان دۆزییەوە چی بکەین.

موسا وتی: دوبارە دەگەڕێینەوە و هەواڵی دۆزینەوەی شاری زێڕی پێ ڕادەگەیەنین.

نون لێی پرسی: ئایا ئێمە شاری زێڕ داگیر ناکەین؟

موسا وتی: ئێمە داگیرکەر نین، تەنها فەرمانیان پێداوین شاری زێڕیان بۆ بدۆزینەوە. سەرەڕای ئەوەش"سوکەر"یش ناتوانێت پارچەیەك لەو زێڕانە ئەگەر لەڕاستیدا زێڕی تێدا بێت بۆخۆی خەڵگرێت، چونکە لەمحاڵەتەدا یاری بەسەری خۆی دەکات، فیرعەونیش لەمبارەیە بچوکترین لێبوردنی نیە.

نون دوبارە لێی پرسی: لەوانەشە ڕێگاکەمان ون بکەین.

موسا وتی: ئێمە هەرگیز ڕێگا ون ناکەین، لەبەرئەوەی ڕوباری نیل باشترین ڕێبەرمانە، ئێمە بەرەو سەرچاوەی نیل دەڕۆین.

پەیوەندی نێوان"نون و موسا"بەدرێژای ئەم ڕێگایە تا دەهات بەهێزتر دەبوو و گفتوگۆیەکی زۆر لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕی پێکرا. نون پێشتر بگرە وشەی نەخێر یان بەڵێی نەدەهێنایە زمان، لەڕێدا هەوڵیدا چەند وشەیەك لەزمانی ڕەچەڵەکی خۆی فێری موسا بکات. موسا بەدوبارەکردنەوەی ئەو وشانە وتی: ئەم وشانە زۆر لەزمانی میسریەوە نزیکە، دیارە ئەم دوو زمانە بنەچەیەکی هاوبەشیان هەیە. کاتێك گەشتنە ناوچە کوێستانیەکان بینی گالیسکەوان بەترسەوە تەماشای ترۆپکی شاخ دەکات.

موسا لێی پرسی: مەگەر تۆ لەکێو دەترسیت؟

نون وەڵامی دایەوە: من لەکێو ناترسم، بەڵکو لە"بعل"دەترسم.

موسا وتی: "بعل"چ پەیوەندیەکی بە کێوەوە هەیە؟

نون وەڵامی دایەوە: "بعل"لەگەڵ منداڵەکانیدا هەمیشە لەترۆپکی کێوەکاندا ژیان بەسەر دەبات.

موسا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: ناتوانم باوەڕ بەم قسەیە بکەم، بۆچی کاتێك لەدەشتدایت، بەو ڕادەیە لە"بعل"ناترسیت.

نون وتی: لەدەشتیشدا لە"بعل"و منداڵەکانی دەترسم، بەڵام لەنزیك کێوەکانەوە زیاتر لێی دەترسم.

موسا وتی: تۆ لەچ شوێنێکدا دەژیایت؟

نون وتی: شوێن لەدایك بونم دەشتێکی فراوانە بەناوی"کەنعان"

موسا وتی: ئەم ناوە بەلامەوە زۆر ئاشنایە... . دوای ئەوە لێی پرسی: تۆ ئاگاداری دایك و باوك و باوباپیرانتی، باسی ئەوانم بۆ بکە!

نون وتی: هەموو کەسێك باپیرەم باش دەناسێت، "ئیبراهیم"هەڵبەت هیچ کەسێك نازانێت لەچ سەردەمێکدا ژیاوە، لەوانەیە کاتێك ژیاوە کە میسریش بونی نەبوبێت.

موسا وتی: ئێمەش هاوشێوەی ناوی"ئیبراهیم"مان هەیە کە بە"ئاورام"بانگی دەکەین.

نون وتی: ئەم ناوەش هی ئێمەیە، میسریەکان بێ لەم ناوە هەندێك شتی تریان لەئێمەوە وەرگرتووە، "کەنعان"ولاتێکی کۆنە و شتگەلێکی زۆری بەمیسر بەخشیوە. کاتێك"نون"باسی باوباپیرانی بۆ موسا دەکرد ئەفسانەیەکی زۆریشی ئاوێتەی گوتارەکانی کردبوو، بەڵام لەکۆتایی"موسا"وا لە"نون"تێگەشت کە باوباپیرانی"نون"ی نۆکەری بەواتا یەکەم باپیر و دووەم باپیری خێڵە سەرەتاییەکانی کەنعان"ئیبراهیم"بووە کە بەزمانی میسری بە"ئاورام"بانگی دەکەن هەروەها سەرۆکایەتی ئەو خێڵەشی لەئەستۆدا بووە، دوای ئەو"ئسحاق"ی کوڕی"ئیبراهیم"بووەتە جێنشینی باوکی، هەڵبەت"نون"ئسحاق"ی بە"پترهاگ"بانگ دەکرد، دوای ئەویش"یەعقوب"بو بەجێنشینی کە ئەویش بەزمانی"کەنعان"ی ئەو سەردەمە بە"یاکوب"بانگیان دەکرد، سەرەڕای ئەم ناوەش ناوێکی تری هەبوو بە ناوی"یس رایل"، "نون"بەو شێوەیە بۆ موسای باسکرد کە"یعقوب"کوڕێکی جوانی بەناوی"یوسف" و چەند کوڕێکی تری هەبووە.

کاتێك کۆتایی بەو داستانەی"نون"هات، موسا لێی پرسی: ئەگەر بەهەڵەدا نەچوبم"یعقوب"دوانزە کوڕی هەبووە و هەریەك لەکوڕەکانی سەرۆکایەتی خێڵێکیان لەئەستۆ گرتبوو و دوانزە خێڵەکەی ئیسرائیل لەمانەوە سەرچاوە دەگرن؟

نون وتی: زۆرباش لەمەبەستم تێگەشتی.

دوای ئەوە موسا لێی پرسی: تۆ سەر بەکام یەك لەم خێڵەیت؟

نون وتی: بۆچی ئەم پرسیارەم لیٚ دەکەیت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی خۆشم سەر بەیەکێك لەم دوانزە خێڵەم.

نون وتی: لەبەرئەوەی تۆش سەر بەم خێڵانەیت پێت دەڵێم کە سەر بەچ خێڵێك لەم خێڵانەم، من سەر بەخێڵی "لوی"م.

"موسا"ش وتی: من سەر بەخێڵێکم کە لەوڵاتی "کوش"دا نیشتەجیٚ بون و سەر بەم خێڵانەن، بەڵیٚ من سەر بەخێڵی "کوش"م. دوای ئەوە موسا دەستی بۆ ڕوباری "نیل" ڕاکێشا و وتی: تەماشا کە ڕوباری نیل لەم ناوچەیەدا ڕەنگی شین باوە، بەڵام گۆڕاوە بەڕوبارێکی زۆر بچوك و زیاتر لەچەم و جۆگەلەیەك دەچێت تا ڕوبارێکی گەورە. ئەم ناوچەیە کوێستانیە و ناتوانین بەگالیسکەکانمانەوە لەوێوە تێپەڕین، بۆیە دەبێت گالیسکەکانمان لێرەدا بەجیٚ بهێڵین و بەئەسپەکانمان ئەم ڕێگایە بگرینە بەر. ئەو ڕێگایەی ئەوان گرتبویانە بەر دۆڵێك بوو کە لەکەنار ڕوباری "نیلە"تا ترۆپکی شاخەکان بەبەرگێکی سەوز داپۆشرابوو.

نون وتی: وەك بڵێی فەرشێکی سەوزیان لەسەرتاپای ئەم ناوچەیەدا ڕاخستبێت.

لەو ناوچەیەدا شەوانی زۆر سارد دەبوو و خەڵکەکەی ناچاردەبوون ئاگر بکەنەوە. سەیر لەوەدا بوو کە هیچ گیانەوەرێك سڵی لیٚ نەدەکردنەوە و زۆر بەئاسایی لێیان نزیك دەبونەوە و مەیمونەکانیش شەو و ڕۆژ لەچواردەوریاندا بون و گیانەوەرەکانی تریش لەسەر تاوێرە بەردێك ڕادەکشان و سەرقاڵی تەماشاکردنی ڕێبوارەکان بون. یەکێك لەخۆشگوزەرانی سەربازەکان ئەو کاتانە بوو کە کەرەکان دەستیان بەسەرەسەر دەکرد، دوای تەواو بونی ئەو سەرەسەرە گیاندارەکانی تر هەریەك بەشێوەی تایبەتی خۆیان دەستیان دەکرد بەهەراوهوریا، ڕۆژێکیان لەڕێگایەکدا سمی ئەسپەکەی "موسا" چەقیە ناو کونێك و بووبەهۆی شکاندنی مەچەکی ئەسپەکەی، چیتر دوای ئەوە ئەسپەکەی نەیدەتوانی ڕیٚ بکات، دوای ئەوە لەنێو خۆیاندا گفتوگۆیان بوو و دەیانوت ئەگەر لێرە بەجێی بهێڵین شێرەکان چواردەوری دەگرن و پارچەپارچەی دەکەن، "موسا"ش حەزی نەدەکرد شێرەکان ئەسپەکەی پارەچە پارچە بکەن، بۆیە ئەوەی بەباش زانی بیکوژێت بۆئەوەی لەو ئازارە ڕزگاری بکات.

موسا بەیەکێك لەسەربازەکانی وت: تۆ بەشێوەیەك بیکوژە کە هەست بەهیچ ئازارێك نەکات.

ئەو ڕۆژەی ئەسپەکەیان کوشت"نون"دارێکی پیشانی"موسا"دا و وتی: ئەمڕۆ چل و نۆیەمین ڕۆژی ڕێکردنمانە.

موسا پرسی: بەچ شێوەیەك بەوردی ئاگاداری ئەوەیت کە چەندەمین ڕۆژی کۆچمانە؟

"نون"یش دارەکەی دەستی پێنیشاندا کە هەموو ڕۆژێك هێڵێکی پێدا دەهێنا، کە چل و نۆ هێڵی پێدا هێنرابوو. "نون هەموو بەرەبەیانێك پێش ئەوەی بەڕێکەون هێڵێکی تازەی پێدا دەهێنا.

لەمکاتەدا داستانی سەرچاوەی ڕوباری"نیل" دەمە و دەم بەنێو سەربازەکاندا گواسترایەوە، چونکە ڕوباری"نیل"لەهەر ناوچەیەکدا بەشێوەیەك لەشێوەکان بەنێو کێو و دەشتەکاندا تێدەپەڕێت. لەنێو هەموو بەسەرهاتەکاندا تەنها بەسەرهاتێکیان لەنێو سەربازەکاندا ڕەواجی هەبوو ئەویش ئەو بەسەرهاتەیان بوو کە هەرکەسێك بڕۆشتایە بەدەوای دۆزینەوەی سەرچاوەی ڕوباری"نیل"دا هەرگیز نەگەڕاوەتەوە. لەهەمان ئەو کاتەدا هەم ئەوان گەشتنە ترۆپکی شاخێك و تەماشای تیشکێکی ئەرخەوانیان دەکرد.

نون وتی: موسا تەماشای ئەوێ بکە ئەو شوێنە بەدڵنیاییەوە کۆتایی جیهانە، ئەوە هەمان ئەو ئاگرەیە کە وتم سوتێنەرە، ئیتر لێرە بەدواوە دەگەڕێمەوە و هەنگاوێك بەرەوپێش نانێم.

موسا لێی تورە بوو و بەسەریدا هاواری کرد و وتی: نامەوێت ئەرکێك کە پێم سپێدراوە بەهۆی ئەفسانە پەرستیەکانی تۆوە بەنیوەچڵی بەجێ بهێڵم، تۆ کەسێکی ئەندێشە پەرستی و والێکی دەدەیتەوە و کە لێرەدا چیتر کۆتایی بەجێهان هاتووە، لەکاتێکدا هەرچەنێك بڕۆین هێشتا کەمترین ڕێگای ئەم جیهانەمان بەپێی بڕیوە، لەبەرئەوە ئەگەر ئەو بەرپرسیاریەتیەی بەمن سپێدراوە بەجێی نەگەیەنم، ئەوا بەسزای سەرکێشی دەمکوژن.

نون وتی: تۆ ئالێرەوە بگەڕێوە و پێیان بڵێی کە شاری زێڕم نەدۆزیەوە.

موسا وتی: کاتێك فەرمانده"سوکەر موسا"لێم بپرسێت، چەند ڕۆژ ڕێت کرد، لەهەمان ئەوساتەدا بۆی دەردەکەوێت کە من فەرمانەکانی ئەوم جێبەجێ نەکردووە، بەڵام بەلایەنی کەم دەبێت سەد ڕۆژ ڕێ بکەین، لەکاتێکدا بەپێی ئەو هێڵانەی لەسەر ئەو دارە کێشاوتن هێشتا نیوەی ئەو سەد ڕۆژەمان نەبڕیوە، لەبەرئەوە من بەردەوامی بەم ڕێیەی خۆم دەدەم.

لەو شەوەدا ئاسمان هەوری بوو و هەورەگرمە و هەورە بزیسکەیەکی زۆری هەبوو، دوای ئەوەش باران باری، لێزمەی باران بەڕادەیەك زۆر بوو بووە هۆی ئەوەی ڕوباری نیل بەرز بێتەوە و هەڵچێت و لەگەڵ خرۆشانی هاوکات لەگەڵ هەورەگرمەدا ڕوناکیەکی ترسناکی لەدۆڵ و چەمدا دروست دەکرد، "نون"بێدەستەڵات لەترساندا دەستی کرد بەگریان. "موسا"ش کە دەیزانی"نون"دوچاری"ئەندێشەپەرستی بووە زۆر گوێی پێ نەدا، تا سەرئەنجام کۆتایی بەباران بارین هات و ئەستێرەکانی ئاسمان دەرکەوتن.

موسا وتی: تەماشا کە ئەگەر ئەو شوێنە کۆتایی جیهان بوایە ئێستا بزیسکەی ئاگری لێ بەرز دەبویەوە و تۆ لەتاریکیەکی تەواودا بەجوانی چاوت بەئاگرەکە دەکەوت، بەڵام هەر بەوشێوەی خۆت دەیبینی ئەو ئاگرەی تۆ باست دەکرد ئێستا دیار نیە، ئەوەی ئەمڕۆ لەکاتی خۆرئاوابوندا چاوت پێی کەوت هەورگەلێکی سورباوبون. ئەگەر ئێرە کۆتایی جیهان بوایە ئەوا ئێمە بەم ئاسانیە نەماندەتوانی سنوری ببەزێنین، ئێستاش با بڕۆین بۆئەوەی پێت نیشان بدەم کە چەنێك ڕێگامان لەبەرماوە ببڕین و شتێك کە کۆتایی جیهان بێت بونی نیە. موسا و هاوڕێکانی بۆماوەی سێ ڕۆژ لەناوجەرگەی بیاباندا لەکەنار ڕوباری نیلەوە ڕێگای خۆیان گرتە بەر، ڕۆژی سێیەم مارێکی ژەهراوی"موسا"ی گەست. "موسا"ش یەکسەر مارەکەی بەچەقۆکەی دەستی کوشت و مارناسەکان یەکسەر وتیان، ئەوە مارێکی ژەهراویە.

نون وتی: دەبێت هەر ئێستا جێگە چزی مارەکە بەچەقۆ هەڵدڕین، دوای ئەوە بەدەم دەست بەمژینی شوێنە بڕاوەکە بکەین، "نون"ئەوەندە شوێنی بڕاوەکەی مژی و تفیەوە تا موسا لەهۆش خۆی چوو. ڕێکردنیان بەهۆی باری تەندروستی موساوە ڕاوەستا. موسا ئەو ڕۆژە تا بەیانی هەر لەحاڵی لەهۆش چوندا بوو

و"نون"یش لەبەرئەوەی ئەزمونی لەمبوارەدا هەبوو هەولّی دا بەبەردەوامی لاشەی لەحالّی فێنکیدا ڕاگرێت و پارچە دارێکی خستە نێوان ددانەکانیەوە، چونکە موسا بەهۆی کاریگەری ژەهرەکەوە لەرز و دانەچیڕەی لیّ کەوتبوو. کاتێك موسا چاوی کردەوە سەرەڕای ئەوەی لەرزەکەی کەمێك کەم بوبویەوە، بەلاّم وڕێنەی دەکرد و لەبەرخۆیەوە بیّ ئەوەی بتوانێت بەسەر خۆیدا زالّ بێت قسەی دەکرد: من کوڕی فیرعەون نیم، من کوڕی یەکێك لەخەلّی"ئیسرائیل"م کە لەولاّتی"کوش"کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاّتی دەلّتای"نیل"ەوە نیشتەجێن، دایکی ڕاستەقینەم لەناو سەبەتەیەکدا منی داوە بەدەم ڕوباری نیلەوە و شازادەیەکی میسری بەناوی"ئنخاس ئامون"منی لەڕوباری نیل گرتووەتەوە و بردومیەتە کۆشکی فەرمانڕەوایی و وا تێی گەیاندبون کە من کوڕی ئەوم بۆئەوەی لەلای فیرعەون خۆشەویست ببم، لەهەموو شوێنێکدا منیان بەشازادە بانگ دەکرد، لەکاتێکدا من کەنیزە زادەیەکی ئیسرائیلی بوم. "نون"زانی"موسا"وەکو خۆی کۆیلە زادەیەکە و لەخێلّی ئیسرائیلە، بەلاّم نەیدەتوانی لەوە تێبگات کە بەچ شێوەیەك کەسێك لەخێلّی ئیسرائیل دەبێتە شازادەیەك! زۆر سەری لەو بەسەرهاتەی"موسا"سوڕما، پاشان لەبەرئەوەی بەو حالّەوە تەماشای"موسا"ی دەکرد گریا!

موسا دەیوت: تۆش لەهەمان نەژادی منی زۆر بەڕێز و سۆزەوە مامەلّەت لەگەلّدا دەکردم. تۆ برای منیت...

دوای ئەوە"نون"پێی وت: پێم وتی ئێرە کۆتایی جیهانە و تۆ باوەڕت پیّ نەکردم... . دوای ماوەیەك پێی وت: تۆ باوەڕ بەوە ناکەیت کە ئەوە"بون"بوو کە سمی ئەسپەکەی تۆی چەقاندە ناو کونێکەوە و شکاندی، تۆش ناچاربویت ئەو ئەسپەی کە زۆر خۆشت دەویست بکوژیت بۆئەوەی شێرەکان بەزیندویەتی پارەچ پارچەی نەکەن. ئەوە"بون"بوو کە ئەم مارەی هێنایە سەر ڕێت و گەستیتی و خەریك بوو بتکوژێت. "نون"زۆر لێت توڕەیە و تا ئەو کاتەی نەگەڕێیتەوە دەستبەردارت نابێت.

موسا وتی: ئەندێشە پوچەلّەکان زالّ بون بەسەر هزرتدا و هۆکاری هەر کارەسات و ڕوداوێك دەگەڕێنیتەوە بۆ"بون"

نـون وتـی: ڕۆحـەکانی ئـەم دۆڵـە لەشـێوەی مـاردا خۆیـان پیـشان دەدەن کـە ماری"هوشتن"ی پیێ دەڵێن، بەڵام ئەمانە ئەو مارە نین کە"لئو"یان گەستووە.

موسـا تەماشـایەکی پـێ ئاوسـاوەکەی کـرد و بـەردەوام هەسـتی بەتینویـەتی دەکـرد"موسـا"ش بەڕادەیـەك لاواز و بێهێـز بـوو کـە نەیـدەتوانی جـامێکیش بەدەستەکانی بگرێت، لەئەنجامدا"نون"ناچاربوو یارمەتی بدات بۆئەوەی بتوانێت ئاوەکەی بخواتەوە. هەموو ئەو سەربازانەی کە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد بگەڕێنەوە و حەزیان نەدەکرد لەوە زیاتر بڕۆن، زۆر خۆشحاڵ بون بەوەی"موسا"مار گەستی، چونکە حەزیان دەکرد بمرێت بۆیە بە بەردەوامی هەواڵیان دەپرسی. موسا وردە وردە ئامادە بوو و لە"نون"ی پرسی: ئەرێ بەڕاست چۆن ئەمە ڕویدا.

نـون وتـی: مـن و تـۆ شـان بەشـانی یـەکتر ڕێمـان دەکـرد و لـەناکاو جوتێك مـار پەلاماری داین، یەکەمیان تۆی گەست و دووەمیشیان منی گەست.

موسا وتـی: ئەگەر ئـەو مـارەی تـۆی گەستبێت، کەواتـە چۆن ئـاوا تەندروست و چوست و چالاکیت.

نون وتی: ئەو مـارەی تـۆی گەست زۆر جیاواز بوو لـەو مـارەی من، ئـەوەی منـی گەست مـاری"نوهشتن"بـوو، ڕۆحـی مارەکان وەکو"نوهشتن"دەتگەزن بـەڵام جێگە گەسـتنەکەی بەجەسـتەی مرۆڤـەوە نامێنێـت و تـۆش دەبێـت ئـەوە بزانـی کە"نون"بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدایە و لێمان جیا نابێتەوە و ناهێڵێت هیچ کەسێك ئازارمـان پێبـدات، مەگـەر ئـەوەی بەپێـچەوانەوەی خواستەکانی ڕەفتـار بکـەین، ئەوکات هەوڵی کوشتنمان دەدات.

موسـا لێـی پرسـی: ئەوکاتانـەی کۆیلـە فرۆشـەکان بـەڕوتی قامـچیان لـێ دەدایـت"بـون"لـەکوێ بوو؟بۆچـی لەوکاتـەدا بـەرگری لـێ نـەکردی، مەگـەر تـۆ چ ڕفتارێکت بەپێچەوانەی خواستەکانی ئەو ئەنجام دابوو؟ بەڕاستی تۆ کەسێکی زۆر سـادەیت کـە واهەسـت دەکـەیت"ڕۆحـی مـار" یـان خـودای"مـار" بەناوی"نوهشتن"شایستەی ئەوەیە بیپەرستی؟ مار جۆرێك گیانەوەری گەزندەی ئازار بەخشە، لەهەر کاتێکدا هەلی بۆ برەخسێت ئیتر هەر جۆرە گیانەوەرێك بێت پەلاماری دەدات و دەیگەزێت بۆئەوەی بیکوژێت. من تۆ بەکەسێکی تاوانبار نازانم

و بەهیچ شێوەیەکیش سەرزەنشتت ناکەم، تەنها لەبەرئەوەی گیانەوەرێکی ئاوا درێو و ئازاربەخشت دەپەرست؟ ئەو مارەی کە بەناوی "نوهشتن" بانگ دەکرێت ئەفسانەیە و چیتر وەلای نیّ، ئێستا هەم بریسمە و هەم هەست بەماندوییەتی دەکەم.

نون وتی: بەدڵنیاییەوە ئەمە نیشانەی ئەوەیە بەرەو چاك بونەوە دەڕۆیت، هەرئێستا ماسیەکی تازەت بۆ دەبرژێنم، هەمان ئەو ماسیەی چەند ساتێك لەوەوپێش خۆم لەڕوباری "نیل" ڕاوم کرد، هەرئێستا ماسیەکی برژاو بۆ گەورەم ئامادە دەکەم.

موسا دوای نان خواردن دوبارە لەگەڵ "نون"دا دەستی کردەوە بەگفتوگۆ، بەڵام ئەمجارەیان لەبارەی "ئامون"ەوە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد نەك "ئاتون" چونکە ئەگەر لەباری "ئاتون" گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتردا بکردایە "نون" بگرە لەوشیەکی ئەو گفتوگۆیەیان تێنەدەگەشت و حەزی نەدەکرد گوێی لیّ بێت. لەبەرابردوودا موسا لەگەڵ "نەف"ی سەرۆکی ئەندازیارانی کۆشکی "فیرعەون" گفتوگۆیەکی کردبوو و لەنێو ئەم گفتوگۆیەیاندا ئاماژەیان بەوە دابوو کە پایەدارترین تەلار ئەو تەلارەیە لەسەر بنەمای بیرکردنەوە و تێڕوانین بنیات دەنرێت و هەرگیزیش ناڕوخێت. موساش کە دەیزانی لەسەردەمی منداڵیدا ئەوەندە باسی "بون"یان بۆ کردووە کە مەحاڵە بتوانێت بچوکترین دانوستان لەبارەی بیروباوەڕەکانیدا بکات، تەنها کارێك کە توانی ئەنجامی بدات بۆئەوەی کەمێك "نون" لەم بیروباوەڕەی جیابکاتەوە، ئەوەبوو وتی: خودای "نوهشتن و بون" خودای وڵاتانی ترن، ئەمانە لەمیسردا بارەگایان نیە و لێرەشدا جۆری خوداکان جیاوازن لەوەی تۆ باست کرد، ئایا تۆ کەسێك دەناسیت کە لەمیسردا "بون یان نوهشتن" بپەرستێت؟ ئەو خودایانەی کە تۆ دەیانپەرستی لێرەدا بەهیچ شێوەیەك بونیان نیە. ئەم قسەیە کەمێك کاری لە "نون" کرد و وردە وردە، دوای ئەوە کەمێك باسی ئاتونی بۆ کرد و هزری لە "بون"ەوە بەرەو "ئامون" دوای ئەوەش بەرەو "ئاتون" ڕەوانە کرد.

لەم نێوەندەدا"نون"لەکاتی گفتوگۆکاندا ناوی دایك و باوك و خوشك و براکان و ئەندامانی خێزانی هێنا و وتی: من لەخێڵی"یوی"یەکێك لەدوانزە خێڵەکانی ئیسرائیلم، لەوەیکە"یوی"زۆر مەزن نیە بەلایەنی کەم ئەو خێڵە هەمویان یەکتری باش دەناسن، بگرە من دەتوانم ناوی دایك و باوکی تۆ کە تۆیان هەڵداوەتە ڕوباری نیلەوە پێ بڵێم.

موسا لە"نون"ی نۆکەری ڕاماو و پێی وت: تۆ ناوی دایك و باوکی من دەزانی؟

نون وتی: بەڵێ ناوی باوکت بەزمانی"کوش"ئام رام"[30]ە.

موسا بەکونجکاویەکەوە لێی پرسی: تۆ باوکم دەناسی؟ ئایا لەژیاندا ماوە؟

نون وتی: باوکت کۆچی دوایی کردووە بەڵام دایکت هێشتا زیندووە، بەواتا تا ئەو کاتەی من لە"یوی"بوم دایکت زیندوو بوو.

موسا لێی پرسی: دەزانی ناوی دایکم چیە؟

نون وتی: بەڵێ دەزانم ناوی دایکت چیە، ناوی"جوشبد"ە.

موسا چەند جارێك ئەو ناوەی لەبەرخۆیەوە وتەوە و وتی: سەرۆکی کاهینانی کۆشکی فەرمانڕوایی پێی وتم دایکم لاو بووە و نزیکەی شانزە تا حەڤدە ساڵ زیاتر تەمەنی نەبووە.

موسا وتی: بەلەبەرچاو گرتنی ئەم چەندساڵەی دوایی، بەواتا ئێستا کە تەمنم بیست ساڵە، دایکم نزیکە چل ساڵ دەبێت و دەتوانم بەزیندویی چاوم پێی بکەوێت... . دوای ئەوە دوپاتی کردەوە: ئایا بەڕاستی تۆ بەچاوی خۆت دایکی منت بینیوە؟

نون وتی: بەڵێ من دایکتم بینیوە. "جوشبد"هاوسەری"عیمران"بێ لەتۆ کوڕ و کچێکی تری لەهەمان هاوسەر هەیە، کوڕەکەیان ناوی"هارون"ە و کچەکەشیان ناوی"میریام"ە.

موسا وتی: هەر زانیاریەکی ترت لەبارەی خێزانەکەی من هەیە پێم بڵێ.

نون وتی: "جوشبد"ی دایکت لەخێزانێکە بەناوی"سفیر"، باوکت ئاموزای باوکمە، کەواتە من و تۆ نەك تەنها لەیەك خێڵین بەڵکو خزمی یەکتریشین.

---

[30] ئەوە هەمان ئەو"عیمران"ەیە کە ئێمە دەیناسین.

# شاری زێڕین

هەموو هێزەکە بەهۆی ئەو مارەی کە"موسا"ی گەست پشوی دا تا ئەوکاتەی لەلایەن موساوە فەرمانی جوڵانەوە دەرکرایەوە. لەو ساتە بەدواوە، ڕێکردنیان بەو ڕادەیە ئاسان نەبوو، چونکە ڕێگاکان سەختی و سەرەوژێری و بەرەوژوری و پێچاوپێچ هاوکات لەگەڵ گیاندارانی بێهێز و توانادا ڕێگای بەریان سەخت و دژوارتر دەکرد. موسا و هاوڕێکانی بەهەر شێوەیەك بوو بەردەوامیان بە پێشڕەویەکانی خۆیان دا تا ئەوەی گەشتنە دەریاچەیەك کەڕوباری نیل لەوێوە سەرچاوەی دەگرت، دەریاچەیەك کە ئاوێکی زوڵاڵ، ئاوێك کە لەکێو و تافگەی دەریاچەوە هەڵدەقوڵا سەرچاوەی دەگرت، ئەو شوێنەی سەرەتای ڕوباری نیل بوو و ڕوباری"نیل"یش لەو تافگەوە سەرچاوەی دەگرت. بەچواردەوری ئەو دریاچەشدا گیاندارگەلێکی جۆراوجۆر سەرقاڵی لەوەڕاندن بون، بگرە فیلەکانیش بەشەفرەی درێژیانەوە لەو چواردەورەدا دەبینران. موسا لەمیسردا تەنها وێنەی فیلەکانی بینیبوو و ئەوە یەکەمجاربوو کە لەنزیکەوە چاوی بەفیل بکەوێت. موسا و سەربازەکانی بەچاوی سەرسوڕمانەوە تەماشای دیمەنگەلێکی جوانی سروشتیان دەکرد و نەیاندەزانی تەماشای کوێ بکەن، تائەوکاتەی چەند ڕەشپێستێك بەرەوڕویان هاتن. ئەم ڕەشپێستانە بەپێچەوانەی ڕەشپێستەکانی وڵاتی"کوش" باڵایەکی کورتیان هەبوو و لەسەرخۆ چەند گوتەیەکیان هێنایە زمان کە بەهیچ شێوەیەك لێی تێنەگەشتن. موسا و سەربازەکانی تەماشایەکی یەکتریان کرد، لەهەمان ئەو کاتەدا ڕەشپێستەکان بەدەستیان ئاماژەیان بۆ شوێنێك کرد و ڕێگایان پێنیشان دان.

"کربی" بەسەربازەکانی وت: بەڕێ کەوین و بزانین چیان لێمان دەوێت...

دوای ماوەیەك ڕۆشتن گوندێك دەرکەوت، ئەو گوندە لەناو دارستانێکی چڕدا شاردرابویەوە. لەبەردەم گوندەکەدا پیاوێك چوارمشقی دانیشتبوو و ئاوی دەخواردەوە. وا دەهاتە بەرچاو کە کوێخای ئەو گوندە بێت. هەرئەوکاتەی چاوی بە موسا و هاوڕێکانی کەوت بەزمانی میسری بەخێرهاتنی لێ کردن!

دوای ئەوە لێی پرسین: بەدڵنیاییەوە دزانم ئێوە خەڵکی میسرن. موسا و هاوڕێکانی بەبیستنی زمانی میسری لەناوچەیەکی ئاوا دور و نامۆدا لەوپیرەمێردە ئەویش بێ ئەوەی گوتەیەك بهێننە گۆ بەواق و وڕماوی تەماشایان دەکرد، کاتێکیش هاتنەوە هۆش خۆیان وتیان: بەڵێ ئێمە میسرین، بەڵام تۆ؟

پیرەمێرد وتی: دەزانم کە سەیرتان لێدێت کە من ئاگاداری ناسنامەی ئێوەم، ئێستا ماندون دانیشن، کاتێکی زۆرمان بۆ گفتوگۆ بەدەستەوەیە. لەئێستادا بحەوێنەوە و ماندویەتی خۆتان دەربکەن.

ئەو پیرەمێردە بۆماوەیەك لەگەڵ هاوڕێکانی قسەی کرد کە میسریەکان هیچی لێ تێنەگشتن، دوای ماوەیەك چەند کاسەیەکی دارینی پڕ لەمێوەی ڕەنگاوڕەنگیان خستە بەردەم "موسا"و هاوڕێکانی. دوای ئەوە شەرابی پێشکەش کردن و وتی: ئەمە شەرابی "ئزگیل"ی ناوچەی خۆمانە. هەموو سەربازەکان بێ لە"موسا" لەو شەرابەیان خواردەوە. موسا لەهەمان ئەوکاتەدا تەماشایەکی چواردەوری کرد و بینی ڕەشپێستەکان تاڕادەیەك ڕوتن. تاکە پۆشاکیان جۆرێك ڕیشاڵبوو کە تەنها بۆ داپۆشینی دەزگای پەیوەندی و کۆمیان بەکاریان دەهێنا. پیاوەکان نێزەیەکی درێژ و نوکێکی مەفرەغیان بەدەستەوە بوو. تاکە چەکێك کە بەناونیشانی چەکی ڕاستەقینە و کارا بەلایانەوە گرنگ بێت شمشێر و چەقۆ بوو کە بەدەستیانەوە بەدی دەکرا، بەڵام تیروکەوانێکیشیان هەبوو کە دیار بوو کاریگەر و کارابوو. موسا و سەربازەکانی بەهۆی دوردرێژی ڕێگاوە ڕیشێکی درێژیان پەیدا کردبوو و هەر ئەم دیمەنەش سەرنجی منداڵەکانی ڕادەکێشا و یاریان بەڕیشیان دەکردن و ڕایاندەوەشاند، ژنەکانیشیان بەدەنگێکی بەرز پێیان پێدەکەنین. پیاوە ڕەشپێستەکان کە هیچ کامێکیان مویان پێوە نەبوو بەبینینی ئەو هەموو پیاوە ڕیش درێژە سەریان سوڕمابوو، بۆیە ڕیشی میسریەکان بوبە هۆی گوتە و باسی

خەڵکی ئەو ناوچەیە. هەروەها جلوبەرگی میسریەکانیش سەرنجی ڕەشپێستەکانی بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو. لەهەموو سەرنج ڕاکیشتر شمشێرەکەی موسا بوو کە لەئاسن دروست کرابوو. کابرای پیرەمێرد کە ناوی"دوگانا"بوو خۆیی پێناساندن.

ئەو گوندە لەچەند خانویەکی بچوك پێکدەهات، هەریەك لەو خانوانە ڕەنگدانەوەی خێزانی پێوە دیاربوو، پەرژین و دیوار بەچواردەوری خانوەکاندا بەدی نەدەکرا، لەناو خانووەکەشدا هیچ شتێکی وەك دەرگا و پارێزەر بەدی نەدەکرا. بگرە بۆ ساتێکیش زەردەخەنە لەلێوی خەڵکی ئەو گوندە نەدەبڕا. لەدواییدا موسا کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ پیرەمێردا دەکرد پەیی بەهۆکاری نەبونی دەرگا و دیوار و پەرژینی ماڵەکان برد و تێگەشت لەو لادێیەدا هیچ شتێك بەناوی دزی و دەستێوەردان بونی نیە و هیچ کەسێك خەمی سبەینێ ناخوات، ئەمانە تەنها بۆ ئەمڕۆ و هەنوکە دەژین، نەك وەك میسریەکان لەکاتێکدا هێشتا لەژیاندا بون ڕایاندەسپارد گۆڕێکی باشیان بۆ ئامادە بکەن و چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کەی بمرن بۆئەوەی بەخاکیان بسپێرن بۆئەوەی بەپێی خەیاڵ پلاویەکانیان دوبارە زیندوو ببنەوە، لەکاتێکدا کە هەموو ڕۆژێك دەمردن، لەهەمان ئەوکاتەدا خەڵکی"دوگانا"بەهیچ شێوەیەك نەبیریان لەمەرگ و نە لەسبەی دەکردەوە بگرە لەمەرگیش نەدەترسان. ڕاوەماسی، ڕاوی ئاژەڵ، مەلەکردن لەدەریاچە"ازگیل" لەناو ئەو جەنگەڵەدا چوارچێوەی ژیانی سادەیان بوو. . ئەمانە بەپێچەوانەی میسریەکان بەهیچ شێوەیەك باوەڕیان بەژیانی دوای مەرگ نەبوو، بۆئەوەی بەهۆی ئەو ئەندێشەوە دوچاری گرفتاری خەیاڵپلاوی ببن.

"دوگانا"ی پیرەمێرد وتی: تا ئەوکاتەی مرۆڤ نەیەت بۆ ناوچەیەکی ئاوا دور پەی بەزمان نابات کە ڕۆڵێکی گرنگ لەنێوان پەیوەندی مرۆڤەکاندا دەبینێت، ئەگەر مرۆڤەکان شارەزای زمانی یەکتری نەبن ئەوا ژیانێکی سەختیان دەبێت، لێرەدا تەنها منم کە شارەزای زمانی میسریم.

موسا لێی پرسی: دەبێت تۆ سەرۆکی ئەم خێڵە بیت؟

پیرەمێرد وتی: سەرۆك نیم، بەڵکو پزیشکم و سەرقاڵی چارەسەرکردنی خەڵکیم، مـن لـە"مـاڵی ژیـان"ی "تـبس"خوێندومـە. بـیّ لەزانـستی پزیـشکی، پێـشبینی ئایندەشیان بۆ دەکەم.

موسا لێی پرسی: تۆ کە پزیشکی چ پەیوەندیەکت بە پێشبینی کردنەوە هەیە؟

پیرەمێرد وتی: من ئاو دەڕێژمە ئەو کاسەیەی کە لەبەردەممدا دەیبینن و ئایندە و ڕابردووی هەموو کەسێکی تێدا ئاشکرا دەکەم، ئێستاش تۆ ئەی شازادە حەز دەکەیت ئایندە یان ڕابردوت بۆ ئاشکرا بکەم! هەروەها بەخێرهاتنی تۆ و"نون"ی نۆکەرت دەکەم!

موسـا و هاوڕێکـانی لەسەرسـوڕماندا وەك پەیکـەر وشـك بـوون، و موسـا لێـی پرسی: تۆ ناوی نۆکەرەکەی من لەکوێوە دەزانی؟ لەکوێوە ئاشنای ناسنامەی من بویـت، چـونکە لـەوەوپێش لـەهیچ شـوێنێکی تـردا گفتوگۆمـان لەگـەڵ یـەکتردا نەکردووە.

"دوگانا"وتی: لەڕاستیدا ماوەیەك لەوەوپێش چەند کەسێك لـەوڵاتی"کوش"ەوە هـاتن بـۆ ئێـرە، سـەرەڕای ئـەوەی مـاوەی نێـوان وڵاتـی"کـوش"و ئێـرە زۆر دورە، هەندێجار خەڵکی سەردانی ئێرە دەکەن، و بۆماوەیەك نیشتەجێ دەبن و دوای ئەوە دەگەڕێنەوە. ئەو کەسانەی هاتن بۆ ئێرە تۆ و"نون"ی نۆکەرەکەی تۆیان دەناسی، هەروەها پێیان وتم کە تۆ فەرماندەی گالیسکەوانەکان بویت. هەروەها پێیان وتم ئەگەر تۆ سەرکردەی هێزی سەربازی نێردراو بویتایە ئەوا "ئێرگەباین"ی پادشای کوش بەکوشت نەدەدرا، هەروەها کوشت و کوشتار نەدەکەوتە نێو لاو و منداڵ و ژنانی "کوش"یشەوە. هەروەها باسی تۆ و"نون"ی نۆکەرتیان بۆ کردوم. ئەوان دەیانوت"موسا"ناوێکی ناتەواوە و نۆکەرەکەی تۆش خێڵەکیە، هەروەها باسی هەموو تایبەتمەندیەکی تۆیان بۆکردوم، هەڵبەت باسی هەندێك شتی تریان بۆ کردم.

موسا پرسی: باسی چیان بۆ کردویت؟

پیرەمێرد وتی: ئەوان باسی ئەوەیان بۆ کردوم، سەرەڕای ئەوەی تۆ شازادەیت، بەڵام تۆی لەمیسر دور خستەوە و فیرعەون نەیدەویست لەمیسردا بمێنیتەوە،

هەروەها نەیویست تۆ فەرماندەی هێزی نێردراوی میسر بیت بۆیە تۆی کردە فەرماندەی هێزی گالیسکەوانەکان، لەکاتێکدا هیچ شتێکت لەبارەی گالیسکەوانیەوە نەدەزانی و شارەزای نەبویت. هەموو ئامانجێکی تەنها دورخستنەوەی تۆ بوو لەمیسر، بۆئەوەی بەشکم لەگۆڕەپانی جەنگدا بکوژرێیت، بەلاّم ئەوە ڕوینەدا کە فیرعەون دەیویست. پێیان وتم فەرماندەی میسر، فەرماندەی پێشوو پێش مەرگی تۆ کردە جێنیشنی خۆی، بەلاّم تۆ ئەو بەرپرسیاریەتیەت دا بەکەسێکی تر، بۆئەوەی دژایەتی و ڕقەبەرایەتیەك لەنێوان تۆ و ئەودا ڕو نەدات.

موسا لێی پرسی: تەواوی ئەم نهێنیە سەربازیانە، دانیشتوانی"کوش"بۆیان گێڕایتەوە؟

"دوگانا"وەلاّمی دایەوە: بەلّێ!

موسا وتی: بەڕاستی بەلامەوە سەیرە، سەرەڕای ئەوەی لەناوچەیەکی ئاوا دور و سەختدا دەژیت، بەلاّم هەواڵەکانت زۆر تازەن، هەروەها ئەوەی سەری سورماندوم و سەرنجی ڕاکێشاوم شێوازی قسەکردنی تۆیە بەزمانی میسری کە زۆر پاك و ڕەوان گفتوگۆی پێدەکەیت!

"دوگانا"وتی: گفتوگۆکردنی منیش بەزمانی میسری خۆی بۆخۆی بەسەرهاتێکی تایبەت لەخۆ دەگرێت، منیان برد بۆ میسر، هەڵبەت خۆم نەڕۆشتم.

موسا لێی پرسی: پیش ئەوەی باسی رۆشتن بۆ میسر بکەیت، دەتوانی پێشبینی ئایندەم بکەیت؟

"دوگانا"وتی: بەلّێ. کاتێك پێشبینی ئاینده دەکەیت، سەرەڕای ئەوەی ڕوداوەکانی ڕابردوو کاریگەرنین، لەبەرئەوەی ناتوانیت ڕاستەخۆ ڕاستیەکان بۆ خەڵکی ئاشکرا بکەیت، بۆیە ناچار دەبم وەك پێشبینیەك نایخەمە ڕوو، لەکاتێکدا ڕوداوەکانی ڕابردوو، بەشێکن لەڕابردوو و کار لەئایندەی هیچ مرۆڤێك ناکات، بەلاّم لەهەندێك بابەتدا ئەم ڕوداوانە بەشێوەیەك دەردەکەون کە زۆر لەهەنوکە نزیکترن تا ڕابردوو. بۆنمونە کەسێك براکەی مردووە و وای دەزانی براکەی بەشێوەیەکی سروشتی مردووە، بەلاّم ئەگەر پێی بڵێن براکەیان کوشتووە و بەشێوەیەکی سروشتی کۆچی دوایی نەکردووە، دوچاری خەم و دڵگرانی دەبێت و تا ئەوکاتەی

بکوژی براکەی نەدۆزێتەوە کۆڵی لێ نادات، بەڵام ئەو کەسەی ڕوداوەکانی ڕابردوی بـۆ گێڕاوەتـەوە، ئەگـەر ئامـاژەی بـەم خاڵـە نەکردایـە، دەڵـەڕاکێی لەبیـسەردا نەدەوروژاند.

موسا بەبیـستنی ئـەو گوفتارانـە لـەدەمی "دوگانـا" سەرسـوڕمانی زیـاتر کـرد. چـونکە بـەهیچ شـێوەیەك چاوەڕێی نـەدەکرد لـەکونجێکی دوری ئـەم جیهانـەدا کـە بەگوتەی "نون" کۆتایی جیهانە، کەسێك بیروبۆچونێکی ئاوا بخاتە ڕوو.

"دوگانا" وتی: هەرلەبەرئەوەش کاتێك تەماشای ئاوی ناو کاسە دەکەم بۆئـەوەی باسـی ڕوداوەکـانی ئاینـدەی ژیـانی ئـەو کەسـانەی لـەم ناوچـەیەدا دەژیـن بکـەم، بەشـێوەیەکیش باسـی ڕاسـتیەکانیان بـۆ دەکـەم بۆئـەوەی بیـسەر بەبیـستنی ڕانەوەشـێت و بترسـێت، و فـشاری بەرگـەگرتنی ڕوبەڕوبونـەوەکانی لەگـەڵ ڕاستیەکاندا زیاتر بکەم.

دوای ئەوە "دوگانا" بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: ئەمڕۆ دەبینم کوڕە لاوەکان زۆر حەزیان لەژنە، کچ و کوڕانی لاو خوازیاری یەکترین، بەڵام ئەگەر بۆیان باسبکەم لەدەرونی هەریەك لەمانەدا چی دەگوزەرێت، ئەوا بەشێوەیەك لەیکتر بێزار دەبن کە ناشتوانن بۆساتێکیش لەبەرامبەر یەکتردا دان بەخۆیاندا بگرن. هەر لەبەرئەوەش کاتێك ژن و مێرد دێن بۆلام و منیش چەند پرسیارێکیان لێدەکەم و دواجار ناچار دەبم ڕاستی کەسایەتی و ژیانیان لەبەرگێکی نەرم و نیانەوە بپێچم ئەوکات بۆیان بگێڕمەوە.

موسا وتـی: ئـەکرێت شتێکی ئـا لـەو شێویەش لـەبارەی ئایندەمـەوە پێشبینی بکەیت؟

"دوگانا" وەك جاران تەماشای ئـاوی نـاو کاسـەکەی کرد و وتـی: تـۆ لەسـەردەمی منداڵیـدا لەکۆشـکی فەرمانڕەواییـدا گـەورە بویـت، بـەڵام پێـشتر، مەبەسـتم لـەدایك بونتە، لەدواییدا بۆت باس دەکەم.

موسا وتی: کەمێکی باسی ژیانی ناو کۆشکم بۆ بکە.

"دوگانا"وتی: لەکۆشکدا کاهینێك هەبووە کە زۆر تۆی خۆشدەویست. سەری دەتاشی و بەرۆن چەوری دەکرد، کاهینەکانی کۆشك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بون...

موسا وتی: باسی دوای ئەوەشم بۆ بکە.

کاتێك"دوگانا"بینی موسا زۆر تامەزرۆی بیستنە، بەم شێوەیە بەردەوام بوو: کاهین هەم تۆی خۆشدەویست هەم دایکت. ئەو پیاوە وەکوو مامۆستایەکی دڵسۆز زۆرشتی فێرکردی، هەڵبەت شتگەلێك کە بەهیچ شێوەیەك فێری کەسانی تری نەدەکرد بەڵام تۆ زۆر شتی لێوە فێر بویت.

موسا پرسی: دەتوانی پێم بڵێی باسی چی بۆ دەکردم؟

"دوگانا"وتی: کاهین لەبارەی خوداوە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردی.

موسا وتی: دوای ئەوە؟

"دوگانا"وتی: تۆ باوەڕت بەخودای"ئامون"نەبوو، لەبەرئەوە هەوڵی لەگەڵدا دەدایت بۆئەوەی باوەڕ بەخودا"ئاتون"بهێنی.

موسا لێی پرسی: دوای ئەوە چی ڕویدا؟

"دوگانا"وتی: ئەوە بوو تۆ گەشتێکت کرد و لەکاتی گەڕانەوەتدا سەری بڕاوی ئەو کاهینەیان دا بەدەستەوە کە"فیرعەون"ی پادشا فەرمانی کوشتنی دابوو.

موسا وتی: ئەی پیاوی دانا، ئەوەی باست کرد زۆر ڕاستبوو، کاهینیان لەبەرهەمان ئەو شتەی کە تۆ باست کرد کوشت، فیرعەون ویستی لەوە ئاگادار بکاتەوە، بۆئەوەی بزانێت سەرئەنجامی"ئاتون"پەرستی بەچی کۆتایی دێت، دوای ئەوە منی نارد بۆ ئەم شوێنە تا شاری زێڕین بدۆزمەوە.

"دوگانا"بەسەر سوڕمانێکەوە لێی پرسی: تۆ لە"کوش"ەوە هاتوی بۆ ئێرە تەنها بۆئەوەی شاری زێڕین بدۆزیتەوە؟

موسا وتی: ئەمە فەرمانی فیرعەونە دەبوو هەر بهاتمایە، هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم لەبەردەستدا نەبوو.

"دوگانا"وتی: فیرعەون واهەست دەکات کە شاری زێڕین بونی دەرەکیشی هەیە؟

موسا وتی: ئەگەر باوەڕیشی پێی نەبێت، وا خۆیی دەنوێنێ کە بونی هەیە.

"دوگانا"وتی: باشە فیرعەون بۆچی تەنها تۆی بۆ ئەم مەبەستە ناردووە؟

موسا وتی: بۆئەوەی بەشکم بەهۆی گەڕان بەدوای خەیاڵپڵاویەکانیدا من بکوژرێم.

"دوگانا" وتی: کەواتە تۆ دەتزانی کە شاری زێڕین بونی نیە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕێگای دۆزینەوەیت گرتە بەر؟

موسا وتی: سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی فیرعەون سزاکەی مەرگە، ئەو منی بەدوای مەرگدا ناردووە.

"دوگانا"وتی: بێگومان فیرعەون زۆر ڕقی لەتۆیە.

موسا وتی: لەبەرئەوەی وا هەست دەکات هەوڵی لەناوبردنی دەدەم.

"دوگانا"لێی پرسی: ئایا لەڕاستیدا مەبەستێکی ئاوات هەیە؟

موسا وتی: ئەو وا هەست دەکات.

"دوگانا"لێی پرسی: ئایا ئەو شارەی باست کرد دۆزیتەوە؟

موسا وتی: لەو ڕۆژەوەی کەوتینە ڕێ دەمزانی کە شارێکی ئاوا تەنها لەخەون و ئەندێشەکاندا بونی هەیە.

"دوگانا"لێی پرسی: بۆچی ئەوەندە دڵنیابویت کە شارێکی ئاوا هەر لەبنەچەوە بونی نەبێت؟

موسا وتی: ئەو شارە خیاڵیە بەوشێوەی کە باسی دەکەن لەهزر و مێشکدا جێی نابێتەوە، ناتوانرێت شتێکی ئاوا لەڕوی ڕاستیەوە پەسەند بکرێت، بۆیە ئەوەی لەبارەی ئەو شارەوە باسکرا هەموو خەیاڵپڵاوی و سەرابە.

"دوگانا"وتی: بەڵام شاری زێڕین لەڕاستیدا بونی دەرەکی هەیە.

موسا بەشێوەیەکی نادیار وتی: بەڵێ بونی هەیە.

"نون"ی نۆکەری موسا بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: ئایا تۆ شوێنی ئەو شارە دەزانی لەکوێیە؟

"دوگانا"وتی: بەڵێ دەزانم.

"نون"بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە بەئەرك نەبێت هەر ئێستا پێمان نیشان بدە.

"دوگانا"ش وتی: تەماشای ئەویَ بکەن، تەماشای خانوەکانی ئەو گوندە بکەن، ئەوە هەمان ئەو شارەیە کە بەدواییدا دەگەڕێن.

"نون"وای دەزانی "دوگانا"گاڵتەیان لەگەڵدا دەکات، بۆیە وتی: گەورەم بەدوای شاری زێڕیندا دەگەڕێت، نەك خانوی شڕ و وڕی ئەم گوندە!

"دوگانا"وتی: شاری زێڕین بەواتا شارێك کە نێوەندی زێڕ بێت، ئەو شارەش دەقاودەق لەهەمان ئەم شوێنەدایە... دوای ئەوە بەردەوامی پێدا: ئایا دەتانەوێت زێڕ بەدەست بهێنن؟

موسا وتی: من زۆر حەزم لەزێڕ نیە، چونکە بەهیچ شێوەیەك پێویستم پێی نیە.

"دوگانا"وتی: ئایا فیرعەونیش بەو شێوەیە؟

موسا وتی: فیرعەون خەزێنەی زێڕی هەیە، کە هەست بەزیاد کردن یان کەمکردنەوەی ناکرێت.

"دوگانا"وتی: بەهەرحاڵ ئێستا بۆ پەیداکردنی ڕەنج و ئازاری ئەم ڕێگایەت لەئەستۆ گرتووە، لەبەرئەوە ئەو شارەی بەدوایدا وێڵن لەهەمان ئەم شوێنەدایە...

موسا بێ گوێدانە هیچ شتێك و بەکەمتەرخەمیەکەوە تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد و"دوگانا"ش وتی: سەیرە تۆ بۆ بەدەست هێنانی زێڕ تاڵی ئەم ڕێگایەت چەشتووە، بەڵام ئێستا کە ئەو شارەت دۆزیوەتەوە بۆچی بەو کەمتەرخەمیەوە تەماشای دەکەیت؟

موسا وتی: لەم کۆچەمدا زۆرێك لەسەربازەکانم لەپێناو زێڕدا گیانیان لەدەست دا، من نامەوێت لەوە زیاتر خوێنڕێژی ببێت.

پیرەمێرد وتی: بۆیان گێڕامەوە کە لەوڵاتی"کوش"دا لەپێناو زێڕ چ کوشت و کوشتارێکیان بەرپا کردووە.

موسا لایەنگری ئەو قسەیەی کرد

دوای ئەوەی درێژەی بەقسەکانی دا و وتی: ئەگەر بزانن ئێرە زێڕی هەیە، بەدڵنیاییەوە دەیکەن بەگۆمی خوێن. لەم گوندەدا هەرکەسێك زێڕ بدۆزێتەوە دەیسپێرێت بەمن و منیش دەینێرم بۆ وڵاتی "کوش" و لەبەرامبەردا ئەو

کەرەستانەی لە"مەفرەغ"دروستی دەکەن، کەرەستەی وەك چەقۆ و نوکی نێزە و هەندێك شتی ترمان لەبەرامبەر ئەو زێڕەدا پێدەدەن.

"نون"پرسی: خۆتان ناتوانن"مەفرەغ"دروست بکەن؟

"دوگانا"وەڵامی دایەوە: پێویستی بە"قورقوشمە"کە ئێمە نیمانە، "قورقوشم"تێکەڵی"مس"دەکەن و ئاوێتەی"مەفرغ"بەدەست دێت. ئێمە زێر لەلای خۆمان هەڵناگرین، بۆئەوەی بەهۆی تەماعی زێڕەوە نەبینە نیچیری داگیرکەران و تەماعبازەکان بۆئەوەی کوشت و کوشتارمان تێ بخەن، لەوڵاتی"کوش"لەزێر شتی جوانی لێ دروست دەکەن. هەر لەبەرئەوەش هەمیشە لەهەڕەشەی داگیرکردندا دەژیت.

موسا وتی: ئێستا وردە وردە بۆم دەردەکەوێت کە تۆ کەسێکی سادە نیت، بەڵکو دانایەکیت، چونکە تا ئەوکاتەی کەسێك خوازیاری زانست و مەعریفەت نەبێت بەوشێوەی تۆ ناتوانێت بابەتەکان بخاتە ڕوو، تۆ کەسێکی خوێندەورای.

"دوگانا"وتی: پێشتر وتم منیان بەکۆیلەی برد بۆ میسر و لەوێ بومە نۆکەری پزیشکێك. ئەو پیاوە هەموو ڕۆژێك پشکنینی بۆ نەخۆشەکان دەکرد و دوای ئەوە دەڕۆشتە دەرەوە، بەڵام نەمدەزانی کاتێك دەردەچێت بۆ کوێ دەڕوات، دوای ئەوە زانیم کە یەکێکە لەمامۆستاکانی قوتابخانەی"ماڵی ژیان"ی میسر` لەماڵدا لەکاتی چارەسەرکردنی نەخۆشەکاندا هاوکاری خاوەنەکەمم بەبەستنی برین و ماڵینی مەڵهەم بەسەر بریندا دەکرد. کابرای پزیشکی خاوەنم کاتێك بینی بەوشێوەیە لەئیشوکارەکانیدا یارمەتی دەدەم، فێری ئەوەی کردم بەچ شێوەیەك ئێسقانی شکاوی دەست و پێ بگرمەوە، دوای ئەوە فێری خوێندن و نوسینی کردم، دوای ماوەیەك فێری خوێندن و نوسین بوم. ئەو ڕۆژانەی خاوەنەکەم دەڕۆشت بۆ"ماڵی ژیان"، منیش دەڕۆشتم بەدوای کتێبە پزیشیەکاندا دەگەڕام و بەدەستم دەهێنان، سەرەڕای ئەوەی بەسەختی دەمتوانی بیانخوێنمەوە، بەڵام ئەو کتێبانە جیهانێکی تریان بەڕومدا کردەوە، زانیم بۆچی گەنجێك لەناوکاو دەمرێت، زانیاریەکی تەواوم لەئەندامەکانی جەستەدا بەدەست هێنا. هۆکاری نەخۆشیەکانم زانی. لەهەمان ئەو کتێبخانەیەدا کتێبێکم بەدەست هێنا و ئەوەم تێدا خوێندەوە کە هەموو خێڵێك

لەهزر و تێڕوانینی خۆیدا شارێکی زێڕین دروست دەکات کە هەموو تێیدا خۆشبەخت و تەندروست و خۆشحاڵن. لەو شارەدا هیچ کەسێك ناچار نیە درۆ بکات، نەدزی دەکات و نە ناچار دەبێت هیچ کەسێك بکوژێت، چونکە هیچ هۆکارێکی بۆ درۆکردن بەدەستەوە نیە.

"نون" لێی پرسی: لەم گوندەی کە تۆ تێیدا نیشتەجێی و پێی دەڵێیت"شاری زێڕین" ئایا تائێستا کەسێك درۆ یان دزی یان کارێکی پێچەوانەی یاسای ئەم شارە کردوە یان نە، ئەگەر کارێکی واش بکات سزاکەی چیە؟ لەبەرئەوەش ئەم پرسیارەت لێدەکەم، چونکە لەو شوێنەی تێیدا ژیاوم"کەنعان"، باسی خێڵێکیان بۆ دەکردم کە زۆر بێباك بون لەئەنجامدانی هەر کارێك و بەشێوەیەك مرۆڤیان دەکوشت کە بەرازیش بەو شێوەیە ناکوژرێت، دەمەوێت بزانم سزای پیاوکوژی لەلای ئێوەدا بەچ شێوەیەکە؟

"دوگانا" وتی: لەم ناوچەیەی تێیدا دەژیم، هیچ کەسێك درۆ ناکات، هەروەها هۆکاری دزیکردنیش لەم ناوچەیەدا بەتەواوی وشك هەڵهاتووە، چونکە دایکان لەگەڵ منداڵەکانیاندا ڕاستگۆیانە ڕەفتار دەکەن، بگرە چیرۆکیش بۆ منداڵەکانیان ناگێڕنەوە، چونکە درۆ لەچیرۆکەکانیشدا دەکرێت و بەو هۆیەوە منداڵەکانیش خوو بەدرۆکردنەوە دەگرن. دەربارەی کوشتنیش ئەگەر کەسێك هەوڵی کوشتنی کەسێك بدات، ئێمە لەم گوندەدا دەری دەکەین، ئەمەش خۆی بۆخۆی سەختترین سزایە، ئەو کەسەی لەنێو ئێمەدا دەژیت ناتوانێت لەژینگەیەکی تردا بژیت، چونکە ڕەفتار و نەریت و خووەکانی ئێمە زۆر جیاوازە لەخێڵ و نەتەوەکانی تر. نامەوێت بڵێم ڕفارەکانمان والاّ و پێشەنگی نەتەوەکانی ترە، بەلاّم ڕاستیەکەی ئەوەیە کە درۆ و دزی و کوشتن تایبەتە بەکۆمەڵگانی وەك وڵاتی میسر کە نوقمی مامەڵە و بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بون، ناتوانن هیچ ڕۆژێکیان بێ درۆ تێپەڕێنن، بەلاّم لێرەدا ئێمە هۆکارێکمان بەدەستەوە نیە بۆئەوەی لەپێناویدا درۆ بکەین، لەوڵاتێکی وەك میسر دەوڵەمەند و هەژار دوو چینی جیاوازن لەیەکتری. لەکاتێکدا لێرەدا هەموومان یەکسانین، دەبینن کە کلیل و قوفل و پەرژین لەم گوندەدا نابینن، هەموویان بەئەندازەی ئەوەی بژین بەدەست دەهێنن.

موسا وتی: بەدڵنیاییەوە ئێوە خوداگەلێکی ڕاستگۆ و دروستکارتان هەیە، بۆیە خەڵکی ئێرە بەوشێوەیە ڕەفتار دەکەن.

"دوگانا"وتی: سەرەڕای ئەوەی تۆ میسری نیت، بەڵام میسریەکان باوەڕیان بەخوداکان هەیە. ئەوە بەشێکە لەڕەوشت و سروشتی ئەوان کە دەبێت یەکێك بپەرستن، کاتێك کەسێك دەکوژن، دەڵێن بەفەرمانی خودا ئەوم کوشتووە! لەکاتێکدا ئێمە دەست لەتاوانی کوشتنە نادەین، ئێمە باوەڕمان بەهیچ کەسێك نیە و هیچ خودایەکی ستەمکاریش خۆی بەسەر ئێمەدا ناسەپێنێ تا فەرمانی کوشتنمان بۆ دەربکات، یان بەناوی خودا دەست لەتاوان و کوشتنەوە بدەین.

موسا لێی پرسی: ئێوە باوەڕتان بەهیچ خودایەك نیە، بەڵام بیر لەوەناکەنەوە سەرئەنجام دەبێت باوەڕتان بەشتێك هەبێت؟

"دوگانا"وتی: ئێمە باوەڕمان بەزۆر شت هەیە، بەڵام باوەڕمان بەخودای بێ بنەما نیە.

موسا لێی پرسی: دەتوانیت پێم بڵێیت بیروبۆچونت لەبارەی مەرگەوە چیە.

"دوگانا" وەڵامی دایەوە: مەرگ وەکوو خەو وایە، کۆتایی مەرگ خەوێکە کە بێداری نیە. باوەڕیشمان بەژیانی دوای مەرگ و ئالەم جۆرە شتانەش نیە، چونکە ئەگەر بڕیاربێت ئەم هەموو گیانەوەر و مرۆڤە دوای مەرگ زیندوو ببنەوە، بیهێنەرە بەرچاو خۆت چی ڕوو دەدات، ئێمە لەوباوەڕەداین مرۆڤ و گیانەوەر لەڕوی ژیان و مەرگەوە هیچ جیاوازیەکیان نیە، ئەوەی جیاوازە جۆری ژیانیانە، ئێستاش لەبەرئەوەی قسەی زۆرم بۆ کردویت هەست بەماندویەتی دەکەم و پێویستمان بەحەوانەوەیە. دوای ئەوە بەزمانی خۆی چەند قسەیەکی لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا کرد دوای ئەوە موسا و هاوڕێکانیان ڕەوانەی خانویەکی ئەو گوندە کرد. سەربازەکان بەهۆی ماندویەتیانەوە نەیانزانی بەچ شێوەیەك خەویان لێ کەوتووە، بەیانیەکەی خۆیان لەناوچەیەکی جوان و دڵڕفێندا بینیەوە. خواردن لەڕێی ڕاوێکی فراوانی ئەو ناچەیە و ڕاوی ماسیگەلێکی جۆراوجۆری خۆش، ئاوی زوڵاڵ، هەوایەکی پاك و شێدار و فێنك. ئاسمانی جوانی پڕ لەئەستێرە و ژیان لەگەڵ

کەسانێکدا کە بیر لەسبەی ناکەنەوە، نە میراتیان بۆ هیچ کەسێك بەجیٚ دەهێلاٚ و نەدەبونە مایەی دەریدەسەری هیچ کەسێك، شارێك کە هەموویان بەرپرسی ڕەفتارەکانی خۆیان بون، بگرە کوێخا و سەرۆك دێشیان نەبوو، "دوگانا"بەپزیشك و ڕاوێژکاری ئەو گوندە لەقەڵەم دەدرا نەك سەرۆك و فەرمانڕەوای دێیەك. یەکێك لەو هۆکارانەی کە بووە هۆی ئەوەی"موسا"بۆماوەیەکی دور و درێژ لەوێدا بمێنێتەوە، نەبونی سەرۆك و پێشەنگی کەسێك بەسەری کەسێکی تردابوو، سەرەڕای ئەوەی خەڵکی"کوش"گوێڕایەڵی"دوگانا"یان دەکرد، بەڵام قسەکانی بڕیار و فەرمان نەبوو، بەڵکو وەك ڕێنماییەك لەقەڵەم دەدرا. "دوگانا"پێشنیاری ئەوەی لە"موسا"کرد کە ژن بهێنێت و لێرەدا بمێنێتەوە بۆئەوەی فێری پیشەی پزیشکی بکات.

موسا وتی: من حەزم لەژن هێنان نیە، فێربونی پیشەی پزیشکی پێویستی بەکات و شوێن و ناوچەیەکی تایبەتە.... موسا بیٚ لەم گوتانە باسی ئەوەشی بۆکردن کە لەڕێدا مارێك گەستی.

"دوگانا"لێی پرسی: چۆن مارێك بوو؟چونکە هەموو مارێك دژە ژەهری هەیە. دوای ئەوە بڕێك دەرمانی دا بە"موسا"و وتی: هەرکاتێك مارێك گەستیتی ئەم دەرمانە تێکەڵی ئاو بکە و بیخۆرەوە. ئەم دژە ژەهرە کاریگەری ژەهر پوچەڵ دەکاتەوە. ڕۆژی ماڵئاوایی موسا و سەربازەکان خەڵکی ئەو گوندە کۆبونەوە و بەدڵگرانیەکەوە ڕۆشتن و خەڵکی ئەو گوندەش بۆماوەیەك لەگەڵیاندا ڕۆشتن و ڕەوانەیان کردن، هەندێکیشیان لەدڵگرانیاندا دەگریان، و"دوگانا"ش موسای لەئامێز گرت و بەکوڕم بانگی کرد.

ڕێگای دورودرێژی گەڕانەوە لەگەڵ ئەو هێلانەی لەسەر دارەکەی"نون"دا دەکێشرا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کورتر دەبوو، تا ئەوکاتەی هاوڕێکانی "موسا"دیواری "کوش"یان لەدورەوە بینی و زانیان کۆتایی بەئەرکەکەیان هاتووە. موسا دوای گەشتنی ڕۆشت بەدوای"سوکەر موسا"ی فەرماندەدا، بەڵام پێیان وت ڕۆشتووە بۆ

پایتــەخت و دوای شەســت ڕۆژی تــر دەگەڕێتــەوە. "موســا"ش بــەپێی یاســا و بنەماکانی وڵاتی میسر ماوەی سێ ساڵە لەمیسر دورخراوەتەوە، وای دەزانی چیتر هیچ ڕێگریـەك لەبـەردەم گەڕانـەوەی بۆ میسر بەدی ناکرێت، دەتوانێت ڕاستەخۆ بـڕوات بـۆلای"مریـت"ی دەسـتگیران و پزیـشکی بـاوکی، بـەڵام دەبێـت چـاوەڕێی گەڕانەوەی"سوکەر موسا"بکات. دوای تێپەڕبونی ماوەیەك"سوکەر موسا"گەڕایەوە و لێی پرسی: شاری زێڕینت دۆزیەوە؟

"موسا"ش وەڵامی دایەوە: خۆت باش دەزانی کە شاری زێڕین بەهیچ شێوەیەك بـونی نیـە، ئێـستا کـاتی ئـەوە هـاتووە بگەڕێمـەوە بـۆ میـسر، چـونکە کەسـانێك چاوەڕێی گەڕانەوەم دەکەن.

"سوکەر موسا"هێشتا نەیزانیوە کە"موسا"کۆیلە زادەیـە و وایـدەزانی شازادەی کۆشـکی فەرمانڕەواییە. ئەو لەپایتەختـدا فیرعـەونی بـەهۆی ئـەوەی بینـی موسـای لەگەڵـدا نیـە زۆر خۆشـحاڵ بـوو، بـەڵام لەهـەمان کاتـدا هـیچ بەربەسـت و ڕێگریـەك نەیدەتوانی ڕێ لەگەڕانەوەی موسا بگرێت.

موسا وتی: سبەی دەگەڕێمەوە بۆ میسر و پرسیاری بارودۆخی میسری لێکرد.

"سوکەر موسا"ش وتی: ئەوەی بەلاتـەوە سەیر بێت بنیات نانی پەرستگایەکی تازە کە بڕیارە"نف"ی تەلارساز بۆ فیرعەون دروستی بکات.

موسـا وتـی: لەپایتەختـدا پەرسـتگاگەلێکی زۆرمـان هەیـە، ئەمـەیان چ جـۆر پەرستگایەکە؟

سوکەر موسا وتی: کاتێك دەگەڕێیتـەوە بۆ پایتـەخت دەتـوانی نمونەیـەکی ئـەو پەرسـتگایەی کـە بڕیـارە لـەناو چـوار بـەردا بیتاشـن دەبینـی، ئـەو بەردانـەش کـە دەیتاشن لەبەردەم پەرستگاکەدا دایدەنێن، لەهـەمان کاتدا چوار پەیکەری فیرعـەون بەلاسـەریەوە دەتاشـن، ئـەم جـۆرە تـەلارەی کـە"نـف"باسـی دەکـات، بۆهەمیـشە دەمێنێتەوە و لەناو ناچێت، کاتێك ڕۆشتی بۆ ئەوێ لەنزیکەوە پرسیاری وردەکاری دروستکردنی ئەم پەرستگایەی لێ بکە.

## موسا و ماڵی"موسا ئاتون"ی پزیشك

"نون"لەگەڵ نیشان دانی ئەو ماڵەدا وتی: گەورەم ئایا دەزانی یەکەمین جار کەی بوو هاتین بۆ ئەم ماڵە؟

موسا وتی: سێ ساڵ و شتێك لەوەوپێش.

"نون" وتی: سێ ساڵ لەئێستا لاوتر بوین. موسا ئاوێنەکەی ڕوبەڕوی خۆی گرت، دوای ئەوە دای بەدەستی"نون"ەوە، ئەویش تەماشایەکی خۆی کرد و وتی: گەورەم لەبەرئەوەی من نۆکەری تۆم هەر کەم و کورتیەکم تێدا بێت گرفت نابێت، بەڵام ئەگەر تۆ بەو شێوەیە بڕۆیتە لای دەستگیرانەکەت لێت دەتۆقێت.

موسا وتی: ڕاست دەکەیت. دەتوانی سەر و ڕیشم بۆ بتاشیت و منیش سەر و ڕیشت بۆ بتاشم.

موسا و نون بەلێخوڕی"گەمی"کەیان وت بمانگەیەنەرە ئەوبری ڕوباری نیلەوە، دەمانەوێت کەمێك لابدەین. دوای ئەوەی"گەمی"کە کەناری گرت، بەستیانەوە بەپەتێکەوە، دوای ئەوە خۆیان بەسەرتاشینی یەکتریەوە سەرقاڵ کرد. دوای ئارایشت و خۆشۆردن موسا جوانتریی جلوبەرگی لەبەرکرد و جلێکی زۆر جوانیشی دا بە"نون"بۆئەوەی لەبەری بکات، پشتێنێکی زیونیشیان کڕی و"نون"لەکەمەری بەست. ئارایشت و جلپۆشین و خۆ ڕێك خستنیان تانیوەڕۆ درێژەی کێشا ئەوکات بەرەو ماڵی"موسا ئاتون"ی پزیشك بۆ چاوپێکەتنی"مریت ئاتون"بەڕێ کەوتن. موسا هەر ئەوکاتەی لەو ناوچەیە نزیك بویەوە لەدورەوە تەماشایەکی ئەو ماڵەی کرد و بینی بەشێك لەو ماڵە وێران بووە. دوای ئەوە

موسا و نون سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە بە"گەمی" ڕێگای میسریان گرتەبەر. لەبەرئەوەی لەنیلەوە لەوشکانی خێراتر دەگەشتنە شوێنی مەبەستیان بۆیە ڕێگای ئاویان گرتەبەر... موسا بەهۆی گەڕانەوەی بەڕادەیەك وروژا و خۆشحاڵ بوو، لەکاتی هەڵهاتنی خۆری بەیانیدا ماڵی سپی پزیشکی بینی و نەیتوانی لەخۆشیاندا ڕێ لەفرمێسك و گریانی بگرێت و بە"نون"ی وت: سەرئەنجام گەشتین ئێستا "مریت ئاتون"چاوەڕێیە.....

لەهەمان ئەو شوێندا لاشەیەکی بینی، لاشەی منداڵێك بوو، دیاربوو کە ئەو منداڵە هی کەنیزەیەکی ئەو ماڵەیە.

موسا کاتێك ئاماژەی بۆ ئەو منداڵە کرد بە"نون"ی وت: دەبینی جەستەی ئەم منداڵە وەك پێستە وشك بوەتەوە، خۆر ئەو لاشەیەی وشك کردووەتەوە، دیارە ماوەیەك بەسەر مەرگی ئەو داماوەدا تێپەڕیوە. من بەبینینی ئەم لاشە و وێرانی ئەم ماڵە هەستێکی خراپ بەرۆکی گرتوم.

نون وتی: گەورەم، ئەو منداڵەیان کوشتووە، لەوباوەڕەدام خوداکانی"کوش" لەپەرستگاوە تێپەڕیون و ئەم کارەیان ئەنجام داوە.

موسا وتی: بێگومان چەند کەسێك لە"کوش"ەوە هاتون بۆ ئێرە و هەم ئەم منداڵەیان کوشتووە و هەم زیانیان بەماڵەکەش گەیاندووە. موسا بەوردی تەماشای ماڵی پزیشکی گۆشەگیری کرد و زانی کە بەشێکی ئەو ماڵە وێران کراوە و بەشکەی تریشی سوتێنراوە، چونکە پاشماوەی ئارگرەکەی پێوە دەبینرێت.

"نون"یش هەمان بۆچونی هەبوو و وتی: با بەپەلە بڕۆینە ماڵەکەوە.

لەسەرەتای چونە ژوریان لەبەردەم ئەو خانوەدا کە پێشتر باخچەیەکی جوان بوو، زەوی وشك و گیای کێوی تێدا ڕوابوو. لەناو ماڵەکەشدا جەستەی"موسا ئاتون"ی پزیشك لەگۆشەیەکدا کەوتبوو. موسا شێوازی جلوبەرگ و قەد و باڵای پزیشکی ناسیەوە، نەك لەڕوخساریەوە، چونکە جەستەی سەری پێوە نەبوو.

موسا وتی: سەریان بردووە بۆئەوەی نەتوانرێت لاشەی مۆمیا بکرێت. موسا دوای ئەوەی چاوی بەلاشەی"موسا ئاتون"ی گۆشەگیری کەوت لەگۆشەیەکی تردا چاوی بەلاشەی"مریت ئاتون" کەوت، کچێك کە موسا بۆ ماوەی سێ ساڵ بەیادی ئەوەوە شەوی بەڕۆژ و ڕۆژی بە شەو دەکردەوە بۆئەوەی بگەڕێتەوە و جارێکی تر چاوی پێی بکەوێت و ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنێت. جەنگاوەرانی وڵاتی"کوش" هەم"مریت" و هەم"دایکیشیان کوشتبوو، موسا بەهۆی لاشەی ئەو منداڵەوە زانی کە ماوەیەك بەسەر کوشتنیاندا تێپەڕیووە، بەڵام بەهۆی وشکی هەواو و نەبارینی باران لاشەیان هەڵنەوەشاوە، بەڵکو وشك بووە. وشکی تەرمەکان

ئەو خاڵەی هێنایەوە یاد"نون" کە بەلایەنی کەم ماوەی ساڵێك بەسەر ئەم تاوانەدا تێپەڕیوە، لەوانەشە زیاتر.

نون وتی: بەلامەوە سەیرە، چۆن بەدرێژایی ئەو ماوەیە هیچ کەسێك سەردانی ئێرەی نەکردووە!

موسا دوای بینینی لاشەی"مریت ئاتون"بێدەنگی بۆخۆی هەڵبژارد و هیچی نەوت.

نون وتی: گەورەم دەزانم لەچ بارودۆخێکدایت و چەنێك خەمیان بۆ دەخۆیت. ئەگەر دەتەوێت جەستەی دەستگیران و دایکی مۆمیا بکرێن، ئەوا دەبێت بیانگوازینەوە بۆ"کرنگ" وپێیان بڵێین کە بۆمان مۆمیا بکەن.

موسا هەر بەوشێوەیە بێدەنگ بوو و هیچی نەوت.

نون لێی پرسی: ئەگەر ڕێم بدەیت بەهاوکاری لێخوڕ"گەمیّ"کەمان لاشەکان بەخاك بسپێرین.

موسا توانای قسەکردنی نەبوو و هەر بەوشێوەیە لەخۆ ڕاماو تەماشای شوێنێکی دەکرد. "نون"بێدەنگی موسا بەهێمای بەڵێ لێکدایەوە و لێخوڕی"گەمیّ"کەی بانگ کرد.

لێخوڕی"گەمیّ"کەش وتی: لەڕاستیدا بریسمە. هەر زۆر باش بوو کە بانگت کردم بۆئەوەی نانی نیوەڕۆتان لەگەڵدا بخۆم، بەڵام کاتێك خۆی کرد بەماڵدا و چاوی بەلاشەکان کەوت، ئەوکات زانی چ باسە و چاوپێکەوتنی دەستگیرانەکەی گۆڕاوە بەچ کارەساتێك.

"نون"لە لێخوڕی"گەمیّ"کەی پرسی: دەتوانی لێکی بدەیتەوە چ کاتێك ئەم کارەساتە ڕویداوە.

لێخوڕی"گەمیّ"کە لاشەکانی پشکنی و وتی: بەلایەنی کەم ساڵ و نیوێك دەبێت کە ئەم کارەساتە ڕویداوە.

نون وتی: منیش بەهەمان شێوەی تۆ لێکم دایەوە.

لێخوڕی"گەمیّ"کە لێی پرسی: دەزانی کێ کوشتونی؟ بۆچی لاشەکانیان مۆمیا نەکردووە؟

نـون وتـی: لەبەرئـەوەی لەوانەیـە هـیچ کەسـێك ڕێـی لێـرە نەکـەوتبێت، لەوانەیـە یەکـەمین کەسـانێك بـین کـە دوای کوشـتنیان چـاومان پێیـان بکـەوێت. ئێـستاش هاوکـاریم بکـە بۆئـەوەی گۆڕیـان بـۆ هەڵکـەنین بۆئـەوەی بـەخاکیان بـسپێرین. لێخوڕی"گەمیٚ"کە لەهـەمان ئەوکاتـەدا تەماشـای جلوبەرگی"موسا"ی کـرد و زانـی ئـەو یەکێکـە لـە شـازادەکانی کۆشـکی فـەرمانڕەوایی میـسر. چـونکە لەکـەناری ڕوباری"نیل"دا بەئاگاداربونی لەهێماکان پەیی بـەوە برد"موسا"کەسێکی ئاسایی نیە و لەشازادەکانە. موسا لەوکاتەوەی ڕێگای ماڵی"مریت ئاتون"ی گرتووەتە بەر لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو، بەڵام دوای ئەوەی خۆی کرد بەماڵی"مریت"دا و بینی لاشەی دەستگیرانەکەی بەکوژراوی کەوتووە، خەمێکی قوڵی بەرۆکی گرت.

"نون" و لێخوڕی"گـەمیٚ"کە لـەناکاو ئەم گۆڕینـەیان بەجوانی لەموسـادا بینـی و لێخـوڕی"گـەمیٚ" کـە پیـاوێکی جیهـان دیـدە و ئەزموندیـدە بـوو زانـی لەوانەیـە ئەو خەمـەی کارەسـاتێکی لـەناکاوی بەسـەر ئـەو کـوڕە لاوەدا بهێنێـت. بەدرێـژایی ڕێگا تـەنها باسـی مـەرگ و بێوەفـایی جیهـان و هەنـدێك بابـەتی تـری دەکـرد، بۆئـەوەی کـەمێك لەخەمـەکانی کـەم بکاتـەوە. لێخـوڕی"گـەمیٚ"کـە کەسـێکی بەتەمـەن بـوو و مردوویەکی زۆری بەچاوی خۆی بینیبوو، ئەو وتـی: مـەرگ دەقاودەق وەکوو ژیـان وایە، مەرگ و ژیـان هـیچ جیاوازیـەکیان لەگـەڵ یەکدا نیـە. ژیـان وەکـوو "نیـل"لـەم دۆڵەدا بەردەوام دەبێت، مەرگیش بریتیـە لـەم ڕوبـارە، بـەڵام لـەڕێڕەوە باریکترەکانـدا لەشـێوە جۆگەلەیـەك ئـاودێری کێڵگـەکان دەکـات. خـەڵکی والێکـی دەدەنـەوە ئـەو ئـاوەی لەجۆگەلەکانـەوە دەگاتـە کێڵگەکـەیان، لەگـەڵ ئـەو ئـاوەی لـەڕوباری نیلـدا لـەحاڵی خرۆشـاندایە جیـاوازە، لەکاتێکـدا وانیـە، هـەردوکیان لەسەرچـاوەیەکەوە هەڵدەقوڵێن، بەڵام دابەشی چەند ڕێڕەوێك کراون، ئەو هەمان ئەو مرۆڤەی پێشووە، بەڵام لەڕێڕەوێکی تازەدا خۆی دەبینێتەوە بەڵام نەمردووە، بەڕوکەش مـردووە بـەڵام لەناخەوە زیندووە. هیچ یەك لەم گوتانە نـەیانتوانی بۆ سـاتێکیش دڵنـەوایی موسـا بدەنەوە، هەر لەبنەچەوە بیر و هەستی موسا لەویٚ نەبوو، تا بتوانێت گوێی لەشتێك ببێـت. تـەنها جوڵەیـەك کـە"موسـا"ئـەنجامی دەدا، پێـدانی بڕێـك زێڕبـوو بۆئـەوەی لەمەراسیمی بەخاك سپاردنەکەیاندا، ئەویش دوای مومیاکردنیـان لەهـەمان شـوێنی

کوشتنیاندا خەرج بکات. دوای ئەوە موسا توانی بە"نون"بڵێت بڕوات بۆ لای"نف"ی تەلار ساز و پێی بڵێت گۆڕێك بۆ ئەم سێ کەسە بەتکای موسا دروست بکات، بۆئەوەی گۆڕەکەیان لەناو نەچێت. من لێرەدا دەمێنمەوە تا تۆ دەگەڕێیتەوە.

نون لێی پرسی: چ کەسێك کارەکانت ئەنجام دەدات، چ کەسێك خواردنت بۆ دروست دەکات؟

موسا وتی: تۆ دڵگرانی من مەبە. تەنها زوو خۆت بە"نف"ی تەلارساز بگەیەنە و ئەو لەگەڵ خۆتدا بهێنە بۆ ئێرە. "نون"دڵی نەدەهات"موسا"بەتەنها بەجێ بهێڵێت، بەڵام لەبەرئەوەی دەیزانی هەر دەبێت بڕوات و کاروباری مۆمیاکردنەکە ڕێکبخات ناچار بەڕێکەوت و گەشتە شوێنێك کە لەنزیك کەنار ڕوباری"نیل"دا کۆمەڵێك کەس خەریکی دروستکردنی پەرستگای فیرعەون بون و بڕیاربوو پەرستگای ناوبار لەناو بەردێکدا هەڵکۆڵن.

"نون"لەکرێکارەکانی پرسی: ئایا"نف"ی تەلارساز لێرەیە؟ لەدوای ئەو پرسیارە کرێکارەکان"نون"یان بردە لای"نف"ی تەلارساز.

نف وتی: من ماوەی سێ ڕۆژی تر سەرقاڵی کارم، بۆیە ناتوانم ئێرە بەجێ بهێڵم، بەڵام لەدواییدا هەوڵ دەدەم خۆم بگەیەنمە ماڵی"موسا"ی پزیشکی گۆشەگیر، کۆمەڵێکیش کرێکار بۆ ئەنجامدانی هەندێکار لەگەڵ خۆمدا دەهێنم، هەر بەوشێوەی بەڵێنی"نف"ی تەلارساز لەگەڵ"گەمی"یەکی پڕ لەکرێکار و کەرەستەی پێویستی مۆمیاکردن بەرەو لای موسا و ماڵی پزیشك بەڕێکەوت. هەر ئەوکاتەی گەشتە ئەوێ سەرەتا تەرمەکانی لەگۆڕی کاتیدا دەرهێنا و هەناویانی لەڕیخۆڵە و دڵ و سینە خاڵی کرد، دوای ئەوە پڕیکرد لەدەرەمانی تایبەت و لاشەیانی بەشریتێك پێچا. "نف"ی تەلارساز بەهۆی سەرقاڵ بونی لەکارگای دروستکردنی پەرستگادا، فیرعەون تەنها دوو ڕۆژ لەلای"نون"مایەوە بۆئەوەی نەخشە و فەرمانی دروست کردن و ئەندازیاری گۆڕەکەی بۆ فەراهەم بکات. دوای ئەوە وەستایەکی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەڵبژارد و پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بە"نون"ی نۆکەری"موسا"ی وت: دەبێت بگەڕێمەوە و سەرقاڵی سەرپەرشتی کردنی پەرستگاکەی فیرعەون بم، بەڵام کاتێك تۆ گەڕایتەوە دەڕۆین بۆ"کرنگ"بۆئەوەی

چاوم بە"موسا"ی خاوەنت بکەویت. "نون"لەبەردەم ماڵەکەی"پزیشك"دا دوای دروست کردنی گۆڕەکان و ناشتنی لاشەی مردووەکان، ڕۆشتەوە بۆ لای"نف"ی تەلارساز بۆئەوەی پێکەوە دوای تەواوکردنی پەرستگاکەی فیرعەون بڕۆن بۆ"کرنگ"بۆئەوەی چاویان بە"موسا"بکەویت.

ماوەیەکی زۆرە"نف"ی تەلارسازی چاوی بە موسا نەکەوتووە، بۆیە بەبینینی زۆر خۆشحاڵ بوو و بینی موسا زۆر دڵگران و سەر لێشێواوە، لەبەرئەوە سواری"گەمی"بون و ڕێگای باکوریان گرتەبەر. "موسا"بەدرێژایی ئەو ڕێگایە بێدەنگ بوو، وەك بڵێی هەر"نف"ی لەگەڵدا نەبێت. هەندێجار بۆماوەیەك چاوی دادەخست و ڕۆدەچووە جیهانێکی ترەوە. هیچ ڕوداوێك کە لەچواردەوری موسادا ڕویدەدا نەیدەتوانی بچوکترین کار لەدەرون و ڕەفتاری"موسا"بکات و ئەو لەحاڵەتی ماتی و بەردئاسایی دەربهێنێت. سەوڵ لێدەرەکان سەوڵەکانیان لەئاوەکەدا دەرهێنا و لەسەر"گەمی"کە دایان نا، بۆئەوی نانی ئێوارەیان بخۆن و لەسەر سەکۆی"گەمی"کە کەمێك بخەون. بەیانی ڕۆژی دوایی کاتێك سەوڵ لێدەرەکان لەخەو هەستان"گەمی"کە بەئاراستەی ڕەوتی ڕوبارەکە بەخێرایی دەڕۆشت و هەمان خێرایی ڕوباری هەبوو، هەڵبەت پێویستی لێخوڕینی گەمی ئەوەیە خۆی بەسەر سوکانی"گەمی"کەدا زاڵ بکات، بۆئەوەی نەوەك"گەمی"کە بەر کەناری ڕوبار بکەویت یان بدات لە"گەمی"کانی تر کە لەو ڕوبارەدا هاتوچۆ دەکەن. کۆتایی بەڕۆژی یەکەمی گەشتەکەیان هات و شەو داهات، سەوڵ لێدەرەکانیش دوای خواردنی نانی ئێوارە خەوتن و"نف"ی تەلارساز لەو ماوەیەدا بوبە لێخوڕی"گەمی"کە. سوکانی ئەو"گەمی"یە بریتی بوو لە سەوڵێکی درێژ کە لەدوای"گەمی"کەوە هاوسەنگی"گەمی"کەی پێ ڕادەگیرا، لەهەمان کاتدا ئاڕاستەی ڕێڕەوی خۆی دەکرد. "نون"یش لەتەنیشت"نف"دا ڕاوەستابوو، بەڵام"موسا"لەبنی"گەمی"کەدا ڕاکشابوو و وا دەهاتە بەرچاو کە خەوی لێ کەوتبێت، "نف"ی تەلارساز لەگەڵ"نون"دا گفتوگۆی دەکرد، بابەتی گفتوگۆکەشیان خودی"موسا"بوو!

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: سەیرم لەوە دێت بەچ شێوەیەك"موسا"بەو هەموو خوێندەوارییەوە هەروەها لەقوتابخانەدا زۆر شتی لەبارەی ناوچەكانی تر خوێندووە، تائێستا ناوی شارێكی بەناوی"شاری زێڕین"نەبیستووە، ئایا نەیدەزانی شاری زێڕین بونی دەرەكی نیە و جگە لەئەندێشە و خەیاڵپڵاوی هیچی تر نیە؟

"نون"وەڵامی دایەوە: هەڵبەت گەورەم زۆر باش دەیزانی شاری زێڕین بەهیچ شێوەیەك بونی دەرەكی نیە. خودی خۆشی لەسەرتای كۆچكردنی بۆئەو شارە ئاماژەی بەوە دا، بەڵام فەرماندە بەفەرمانی فیرعەون ئەوی ناچاركرد بڕوات و بەدوای شاری زێڕیندا بگەڕێت.

"نف" لێی پرسی: ئەو شارەی كە وا هەست دەكرا شاری زێڕینە چ جۆر شارێك بوو؟

نون وتی: لەو شارەدا"ئیرەیی، كینە و پێویستی" بونی نەبوو، هەمویان خۆشحاڵ و ڕازی بوون.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: موسا لەشاری زێڕیندا تێكەڵاوی لەگەڵ هیچ كەسێكدا دەكرد؟

نون وتی: مەبەستت لەتێكەڵاوی چیە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: مەبەستم تێكەڵاوی ژنەكانی دەكرد.

نون وتی: گەورەم هیچ كاتێك تێكەڵاوی لەگەڵ ژنەكانیاندا نەدەكرد، بگرە بەرپرس و سەرۆكەكەشیان پێشنیاری ئەوەی لێكرد لێرە بمێنێتەوە و هاوسەرێك بۆخۆی هەڵبژێرێت، بەڵام گەورەم ئەو پێشنیارەی ڕەت كردەوە.

***

لەو سەردەمەدا خەڵكی میسر باوەڕیان بەوە بوو ڕوباری"نیل"چارەسەر بەخشە، ئەگەر نەخۆشێك خۆی هەڵداتە ڕوباری نیلەوە نەخۆشیەكەی چارەسەر دەبێت، بگرە ئەگەر دوچاری گرفتیش بوبێت، هەر ئەوكاتەی خۆی هەڵدایە ناو ڕوباری نیلەوە گرفتەكانی چارەسەر دەبن. ئەم ڕێگا چارەسەریە هەرچی بێت بەسەر"موسا"دا سەلمێنرا كە وایە، چونكە موسا باسی گرفتاری و دڵگرانیەكانی

بۆ هیچ کەسێك نەدەکرد، بگرە باسی نەدەکرد بۆ نزیکترین هاوڕێی خۆی کە"نف"ی تەلارساز بوو. لەڕاستیدا وا دەهاتە بەرچاو کە توانای گفتوگۆکردنی لەدەست دابێت. سەرەتا"موسا" لەناو"گەمیٚ"کەدا دادەنیشت و تەماشای گەشتی گەمێکەی دەکرد، کاتێکیش هەستی بەماندویەتی دەکرد، لەکەنار ڕوباری نیلدا ڕادەکشا. بگرە"موسا"داوای خواردنیشی نەدەکرد و "نون"لەکاتی خۆیدا خواردنی بۆ ئامادە دەکرد، تا ئەوەی وردە وردە لەگەڵ"نف"ی تەلارسازدا کەوتە گفتوگۆ و باسی ڕوداوەکانی"کوش"ی بۆکرد و باسی دیمەنی جوان و سەرسوڕما و سەرچاوەی ڕوباری نیلی بۆ کرد. بۆنمونە ئەو یەکێك لەوبابەتانەی "موسا"بۆ "نف"تەلارسازی گێڕایەوە ئەو جەنگە بوو کە لەنێوان میسر و وڵاتی"کوش"دا بەرپابوو، بەواتا لەڕاستیدا میسریەکان کوشت و کوشتاریان خستە نێو خەڵکی"کوش" و باسی ئەوەشی بۆ کرد کە بەچاوی خۆم ئەو جەنگ و کوشت و کوشتارەی بینیوە و لەکۆتایی جەنگیشدا ئەم پرسیارە وەك چەکوش دەدرا لەسەرم، بۆچی مرۆڤەکان وەك ئاژەڵە کێویەکان دەکەونە گیانی یەکتری و یەکتری دەکوژن. لەکاتێکدا جیهان بەو فراوانیەوە جێگەی هەموو کەسێکی تێدا دەبێتەوە و پێویست بەوە ناکات بۆ دابین کردنی پێویستیەکانمان کەسانی تر بکوژین و مافی کەسانی تر زەوت بکەین. پێشتر لەمامۆستاکانم بیستووە کە زەوی زۆر لەوە گەورە ترە کە ئێمە لێکی دەدەینەوە. من زۆرباش بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی گرتبومە بەر بۆئەوەی شاری زێڕین و سەرچاوەی ڕوباری نیل بدۆزمەوە پەیم بەم ڕاستیانە برد. بەڕادەیەك زەوی بۆ کوشتوکاڵ زۆرە کە هیچ کەسێك بێکار و برسی نابێت. لەو گەشتەمدا پەیم بەو ڕاستیانە برد، ئەگەر دە ئەوەندەی کۆمەڵگای میسر و وڵاتانی تریش لەدایك ببن، ئەوا زەوی بۆ تێرکردنی ورگیان زۆر لەژمارەی ئەو دانیشتوانە زیاترە.

"نف"ی تەلارساز وتی: ڕاست دەکەیت، جیهان بەڕادەیەك فراوانە کە هەرچەنێك کۆمەڵگای نوێی تێدا لەدایك ببێت، دەتوانن تێیدا بژین، کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و سەرچاوە و پیشەکانی تر بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان لەم جیهانەدا بەدەست دێت و خەڵکی ئەم جیهانە نابێت بۆ ئەم پێداویستیانە بکەونە گیانی یەکتری.

بەبۆچونی من ئەم گرفتە لەپەرستنی خودا جۆراوجۆرەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، هەر خودایەك یاسایەکی تایبەت بەخۆی هەیە، لەبەرئەوەی خەڵکانی جۆراوجۆری ئەم جیهانە خوداگەلێکی جیاواز و جۆراوجۆر دەپەرستن، بەبۆچونی من جەنگ و مرۆڤ کوژی و داگیرکردنیش لەپەرستنی خودای جۆراوجۆر و ئالەم جۆرە بیروباوەڕانەوە سەرچاوە دەگرێت، بەدڵنیاییەوە ملکەچ بونی ئەو هەموو نەتەوەیەی جیهان لەبەرامبەر ئەو هەموو خودایانەدا بارودۆخێکی ئاوا دەهێنێتە بوون. بۆ نمونە بەفەرمانی خودا هەندێك لەخێڵەکان، کوشت و کوشتار دەخەنە خێڵەکانی ترەوە، و بەپێچەوانەشەوە هەندێك خێڵیش بگرە کوشتنی گیانەوەرێکیش بەتاوان دەزانن هەڵبەت بەفەرمانی خوداکان. هەندێك لەخێڵەکان بۆنمونە خەڵکی "دوگانا" هەرچیان هەیە لەنێو خۆیاندا دابەشی دەکەن و هیچ کەسێك لەهیچ کەسێکی تر بەباشتر نازانن و بەو هۆیەشەوە ژیانێکی ئارامیان هەیە. بەڵگەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە هیچ خودایەك ناپەرستن.

"نف"ی تەلارساز لە"نون"ی پرسی: بەڵام خەڵکی"دوگانا"-شاری زێڕین- هیچ خودایەك ناپەرستن.

نون وتی: ئێمەش بەو هۆیەوە هەمان ئەو پرسیارەمان لێکردن، لەوەڵامدا پێیان وتین، ئێمە باوەڕمان بەهیچ خودایەك نیە، هەر لەبنەچەوە هیچ خودایەك ناپەرستین.

"نف"ی تەلارساز وتی: ناتوانم باوەڕ بەوە بهێنم کە خێڵ و نەتەوەیەك بێ خودا بن، ئەمە شتێکی مەحاڵە.

نون وتی: "موسا"ی خاوەنم زۆرباش ئاگاداری ئەوە بوو کە دانیشتوانی "دوگانا"هەمان ئەو گوتەیان هێنایە زمان-ئێمە هیچ خودایەکمان نیە-.

تەلارساز وتی: بگرە ئەوانەی کە وا خۆیان نیشان دەدەن هیچ خودایەك ناپەرستن، هەمان ئەو خەڵکانە نەریت و بنەمای و یاسایەکی تایبەت بەخۆیان هەیە کەلەناو کۆمەڵگاکەیاندا پەیڕەوی لێ دەکەن و پابەندن پێیەوە، بۆیە هەمان ئەو کۆمەڵگایەی تۆ باستکرد شێوە خودایەکیان لەڕێی نەریت و یاسا و بنەمای کۆمەڵایەتیەوە بۆ خۆیان دروست کردووە، بۆیە هیچ کەس و کۆمەڵگایەك و خێڵێك

بەدی ناکرێت کە خاوەنی خودایەك نەبێت، بەدڵنیایەوە ئەو بۆچونە پوچ و بێبنەمایە کە دەڵێن هیچ خودایەك ناپەرستن، بگرە خێڵێکی وەك"دوگانا"ش لەبەرئەوەی چوارچێوەیەك لەیاسا و نەریتیان بۆخۆیان دارشتووە و پەیرەوی لێ دەکەن. هەمان ئەو چوارچێوەیە جیاوازی نێوان چاك و خراپ و رەفتارەکانی تر دەستنیشان دەکات. بەدڵنیاییەوە پێت دەڵێم بگرە گیانەوەر و باڵندەکانی ئاسمانیش خودایەکیان هەیە بۆئەوەی بنەمای و شێوازی ژیانی نێوان کۆمەڵگاکان رێك بخات. "نون"نەك تەنها مرۆڤ بەڵکو هەموو بونەوەرێکی زیندوو ئیتر لەهەر کوێی ئەم گۆی زەویەدا بێت ئیتر لەوشکانیدا بێت یان لەئاودا یان لەهەوادا بێجیاوازی دەبێت خودایەکیان هەبێت، چونکە بێ ئەو مەحاڵە بتوانن بژین. من لەوەش زیاتر پێداگیری دەکەم و دەڵێم بگرە بێگیانەکانیش خودایەکیان هەیە.

"نون"وتی: بێگیانەکانی وەك ئاو و ئاگر و بەرد و دار، بەچ شێوەیەك دەکرێت خودایەکیان هەبێت؟ دەتوانی پێم بڵێی کێ خودای ئاگرە؟

"نف"وەڵامی دایەوە: خودای ئاگر هەمان ئەو کەسەیە کە فەرمانی سوتان و سوتاندن دەردەکات، خودای ئاویش هەمان ئەو کەسەیە کە فەرمان دەدات ئاگر بەئاو بکوژێنێتەوە و لەنێو مرۆڤەکانیشدا خوداگەلێکی جۆراوجۆر هەیە، خودایانی چاکمان هەیە و خودایان خراپ، بۆیە خوداکان لەهەموو شوێنێکدا هەن. لەکێوی"قاف"خێڵێك هەیە کە خوداگەلێکی باشیان هەیە، بگرە خاوەنەکەت "موسا"چاوی پێیان کەوتووە.

موسا وتی: وایە. لایەنگری ئەم قسەیەی دەکەم.

"نف"وتی: ئەم خێڵە سەرقاڵی کرین و فرۆشتنن، بۆیە لەوڵاتێکەوە دەرۆن بۆ وڵاتێکی تر تا ئەو کاتەی کاڵاکانیان بەتەواوی ئاڵوگۆر پێنەکەن ئەم گەشتەیان بەوشێوەیە بەردەوام دەبێت، خودای ئەم خێڵە ناوی"پرومتە"یە کە لەکێوی "قەفقاز"دا دەژیت. ئەم خێڵە لەوباوەرەدان خوداکەیان بەبەزەیی و میهرەبانە و مەحاڵە بتوانێت زیان بەخەڵکەکەی بگەیەنێت، بگرە هەرەشەکانی ژیانیشیان لێ دور دەکاتەوە، ئەگەر یەکێك لەباوەرپدارانی"پرومتە"دوچاری هەر هەرەشەیەك ببێتەوە، "پرومتە" ناهێڵێت هیچ زیانێکی پێ بگات، مەگەر ئەوەی لەوکاتەدا

ماوەی ڕزگار کردنی نەبێت. "پرومتە" ئەوەی مرۆڤ دەیەوێت بۆی هێناوەتە بون، گیانەوەری گیاخۆری دروست کردووە، ماسیەکانیشی بەشێوەیەکی تر دروست کردووە، مرۆڤی گۆشتخۆر دروست کردووە، بۆئەوەی ئەویش بەشێکی لەچێژەکانی ژیاندا هەبێت، گیا و ڕوەك و گوڵە بۆندارەکانی دروست کردووە بۆئەوەی مرۆڤ بەبۆنکردنیان مەست ببێت. "پرومتە" بۆئەو کەسانەی باوەڕیان پێیەتی ئاگری لەقولەی"قاف" کە "قەفقازی"ئێستایە هێنایە خوارەوە و مرۆڤی فێر کرد کە بەچ شێوەیەك بەکاری بهێنێت و سودی لێ وەرگرێت، پەیڕەوانی"پرومتە" دەزانن بەچ شێوەیەك سود لەئاگر وەرگرن.

"پرومتە"مهرەبانە و ئەوەی بۆ باوەڕداران دوپاتکردووەتەوە کە نەوەکو دەست لەکارگەلێکی وەکو کوشتن و ستەم ئەنجام بدەن. لەڕوی ڕەفتار و کردارەوە پەیڕەوانی"پرومتە" یەکێکن لەمیهرەبانترین خێڵی جیهان و زۆر بەدەگمەن بینراوە ئەم خێڵە لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ بێن، بگرە ئەمانە نەك شەڕی جەستەیی بەڵکو دەمەقرەش لەگەڵ یەکدا ناکەن و بەسەر یەکتریشدا ناقیڕێنن، تەنها لەدوو کاتدا دەتوانی گوێت لەدەنگی پەیڕەوانی"پرومتە"بێت، لەکاتی بانگکردنی یەکتری بۆئەوەی زانیاریەك بەیەکتری بدەن، دووەمیان لەکاتی گۆرانی وتندا. ئەگەر پەیڕەوانی"پرومتە"لەگەڵ خەڵکی"هاتی"دا بەراورد بکەین، ئەوکات تێدەگەین چ جیاوازیەك لەنێوان ئەم دوو خێڵەدایە. "هاتی"ەکان زبر و بەدڕەوشت و توندخوو و بێبەزەیی و دەمشڕن، بگرە گفتوگۆی ئاساییشیان لەشەڕ خراپترە. ئەم خێڵە لەبەر هەندێك بابەتی ئاسایی شەڕ لەگەڵ یەکتردا دەکەن، لەوانەشە بگاتە حاڵەتی کوشتنیش. لەوانەیە لەبەر پێکێك ئاوجۆ ناکۆکیەکی زۆر گەورە تا ئاستی کوشتن لەنێوانیاندا دروست ببێت، هۆکاری ئەو هەموو توندوتیژیەش ئەوەیە کە خێڵی"هاتی"پەیڕەوی لەخودایانی جنگخواز دەکەن و ناتوانن بەسەر خۆیاندا زاڵ بن و ویستیان"ارادە"زۆر لاوازە. خوداکانی"هاتی"خوداگەلێکی خوێنڕێژ و توندڕەو و بێبەزەیین، هەر ئەم ڕەوشت و خووە خواوەندی هاتی، بوەتە هۆی ئەوەی پەیڕەوانی بەوشێوەیە توندڕەو و بێبەزەیی و بێڕەوشتیان لێ دەربچێت،

بەکورتیەکــەی خوداکــان نمونــە و هێمــان و پەیڕەوانیــشیان دواکەوتــە و لاساییکەرەوەی ئەوانن.

موسا وتـی: بیستومە کە پەیڕەوانی "پرومتە" خودای خۆیان لەکێوی "قاف" زیندانی کردووە و بەزنجیر "پرومتە"یان بەستووەتەوە بۆئەوەی نەتوانێت لێیان هەڵبێت.

"نف" وتـی: زیندانی کردن و بەستنی "پرومتە" بەسەر قولەی "قاف"ەوە تەنها دەستەواژەیەکی سەرزارەکیە. چونکە پەیڕەوانی "پرومتە" ئەویان بەزنجیر بەکێوەکەوە نەبەستووەتەوە، بەڵکو بەڕادەیەك "پرومتە"یان خۆش دەوێت کە ئەویان لەوێ ڕاگرتووە بۆئەوەی خودا لە قولەی "قاف"ەوە نەڕوات بۆ هیچ شوێنێکی تر. لەبەرئەوەی دەزانن کە "پرومتە" خودایەکی میهرەبان و بەبەزەییە و دەتوانێت لەهەر شوێنێك خۆی بیەوێت بژیت، ئەگەر لەسەرەتادا خەڵکی ئەویان لاپەسەند نەبوایە "پرومتە" بەرەفتارەکانی خەڵکی دەکردە پەیڕەو و گوێڕایەڵی خۆی و سەرنجی هەموویانی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. "پرومتە" خودایەکی بەبەزەیی و مهرەبانە و بەردەوام هەوڵ دەدات مرۆڤ لەخۆشبەختیدا بژیت، بەستنەوەی "پرومتە" دەبێت بەڕشتەی گفتوگۆی بزانین نەك زنجیری ئاسنین و کەرەستەکانی تر.

نون لێی پرسی: بەپێی ئەوەی تۆ ئێستا باست کرد "پرومتە" خودای "قاف" خۆشی حەز ناکات ئەوێ بەجێ بهێڵێت و بڕوات بۆ شوێنێکی تر؟

"نف"ی تەلارساز وەڵامی دایەوە: تا ئەو کاتەی باوەڕدارانی "پرومتە" ئەویان خۆشبوێت، ئەوا ئەویش لەلایان دەمێنێتەوە و ناڕوات بۆ هیچ شوێنێکی تر، لەڕاستیدا خەڵکی "قاف"و خوداکەیان یەکتریان زۆر خۆشدەوێت.

"نون" لێی پرسی: کەواتە بۆچی "پرومتە" دەڕوات بۆ شوێنێکی تر؟ لەبەرچی دەڕوات؟

"نف"ی تەلارساز وەڵامی دایەوە: ئەگەر خودای چاکە ڕوو لەوڵاتێك وەرگێڕێت و بەجێی بهێڵێت، ئەوا خەڵکەکەی دوچاری دەردیسەریەکی زۆر دەبن و چیتر نابنە

خاوەنی خودای چاکە. هەڵبەت ئەو خودایەش نابێت بەخودایەکی باشی لەقەڵەم بدەیت کە خەڵکەکەی بەجێ بهێڵێت.

"نون"لێی پرسی: بۆچی نابێت خودایەکی باش بێت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: بنەمایەك فەرمانڕەوایی هەموو شوێن و وڵاتێك دەکات، ئەویش ئەوەیە ئەگەر وڵاتێك خودایەکی چاك لەدەست بدات، دەبێتە خاوەنی چەند خودایەکی خراپ.

"نون"لێی پرسی: چ کاتێك خودایەکی چاك ڕو لەوڵات و میلەتێك دەکات و بۆچی دەڕوات؟

"نف"ی تەلارساز وەڵامی دەداتەوە: هۆکاری ڕۆشتنی خودایەکی چاك دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی لایەنگرانی.

نون لێی پرسی: ئایا ئەکرێت نەتەوەیەکی باش و خاوەن ویستیش خودایەکی چاك لەدەست بدەن؟

"نون"ی تەلارساز وتی: بەڵێ، ئەویش کاتێك کە ئەو خێڵە ڕێگای گەندەڵکاری بگرنەبەر و بکەوێتە سەر تولەڕێی خراپەکاری، بەکورتیەکەی گەندەڵی و خراپەکاری لەو وڵاتەدا زۆر بێت.

نون لێی پرسی: ئەی تەلارسازی کۆشکی فیرعەون، گوتارەکانت لەبارەی "پرومتە"ی خودای خەڵکی"قاف"زۆر سەرنج ڕاکێشن، بەڵام ئێمەش خەڵکانێکی سەرەتایی و نەزانین و لەبارەی خوداکانی خۆمانەوە بەسەرهاتگەلێکی زۆرمان هەیە.

"نف"ی تەلارساز پرسی: ئەو بەسەرهاتانە چین؟

نون وتی: لەو سەردەمانەی کە مێژووەکەی نادیارە، مرۆڤ لەشوێنێکدا دەژیا کە نە برسیەتی و نە تینویەتی نە گەرم و نەسارما بونی نەبوو و بەبەشێك لەگرفتەکانی ئەو شوێنە لەقەڵەم نەدەدرا. ئەو شوێنەیان بە"بەهەشت"بانگ دەکرد، هەوایەکی گونجاوی -نەسارد و نە گەرم- هەبوو. هەروەها بەهیچ شێوەیەك نەخۆش نەدەکەوتیت، خواردن و خواردنەوە بۆ هەموو کەسێك فەراهەم بوو، تەنها یەك میوە قەدەغە بوو بیخۆیت.

مرۆڤ پرسی: میوەی چ درەختێك نابێت بخورێت.

خوداش فەرمووی: ئەو میوەی ناوی"زانست"ە، تۆ نابێت لەو میوەیە بخۆیت.

مرۆڤ پرسی: بۆچی نابێت لەو میوەیە بخۆم؟

خودا فەرمووی: خواردنی ئەو میوەیە یەکسان بە"دانایی"تۆ و چیتر لەو ساتە بەدواوە پێچەوانەکەی دەست پێدەکات... سەرەتا مرۆڤ بەڵێنی دا لەو میوەیە نەخوات، بەڵام لەدواییدا نەیتوانی بەڵێنەکەی خۆی بپارێزێت، لەمیوەی زانستی خوارد، دوای ئەوە لەبەهەشت دەرکرا.

موسا دوای ئەوەی کۆتایی بەگوتەی"نون"ی نۆکەری هات وتی: ئێستا باسی شتێکت بۆ دەکەم کە بەلاتەوە زۆر سەیر بێت.

"نف"پرسی: باسی چیم بۆ دەکەیت؟

موسا وتی: من لەنەژادی ئیسرائیل و لەخێڵی"لوی[31]"م.

"نف"ی تەلارساز وتی: تۆ لەخێڵی"لوی"ت؟ باوەڕ ناکەم.

موسا کە چاوەڕێی وەڵامێکی ئاوا نەبوو سەرەتا بەلایەوە زۆر سەیربوو و وتی: دەتەوێت بۆت ڕونبکەمەوە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: پێشتر ڕونکردنەوەیەکم لەمبارەیەوە بیستووە، ئەویش لەزمانی کاهینی مەزنی کۆشکی فەرمانڕەوایی، لەبەرئەوە پێویست بەدووبارەکردنەوەی ناکات.

موسا بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەو چی بۆ باس کردویت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: بەهەرحاڵ، ئێستا پێویست بەگێڕانەوەی سەرگوزەشت ناکات، بۆیە دەبێت بۆت ڕونبکەمەوە دوای بیستنی نهێنی لەدایك بونت تێگەشتم دایکت ئارەزوی چی بۆ دەکردی و "ئامون تپ"ی کاهینی مەزنی کۆشکی فەرمانڕەواییش هەمان ئارەزوی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو تۆ ببیتە پادشای "میسر". تۆ بەناونیشانی فیرعەونی میسر بانگەشە بۆ خودای نەبینراو بەناوی "ئاتون" بکەیت، بۆئەوەی باوەڕ بەخەڵکی میسر بهێنن و لەباتی خودای"ئامون" خودای"ئاتون"بپەرستن.

---

[31] یەعقوب دوانزە کوڕی هەبوو کە یەکێکیان ناوی"لوی"بوو.

دوای ئەوە"نف"لێی پرسی: ئایا ئەوەت لەبیرە کە ڕۆژێك تۆم برد بۆ وڵاتی"کوش" بۆئەوەی پیشانت بدەم خەڵکی بەچ شێوەیەك دانەوێڵەکانیان خەزێنە دەکەن؟

موسا وەڵامی دایەوە: زۆرباش لەبیرمە.

"نف"ی تەلارسازیش وتی: ئەو ڕۆژەی تۆم برد بۆ وڵاتی"کوش"، تۆ وات دەزانی لەبەرئەوە تۆم برد بۆ ئەوێ بۆئەوەی ئاشنای شێوازی خەزێنەکردنی دانەوێڵەت بکەم، لەکاتێك مەبەستم ئەوە بوو کەبەڕاستی ببینی تۆ لەچ نەژاد و خێڵێکیت، و لەنزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ خێڵەکەی خۆتدا پەیدا بکەیت و بەچاوی خۆت شێوازی ژیانی خێڵی ئیسرائیل ببینی.

موسا وتی: بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری ئەوە نەبووم کەمەبەستت ئەوەبووە نەژاد و خێڵێك پیشانی من بدەیت کە خۆم لەوانم.

"نف"ی تەلارساز وتی: دەمویست لەنزیکەوە بەرجەستەیان بکەیت و بزانی کە ئەوەی ئیسرائیل لەچ گرفتاری و ناسۆریەکدا دەژین، ئەو ڕۆژەی خێڵەکەی خۆتم پێ نیشان دایت، هێشتا هەرزەکاربویت و بەتەمەنی ژیری نەگەشتبویت، بەکورتیەکەی هێشتا نەبوبویت بەپیاو، بەڵام ئێستا بارودۆخەکە جیاوازە، لەبەرئەوەی ئێستا تۆ بەبینینی زۆرێك لەگرفتی خەڵك و میلەتگەلێکی جۆراوجۆر، و بەشدارکردن لەجەنگ و ئەزمون وەرگرتن لەم هەلومەرجانە بەڕاستی بویت بەپیاو.

موسا وتی: ئێستا مەبەستت لەم قسانە چیە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: مەبەستم ئەوەیە دەتوانی بڕیار بدەیت و بڕیاری خۆت کرداری بکەیت، بێئەوەی هیچ کەسێك فەرمانت بەسەردا بکات.

لەوگەشتەدا"گەمێ"ی ئەو سیانە ڕێگای پایتەختی گرتبووە بەر و لەڕێگادا گفتوگۆیەکی زۆریان لەگەڵ یەکدار کرد و "موسا"ش ئاگاداری ڕابردووی"نف"بوو.

"نف"ی تەلارساز دوای ئەوەی گوێی لەبەسەرهاتە ناخۆشەکانی موسا بوو، هەوڵی دا باسی بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ موسا بکات و وتی: لەسەردەمی لاویەتیدا ئاشقی کچێك بوم، باوکی ئەو کچە وەك باوکی"مریت ئامون" پێی وتم: دەبێت دانبەخۆمدا

بکرم و چاوەڕێ بکەم. کچەش وتی: منیش دەبێت ماوەیەك چاوەڕێبکەم، بۆئەوەی بارودۆخم لەڕوی داراییەوە باشتر دەبێت، تا بتوانم ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچێکدا پێك بهێنم. منیش ساڵانێکی زۆر تاڵیم چێشت تا ئەوکاتەی بارودۆخی دراییم باشتر بوو و گەڕامەوە بۆلای ئەو کچە، بۆئەوەی پێی بڵێم کە بەباوکی بڵێت ئێستا هەلومەرجی پێکهێنانی ژیانی هاوسەریەکی لەبارە. باوکی کچەش بەم هاوسەریەتمان ڕازی بوو، ئێمەش ژیانی هاوسەریەتیمان پێکهێنا، بەڵام کاتێك هاوسەرەکەم سکی پڕ بوو، لەکاتی منداڵبوندا کۆچی دوایی کرد و ئەو بەسەرهاتەش زۆر خەمگینی کردم، منیش ئەوشتانەی بەهاوسەرەکەمەوە پەیوەست دەکرا بەهۆی ئازار و خەمەکانمەوە دورم خستنەوە لەخۆم و ئاشکرایە لەوماڵەش بارم کرد بۆئەوەی هاوسەری کۆچکردوم نەهێنێتەوە یاد. من بۆ فەرامۆشکردنی خەم و دڵتەنگیەکانم، تا لەتوانامدا بوو لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا خۆم بەکارەوە سەرقاڵکرد و خواردنێکی سادە و ساکاریشم بۆخۆم ئامادە دەکرد و هەر لەشوێن کارەکەشمدا دەخەوتم، بەڵام کاتێك هاوڕێکانم بۆ نمونە وەکوو کاهینی مەزن"ئامون تپ" و"ئنخاس ئامون" کۆچی دواییان کرد، ناچاربوم لەکۆشکەوە باربکەم بۆ ماڵێکی دەرەوەی کۆشك. بۆئەوەی کاتێك پیویستم بەخەو بێت بڕۆم بۆ ئەوێ تا کەم کەم بتوانم بەسەر خەمەکاندا زاڵ بم.

# لەپایتەخت و لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا

سەرئەنجام ئەو گەشتە دوورودرێژانە کۆتاییان پێهات و"گەمی"لەکاناردا لەنگەری گرت بۆئەوەی سەرنشینەکانی پیادە بکات. "نف"لەوناوچەیەدا بەهۆی ناوبانگیەوە جێی ڕێز و خۆشەویستی تەواوی کرێکارانی کەشتی و باربەرانی ئەو لەنگەرگایەبوو، بەڵام"موسا"کەسێکی نەناسراو بوو، هەروەها هیچ هێمایەکی شازادەییشی بەخۆیەوە هەڵنەواسیبوو. جلی"نون" و جلی"موسا"تاڕادەیەکی زۆر وەکوو یەك وابوون. مەحاڵ بوو بتوانی دەستنیشانی بکەیت کە کام لەم دوانە شازادەیە و کامیان نۆکەرە. "موسا"دوای سێساڵ کە لەپایتەخت دورکەوتبویەوە بەبینینی دیوارەکانی کۆشك و بۆنی تایبەتی ڕوباری نیل و دیمەنەکانی تر هەستی کرد ئەوەیی ئەمڕۆ دەیبینێت، زۆر جیاوازە لەوەی سێ ساڵ لەوەوپێش بینیویەتی. ئەو زانی بۆچی دیوارەکانی کۆشکی فیرعەون وەکوو ڕابردوو شکۆمەندی و مەزنی جارانیان نیە. هۆکارەکەی بێئەزمونی و نەبینیی هەلومەرجی دەورووبەر و وڵاتانی تربوو، لەسەردەمی لاویەتی و هەرزەکاریدا، بەکورتیەکەی ئەو جیهانی لەهەمان ئەو کۆشکەدا دەبینی. دیدگای موسا دوای گەڕانەوەی سێساڵە هەمەلایەنە و پڕمەودا بوو، بەبینینی ڕوداوگەلێکی جۆراوجۆر و بیستنی دیدگاگەلێکی جۆراوجۆر لەگەڵ ئەو دیدگا سەرەتایەی کە لەبارەی جیهانەوە هەیبو زۆر جیاواز بوو. ئەو لەگەڕانەوەدا نیگاکانی وەك پیاوێکی تەواو و پێگەشتوو و کونجکاو بەهەموو شتێکدا دەخشاند.

پیش ئەوەی پیادە بن"نف"وتی: وەرە پێکەوە لەهەمان ئەو ماڵەی تێیدا نیشتەجێم بژین... "نف"ی تەلارساز لەبەرئەوە ئەم پێشنیارەی لێکرد چونکە

دەیزانی "موسا" حەز ناکات بگەڕێتەوە بۆ کۆشکی فیرعەون و لەوێ نیشتەجێ ببێت. "نف" لەماڵێك کە لەخشت دروستکرابوو و لەپێنج ژور و هەیوانێك پێکدەهات دەژیا. سەرەڕای ئەو ژورانە چێشتخانە و سەربانێکی فراوانی بۆ خەوتنی شەوانی هاوین هەبوو. باخچەکەشی ئەوەندە درەختی زەیتون و هەنجیری تێدابوو کە شوێنی بۆ هەیوان نەهێشتبویەوە.

موسا سەری سوڕما.

"نف"ی تەلارسازیش هۆکاری سەرسورمانەکەی لێ پرسی.

"موسا"ش لەوەڵامدا وتی: لەکاتێکدا تۆ ئەم تەلار و کۆشکە مەزنانە بۆ خەڵکی دروست دەکەیت، بۆچی خۆت ماڵێکی ئاوا بچوك و بێنرخت هەیە؟

"نف"ی تەلارسازیش وتی: مەزنی و فراوانی ماڵ هێمنی و ئارامی بەمرۆڤ نابەخشێت، بەڵکو شێوازی ژیان و چۆنیەتی تێپەڕاندنی تەمەنت سەرچاوەی هێمنی و ئارامی تۆیە. ئەم ماڵە کە بێژن و منداڵم بۆ من بەسە.

"نف"ی تەلارساز خزمەتکارێکی پیاو و چێشتکەرێك و باخەوانێکی هەبوو، لەم ڕوەوە موسا زیاتر سەری سوڕما، چونکە بینی "نف"ی تەلارساز کەنیزەکی ژنی نیە، لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە پیاوانی سەڵت لەمیسردا بەلایەنی کەم دو یان سێ کەنیزەکی ژنیان هەیە و ئەم کارەش بەلای هەموو میسریەکەوە ئاسایی بوو. کاتێك موسا بینی هیچ ژنێك لەو ماڵەدا بەدی ناکرێت ئەوسا ڕازی بوو بەوەی لەگەڵ "نون"دا نیشتەجێ ببێت. خودی "نف"ی تەلارسازیش نەیدەتوانی بەشێوەیەکی بەردەوام و درێژخایەن لەو ماڵەدا بمێنێتەوە، بۆیە ماڵەکەی بە موسا و "نون"ی خزمەتکاری سپارد، دوای ئەوە خۆی ڕۆشت بۆ دروست کردنی پەرستگایەکی تازە کە فیرعەون پێی ڕاسپاردبوو. هەربۆیە موسا زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی بێئەوەی هیچ کەسێك بیناسێتەوە لەپایتەختی میسردا ژیان بەسەر دەبات، بەڵام ناچار بۆ یەکلایی کردنەوەی سەروەت و سامانەکەی سەردانی کۆشکی فەرمانڕەوایی بکات و چاوی بە "ستی موسا"ی سەرۆك و بەرپرسی سەروەت و سامانەکەی بکەوێت، چونکە بگرە پارچە کانزایەکیشی بۆ خەرج کردن پێنەبوو. موسا بەهەمان ئەو جلوبەرگە ئاسایی و نەناسراوەوە و بێ هیچ هێمایەکی تایبەت

بەخۆی ڕێگای کۆشکی گرتەبەر هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جلە تایبەتەکانی خۆی لەدەست داوە. گەشتە بەردەم بارەگای کۆشکی فەرمانڕەوایی فیرعەون و بەرپرسی پاسەوانان لێی پرسی:

-تۆ کێیت کە دەتەوێت بڕۆیتە ناو کۆشکی فەرمانڕەواییەوە؟

"موسا"ش تەماشایەکی سەرتاپای ئەفسەری پاسەوانی کرد و وروژا و نەیتوانی ڕێ لەسەرسوڕمانی خۆی بگرێت، چونکە ئەو پیاوە لێوی سور و برۆکانی ڕەش کردبوو، پاسەوانەکانی تریش بەهەمان شێوەی ئەفسەرەکەیان ئاڕایشتیان کردبوو. موسا دەیزانی ئەم پاسەوانانە لەشازادەکانن، بەلام ئەو شازادانەی کە دایکیان کەنیزەك بوون. "موسا"دوای سێسالْ دوری لەکۆشکی فەرمانڕەوایی پەیی بەوە برد کە چ گۆڕانکاریەك لەوێدا ڕویداوە، گۆڕانی پاسەوانەکان بەلْگەی گۆڕینی نەریتی کۆشکی فەرمانڕەوایی دەسەلمێنێت. پاسەوانەکان"موسا"یان بێنەوەی هیچ هێمایەکی فەرمانڕەوایی پێوە بێت ناسیەوە و ڕێیان پێدا بچێتە ژورەوە و تەواوی کاربەدەستانی کۆشك زانیان کە"موسا" گەڕاوەتەوە، بەلام بەژن و بالای"موسا"بەهەمان ئەندازەی ئارایشتی ژنانەی پاسەوانەکانی کۆشك بەلای کاربەدەستان و دەستەلاتدارانی کۆشکەوە سەرسوڕهێنەر بوو. موسا تەماشای هەر لایەکی ئەو کۆشکەی بکردایە یادگاری ڕابردوو و سەردەمی مندالْی زیندوو دەکردەوە، لەوکاتەدا موسا ناونیشانی"ستی موسا"ی بەرپرسی سەروەت و سامانی لەیەکێك لەپاسەوانەکانی کۆشك وەرگرت.

کاتێك"ستی موسا"بیستی"موسا"گەڕاوەتەوە بەدلْگرانیەکەوە بەرەوپیری ڕۆشت، "ستی موسا"زۆرباش ئاگاداری ئەوەبوو کە فیرعەون زۆر ڕقی لێیەتی و زۆریش لێی تورەیە، بەلام ئەوەی بەباش زانی وا خۆی بنوێنێت کە ئاگاداری ئەم بابەتە نیە و وەك شازادەیەك مامەلْەی لەگەلْدا بکات و وتی:

-من بەم گەڕانەوەیەت زۆر خۆشحالْ بوم، چونکە دەمزانی سەرئەنجام دێیتەوە، فیرعەونیش ئاگاداری گەڕانەوەی تۆ بوو، لەبەرئەوە باشتر وایە بڕۆیت بۆ لای ئەو.

موسا وتی: نەهاتوم بۆئەوەی چاوم بەفیرعەون بکەوێت، بەلْکو هاتوم تا بڕێك لەزێڕ و هەندێك لەداراییەکانی دایکم وەرگرم کە لەلای تۆیە.

"ستی موسا"لەوکاتەدا سەری ڕێزی دانەواند و وتی: ئەوەی دایکت لەدوای خۆی بەجێی هێشتووە وەك ئەمانەتێك لەلای منە و بگرە دەستم لەئەنگوستیلەیەکیشی نەداوە، بەڵام بەمەرجێك دەتوانیت دەست لەسامانی دایکتەوە بدەیت کە سەردانی فیرعەون بکەیت و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەیت، ئەگەر ئەو فەرمان بدات ئەوا دەتوانی تەواوی سامانەکەت هەر ئێستا وەرگریت، چونکە من جگەلە کەسێك کە ئەمانەتێکی لەلایە هیچ شتێکی تر نیم.

موسا وتی: لەئێستا بەم جلە ئاساییانەوە ڕۆشتن بۆ لای فیرعەون بەکارێکی باشی نازانم.

"ستی موسا" وتی: بەهەرحاڵ ئەگەر بتەوێت سامان لەمن وەرگریت دەبێت فەرمانی فیرعەونت پیٚ بێت.

"موسا"ش ناچار بەهەمان ئەو جلوبەرگەوە ڕۆشتە لای فیرعەون و فیرعەونیش زۆر سەری سوڕما بەوەی"موسا"ی بەجلێکی سادەوە بینی، چونکە تا ئەوکاتە ئەوە ڕوی نەدابوو کەسێك بەبەژن و باڵا و جلوبەرگێکی ئاواوە سەردانی فیرعەون بکات، بۆیە هەموو کەسێك هەوڵی دەدا جوانترین جلوبەرگ لەبەربکات ئەوکات هەوڵی ئەوە بدات چاوی بەفیرعەون بکەوێت. ئەو کەسانەش کە لەلای فیرعون بون سەرسوڕمانیان لە فیرعەون کەمتر نەبوو. هەڵبەت پێشتر فیرعەونیان ئاگادار کردبووەوە کە"موسا"هاتووە و بەجلوبەرگێکی شڕەوە دەیەوێت چاوی پێی بکەوێت، فیرعەونیش پێی ڕاگەیاندن"موسا"بەو جلوبەرگەوە بکەنە ژورەوە، بەڵام لەوباوەڕەدا نەبوو کە موسا بەشکۆمەندی و پایەدارییەوە ببینێت. فیرعەون بەدەستی پێی ڕاگەیاند کەبێت لەسەر تەختەکەی پاڵی دانیشێت بۆئەوەی گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، لەبەرئەوەش داوای لێکرد لەتەنیشتیەوە دانیشێت تا ئامادەبوان گوێیان لەگفتوگۆکانیان نەبێت. "موسا"تەماشایەکی فیرعەونی کرد و بینی بەوشێوەیەش لەڕوی تەمەنەوە گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە.

دوای ئەوە موسا سەری دانەواند، بیستی فیرعەون دەڵێت: هەرچەند ماوەیەکی زۆرە لەکۆشکی فەرمانڕەوایی دور کەوتویتتەوە، بەڵام نەریتی کۆشکی

فەرمانڕەوایەت لەبیر نەچووەتەوە. ئێستا بۆم بگێڕەرەوە سەرچاوەی ڕووباری نیل و شاری زێڕینت دۆزیەوە؟

موسا وەڵامی دایەوە: بەگوتەی کاهینەکان سەرچاوەی ڕووباری نیل لەبارەگای خوداياندا جێگیرە.

فیرعەون وتی: کارم بەگوتەی کاهینەکانەوە نیە، لەتۆ دەپرسم سەرچاوەی ڕووباری نیل و شاری زێڕینت بینی؟

موسا وەڵامی دایەوە: ئێمە ئەو هەموو ماوەیە بەدرێژایی ڕووباری نیل ڕێمان کرد تا گەشتینە شوێنێك کە ڕووبار گۆڕا بە جۆگەلەیەك و لەوێشەوە بەردەوامیمان دا بەپیادەکەمان تا گەشتینە دەریاچەیەك، لەوەو دوا چیتر نەمتوانی لەوە تێبگەم ئایا ئەوە ڕووباری نیلە یان یەکێکە لەلقەکانی ڕووباری نیل.

فیرعەون وتی: ئەی شاری زێڕین چی؟

موسا وتی: ئەو شارەی کە بەزێڕ ناوبانگی دەرکردووە بونی دەرەکی نیە، تەنها چەند خانویەکی بچوك و کۆمەڵێك ڕەشپێستی تێدا دەژیت. کۆمەڵە هەژارێکی ڕوت و ڕەجاڵبون، چ بکات بەوەی خاوەنی زێڕ بن.

فیرعەون لەوکاتەدا بێدەنگ بوو، فیرعەون ئەوەی هێنایەوە یاد خۆی کە سێساڵ و شتێك لەوەوپێش فەرمانی دا قازێکی بۆ ڕاوبکەن تا فالێکی پێ بگرێتەوە، دوای ئەوەی ئەو قازەیان بۆ ڕاوکرد بردیانە لای کاهینی مەزن بۆئەوەی پێشبینی ئایندەی بۆ بکات. کاهینی مەزنیش چیقڵدانی قازی پشکنی و بەردە ڕێزێکی ڕەشی تێدا بینی و بەفیرعەونی وت: نەهامەتیەکی مەزن هەڕەشەی لەناوچونت لێدەکات.

فیرعەونیش بەدڵگرانیەکەوە پرسی: چ جۆر هەڕەشەیەك بەچ شێوەیەك دەتوانرێت ڕێی لێ بگیرێت.

کاهین وتی: بەهیچ شێوەیەك ڕێی لێناگیرێت، جگە لەوەی ئەو کەسەی کە گومانت لێی هەیە و لێی دەترسیت لەناوی ببەیت بۆئەوەی بەم شێوەیە ڕێ لەو هەڕەشەیە بگریت، بەڵام فیرعەون لەسەرتاسەری پایتەختی میسردا تەنها لەیەك کەس دەترسا و ئەو کەسەش"موسا"بوو، چونکە بەفیرعەونیان وتبوو موسا

باوەڕی بەخودای"ئامون"نیە و وەك خودایەكی خۆی پەسەندی ناكات، خودی فیرعەونش دەیزانی كە"موسا"باوەڕی بەخودای"ئاتون"ە و ڕۆژێك دێت میسر وێران دەكات، تەنها ئەو نوكە نێزە كاریگەرەی كار لەو بكات بێبەشكردنیەتی لەسامانی"ئنخاس ئامون"ی دایكی. كاتێك فیرعەون بەدەم ئەم بیرۆكەوە نوقمی ئەندێشەی بوبو بەردەوامی بەبێدەنگی خۆی دا، ئەوانەش كە لەچواردەوریدا بون زۆر باش ئاشنای خوڕەویشتی بون و دەیانزانی هەركاتێك فیرعەون بەوشێوەیە بێدەنگ بێت، دەیسەلمێنێت كە زۆر توڕەیە.

دوای ئەوە لەناكاو فیرعەون سەری هەڵبڕی و هاواری كرد: بۆچی دوبارە گەڕایتەوە بۆ پایتەخت؟

موسا وەڵامی دایەوە: هاتوم بۆئەوەی ئەو سامانەی وەك میراتێك لەدایكمەوە بۆم بەجێ ماوە وەرگرم، چونكە بۆ دابین كردنی بژێوی ژیانم پێویستم بەو سەروەت و سامانەیە.

فیرعەون هاواری كرد: گەرچی ڕاسپێدراوم بگرە گەردێك لەو سامانەت پێ نەبەخشم، بەڵام فەرمان دەدەم"ستی موسا"هەموو سامانەتەكەت بۆ بگەڕێنێتەوە.

موسا وتی: سوپاست دەكەم.

فیرعەون وتی: پێویست بەسوپاسكردنم ناكات، چونكە دەزانم تۆ ڕقت لێمە حەز دەكەیت سەرم لەلاشەم بكەیتەوە.

موسا وتی: ئەی فیرعەونی ئەم سەردەمە، من لەوڵاتی"كوش"ئەوەندە كوشت و كوشتارم بینیوە، چیتر لەكوشتن بێزارم.

فیرعەون وتی: سەرەڕای ئەوەش ئەو ڕقەی لەبەرامبەر مندا هەتە بە لەناوبردنی من كۆتایی دێت.

موسا وتی: بەهەڵەدا چویت، بۆ جێبەجێ كردنی دادوەری ڕێگاگەلێكی زۆر هەیە كە لەكاتی ڕوداوەكاندا خۆی ئاشكرا دەكات، هەر ئەم جۆرە دادوەریانەش تۆ لەكوشتن و خوێنڕشتن بەدور دەگرێت.

ئەم گوتەیەی موسا بەلای ئامادەبوانەوە تازە و بێوێنە بوو، چونكە هیچ كەسێك تا ئەو كاتە بەوشێوەیە قسەی نەكردووە.

فیرعەون بەهۆی بیستنی گوتە بوێرکانی موساوە سەری سوڕما و وتی: ئەی ئەو مرۆڤەی کە نیوە ناوت هەیە، چ خودایەك پشتگیریت دەکات کە بەشانازی و خۆ بەزلزانیەکەوە قسەدەکەیت؟

موسا وتی: ئەی فیرعەون هەموو کەسێك زۆرباش دەزانێت کە"ئنخاس ئامون"بەدەستی تۆ کوژراوە، ئەگەر لەدوای ئەم قسانەشم بکوژرێم هەموو کەسێك زۆر بەباشی دەزانێت کە بکوژی من تۆیت.

فیرعەون تەکانێکی دا بەخۆی و هەوڵی دا بەسەر خۆیدا زاڵ بێت دوای ئەوە لەسەرخۆ وتی: بۆچی لەباتی دژایەتی کردنم هەوڵ نادەیت لەگەڵ مندا هاوپەیمان بیت و دەست بنێینە ناو دەستی یەکترەوە بۆئەوەی لەهەموو شتێك بەهرەمەندت بکەم؟

موسا وتی: ئەوەندەم هەیە کە بتوانم بژێوی ژیانم دابین بکەم و لەوەش زیاتر پێویستم بەهیچ شتێکی تر نیە.

فیرعەون وتی: شێوازی قسەکردنت بێزار و دڵگرانم دەکات، هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ تۆدا دا بەڵام دیارە ڕقت لەخودایانی میسرە. کاهینەکان پێیان ڕاسپاردوم بتکوژم، بەڵام من ئەم کارەم نەکرد، بەڵام ئێستاش پەشیمانم، چونکە بەڕاستی لەئێستادا بەرگەی ئەم بێشەرمی و بوێریەت ناگرم و لەوانەیە لەهەر ساتێکدا هەڵچم و فەرمانی کوشتنت دەربکەم... فیرعەون دوای ئەوە وتی: تۆ بۆچی بەو شێوە بێشەرمانە ڕەفتارم لەگەڵدا دەکەیت؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی دەزانم لێم دەترسی، بەڵام نازانم بۆچی لێم دەترسی! تەنها ئەوە دەزانم کە لێم دەترسی.

فیرعەون وتی: ئەی کوڕی لاو تۆ نابێت لێبوردەیی بەترس لێك بدەیتەوە. بۆچی لەتۆ بترسم؟ چونکە هەر لەسەردەمی منداڵیەوە بەلێبوردەییەوە ڕەفتارم لەگەڵدا کردویت ئێستاش هەر بەوشێوەیە ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەم. هەڵبەت نامەوێت بڵێم بەزەییم پێتدا هاتووەتەوە چونکە دڵنیام ئەم گوتەیەم پەسەند ناکەیت! بەڵام لەبەرامبەرتدا لێبوردە بوم ئەویش لەبەر سێ هۆکار. یەکەم: لەبەرئەوەی کوڕی"ئنخاس ئامون"یت، دووەم: لەنێو شازادەکانی میسردا لەڕوی قەد و باڵا و

شێوەتەوە بێوێنـەی و سـێیەمیان: لەبەرئـەوەی بەناونیـشانی فەرمانـدەی هێـزی گالیـسکەوانی ڕۆشـتویت بـۆ وڵاتـی"کـوش" و ئازایـەتی خۆتـت سـەلماند و وەك سـەربازێکی ئـازا و دلێـر گوێڕایـەڵ بویـت و جـەنگاویت، بیـستومە ئەوکاتانـەی سـەربازەکان خـەویان لـێ کـەوتووە تـۆ بێداربویت. من لـەڕێی نامـەکانی فەرمانـدەی هێزی سـەربازی نێردراوەوە هـەموو زانیاریـەکی تـۆم پێگەشتووە و زانیومـە کـە تـۆ تاکە ئەفسەربویت لەگەڵ ژناندا ڕات نەدەبوارد. منیش تەنها لەبەر ئەم تایبەتمەندیە بەرجەستانەت لـەڕۆژێکی ئاوادا نـەمهێڵاوە هـەوڵی کوشتنت بدرێت، سـەرەڕای ئـەم تایبەتمەندیـە بەرجەسـتانەت گوێـت بەبـچوکترین شـتی هاوڕێیـان و ئـەو کەسـانەی چاکەی تۆیان دەوێت نەداوە.

موسا لێی پرسی: لـەچ ڕویەکەوە دەڵێت گوێم بە هـاوڕێ و خێرخـوازانی خـۆمم نەداوە؟

فیرعەون وتی: چونکە دوای ئەوەی گەڕایتەوە بۆ پایتەختی میسر لەباتی ئـەوەی بێیت بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی ڕۆشتی لەماڵی"نف"تەلارسازدا نیشتەجێ بویت.

موسـا پرسـی: ئـەم بابەتـە چ پەیوەندیـەکی بەگوێنـەدان بـەهاوڕێیان و خێرخوازانمەوە هەیە.

فیرعەون وتی: لەڕستیدا هۆکارەکەی ئەوەیە، چونکە تۆ خۆنەویستانە هۆکاری لـەناوبردنی"نـف"ی تەلارسـازت فەراهـەم کـردووە. ئـەم کـارەی ئـەو دەبێتـە هـۆی لەناوبردنی.

موسا بەنیگەرانیەکەوە لێی پرسی: بەواتا تۆ دەتەوێت"نف"تەلارساز بکوژیت؟

فیرعـەون وتـی: من نـەموتووە دەبێت لـەناو ببرێت، بەڵام ئەم کـارە زیـانێکی زۆر بـەژیانی دەگەیـەنێت، ئێستاش پرسیارێك لـەم نێوەنـدەدا سـەر دەردەهێنێت، ئـەو پرسـیارەش ئەوەیـە تـۆ دەڵێیـت مـن بێهـودە لـەتۆ دەترسـم، ئەگـەر بەڕاسـتی تـۆ مەبەستێکی خراپت لەبەرامبەر مندا نیە، بۆچی لەکۆشکەکەی مندا نەخەوتیت. ئەم ڕەفتـارەت جگـە لەمەبەسـتێکی خـراپ لەبەرامبـەر منـدا هـیچ واتایـەکی تـر لـەخۆ دەگرێت؟ تۆ دەبێت بزانی ئەو کەسانەی کە دەبنە دۆستی دوژمنەکانی فیرعەون، خـودی ئـەو کەسـەش بـەدوژمنی فیرعـەون لەقەڵـەم دەدرێـت، چـونکە ئـەو کەسـەی

فیرعەون لێی دەترسێت بێ ئەملاولا بڕیاری مەرگی بەسەردا دراوە بۆئەوەی لەدوای مردنی هیچ گومان و ترسێك ختوكەی نەدات، هەركەسێكیش بەرگری لەدوژمنی فیرعەون بكات، بەهەمان شێوە ئەویش مەرگی بۆ خۆی مسۆگەر كردووە.

موسا وتی: بەهیچ شێوەیەك بیرم لەم بابەتە نەكردووەتەوە.

فیرعەون وتی: ئەی موسا تۆ چۆن دەستی هاوكاری لە"نف"ی تەلارساز بەرزدەكەیتەوە و بەهیچ شێوەیەك دەستی لێبوردەیی بۆ من درێژناكەیت و داوای هیچم لێناكەیت. تۆ داوای هیچ شتێك لەفیرعەون، لەمن كە فیرعەونم ناكەیت، بەڵام داوای هەموو شتێك لەتەلارسازێك دەكەیت؟ بۆچی؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی"نف"ی تەلارساز فیرعەون نیە، خانەخوێیی و میوانداری ئەوم پەسەند كرد.

فیرعەون وتی: ئەی كوڕی لاو تۆ تایبەتمەندگەلێكی بەرجەستەت هەیە كە لەهیچ كەسێكی تر ناچێت، ڕەفتارێكی مەزن بەڵام گوتارێكی منداڵانەت هەیە و نازانی دەستەڵات و هێزی فیرعەون تا چ ئاستێكە، تۆ باشتر وابوو بتزانیایە فیرعەون بەیەك دەست ڕاوەشاندن دەتوانێت هەركەسێك كە تۆ بتەوێت تەختی زەوی بكات، تەواوی مرۆڤەكان لەبەرچاوی فیرعەوندا جگە لەگەردێك هیچی تر نین! فیرعەون بەیەك ڕۆژ دەتوانێت هەزاران كەست بۆ لەناو ببات بێ ئەوەی كەسێك بتوانێت لەبەرامبەریدا وشەیەك بهێنێتە گۆ. ئەی موسا تۆ نازانی دەستەڵات تا چ ڕادەیەك چێژ بەخشە، تۆ تامی كوشتنی كەسانی ترت نەكردووە، فیرعەون وەك خوداكان بەهێزە. تەماشاكە هەرئێستا بەشێك لەدەستەڵاتەم پیشانی تۆ دەدەم، بۆئەوەی بزانی فیرعەون تا چ ڕادەیەك توانای هەیە.

دوای ئەوە فیرعەون چەپڵەیەكی لێدا كە لەسەرتاسەری كۆشكدا دەنگی دایەوە، دوای ئەوە فەرمانی دا: هەمووتان بڕۆنە دەرەوە. لەچاو تروكانێكدا بێ لەفیرعەون و موسا هیچ كەسێك لەتەلاری فیرعەوندا نەمایەوە.

فیرعەون بە"موسا"ی وت: بینیت فەرمانەكانم بەچ خێراییەك جێبەجێ كران. بگرە باڵوێزی وڵاتانی تریش بەهەمان شێوەی ئەمانە فەرمانەكانی منیان جێبەجێ كردووە چونكە دەیانزانی ئەگەر لەكاتی خۆیدا فەرمانەكانم جێبەجێ نەكەن

بەتوندی لێیان تورە دەبم. ئێستا تۆش هیچ کاتێك ئەوە لەیاد نەکەیت، هەر فەرمانێك دەربکەم بەو خێراییە بێ ئەملاولا جێبەجێ دەکرێت، بۆنموونە فەرمان بدەم هەموو میسریەکان وڵاتی میسر بەجێ بهێڵن، لەم کاتەدا هیچ کەسێك دوای ئەو فەرمانە ناتوانێت لەمیسردا بمێنێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی پێویستم پێیانە ئەم فەرمانەیان بۆ دەرناکەم. تۆ لەگوتەکانتدا باسی خێڵی"کوش"ت کرد، بەڵام من دەیان خێڵی تری وەك وڵاتی"کوش" گەر لەناو بچن لەبەرچاوی مندا وەك پوشێك وایە، مانەوەی من گرنگە نەك خەڵکی. ئەگەر بەرژەوەندی مانەوە و بونایەتی و پلەوپایەم وا بخوازێت، هەموو بەربەست و خێڵ و نەتەوەیەك لەگەورەوە تا بچوکیان ڕەوانەی مەرگ-وڵاتی خۆرئاوا-دەکەم. لەهەمان کاتدا ئاگاداری ئەوەم تۆ هەوڵی لەناوبردنم دەدەیت، بەڵام لەبەرئەوەی توانای ئەنجامدانی ئەو کارەت نیە دەستەپاچە بویت.

موسا وتی: وەك پێشتر وتم فیرعەون بەهەڵە لەمن تێگەشتووە.

بێدەنگیەکی تاڕادەیەك درێژخایەن باڵی بەسەر ئەو دوانەدا کێشا، بەڵام ئەمجاریان موسا ڕۆچووە هزری خۆیەوە و گوتارەکانی فیرعەنی لەدەرونیدا لێکدایەوە و لایەنگری گوتەکانی فیرعەونی کرد و زانی کە دەستەڵاتێکی تەواوی هەیە، لەڕوی لێبوردەییشەوە فیرعەون ڕاستدەکات، چونکە زۆر بەئاسانی دەیتوانی فەرمانی لەناوبردنی بدات، بێئەوەی هیچ کەسێك بتوانێت ناڕەزایی خۆی لەبەرامبەر ئەم فەرمانەدا دەرببرێت. دوای ئەوە پەیی بەو ڕاستیەش برد کە فیرعەون هەوڵی لەناوبردنی نادات، بگرە هەڕەشە و هیچ زیانێکیشی پێنەگەیاندووە، بەڵکو تەنها هەڕەشەی لێکردبوو. هەروەها نەیدەتوانی لەوە تێبگات فیرعەون بەم ڕەفتارانەی نواندی مەبەستی چی بووە.

فیرعەون بیروهزری موسای ئاوێتەی گوتەکانی خۆی کرد و لێی پرسی: لەکاتی گیانەلانی فەرماندەی هێزی نێردراو"ستی کف"دا ئامادە بویت؟

موسا وتی: بەڵێ ئەی فیرعەون.

فیرعەون وتی: بۆیان گێڕامەوە کە مەرگی"ستی کف"لەنەخۆشیەوە سەرچاوەی گرتووە، نەك ئەوەی لەجەنگدا بریندار بوبێت و دواجار مردبێت.

موسا وەڵامی دایەوە: وایە.

فیرعەون لێی پرسی: لەکاتی گیانەڵانیدا چ بارودۆخێکی هەبوو؟

موسا وتی: وەك ئەوانەی کە گیانیان داوە، وەك ئەوانەی کە دەمرن.

فیرعەون لێی پرسی: ئایا "ستی کف" لەمەرگ دەترسا؟

موسا وەڵامی دایەوە: بەهیچ شێوەیەك لەمەرگ نەدەترسا، بەڵام لەڕووداوەکانی دوای مەرگی دەترسا.

فیرعەون وتی: لەمەبەستت تێناگەم.

موسا وتی: "ستی کف"خەمی بۆ ئەوە دەخوارد کە بۆچی ئەم مەرگەی لەبرینی جەنگەوە سەرچاوەی نەگرت و لەباتی ئەوەی لەگۆڕەپانی جەنگدا بەکوشت بدرێت بۆچی لەجێگە خەوەکەیدا گیان لەدەست دەدات.

فیرعەون وتی: ئەم گوتەیە هەموو سەربازێکی ئازا و دلێر دەگرێتەوە، ئەوان نایانەوێت لەجێگە خەوەکانیاندا گیان لەدەست بدەن، بۆیە بەباشی دەزانن لەگۆڕەپانی جەنگدا کۆچی دوایی بکەن.

موسا وتی: هەموو خەمێکی"ستی کف"ئەوەبوو کە لەخوداکانی میسر دور بوو، ئەویش لەبەرئەوەی ناتوانێت لەنزیکەوە داوای پارێزگاریان لێبکات.

فیرعەون وتی: زۆر سەیرم لەم گوتەیەت دێت، چونکە"ستی کف"زۆرباش دەناسم لەبەرئەوەی زۆر باوەڕی بەخوداکان نەبوو، بگرە زۆر بەباشیش خوداکانی میسری لەبەرنەبوو، بۆیە سەرم لەم گوتانەت سوڕ دەمێنێ کە بەچ شێوەیەك پیاوێك کە بیروباوەڕێکی ئاوای هەبێت شتی وای هێنابێتە زمان.

موسا وتی: لەبەرئەوەی بیروباوەڕی مرۆڤ لەکاتی مەرگ و ژیانی ئاساییدا زۆر جیاوازە و گۆڕانکاری بەسەردا دێت، لەوانەیە بەهۆی خوو و بینینی کەسانی تر و گوتەکانیانەوە ئەویش خۆنەویستانە باسی خوداکان بکات، لەکاتێکدا بەهیچ شێوەیەك باوەڕی پێیان نەبووە. هەڵبەت زیاتر سەیرم لەوکەسانە دێت کە دەجەنگێن، چونکە جەنگ بیروباوەڕی مرۆڤ سست دەکات.

فیرعەون وتی: لەوانەیە شتی وا ڕوبدات.

دوای ئەوەی بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: ئەی موسا لەکاتی لێدوانەکانتدا وتت، هەوڵی لەناوبردنی منت نەداوە وایە؟

موسا وتی: بەڵێ وایە ئەی فیرعەن.

فیرعەون وتی: زۆر حەز دەکەم باوەڕ بەگوتەکانت بکەم.

موسا وتی: ئەوەی لەدڵمدایە پێم ڕاگەیاندی. بگرە بەهیچ شێوەیەك بیرم لەوە نەکردووەتەوە کە هەوڵی لەناوبردنت بدەم.

فیرعەون ئەوکاتانەی موسا قسەی بۆ دەکرد تەماشای چاوانی دەکرد بۆئەوەی بزانێت ئایا موسا ڕاست دەکات یان نە. سەرئەنجام وتی: تۆ ڕاست دەکەیت، منیش بێهودە بیر لەم بابەتە پڕوپوچانە دەکەمەوە کە تۆ هەوڵی لەناوبردنم دەدەیت. ئێستا دەتوانی بڕۆیت و سامانەکەی خۆت لەبەرپرسی دارایی وەرگریتەوە. موسا دوای وەرگرتنی سامانەکەی لەگەڵ"نون"دا لەپایتەختدا نیشتەجێ بون، بەلاّم بەشێوەیەکی تازە و جیاواز. ئەو وەستاکانی کەشتی ڕاسپارت کەشتیەکی بۆ دروست بکەن کە بێ لەچێشت خانە، حەمام و ژوری خەوتن و هەموو خۆشگوزەرانی و پێداویستیەکی تری تێدا بێت، سەرەڕای ئەمانەش شێوازی لێخوڕینی کەشتیەکەش بەشێوەیەك دروست بکەن کە هەم یەك کەس و هەموو دوو کەسیش وەك کەشتیەوانێك پێکەوە بتوانن لێی بخوڕن. "نون و موسا"کەشتیەکەیان وەك ماڵێکی گەڕۆك بۆ خۆیان دەستنیشان کرد و لەسەر ڕوباری نیل گەشتیان بۆ هەموو شوێنێك دەکرد، هەڵبەت گەشتەکانیان سنورداربوو، چونکە پیاوانی فیرعەون بەبەردەوامی چاودێری گەشتەکانی موسایان دەکرد.

موسا جارێکیان کەشتیەکەی بەرەو باکور لێخوڕی، ویستی بڕوات بۆ نیشتمانی دایکی"کوش"، بەلاّم "نون" لەوە ئاگاداری کردەوە کە"گەمی"یەك دوایان کەوتووە و چاودێریان دەکات. بۆیە ئاراستەی گەشتەی گۆڕی و ڕێگای باشوری گرتەبەر و خۆی لەشوێنێکدا بینیەوە کە"نف"ی تەلارسازی سەرقاڵی دروست کردنی پەرستگایەکی مەزنە، لەڕاستیدا لەبەرئەوەی پەرستگاکەیان لەناو بەردێکدا هەڵدەکۆڵی بۆیە بەهیچ شێوەیەك سودیان لەکەرەستەی دروستکردنی تەلار

وەرنەدەگرت. چونکە پەرستگا لەناو جەرگەی بەردێکدا دروست دەکرا. موسا بینی برێکی زۆری بەرد هەڵکۆڵەکان سەرقاڵی هەڵکۆڵینی ئەو پەرستگایە بون، ئەو نمونەیەکی بچوکی پیشانی"نون"دا و وتی: پەرستگا سەرەکیەکە لەسەر ئەم نمونەیە دروست دەکەن.

"نون"یش بەبینینی ئەو نمونەیەی کە درێژیەکەی سێ مەتر دەبوو زۆر سەری سوڕما و وتی: ئایا بەڕاستی ئەو پەرستگا سێ مەتریە تەنها نمونەیەکە؟

موسا وتی: بەڵێ، ئەوە نمونەیەکە دەبێت پەرستگا ڕاستەقینەکە بەپێی ئەم نمونەیە دروست بکرێت و ئێستا بۆئەوەی بەتەواوی دڵنیا بیت دەڕۆم و لەسەرپەرشتی بەردهەڵکۆڵەکان دەپرسم.

بەرپرسی بەردهەڵکۆڵەکان ناوی"شپ تت" بوو و موسا خۆی کرد بەهاوڕێی و ئەویش بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: من دەبێت نەخشەی ئەو یازدە پەرستگایەی کە فیرعەون پێی ڕاسپاردوم بۆ فیرعەون دروست بکەم. ئەم یانزە پەرستگایەش دەبێت لەبەردێك هەڵکۆڵم.

موسا بەتەماشاکردنی ئەو یانزە نمونەیە تەنها یانزەهەمینیانی پەسەند کرد و وتی: تەنها باسی نمونەی یازدەهەمینیانم بۆ بکە کە فیرعەون پەرستگایەکی لەڕێی"نف"تەلارسازەوە دروستکرد کە تا ئێستاش ئەو پەرستگایە پایەدارە و ناوی"پەرستگای ئەبو سمبل۳۲"ە.

"شب تت" بە"موسا"ی وت: فیرعەون دە نمونەی یەکەمی پەسەند نەکرد، بەڵام ئەوە نمونەی یانزەیەمە کاری لەسەر دەکەین و لەحاڵی هەڵکۆڵینیداین. چوار پەیکەری فیرعەون لەهەردوو لای پەرستگاکەدا دروست دەکرێت کە بەرزی هەر پەیکەرێکیان بەلایەنی کەم بیست و یەك"زرع"دەبێت، هەریەك لەو پەیکەرانە ڕویان لەڕۆژهەڵات کردووە بۆئەوەی ڕوناکی خۆری بەرەبەیان لێیان بدات.

---

[32] ئەو پەرستگایە لەساڵی ۱۹٦۰ بەهۆی هەڵچونی ڕوباری نیلەوە نوقم دەبێت و بۆماوەی حەوت ساڵ لەناو ئاودا دەمێنێتەوە، تا ئەوکاتەی بەهاوکاری"یونیسکو" بەبڕی سی و چەند ملیۆن دۆلارێك ئەو پەرستگایەیان لەژێر ئاودا دەرهێنرا و لەشوێنێکی بەرزدا جێگیر دەکرێت.

"شب تت" سەرپەشتیاری تەلارسازانی پەرستگا ئەبو سمیل۳۲ دەکات، بالأیەکی کورت و جوانی هەیە و"نف"ی تەلارساز ئەوی بەموسا ناساند و بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: لەئێستادا ئێمە لەم ناوچەیەدا سەرقاڵی هەڵکۆڵین و دروست کردنی مەزنترین پەرستگاین لەجیهاندا، هیچ تەلارێك لەڕوی قەبارە و مەزنییەوە بەئەندازەی ئەو نابێت، هەڵبەت تەنها"قوچەکیەکان"ی میسر لەم تەلارە مەزنترە کە لەبنیات نانیدا سودێکی زۆری لە بەردەی گەورە و بچوك وەرگرتووە، ئەو بەردانەی لەگەڵ قسلدا بەتەواوی یەکیان گرتووە و ئاوێتەی یەکتری بون. لەکاتێك لەم تەلارەدا هیچ قسلێك بەکار نەهێنراوە و نایەت. ئەمە تەلارێکە کە لەبەردێکی یەك پارچە دروست دەکرێت.

"نف"ی تەلارساز بەموسای وت: ئەم تەلارە بەهەوڵ و پشتیوانی"شب تت"دروست دەکرێت چونکە وشیاری و وردبینیەکی زۆر لەکارەکانیدا دەخاتە گەڕ.

"شپ تت" وتی: سەرەڕای ئەوەی"نف"ی تەلارساز ڕێزێکی زۆرم لێدەگرێت، بەڵام من تەنها ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم. ئەو زیاد لەوەی شایستەمە ستایشم دەکات، هەڵبەت بەشێوەیەك کە خەریکە خۆشم دەگەمە ئەو باوەڕەی بەڕاستی کارێکی زۆر گرنگ ئەنجام دەدەم. لەکاتێکدا کارێکی زۆر سادە و ساکارم ئەنجام داوە. منیش وەکوو ئەو کرێکارانەی ئەرکی ڕۆژانەی خۆیان ئەنجام دەدەن کارەکانم بەڕێوە دەبەم. ئەگەر دەتەوێت بەڕاستی چاوت بە خاوەن و سەرپەرشتیار و بنیاتنەری ئەم پەرستگایە بکەوێت ئەوا دەبێت تەماشایەکی وەستاکەم بەواتا"نف"ی تەلارساز بکەیت کە بەلێبوردەییەوە ئەرك و هونەر و زانستەکانی خۆی دەخاتە بەردەستم. ئەوە"نف"ی تەلارسازە کە نەخشە و پلانی دروستکردنی ئەم پەرستگایەی کێشاوە و بوەتە هۆی ئەوەی ئێمە بەخەیاڵێکی ئاسودەوە بەرنامەی کارەکانمان بەرەوپێشوەی ببەین. من هیچ شتێك لەبارەی زانست و ئەندازیاری و ژمێریاری"نف"ی تەلارساز نازانم.

"نف"ی تەلارساز وتی: ئەی موسا بێ لەپێناسەی ئەم کابرایە، پاڵنەری سەرەکی دروست کردنی ئەم تەلارە خودی فیرعەون بوو، ئەوە داوا و خواستی فیرعەونە کە

[33] لەم سەردەمەدا ئەو پەرستگایە بەو ناوە بانگ دەکرێت.

وای لێکردووین ئەزموون و کارەکانمان کۆبکەینەوە بۆئەوەی ئەم تەلارەی پێ دروست بکەین.

موسا وتی: ئەم گوتەیەت لەلایەکەوە ڕاستە، بەواتا تا ئەوکاتەی کەسێك خوازیاری شتێك نەبێت هیچ کارێك ئەنجام نادرێت و هونەری کەسانی تر لەمبوارەدا بەوشێوەیە کۆ ناکرێتەوە بۆئەوەی خواستێکی ئاوا بهێنرێتە جێ.

"نف"ی تەلارساز وتی: فیرعەون بۆ بنیاتنانی هەر تەلار و پەرستگایەك ماوەیەك دیاری دەکات و دەبێت کارەکەی لەو ماوە دیاری کراوەدا تەواو بکرێت. بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەشەوە تەلارساز مەرگی بۆخۆی مسۆگەر کردووە. هەرلەبەرئەوەشە هەوڵدەدەین ئەو تەلارانەی فیرعەون پێمان ڕادەسپێرێت لەکاتی خۆیدا تەواوی بکەین. لەکاتێکدا لەڕابردودا کاری دروستکردنی تەلارێك لەوانەبوو چەند دەیەیێك بخایەنێت.

موسا پرسی: بەلەبەرچاوگرتنی ئەم هەڕشەیەی فیرعەون، ماوەی چەنێکی بۆ تەواوکردنی ئەم تەلار دیاری کردووە؟

"نف"ی تەلارساز وەڵامی دایەوە: هەڵبەت فیرعەون داوای لەمن دەکرد ماوەی تەواو کردنی تەلارەکانی بۆ دیاری بکەم، منیش دەبوو پێم بوتایە لەماوەی چەنێکدا دەتوانم پەرستگاکەی بۆ تەواو بکەم، بەڵام پێم وت تەنها شتێك کە لەدروستکردنی ئەم پەرستگایەدا دەستەپاچەم دەکات ماوەی تەواوکردن و دروستکردنیەتی.

فیرعەون وتی: تۆ لەوەوپێشتریش چەند تەلارێکی ترت بۆ دروست کردوم و ماوەیەکی دیاریکراویشت بۆ تەواوکردنیان دەستنیشان کردبوو، ئەی ئێستا بۆچی لەدیاری کردنی ماوەی تەواوکردنیدا دەستەپاچە بویت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: منیش بۆ فیرعەونم ڕونکردەوە کە ئەو تالارانەی بەکەرەستەی قسڵ و قوڕ و خشت دروستم دەکردن زۆر جیاوازە لەو تەلارانەی کە لەبەردێك دەبێت هەڵیانکۆڵم، شێوازی بەکارهێنانی ئەم کەرستانە و ماوەی ئامادەکردنیانم لێکدەدایەوە ئەوکات دەگەشتمە ئەو دەرئەنجامەی کە لەماوەی چەنێکدا دەتوانم ئەو تەلارە تەواو بکەم، بەڵام لەبارەی هەڵکۆڵینی کۆشك و

تـــەلارێکی ئـــاوا لەبـــەردێکی مـــەزن کـــە لەدیـــدی تەلارســـازیەوە زۆر جیـــاوازە لەشێوازەکەی تریان بۆیە ناتوانم ماوەی تەواوکردن و دروست کردنی دەستنیشان بکەم. بەڵام فیرعەون بەم ڕونکردنەوەیەم ڕازی نەبوو، بۆیە داوای لە"شپ تت"ی تەلارسازی کرد ماوەیەك بۆ تەواوکردنی ئەم پەرستگایە دەستنیشان بکات. "شپ تت"یش شارەزابوو و دەیزانی کە ناتوانێت کاتێکی بۆ دیاری بکات، لەهەمان کاتدا دەبوو فیرعەونی بەشێوەیەك لەشێوەکان ڕازی بکردایە بۆیە بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: کاتی تەواوکردنی ئەم پەرستگایە بە مردن و ژیانی کرێکاران بەهۆی گـــەرمی و نالـــەباری ئـــاو و هـــەواو و ســـەختی کـــارەوە پەیوەســـت دەکرێـــت، هەرلەبەرئەوەش کاتەکەی نادیارە، مەگەر ئەوەی خولێکی فێرکاری هەڵکۆڵین بۆ کرێکارەکانمان بکەینەوە بۆئەوەی لەهیچ کاتێکدا لەڕوی هێزی کارەوە کەم نەهێنین و هەمیشە کرێکـاری یـەدەکمان هـەبێت بۆئـەوەی کاتێـك کرێکارێکمـان گیـانی لەدەســتدا یـەکێکی تـر جێگـای بگرێتـەوە بۆئـەوەی هەلومەرجـەکان هەمیشـە بەخواستی ئێمە بێت. بۆئەوەی بزانین کارەکانمان تا چ ئاستێك پێشکەوتون، هەرلەبەرئەوەش بەوشێوەی لێکمداوەتەوە ئەو ماوەیە دەبێت سێ ساڵ بێت.

موسا پرسی: ئایا سەرئەنجام تێڕوانینەکانی"شپ تت"ی پەسەند کرد؟

"نف"ی تەلارساز وتی: فیرعەون هەمیشە تێڕوانین و پێشنیاری تەلارسازانی بەئەزمون پەسەند دەکات.

"نون"پرسی: ئامانجی فیرعەون لەدروست کردنی پەرستگایەکی ئاوادا چیە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: فیرعەون ئەم پەرستگایە بۆ ئەوە دورست دەکات کە خەڵکانی سەرتاسەری ئەم جیهانە دوای هەزاران ساڵی تر کاتێك لێرەوە تێدەپەڕن پەرستگا و پەیکەری چوارینە کە بەرزاییەکانیان بیست مەتر دەبێت ببینن و لەسەرســـوڕماندا واقیـــان وڕ بمـــێنێ و لەبەرخۆیانـــەوە بڵـــێن ئـــەوە فیرعەونی"ئامون"پەرست بووە کە ئەم تەلارەی دروست کردووە.

"نون"دوبارە لێی پرسی: ئایا بۆی هەیە ئەم پەرستگایە تێك و لەناو بچێت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: هەرگیز لەناو ناچێت. ئەم جۆرە تەلارانە هیچ شتێك بگرە لافاو و بومەلەرزە و هۆکارەکانی تر ناتوانێت وێرانیان بکات. تەنها لەوانەیە

بەهۆی بومەلەرزەیەکی زۆر بەهێزەوە ترز بکەوێتە نێو دیوارەکانیەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك وێران نابێت. هەڕەشەیەکی تر کە لەوانەیە هەڕەشەی وێرانکردنی ئەم پەرستگایەدا بکات دروست کردنی چەند بەرەبەستێکی بەرزە لەڕوباری نیلدا کە لەوانەیە بەهۆی پەنگ خواردن و زۆربونی ڕوبارەوەکەوە ئەم پەرستگایە لەناو ئاودا نوقم بکات، سەرەڕای ئەوەش ئەم پەرستگایە لەژێر ئاویشدا وەك خۆی دەمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر ئەم پەنگ خواردن و بەرزبون و کەمبونەوەی ئاوی ڕوبار ساڵ لەدوای سواڵ بەردەوام بێت و درێژە بکێشێت ئەوا قوڕ و لیتە دادەپۆشێت و نەوەکانی داهاتوو لەبینینی ئەم هونەرە دیرنەیە بێبەش دەبن.

موسا دوای ماوەیەك گەڕانەوەی لەم گەشتەی نەخۆش کەوت و پزیشکێك لەپزیشکەکانی"ماڵی ژیان"پشکنینی بۆ کرد و هۆکاری نەخۆشیەکەی گەڕاندەوە بۆ ئاوسانی جگەری و وتی: دەبێت هەمیشە شوێنی دانیشتنەکەی بەپاکی ڕابگیرێت و سرکەی شیرین بخواتەوە بۆئەوەی جەستەی لەهەموو ئاڵودەییەك پاك ببێتەوە، هەڵبەت تۆ نابێت بترسیت لەوەی دوای چەند ڕۆژێکی تر توشی"زەردۆیی"دەبیت، تا ئەو کاتەی چاك دەبیتەوە دوچاری ئازار و ناخۆشیەکانی زەردۆیی دەبیت، نەمانی زردبونی ڕوخساریشت هێمای چاك بونەوەتە.

"نون"نۆکەر لێی پرسی: بۆچی ڕوخساری زەرد وەردەگەڕێت؟

پزیشکی "ماڵی ژیان"یش بەم شێوەیە بۆی ڕونکردەوە: هۆکاری زەردبونی ڕوخسار دەگەڕێتەوە بۆ ئاوسانی جگەری. دەبێت زەردئاو لەڕێی جگەرەوە تێکەڵی خوێن ببێت و هەر ئەمەش دەبێتە هۆی زەرد هەڵگەڕانی ڕوخسار، تا ئەوکاتەی ورده ورده جەستە دەگەڕێتەوە باری سروشتی خۆی. پێشبینی کابرای پزیشکی"ماڵی ژیان" ڕاست دەرچوو و"موسا"ش ناچاربوو لەپایتەختدا ماڵێك بۆ خۆی بکرێت و تێیدا حەوایەوە، بەڵام نەیدەتوانی بجوڵێتەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لاوازتر دەبوو. "نون"ی نۆکەری وەك پەرستیارێك بەدڵسۆزیەوە چاودێری لێ

دەکرد و ڕاسپاردەکانی پزیشکی بەجوانی جێبەجێ دەکرد. موسا لاواز بوو و ئەم لاوازیەی گەشتە ڕادەیەك کە کێشی زۆر کەم بکات و ببێتە مایەی تۆقانی خودی"موسا" تا ئەوەی ڕۆژێکیان لەئاوێنەدا تەماشای خۆی کرد و هیچ زەردیەکی لەڕوخساریدا بەدی نەکرد، تامەزرۆیی خواردنیشی زیادی کرد و ئەوەندە نانی خوارد کە ئەمجاریان زۆری خواردنی بو بەهۆی قەڵەو بونی. "نون"بێ لەدروستکردنی هەندێك خواردنی سادە، زۆر شارەزای دروستکردنی خواردن نەبوو، تا ئەوکاتەی ڕۆژێکیان یەکێك لەچێشتلێنەرەکان بەوەرگرتنی ئەنگوستیلەیەك زێڕ"نون"ی فێری چێشتلێنان کرد و"نون"ئەو جۆرە خواردنانەی وەستاکەی فێری کردبوو، بۆ"موسا"ی لێنا و "موسا"ش زۆر حەزی لێکرد، بۆیە ڕۆشت بۆ لای"نون" و ماچێکی کرد. لەم کاتەدا لەمیسردا ئاهەنگێکی مەزن بەرپا بوو. یادەش جەژنی بەرەکەت و زۆری بەروبومە کە هەموو ساڵێك بۆ ئەو مەبەستە بەرپایان دەکرد تا بەروبومی کشتوکاڵیان ساڵ لەدوای ساڵ زیاتر بێت. لەم جۆرە ئاهەنگانەدا بەلایەنی کەم هەموو چینێك یەکسان دەردەکەوتن و هیچ جیاوازیەك لەنێوان هەژار و دەوڵەمەنددا دەرنەدەکەوت. ئاهەنگی زۆری بەروبوم لەنیوەڕۆوە بەبەشداربونی هەموو خەڵکی، هەر لەخاوەنکار و دوڵەمەند و نۆکەر و کەنیز و کەسانی ئاسایی ئەنجام دەدرا، خەڵکی لەماڵەکانیان دەهاتنە دەرەوە، دایکانیش منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا، هەندێکیشیان دەمامکیان لەڕوخساریان دەنا. ئەم دەمامکەش لەکاغەز"پاپیرۆس" دروست دەکرا، ئەو دەمامکانە لەشێوەی گیانەوەری جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگ دروست دەکران و دوای خواردن و خواردنەوە ئەو دەمامکەیان لەڕوخسار دەکرد. لەمکاتەدا دیمەنی ئەو ئاهەنگە زۆر جوان دەبوو، هەرکەسێك ئەم دیمەنەی ببینیایە بەسەرسوڕمانەوە بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنی. چونکە هەموو دەمامکێك لەشێوەی گیانەوەرێکی تایبەتدا دروست دەکرا. لەمکاتەدا هیچ کەسێك نەیدەتوانی بزانێت چ کەسێك و ڕوخسارێك لەپشت ئەم دەمامکەوەیە، ئایا کەسێکی هەژارە یان دۆڵەمەند کۆیلەیە یان کەنیزەك،

خاوەنکارە یان کەسێك کە خاوەنی پلەوپایەیەکی بەرزە. خەڵکی بەدەم گۆرانی وتنەوە ڕێگای پەرستگایان دەگرتەبەر، بەڵام لەبەرئەوەی جێی ئەو هەموو خەڵکە لەو پەرستگایەدا نەدەبویەوە هەر ئەوکاتەی پەرستگا پڕ دەبوو لەخەڵکی، چیتر دوای ئەوە ڕێیان نەدەدا هیچ کەسێکی تر بڕواتە ژورەوە. خەڵکی دەستیان بەسرود خوێند دەکرد. سرودێك کە هەموو میسریەك لەبەری بوو. "موسا" و "نون"پەیوەندیان بەکۆڕ و ئاهەنگ و خەڵکیەوە کرد.

# لەنیشتمانی دایکدا

دوای ئاهەنگی زیادبونی بەروبوم، موسا دوبارەی خانوەکەی خۆی فرۆشت و بەسەر ڕوباری نیلەوە کەشتیەکەی وەك شوێنی نیشتەجێ بونی خۆی هەڵبژاردەوە و دەستی کردەوە بەگەشتەکانی خۆی. هەندێجار سەردانی"نف"ی تەلارسازی دەکرد و تەماشای شێوازی هەڵکۆڵنی بەردەکانیانی دەکردن، هەندێجاریش لەبارەی خودا بینراو و نەبینراوەکان"ئامون و ئاتون"گفتوگۆی لەگەڵ "نف"تەلارسازدا دەکرد.

جارێکیان نون بەموسای وت: لەوانەیە ئەو شارەی تێیدا لەدایك بوم ببینم.

موسا وتی: ئەو شارەی تێیدا لەدایك بویت لەم دەوروبەرەدایە؟

"نون"وتی: لەوانەیە چاوم بەو شارە بکەوێت کە تێیدا لەدایك بوم.

موسا وتی: ئەو شارەی تێیدا لەدایك بویت لەم دەوروبەرەدایە؟

"نون"وتی: بەڵێ، بەڵام حەز ناکەم لەبیاباندا بژیم، چونکە تا ئەو ڕۆژەی لەبیرم بێت بەخۆشگوزەرانی ژیان بەسەر دەبەم و چیتر لەژیانی خێڵەکی و بیابان نشینی دور کەوتومەتەوە. تەنها سەرێکیان لێ دەدەم ئەگەر تۆش حەز بکەیت لەگەڵم بێیت چی لەوە باشترە، پێکەوە دەڕۆین بۆ ئەوێ، بەڵام زۆر لەوێ نامێنینەوە، چونکە ئێمە بەرگەی ژیانی ئەو ناوچەیە ناگرین. ئەوان وەك کۆیلەیەك دەژین، تۆش کە لەکۆشکی فەرمانڕواییدا گەورە بویت مەحاڵە بتوانی خۆت لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا بگونجێنیت. لەبەرئەوەی تۆ بەهەرحاڵ وەك شازادەیەك وایت، بۆیە نابێت تێکەڵی کۆیلەکان ببیت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت، لەبەرئەوەی هەم میسریت و هەم شازادە.

موسا بێدەنگ گوێی لە"نون"دەگرت تا کۆتایی بەقسەکانی هێناو، دوای ئەوە وتی: ئێمە هەموومان مرۆڤین و مرۆڤیش نابێت ناسنامەی ڕەسنی مرۆڤایەتی خۆی لەیاد بکات، هەمووشمان یەکسانین، دوای ئەوە کەوتنە ڕێ تا گەشتنە دەوروبەری وڵاتی"کوش"

کاتێک"نون" موسای بەبێدەنگی بینی پێشنیاری ئەوەی لێکرد: ئەگەر حەز ناکەیت لەگەڵ مندا بێیت بۆ"کوش"دەگەڕێینەوە.

موسا لەسەر سەکۆی"گەمی"کەی ڕاوەستا و تەماشایەکی پێش و دواوەی خۆی کرد، کاتێک ڕوباری"نیل"ی بەچۆڵی بینی وتی: دەڕۆین بۆ کۆش.

"نون"زۆر سەری لەم گوتەیەی سوڕما، چونکە دەیزانی وڵاتی"کوش"پڕە لەسیخوری فیرعەون، کاتێکیش چاویان بەو بکەوێت یەکسەر هەواڵی هاتنی"موسا"بۆ وڵاتی"کوش"ی پێ ڕادەگەیەنن، هەرلەبەرئەوەش ئەم پرسیارەی لێدەکات: گەورەم ئەگەر بەهەڵەدا نەچوبم وتت بەردەوامی بەکۆچەکەمان دەدەین؟

موسا وتی: بەڵێ بەهەڵەدا نەچویت، بەردەوامی بەگەشتەکەمان دەدەین.

نون وتی: لەوانەیە لە وڵاتی"کوش"دا هەڕەشەی کوشتنت لەسەر بێت.

موسا وتی: جلی سادەم لەبەرکردووە و هێمای شازادەیی و دیار کە دەبێتە هۆی ناسینەوەم پێوە نیە...

دوای ئەوە بە"نونی"وت: ڕۆشتن بۆ شوێنی زێدی دایک بەڕاستی مرۆڤ دەوروژێنێت، لەبەرئەوەش زۆر وروژاوم.

سەرەڕای ئەوەی جارێکیان سەردانی وڵاتی"کوش"ی کردبوو، بەڵام نەیدەزانی وڵاتی"کوش"شوێن زێدی دایکیەتی بۆیە هەستێکی تایبەتی لەبەرامبەر ئەو وڵاتەدا نەبوو، بەڵام ئەمجارەیان بەئاگاداربون لەوەی"کوش"نیشتمانی دایک و باوکیەتی و بەگوتەی"نون"خوشک و براکانیشی لەوێ دەژین، بەردەوام تەماشای ئەو ئاڕاستەیەی دەکرد کە وڵاتی "کوش"ی لێبوو. هەڵبەت "موسا"زانیاری ڕێگای"کوش"ی لەکاهینی مەزن"ئامون تپ"ەوە وەرگرتبوو، بەڵام ئێستا هەموو شتێك بەلایەوە نوێ دەردەکەوێت نیگاکانی وردبین و کونجکاوانەبوو.

"گەمی"ەکەی موسا لەشوێنێکدا لەنگەری گرت کە چیتر دەبوو لەگەمیکەیان دابەزینایە.

نون وتی: با لێرە پیادە بین.

هەردوکیان پێیان نایە وشکانیەوە، دوای ماوەیەك ڕێکردن زەویەکی لمینی بەیار لەژێر پێیاندا هەست پێدەکەن، چونکە چیتر هیچ جۆگەلە ئاوێك لەو ناوچەیەدا بەدی ناکرێت. لەولاتی "کوش"دا کشتوکاڵ بەهۆی کەمی ئاوەوە زۆر لاواز بوو و خەڵکی "کوش"زیاتر دەڕۆشتن بۆ پایتەخت و ناوچەکانی تر بۆئەوەی بەخۆڕایی کار بۆ فیرعەون بکەن.

موسا و"نون"چاویان بەدوو بزن کەوت کە ڕایان دەکرد و نون لێی پرسی: بزنیشیان هەیە، بەڵام بۆچی ئاژەڵداری ناکەن.

موسا وتی: لەبەرئەوەی لەلایەن پیاوەکانی فیرعەونەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت و تالانی دەکەن.

لەمکاتەدا دوو منداڵ کاتێك چاویان بە"موسا و نون"دەکەوێت هاوار دەکەن و هەڵهاتن.

نون وتی: مەگەر ئەم مندالانە تائێستا مرۆڤیان نەبینیوە.

موسا وتی: لەولاتی میسر بینینی مسری نیشانەی شومیە و دەڵێن نەگبەتی لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن! ئەو دوانە تیر و کەوان و گۆچانێکیان پێ بوو. تیر و کەوان بەدەستی "نون"ەوە بوو و گۆچانەکەش بەدەستی موساوە بوو. دوای ماوەیەك ڕێکردن ئاوایی خەڵکی کوش دەرکەوت و ژنێك بەلاسەری بیرەئاوێکەوە لەحاڵی هەڵکێشانی ئاودا بوو، بەڵام کاتێك چاوی بەو دوانە کەوت لەترساندا سەتڵەکەی بەردایەوە ناو بیرەئاوەکە و هەڵهات.

"نون"بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: سارە‌اسارە لەچی دەترسی من میسری نیم، من باش تۆ دەناسم لەبەرئەوە ڕامەکە. من کوڕی "ئفلایم"م و تۆ کچی"چید"ی دایکت چۆنە؟

ژن وتی: کوڕی ئفالا ناوی"نون"ە و بەکۆیلایەتی بردیان بۆ میسر و بیستم کە کوشتویانە.

"نون"وتی: تۆ کورەکەی"ئفالا"دەناسی ڕاوەستە بۆئەوەی پێت بڵێم و هێمایەکت پیێ نیشان بدەم تا بزانی درۆت لەگەڵدا ناکەم.

ژن وتی: کوڕی"ئفالا"جلی میسری لەبەرناکات لەبەرئەوەی زۆر ڕقی لەمیسریەکانە.

دوای ئەوەی ژن لێی پرسی: ئەی ئەو پیاوە کێیە کە گۆچانێکی درێژی بەدەستەوەیە؟

نون وتی: ئەو پیاوە خاوەنەکەمە و منی هێناوە بۆ ئێرە تا چاوم بەکەس و کارەکەم بکەوێت.

ژن وتی: ئێوەی میسری باش دەزانن کە ئێمە هیچ شتێکمان نیە پێشکەشی ئێوەی بکەین، بگرە نانیشمان بۆ خواردن نیە، ئەگەر بۆ زێڕ و زیویش هاتون بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتون. لەم نێوەندەدا ژنان و منداڵەکان لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە و لەو دەوروبەرەدا تەماشای ئەو دوانەیان دەکرد. پیاوێکی بەتەمەنیش بەپەلە لەماڵ هاتە دەرەوە و خۆی گەیاندە لای"نون" و موسا. ئەو پیاوە ڕیشێکی درێژی هەبوو، موسا سەری لەو ڕیشە درێژەی سورما و لەوەش سەیرتر بینی ئەو پیاوە تەندروستە، چونکە لەولاتی"کوش"دا تەنها پیاوانی نەخۆش و لەکارکەوتوو بەزیندویی دەمێنن. بەواتا دوای بەدیلکردن و کۆیلایەتی، ئەگەر تەندروست بن ناگەڕێنەوە، بەڵام دوای لەدەستدانی ئەندامێکی جەستەی یان بەهۆی نەخۆشیەوە دەگەڕانەوە بۆ"کوش"، بەڵام ئەم پیاوە نە کەمئەندام بوو و نە نەخۆش، کاتێکیش لە"نون"نزیک بویەوە. بەڵام بینایی ئەو پیاوە زۆر لاواز بوو، بۆیە زۆر نزیک بویەوە و تەماشای"نون"ی کرد و هاواری کرد: ئەوە"نون"ە! کوڕی"ئفالا"خۆیەتی، دایکی"زیلاف"کچی"پاشور"بوو کە دەیوت لەنەوەی"یعقوبە"، بەڵام من دەمزانی لەنەوەی"یەعقوب"نیە بەڵکو لەنەوەی"میدیان"ە[34] بەڵام لەبەرئەوەی لەنەوەی"کتورە و ئیبراهیم"ە کەواتە لەخزمانی ئێمەیە و بەبەشێك لەنەوەی ئیسرائیل لەقەڵەمدەدرێت. ئەو پیرەمێردە ئەوەندە باسی باوباپیرانی کرد تا هەموو خەڵکی چواردەوری بێزارکرد، سەرئەنجام

---

[34] میدیان: لەنەوەی ئیبراهیمە.

ژنێك لەنێو خەڵكەكەدا هاواری كرد: پیرەمێردی گەمژە ئەوەندە چەنە مەدە بۆچی دەتەوێت باسی باوباپیری ئەم پیاوە بكەیت؟

دوای ئەوەی ڕوی كردە"نون"و وتی: بۆچی گەڕایتەوە بۆئێرە و چیت دەوێت؟

پێش ئەوەی"نون"وەڵامی بداتەوە، پیرەمێرد هاواری كرد: تۆ منداڵەكەی خۆت فەرامۆش كردووە، لەسەردەمی منداڵیدا تۆم لەباوەش گرتووە، ئێستاش كە پیربوم بۆچی پێم دەڵێیت گەمژە و چەنەباز؟

كاتێكیش ئەو ژنە ویستی شتێك بەو پیرەمێردە بڵێت ژنێكی تر دەنگی لێ بەرز بویەوە و وتی: "میریان"وازی لێ بهێنە و كارت پێیەوە نەبێت. بەتەمەنی و پیریەتی لەبەرچاو مەگرە. بۆماوەیەك ئەم دەمەقرەیە درێژەی كێشا تا ئەوكاتەی موسا پەیی بەوە برد ئەم دەمەقرەیە جۆرێك سەرگەرمی و گاڵتە و گەپی ئەو ناوچەیە. خەڵكی ئەو ناوچەیە بەم جۆرە بابەتانەوە كاتەكانی خۆیان بەخۆشی تێدەپەڕێنن. خاڵێكی تر كە بەلای موساوە زۆر سەرنج ڕاكێش بوو ئەو پیرەمێردە داوای هاوكاری لەخودایان كردبوو، بۆئەوەی نەفرەت لەو ژنە بكات، ئەو ژنەش بەهیچ شێوەیەك لەو نزایەی نەترسا. لەكاتێكا ئەگەر هەڕەشەیەكی ئاوایان لەمیسریەك بكردایە دەترسان. هۆكارەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ درێژخایەنی ماوەی كۆیلایەتیان، چونكە باوەڕیان نەبوو بەخوداكان. "نون"یش بەهەمان شێوە بوو. كاتێكیش موسا ئەوی لەبازاڕی كۆیلایەتیدا كڕی باوەڕی بەخودایانی سەرزەوی نەبوو.

لەو كاتەدا پیاوێك بەشەلە شەل هاتە پێشەوە و وتی: من برای"ئەفالا"م، ئەو كوڕە"نون"ی برازامە، بەڵێ خۆیەتی! دوای ئەوە پیاو هاتە پێشەوە و"نون"ی لەئامێز گرت وتی: چیتر تۆ هەتیویت، چونكە دایك و باوكت كۆچی دواییان كردووە. كاتێك"ئەفالا"بەسەر داربەستەوە بەكۆڵ خەریكی گواستنەوەی بەردبوو بۆ كاربەدەستانی فیرعەون كەوتە خوارەوە و مرد. ئەندامانی خێزانەكەشت دوای ئەو یەك لەدوای یەك كۆچی دواییان كرد. بەچاوی خۆت دەبینی كە ئێمە جگە لە ڕەنج و مەینەتی هیچ شتێكی تر نەبووەتە بەشمان. ژنەكان دەستیان كرد بەگریان، بەڵام"نون"نەیدەتوانی بگریت. ژنەكان هاتنە پێشەوە و دڵنەوایی"نون"یان دایەوە و لەگەڵ خۆیاندا بردیانە ماڵەوە و لەم نێوەندەدا بەتەواوی"موسا"یان فەرامۆش

کرد، بەلام کاتێک منداڵەکان ئەویان بەتەنهایی بینی بەچواردەوریدا کۆبونەوە.
موسا دوای ماوەیەك بەیەکێك لەو کچانەی -کە سێ چوار ساڵێك تەمەنی بوو- وت: ئەم ملیوانکەیە بکە ملت؟ دوای ئەوە ملیوانکەیەکی کردە ملی کچەکە...
کچەش لەباوەشی"موسا"دا دانیشت و بەزمانی منداڵانە لەکاتێك یاری بەملیوانکەکەی ملی دەکرد لێی پرسی: ناوت چیە؟

ئەویش وتی: ناوم"موسا"یە.

منداڵەکەش پێکەنی وتی: ئەوە ناوێکی میسریە.

موسا وتی: ڕاست دەکەیت ئەوە ناوێکی میسریە.

کوڕێکی چوار ساڵانەش وتی: ئەوە ناوێکی نیوەیە! نیوەکەی تری لەکوێیە؟

کوڕێکی تر پرسی: تۆ چکارەی؟

"موسا"ش وتی: من شازادەم، هەموو منداڵەکان پێکەوە دەستیان کرد بەپێکەنین.

لەمکاتەدا"نون"گەڕایەوە بۆ لای و دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ لای"گەمێ"کەیان و بەدەم ڕێکردنەوە لە"نون"ی پرسی: بەچ شێوەیەك باسی منت بۆکردن؟

"نون"وتی: پێم وتن تۆ فەرماندەی گالیسکە سەربازیەکانیت و باسی ئازایەتی جەنگی خۆمم بۆکردن و تۆش وەك پاداشتێك بۆ ئەم ئازایەتیەم منت هێناوە بۆ ئێرە بۆئەوەی چاوم بەکەس و کارەکەم بکەوێت.

دوای ئەوە"نون"لێی پرسی: پێت وتن ناوت چیە؟

موسا وتی: مەگەر تۆ ناوی منت پێ نەوتن؟

نون وتی: نەخێر، بەڵکو پێم وتن تۆ ناوت"ئامون تپ"ە. مەگەر تۆ ناوی ڕاستەقینەی خۆتت بەو منداڵانە وت؟

موسا وتی: بۆچی دەبوو ناوێکی ترم پێ بوتنایە.

نون وتی: تۆ شێت بویت!

"موسا"ش بەڕادەیەك بەبیستنی ئەم گوتەیە دڵگران بوو کە بۆیەکمینجار هاواری بەسەردا کرد و وتی: دەبێت بزانی کە تۆ کۆیلەکیت و منیش کەسێکی دەستەڵاتدار و خاوەنی تۆم، بۆیە پێت دەڵێم سنوری خۆت بەزانە، چیتر دوای ئەوە هیچ

قسەیەکی لەگەڵ"نون"دا نەکرد تائەوکاتەی گەشتنەوە لای"گەمی"کەیان و گەڕانەوە بۆ میسر.

"نون"یش کاتێك بینی موسا توڕە و دڵگرانە هەوڵیدا بێدەنگ بێت، بەڵام لەناکاو وتی: تۆ لەخۆڕا لێم توڕە بویت. من ئەوەم لەبەرژەوەندی تۆدا دەبینی کە ناوی ڕاستەقینەی تۆ بەوان نەڵێم لەبەرئەوەی چاکی تۆم دەوێت و نامەوێت هیچ گرفتێکت بۆ دروست ببێت.

"موسا"ش وتی: بەچ شێوەیەك لەبەرژەوەندی مندا کارت کردووە، لەکاتێکدا ناوی ڕاستەقینەی منت گۆڕیوە.

نون وتی: لەبەرئەوەی ئەوێ شوێن زێدی تۆیە، لەهەمان کاتدا پاڵت بەدیواری ماڵێکەوە دابوو کە تێیدا لەدایك بویت. تۆ ئەمڕۆ چاوت بەخوشکەکەی خۆت کەوت، هەر لەبەرئەوەش نەمتوانی ناوی ڕاستەقینەی تۆیان پێ بڵێم؟

موسا پرسی: خوشکەکەم لەکوێدا بوو؟

نون وتی: هەمان ئەو ژنەی بەگاڵتەوە شەڕی لەگەڵ پیرەمێردا کرد و ژنێکی تریش ئەوی بە"میریام"بانگ کرد.

موسا لایەنگری گوتەکانی"نون"ی کرد، چیتر لەوبارەوە هیچی نەوت. تا ئەوکاتەی سەردانی"نف"ی تەلارسازی کرد.

"نف"ی تەلارسازیش دەیزانی"موسا"سەردانی خێڵەکەی خۆیی کردووە بۆیە لێی پرسی: هەست بەچی دەکەیت؟

موسا وتی: کاتێك هەلومەرجی ژیانی ئەوانم بینی، هەستم بەوەکرد جیهان لەکۆتایی خۆی نزیك بووەتەوە.

"نف"ی تەلارساز وتی: هەر لەبەرئەوەش کاتی ئەوە هاتووە هەنگاوێك لەپێناو خێڵەکەتدا بەرەوپێش بنێیت.

موسا وتی: دەتوانم چ کارێك بۆ خێڵەکەم ئەنجام بدەم؟

"نف"ی تەلارساز وتی: تۆ نابێت ڕێ بدەیت فیرعەون بێگاری بەهاونەژادەکانت بکات. نابێت بهێڵێت قامچیان لێ بدەن. هەموو ساڵێك ڕێژەی جوتیاران کەم دەبێتەوە و لەبەرامبەردا ڕێژەی کۆیلەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبێت و ڕێژەی

ئـەم کۆیلانـەش بەڕادەیـەك زۆر بـوون، بووەتـە هـۆی ئـەوەی کـەمترین کاردانـەوە لەبەرامبـەر مەرگیانـدا نیـشان بـدەن و لـەباتی مـەرگی کەسـێکدا، دوو کەسـی تـر دەخەنە جێگەکەی. لەکاتێکدا باوباپیرانت پێش ئەوەی بێت بۆ"کوش" و گرفتار بىن، لـەبیابانی"کـەنعان"دا ژیـانێکی ئـازادی خوازانـەیان هـەبوو. سـەرەڕای ئـەوەی ژیـانێکی سـەختیان هـەبوو بـەلاّم کۆیلـە نـەبون... لەکاتێکـدا ئـەمڕۆ هـەر کوڕێـك لـە"کـوش"تەمـەنی دەبێتـە دوانـزە سـاڵ دەیکـەن بەکۆیلـەی خۆیـان، ئێـستا بڕیـارت داوە هاوکاری هاونەژادەکانت بکەیت؟

موسـا وتـی: سـەرەتا دەبێـت بڕۆم بۆ"کـوش"، دوای ئـەوە وەلاّمـی پرسـیارەکەت دەدەمەوە.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: بۆچی دەتەوێت بڕۆیت بۆ کوش؟

موسا وتی: دەمەوێت چاوم بەخوشکەکەم بکەوێت.

"نـف"ی تەلارسـاز لێـی پرسـی: مەگـەر لـەم سـەردانەی دواییەتـدا چـاوت پێـی نەکەوت؟

موسـا وتـی: لەوکاتـەدا نەمـدەزانی کـە لـە"کـوش"دا خوشـکم هەیـە. لـەکاتی گەڕانەوەمدا"نون"پێی وتم: خۆشکێکم لە"کوش"هەیە.

"نف"ی تەلارساز وتی: کەواتە دوای دیداری خوشکەکەت دوا بڕیارِی خۆتم پێ ڕاگەیەنە.

موسا و"نون"دوبارە سواری"گـەمی"کـەیان بونەوە و ڕێگـای"کوش"یان گرتـەوە بـەر، کاتێـك گەشـتنە"کـوش" نـون بەکەسـێکی وت: بەکـچەکەی"عمـران" کـەناوی "میریام"ە بلّێ من کـارم پێیـەتی. "میریـام"یش دوای ماوەیـەك هـات بۆ لای"نـون" "میریـام"لـەڕوی بـەژن و بـالاّوە زۆر لەموسـا دەچـوو، ئـەو تـەنها دوو سـاڵ لە"موسا"گەورەتر بوو، بەلاّم بەڕوکەش لەژنێکی چلّ سالاّن دەچوو، لەبەرئەوەی سەختی ژیان تێکی شکاندبوو.

"میریام" بەترسەوە لێی پرسی: چ کارێکت پێمە؟ دوای ئەوە دەستی کچە دوانزە ساڵەکەی بەتوندی گرت و لێی پرسین: دەتانەوێت کچەکەم ببەن؟

نون وتی: ئەم پیاوە شازادەیە و هاتووە بۆئەوەی هاوکاریت بکات،

کاتێك"میریام"زانی"موسا"شازادەیە، لەجاران زیاتر ترسا و دەستی بەپاڕانەوە کرد و وتی: لەهەموو ئەم جیهانە تەنها ئەم کچە شك دەبەم... دوای ئەوە بەدەم گریان و پاڕانەوەوە پێی وتن: ئەم کچەم لیٚ زەوت مەکەن.

"نون"ئەوی لەزەوی بەرزکردەوە"موسا"ش لەم هەڵسانەیدا هاوکاری کرد و وتی: بۆچی دەترسی، من کوڕی"عمران"و برای تۆم لێم مەترسە! ناوی دایکیشم "جوشبد"ە، منیش لێرە لەدایك بوم، بەڵام دایکم منی خستە ناو سەبەتەیەکەوە و دامی بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، دوای ئەوە شازادەیەکی میسری منی لەڕوباری نیلدا دۆزیەوە و بردمی بۆ کۆشکەکەی خۆی.

"میریام"باوەڕی بەقسەکانی موسا نەدەکرد، بەڵام کاتێك ویستی ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی پێبدات ژنە لێی وەرنەگرت و دەستیشی بۆ وەرنەگرتنی ڕانەوەشاند.

موسا لێی پرسی: بۆچی ئەو زێڕەم لیٚ وەرناگریت؟

"میریام"وتی: لەبەرئەوەی دەتەوێت بەپێدانی ئەو زێڕە کچەکەم لیٚ زەوت بکەیت.

موسا زێڕەکەی فڕێدا و ڕویکردە"نون"و وتی: با بگەڕێینەوە.

دوای ئەوە بەپەلە بە"گەمی"کەیان گەڕانەوە. موسا لەناو"گەمی"کەیدا دانیشت و دەستی کرد بەگریان.

نون لێی پرسی: گەورەم بۆچی دەگریت؟

موسا وتی: لەبەر چەند هۆکارێك دەگریم، یەکەم لەبەر بەدبەختی و نەهامەتی خێڵەکەم، دووەم لەبەرئەوەی هیچ یار و هاودەم و هاوکارێکیان نیە پشتی پیٚ ببەستن، سێیەم دەبینم کە چ جیاوازیەکی مەزن لەنێوان ژیانی من و ئەواندا هەیە.

ئەو دوانە گەڕانەوە بۆ پایتەخت، موسا ڕاستەخۆ ڕۆشت بۆ لای"نف"ی تەلارساز، بەڵام ئەو بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێك کە پێیان ڕاسپاردبوو ڕۆشتبوو بۆ دەرەوەی پایتەخت. "موسا و نون" سواری"گەمی"کەیان بون و ڕێگای باشوریان گرتەبەر تا ئەوکاتەی"نف"ی تەلارسازیان دۆزیەوە و بینیان سەرقاڵی کارەکەی خۆیەتی، "نف"تەلارساز لەبارەی دروستکردنی تەلارێکی تازە کە بڕیاربوو بۆ

فیرعەونی دروست بکات لەگەڵ تەلارسازەکانی تردا لەحاڵی ڕاوێژ و وتووێژدابوو.
"نف"ی تەلارساز"موسا"شی لەم کۆڕەدا بەشداری پێکرد، بۆئەوەی ئەویش ئاگاداری ئەم گفتوگۆیە بێت. دوای ئەوە بە"موسا"ی وت: دەمانەوێت بەردێکی مەزن بگوازینەوە بۆ پایتەخت. بۆئەوەی لەتەنیشت کۆشکی فەرمانڕەواییدا کاری لەسەر بکەین.

دوای ئەوە ئەو بەردە مەزنەی پیشانی موسا دا کە سی"زرع"بەرزایی بوو.

موسا وتی: بەچ شێوەیەك بەردێکی ئاوا مەزن دەگوازیتەوە بۆ پایتەخت؟

"نف"ی تەلارسازیش زەردەخەنەیەکی ژەهراوی کرد و وتی: کێشی ئەم بەردە مەزنە لەچاو پایەکەی ژێرەوەی هیچ نیە، دەبێت ئەم بەرد و پایەیە بتاشرێن، دوای ئەوە باریان دەکەین. کێشی ئەو بەرد و پایەیە بەئەندازەی کێشی بیست و یەك کەر دەبێت!

موسا وتی: بەچ شێوەیەك ئەم کێوە مەزنە دەگوازنەوە بۆ پایتەخت. ئایا باشترنیە هەر لێرەدا ئەوە دەتانەوێت لێی دروست بکەن و بەجێی بهێڵن؟

"نف"ی تەلارساز پێی وت: ئەمە فەرمانی فیرعەونە، داوای بەردێکی ئاوای لێ کردوین، چونکە ئەو ئەم بەردە مەزنەی بۆ پاراستنی خۆی دەوێت.

موسا لێی پرسی: تێچونی گواستنەوە و کاتی گواستنەوە و دروستکردنی چەنێك دەخایەنێت؟

"نف"ی تەلارساز وتی: بەکورتیەکەی تێچونی ئەم بەردە مەزنە لەگەڵ پایەکە و گواستنەوەی بۆ پایتەخەت، لە"قوچەکیەکان"زیاتری تێدەچێت. تەنها ئاماژە بەو خاڵە دەدەم کە دەبێت ڕێژەی سەد هەزار کرێکار بۆ ماوەی پانزە ساڵ لە هەڵکۆینی ئەم بەردەدا کار بکەن.

موسا نەیدەتوانی لەبەردەم تەلارسازەکانی تردا قسە لە"نف"دا بکات، بۆیە پێی وت: لەهەلێکدا دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم.

"نف"ی تەلارساز وتی: دوانیوەڕۆی ئەمڕۆ دەتبینمەوە.

ئەو ئێوارەیە"نف و موسا"لەگۆشەیەکی خەڵوەت و دور لەتەلارسازەکانی تر دەستیان کرد بەگفتوگۆ کردن.

موسا وتی: ئەم دواین گەشتەم زۆر کاری لێکردم، هاتوم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە، هاتوم بۆئەوەی خزمەتێك بەهاونەژادەکانم بکەیەنم... دوای ئەوە وتی: کاتێك لەو کوبونەیەی ئێوە دەرچوم ئەوەم هات بەخەیاڵدا بڕۆم بۆ لای فیرعەون و باسی زیان و بێسودی گواستنەوەی ئەم بەردە شاخینەی بۆ بکەم.

"نف"نەیتوانی هیچ ڕا و بۆچونێکی خۆیی پێ بڵێت، بەڵام موسا بۆ ئەو مەبەست ڕێگای کۆشکی فەرمانڕەوایی گرتە بەر.

## کاتێك موسا ڕوبەڕوی فیرعەون دەبێتەوە

موسا بەهەرحاڵ ڕۆشت بۆ لای فیرعەون و فیرعەونیش پێی ڕاگەیاند لێی نزیك ببێتەوە و لێی پرسی: چی ڕویداوە کە ئاوا سەراسیمە و سەرشێتانە بێش ئەوەی کاتی چاوپێکەوتن دیاری بکەیت هاتویت بۆ سەردانم؟

موسا وتی: دەمەوێت بابەتێکی زۆر گرنگت پێ ڕاگەیەنم، بەڵام هیوادارم لێم تورە نەبیت.

فیرعەون پرسی: ئەو بابەتە چیە؟

موسا وتی: دەمەوێت دەربارەی گواستنەوەی ئەو بەردە مەزنە بۆ پایتەخت کە بڕیارە لەپاڵ کۆشکدا دایبنێیت قسەت لەگەڵدا بکەم.

فیرعەون بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ بۆ ئەوە هاتویت بۆ لام؟

موسا وتی: بەڵێ، چونکە ئەم کارە پێویستی بەپانزەساڵ دەبێت. بەواتا تا ئەوکاتەی ئەم بەردە دەگوازرێتەوە بۆ پایتەخت پانزە ساڵ دەخایەنێت، بەدرێژایی ئەم ماوەیەش خەڵکانێکی زۆر دەمرن، سەرئەنجام کاتێکیش ئەم بەردە گواسترایەوە بۆ پایتەخت هیچ سودێك بەخەڵکی ناگەیەنێت.

فیرعەون وتی: بەڵام سودێکی زۆر بەمن کە فیرعەونم دەگەیەنێت، چونکە بەگواستنەوەی ئەم بەردە و دانانی لەپاڵی کۆشکەکەی مندا هەزار ساڵ دەژیم.

موسا لێی پرسی: کەواتە هۆکاری گواستنەوەی کێوێکی ئاوا بۆ پایتەخت ئەوەیە کە وات لێدەکات تەمەنێکی هەزار ساڵە بەدەست بهێنیت؟

فیرعەون وتی: نەخێر! والێکی نادەمەوە، بەڵکو دڵنیام بەگواستنەوەی ئەم کێوە بەردینەیە و کاتێك سێبەری ئەم کێوە بەر کۆشکەکەم دەکەوێت هەزار ساڵ دەژیم، هیچ گومانێکیشم لەم کارەدا نیە!

موسا پرسی: چ کەسێك پێی وتیت کە بەئەنجامدانی کارێکی ئاوا هەزار ساڵ دەژیت؟

فیرعەون وتی: ئەم نهێنیە"ئوزیریس"ی خودای مەرگ لەخەومدا پێی وتم. ئەو پێی وتم دەبێت ئەو شاخ و پایەیە پێکەوە بگوازرێنەوە بۆ ئێرە.

موسا وتی: ئایا باوەڕ بەو شتانە دەکەیت کە لەخەوتدا دەیبینی و دەیانبیستی؟

فیرعەون وتی: لەوانەیە ئەگەر کەسێکی تریش بیّ لە"ئوزیریس" لەخەومدا ئەمەی پیّ بوتمایە باوەڕێم پیّ نەدەکرد، بەڵام"ئوزیریس"خودای مەرگ و گۆڕستانە.

موسا وتی: ئایا"ئوزیریس"کە پەیکەرەکەی بەدەستی بەرد تاشەکان کە بەفەرمانی تۆ هەڵی دەکۆڵن و تۆ ئەو دەهێنیتە بون و بەسەر خۆتدا زاڵی دەکەیت، بەڕاستی ئەو توانایەی هەیە؟ ئەگەر تۆ ئەو پەیکەرەی نەتاشیت جگە لەبەردێك هیچ شتێکی تر نەبوو، تۆ وەك خودایەك باوەڕت بە بەردێکە؟

تائەو ساتە موسا هیچ شتێکی لەبارەی بون و توانای"ئوزیریس"نەوتبوو، فیرعەون هیچ هەستیاری و دڵگرانیەکی لەخۆیدا پیشان نەدا، بەنەرمی و هێمنیەکەوە گوێی لەقسەکان دەگرت، بەڵام کاتێك خودایەتی"ئوزیریس"ی خستە ژێر پرسیارەوە، فیرعەون پەرێشان بوو و وتی: تۆ بێباوەڕی، بەچ شێوەیەك نکوڵی لەبونی خودای مەرگ و گۆڕستان دەکەیت؟ چۆن دەوێریت سوکایەتی بەخوداکان بکەیت؟

موسا وتی: خودای ڕاستەقینەی مەرگ لەبەرد ناتاشن، چونکە ئەگەر نەیتاشن ئەوا بەهیچ شێوەیەك بونی نابێت.

فیرعەونیش بۆئەوەی کاربەدەستانی فیرعەون کە لەو دەوروبەرەدا بون گوێیان لیّ بێت هاواری کرد: کەواتە تۆ باوەڕت بەخودای میسری نیە، تۆ باوەڕت بەخودای مەرگ و گۆڕستان نیە؟

موسا وەڵامی دایەوە: خودای مەرگ کاتێك بەدەستی بەرد تاشەکان دروست بکرێت، هەر لەو سەرەتایەوە بەرد بووە و دەبێت نەك خودا، بەڵام لەسەرخۆ ئەم وەڵامەی دایەوە بۆئەوەی کەسانی تر گوێیان لیّ نەبێت، چونکە ئەگەر گوێیان لیّ

ببوایە کە موسا نکوڵی لەبونی خودای مەرگ دەکات سزای لەسێدارەدانیان بۆ دەردەکرد. دوای ئەوە بەدەنگێکی بەرز بۆئەوەی ئەوانی تر گوێیان لێبێت وتی: هەڵبەت من باوەڕم بەتۆیە کە فیرعەونیت، تا ئەوەی باوەڕ بەخودایەك بکەم کە بەدەستی بەردتاشەکان دروست دەکرێت.

فیرعەون کەمێك هێور بویەوە و لێی پرسی: ئایا بەڕاستی تۆ زیاتر باوەڕت بەمنە تا"ئوزیریس"؟

موسا وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

فیرعەون بەم باوەڕەی، توڕەییەکەی هێور بویەوە، بەڵام بەدەنگێکی بەرز کە ئامادەبوانی ئەو کۆشکە گوێیان لێ بێت دوبارەی کردەوە: ئایا لە"ئوزیریش"پێشەنگتر و مەزنترم؟

موسا دوپاتی کردەوە و بەدەنگێکی بەرز بۆئەوەی ئامادەبوان گوێیان لێ بێت دوبارەی کردەوە: تۆ زۆر لە"ئوزیریس"مەزنتر و پێشەنگتری.

ئەم گوتەیە بو بەمایەی خۆشحاڵی فیرعەون و ئامادەبوانی زانیان کە موسا بەم گوتەیەی خۆی لەهەڕەشەی مەرگ ڕزگار کرد. فیرعەون وای دەزانی خۆی لەنەوەی خودایانە و گۆشت و خوێنی لەخوداکانەوە سەرچاوە دەگرێت. سەرەڕای پێشەنگتربونی فیرعەون لەخودای مەرگ دوبارە گەڕایەوە بۆ سەرەتای گوتەکانی و لێی پرسی: ئێستا پێم بڵێ مەبەستت لەنەگواستنەوەی ئەم بەردە مەزن و پایەیە بۆ پایتەخت چیە؟

موسا لەسەرخۆ بۆی ڕونکردەوە: چونکە سەد هەزار کەس بەنۆرە و ڕۆژانە بۆ گواستنەوەی ئەم بەردە کاردەکەن. ئەگەر ئەم سەد هەزار کەسە کاری تریان پێ بکرێت، ئەوا بەرهەمەکەیان سودێکی زۆر بەمیسر دەگەیەنێت، لەکاتێکدا گواستنەوەی ئەو بەردە هیچ سودێك نابێت.

فیرعەون لێی پرسی: بەبۆچونی تۆ چ کارێك بەسەد هەزار کەسە بسپێرم؟

موسا وتی: یەکێك لەئارەزووەکانی فیرعەون پەیوەست کردنی "دەریای ڕۆم"[35] بەدەریای دراوسێکەی بووە، دەتوانرێت بەسود وەرگرتن لەم خەڵکە ئارەزووەکەی

[35] دەریای ڕۆم: دەریای میدیتەرانەیە، بەواتا دەریای ناوەڕاست.

فیرعەون کرداری بکەین. بەم کارە دەتوانی گەشە بە ئابوری و چالاکی بازرگانیەکان ببەخشیت.

فیرعەون وتی: مەبەستت ئەوەیە دەست لەم کارە خوداییە هەڵگرین و خۆمان بە کارێکی سەرەتا و ئاسایی سەرقاڵ بکەین.

موسا وتی: تۆ لەسەرتاپای تەمەنتدا چالاکیەکی زۆرت بۆ خودایان ئەنجام داوە و بەهیچ ئەنجامێکیش نەگەشتویت، تەنها بۆجارێك لەپێناو خەڵکیدا هەنگاوێك بەرەوپێش بنێ و تەماشای دەرئەنجامەکەی بکە.

فیرعەون وتی: بەچ بەڵگەیەك بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە من کارم بۆ خوداکان ئەنجام داوە و بەهیچ ئەنجامێك نەگەشتوم؟ خەزێنەی پڕ لەزێڕ و زیو، تەمەنێکی درێژ کە بڕیارە هەزارساڵ بژیم، هەموو ئەمانە خوداکان پێیان بەخشیوم، بەبۆچونی تۆ تەمەنێکی هەزار ساڵە شایستەی ئەوە نیە سەد هەزار کەس کاری بۆ بکات؟

موسا وتی: تۆ تائێستا بەختێکی باشت هەبوو کە ئێسقانیان کون نەکردویت، ئەگینا لەمێژە ڕەوانەی وڵاتی خۆرئاوا کرابویت، لەداستانە ئەفسانەییەکانیشدا نەبیستراوە کەسێك هەزار ساڵ ژیابێت.

فیرعەون پێکەنی و وتی: بەڵێ وایە بەڵام ئێستا خودایان دەیانەوێت من هەزار ساڵ بژیم. هەورەها ئەگەر وابزانی ناتوانم خەڵکی میسر خۆشبەخت بکەم ئەوا بەهەڵەدا چویت، خەڵکی دەبێت لەڕەنج و تەنگانە و سەختیدا بژین بۆئەوەی هەمیشە گوێڕایەڵی فەرمانەکان بن و بتوانێت فەرمانڕەواییان بکات، چونکە مەحاڵە بتوانرێت فەرمانڕەوایی کەسانێك بکەیت کە لەخۆشگوزەرانیدا بژین و پێویستیان بەهیچ کەسێك نەبێت، لەبەرئەوەی ئەوانە لەتەنگانەدا ناژین بۆئەوەی پێویستیان بەکەسێك بێت کە فەرمانڕەواییان بکات.

گفتوگۆی فیرعەون و موسا درێژەی کێشا و فیرعەون بەمشێوەیە بەردەوامیان دا بەگفتوگۆکانیان و وتی: ئایا ئێستا گەشتیتە ئەو باوەڕەی گواستنەوەی ئەو کێوە بەردینە بۆ پایتەخت کارێکی زۆر پێویستە بۆئەوەی بتوانم هەزار ساڵ بژیم، بەواتا بەئەندازەی چل نەوەی خەڵکی میسر.

موسا بێدەنگ بوو و فیرعەونیش پێی ڕاگەیاند کۆتایی بەگفتوگۆکەیان هاتووە دەبێت بەجێی بهێڵێت. موسا ڕۆشتەوە بۆ لای "نف"ی تەلارساز بۆئەوەی گوزارشتی دەرئەنجامی گفتوگۆکەی پێ ڕاگەیەنێت.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: ئێستا بەپێی ئەو بارودۆخەی هاتووەتە پێشەوە دەتەوێت چی بکەیت؟

موسا وتی: چیتر هیوام بەفیرعەون نەماوە، چونکە زانیم بەئەنقەسە خەڵکی میسری لەو نەهامەتیەدا هێڵاوەتەوە، تەنها ڕێگایەك کە بەهزرمدا بێت ئەوەیە کە هاونەژادیەکانم لەمیسرەوە بگەڕێنمەوە بۆ وڵاتی "کوش".

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: ئایا ئەمە لەئاستی خواستی دایکتدایە؟

موسا وتی: دایکم تەنها بەرژەوەندی خۆی لەبەرچاو دەگرت نەك بەرژەوەندی نەوەی ئیسرائیل.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: بەبۆچونی تۆ کام لەمانە گرنگترە؟

موسا وتی: بەرژەوەندی خێڵی ئیسرائیل کە هاونەژادی منن.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: ئایا ئەوەت فەرامۆش کردووە کە تۆ میسریت، لەبەرئەوەی تۆ تەنها لە"کوش"دا لەدایك بویت و لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا وەك شازادەیەك دەناسرێیت. ئەو کەسانەی لەمیسردا باوەڕیان بە"ئاتون"ە پێویستیان بەکەسێکە پارێزگاریان لێ بکات، لەبەرئەوە بەڕۆشتنت هەموویان نائومێد دەکەیت.

موسا وتی: تۆ زۆرباش ئاگاداری نهێنیەکانی ژیانی منیت و زۆرباش دەزانیت نە کوڕی فیرعەونم و نە کوڕی "ئنخاس ئامون"، هەرلەبەرئەوەش دەمەوێت هەموو هاونەژادیەکانم لەم بەدبەختیە ڕزگار بکەم.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: تۆ بەچ شێوەیەك دەتوانی هاونەژادیەکانت ڕزگار بکەیت؟

موسا وتی: تەنها دان بەخۆتدا بگرە و تەماشا کە بزانە بەچ شێوەیەك ئەم کارە ئەنجام دەدەم.

نف وتی: نابێت لەکاتێکدا فیرعەون هێشتا لەژیاندایە ئەم کارە بکەیت. چونکە خوێنڕێژی و کوشت و کوشتارێکی زۆر دەبێت و خوێنی خەڵکانێکی زۆری وەك تۆ لەم جەنگەدا دەڕژێت.

موسا لێی پرسی: بەچ شێوەیەك دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدەم؟

"نف"ی تەلارساز وتی: کاتێك ئەو دەمرێت ئاژاوەیەك لەوڵاتدا بەرپادەبێت، تۆش ئەو ئاژاوەیە بقۆزەرەوە و ئامانجی خۆت بێ هیچ هەڕەشەیەك ئەنجام بدە. باوباپیرانی ڕابردوت خاوەنی هێز و دەستەڵات بون و تۆ دەتوانی لەمیسردا دوبارە زیندویان بکەیتەوە. هاونەژادەکانت بەدرێژایی پێنج سەد ساڵ میسریان خستووەتە ژێر سمی چوارپێکانیان و پێماڵیان کردووە.

موسا وتی: ئێمە بابەتێکی ئاوامان لەوانەی مێژوودا نەخوێندووە و نەمانبینیوە.

"نف"ی تەلارساز وتی: وایە، ئەم جۆرە وانەیە لەناو کۆشکدا بەشازادەکان ناوترێتەوە، چونکە بەهۆی ئەم وانانەوە بۆیان دەردەکەوێت کە خوداکانی میسر توانای ئەوەیان نیە پارێزگاری لەمیسر بکەن، هەرلەبەرئەوەش مامۆستاکانت ناچار پەیڕەویان لەبەرنامەیەك دەکرد کە ئەوان پێیان ڕادەسپاردن بۆئەوەی تەنها لەو چوارچێوەی بۆیان داناون وانەیان پێ بڵێنەوە، نەیاندەهێڵا بگرە یەك شازادەی میسر ئاگاداری ئەم مێژووە بێت کە نەوەکانی ئیسرائیل زاڵ بون بەسەر فەرمانڕەوایانی میسردا و دەستەڵاتی ئەو وڵاتەیان لەژێر دەستدا بووە.

موسا لێی پرسی: ئایا "یەعقوب" کە نازناوەکەی ئیسرائیلە هێشتا لەدایك نەبووبوو تا هاونەژادیەکانم بەنەوەی ئیسرائیل بانگ بکەن؟ لەوانەیە چەند ناوێکی تریان هەبوبێت.

"نف"ی تەلارساز وتی: بەڵێ، "هیگ سوس"بەواتا –بێ لەشوان–!

موسا لێی پرسی: بۆچی باوباپیرانی منیان بە"بێ لەشوان"بانگ کردووە؟

"نف"ی تەلارساز وتی: لەبەرئەوەی لەڕابردودا باوباپیرانت لەبیابانی"کەنعان"دا شوانیان کردووە، بەڵام کاتێك هێرشیان دەکردە سەر میسر، نازناوێکی تریان پێ بەخشین کە"هیگ سوس"بوو. هیگ سوس دوو واتا لەخۆ دەگرێت، واتای ڕوکاری دەرەوەی "بێ لەشوان"ە بەڵام واتا سەرەکیەکەی"چەتە"بووە.

موسا وتی: کەواتە میسریەکان باوباپیرانی منیان بە"چەتە" بانگ دەکرد؟

"نەف"ی تەلارساز وتی: ئەوان بۆماوەی پێنج سەدە میسریان داگیر و تالان دەکرد.

موسا لێی پرسی: لەڕابردوودا بیابان نشینەکان هێرشیان دەرکردە ولاتە دراوسێکانیان، ئەمەیان کارێکی ناسایی نەبوو. ئەم کارە زیاتر لەکاتی وشکە ساڵیەکاندا ڕویدەدا..... لەم کاتەدا موسا وتی: دەمەوێت بڕۆمەوە بۆ لای هاونەژادەکانم و خۆیان بۆ دەرچون لەمیسر ئامادە بکەن.

"نون"یش گوێ لەم قسانە بوو، بۆیە لێی پرسی: گەورەم من لەخزمەتی تۆدام، بەڵام دەتوانم بپرسم بۆچی دەتەوێت بڕۆیت بۆلای خێڵی ئیسرائیل؟

موسا وتی: ئەی نون تۆ یار و هاوڕێ و نهێنی پارێزی منی و نابێت هیچ نهێنیەکت لێ بشارمەوە. بەدڵنیاییەوە دەمەوێت هاونەژادەکانم لەکۆتی بەندایەتی ڕزگار بکەم، بەڵام فیرعەون ڕێم پێنادات، بۆیە دەبێت لەگەڵیدا بجەنگێم. من هەموو خێڵی ئیسرائیل لەوە ئاگادار دەکەمەوە خۆیان بۆ ڕۆشتن و دەرچون لەمیسر ئامادە بکەن.

نون وتی: هەرچی تۆ بڵێیت بەگوێی ڕۆحم وەریدەگرم و جێبەجێی دەکەم.

"موسا و نون"بەپێداگریەکەوە ڕۆشتن بۆئەوەی چاویان بەهاونەژادەکانیان بکەوێت. لەنزیك گوندێکدا"گەمێ"کەیان لەکەناری ڕوباردا ڕاگرت و بەستیانەوە و گەشتنە ئەو گوندەی کە پێشتر سەردانیان کردبوو. خەڵکی لەچواردەوریان کۆبونەوە و بەسۆز و خۆشەویستیەکەوە مامەڵەیان لەگەڵ"نون"دا دەکرد و "موسا"یان پشتگوێ خستبوو، چونکە"نون"یان بەکەسێکی خۆیان دەزانی و "موسا"ش بەکەسێکی بێگانە لەقەڵەم دەدا.

دوای ماوەیەك موسا بە"نون"ی وت: مەبەستی سەردانەکەیان پێڕاگەیەنە.

"نون"یش وتی: خەڵکینە، من لەگەڵ خاوەنەکەمدا کەناوی"موسا"یە کە ئەویش لەنەژادی ئێمەیە هاتوین بۆئێرە بۆئەوەی هاوکاریتان بکەین، بۆئەوەی بتوانن ژیانێکی باشترتان هەبێت. ئەم خاوەنەم کە دوبارەی دەکەمەوە هاونەژادی ئێمەیە، بەواتا وەك ئێوە لەنەوەی ئیسرائیلە و دەیەوێت ئێوە لەدیل و بەندایەتی ڕزگار

بکات. بۆئەوەی وەك ڕابردوو ئازاد بن و نەبنەوە بەکۆیلە. ئێوە دەبێت تاکەی بەخۆڕایی بێگاری بۆ فیرعەون بکەن، ئێمە بڕیارمان داوە نەژادی ئیسرائیل لەمیسر دەربکەین و بیانگەڕێنینەوە بۆ وڵاتی "کەنعان" کە زێدی باوباپیرانیانە، لەوێ دەست دەکەنەوە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداری و چیتر بێگاری بۆ هیچ کەسێك ناکەن. ئێستاش خواستی گەورەم ئەوەیە کە هەرچیتان هەیە کۆی بکەنەوە و خۆتان بۆ ڕۆشتن ئامادە بکەن، بەپیاوەکانیشتان بڵێن دەست لەکارکردن هەڵگرن و بڕۆن، بەڕێکەون بۆئەوەی بڕۆینەوە بۆ"کەنعان"!

یەکێك لەو نێوەندەدا پرسی: بۆچی کۆچ بکەین؟

نون پێی وت: بۆئەوەی ئازادی بەدەست بهێنین و لەبەندایەتی ڕزگارمان ببێت و بێ کرێ کارنەکەین و قامچیکاریمان نەکەن.

خەڵکی وتیان: ئێمە لێرە تەکان ناخۆین! پیاوە تەندروستەکانمان لەکارگاکاندا سەرقاڵی کارکردنن، بێ پیاوەکانمان ناتوانین هەنگاوێك بنێین. تەواوی پیاوە تەندروستەکانمان لەکارگاکانی میسردا سەرقاڵی کارکردنن، بێ پیاوەکان ناتوانین هەنگاوێك بەرەو پێش بنێین، هەموویان لەحاڵی تەلار دروستکردن و بەرد تاشیندان. ئەم پیاوانە بەپاسەوان دەورە دراون بۆئەوەی نەوەك هەڵبێن، بۆیە دەرچونی ئەو پیاوانە لەکارگای بێگاریدا تا ڕادەیەك بەمەحاڵ دەێتە بەرچاو.

موسا بە"نون"ی وت: ڕاست دەکەن. پیاوە بەهێز و تەندروستەکانیان ناچاریان کردون کاریان بۆ بکەن سەرەڕای ئەوەش بەبونی ئەم جۆرە پاسەوانانەوە ناتوانن هەڵبێن. بگرە لەڕۆژدا بەسەختی کرێکارەکانیان دەخستە ژێر چاودێری خۆیانەوە بۆئەوەی نەوەك لەگەڵ یەکتریشدا گفتوگۆ بکەن و هەوڵی داڕشتنی پلانێك بدەن، هەروەها پاسەوانەکان دەستەڵاتی ئەوەیان پێ بەخشرابوو کە بەئارەزوی خۆیان سزایان بدەن و بگرە دەستەڵاتی ئەوەشیان پێ بەخشرابوو ئەگەر هەر پیلان و ڕەفتارێکی نامۆیان ئاشکرا بکەن بیانکوژن و وەڵامی هیچ کەسێکیش نەدەنەوە. تەنها بابەتێك دەبووە هۆی ئەوەی پاسەوانەکان خۆیان لەکوشتنی کۆیلەکان بپارێزن ئەویش ئەوە بوو ترسی دواکەوتنی ئەنجامدانی کاری کارگاکەبوو کە بۆ سەرەپەرشتی کارگاکە بەسزایەکی مەزن لەقەڵەم دەدرا. موسا بیری لەم بابەتانە

کردەوە و لەبەرئەوەی بە بنبەست گەشت، رۆشت بۆ لای "نف"ی تەلارساز بۆئەوەی راوێـژی لەگەڵـدا بکـات و رێگـا چـارەیەکی بـۆ بدۆزێتـەوە، بـەڵام موسـا نەیتوانی "نف" لەپایتەختدا بدۆزێتەوە و هەندێ کەس پێیان وت کە ئەو ئێستا بۆ دروست کردنـی تـەلارێك بـۆ خـودای مـەرگ "ئـوزیریس" لەپەرسـتگادا سـەرقاڵی کارکردنە. موسا دەیزانـی دەبێت رێگای باشوری "ئیسرائیل" بگرێتە بەر بۆئەوەی بگاتە ئەو پەرستگایەی کە دەزانێت دەکەوێتە چ شـوێنێکەوە. کاتێك گەشتە لای پەرستگای ناوبرا و بینی هەموو کۆیلەکان ئیسرائیلین و بەردێك بەکۆڵیانەوەیە و پاسـەوانەکانیش بەقامـچیەك بەلاسەریانەوە راوەسـتاون. بـەردکانیان دەخـستە نـاو سەبەتەیەکی گەورەوە و هەڵیاندەکێشایە سەرەوە. ئەم کارە بەسـێ قۆنـاخ ئـەنجام دەدرا: یەکـەم ئـەو شـوێنەی کـە بەردەکـە دەخرایـە نـاو سـەبەتەیەکەوە، دووەم هەڵکێشرانی سەبەتەکە و سێیەمیش بەکارهێنانی خودی ئەو بـەردە لەکارەکەیانـدا. سـێیەمین قۆنـاخی لەهـەموو قۆناخـەکانی تریـان سـەختتر بـوو، سـەرەڕای ئـەوەی قۆنـاخی یەکـەم و دوومیـشیان وەکـوو سـێیەم تاقـەتپڕ بـوو، لەبەرئـەوەی کۆیلـەکان بـەردەکانیان دەخـستە نـاو سـەبەتەیەکەوە، دوای ئـەوە بەردەکـەیان بـەگوریس بەدارێکـەوە دەبەسـتەوە، دوای ئـەوە هـەردوو دارەکـەیان هەڵدەکێـشایە سـەرەوە و دەیانخستە سـەر شـانیان. ئـەوتیرە دارانـە ئەوەنـدە درێـژبون کـە تـا ئـەو شـوێنەی بـەردەکانیان تێـدا بـەکاردەهێنا دەیـانتوانی بەسـەر تیرەدارەکانـدا تـا بـەردەم ئـەو شـوێنەی بـەکاریان دەهێنـان بیانخلێننـەوە. بـەکارهێنانی خـودی بەردەکـەش لەکارگاکـەدا بـەقۆناخێکی سـەخت و وردا تێدەپـەڕی. ژمـارەی ئـەو کۆیلانـەی کـە بەردەکەیان دەخستە سـەر تیرەدارەکانـەوە دەگەشتە دوو سـەد کـەس! چاودێرەکان دەیانویـست بەردێك بـەو مەزنیـە بەڕێك و پێکی بخرێتە سەر بەردەکانی تر، بـەڵام مـەحاڵبوو بتوانرێـت بـێ وردبونەوەیـەکی تایبـەت و زاڵبـون بەسـەر ئـەو بـەردەدا دەقاودەق بخرێتە سەر بەردەکانی ترەوە.

کاتێـك موسـا سـەردانی شـوێنی کـارکردنی کۆیلـەکانی کـرد و بـارودۆخی نەگبەتباری ئەوانی بینی تەماشایەکی "نون"ی کرد.

"نون"یش وتی: ئەگەر من لەجێی ئەو کۆیلانە بومایە خۆمم دەکوشت و کۆتاییم بەم ژیانە ئازار بەخشە دەهێنا. لەمکاتەدا بەفەرمانی چاودێرەکان فەرمانی هەڵگرتنی بەردەکان دەرکرا و نۆکەرەکانیش ناچار بۆ جێبەجێکردنی بەردەکان هەموو توانایەکی خۆیان خستەگەڕ. لەنێو ئەم کۆیلانەدا پیاوێکی تاڕادەیەك بەتەمەن و کەساس بەدی دەکرا.

نون یەکسەر ئەو پیاوەی ناسیەوەوە و وتی: پێشتر ئەم پیاوەم بینیوە و ڕوخساری بەلامەوە نامۆ نیە.

ئەو پیاوەی کە"نون" وتی لەخێڵی"لاوی"ە، بەڕادەیەك باریك و لاواز بوو کە پەراسوەکانی بەتەواوی بەرجەستە و دەرپەڕیبون و بەتەواوی ڕەنگ بەڕوخساریەوە نەمابوو. موسا لەو ساتە بەدواوە بەردەوام ئاگای لەلای کابرای خێڵی"لاوی"نەژاد بوو و ئاگاداری ئەوە بوو کاتێك ویستی بجوڵێتەوە لەماندویەتیاندا چاوەکانی نوقاند.

پاسەوانەکەش قامچییەکی بەهێزی دا لەپشتی و هاواری کرد: لەکاتی شەو و لەجێکە خەودا مرۆڤ دەخەوێت.

بەڵام ئەو پیاوەی لەبەرئەوەی بەرگەی ئەو قامچیەی نەگرت کەوتە سەر زەوی. کۆیلەکانی تر هەوڵیاندا بەدەنگێکی بەرز هاواری بەسەردا بکەن بۆئەوەی هانی ئەوەی بدەن هەستێتەوە سەر پێ، بەڵام ئەو پیرەمێردە چیتر هەڵنەستایەوە، پاسەوانیش دەستی بەلێدانی قامچی کرد بەڵام بێسود بوو!

"موسا"ش کاتێك بینی کابرای پاسەوان دەستە لەلێدانی هەڵناگرێت ڕۆشتە پێشەوە و پێی وت: لێی مەدە خۆم هەڵیدەستێنمەوە، بەڵام کاتێك لێی نزیك بویەوە بینی کابرای پیرەمێرد کۆچی دوایی کردووە.

لەوکاتەدا تووڕەیی موسا وروژا و بێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێت قامچیەکەی لەدەستی کابرای پاسەوانی گرت و فڕێی دا و بەیەك موشت کابرای پاسەوانی تەختی زەوی کرد. بەو مشتەی ئێسقانی ڕوخساری ئەو کابرایەی شکاندبوو و ئەوکاتەش کە تەختی زەوی بوو سەری بەر بەردێك دەکەوێت و کۆچی دوایی دەکات. پاسەوانانی ئامادە بەبینینی دیمەنی کوشتنی هاوکارەکەیان دەستیان

لەکارەکەیان هەڵگرت و واق و وڕماو لەجێی خۆیاندا وشك بون. "نون"یش کە بەئاگاییەکەوە تەماشای ئەم دیمەنەی دەکرد بینی چەند چاودێرێك هاتن بۆئەوەی لێکۆڵینەوە لەو ڕوداوە بکەن و ئەویان بەمردوویی بینی و ڕویانکردە موسا و لێیان پرسی: تۆ ئەو پاسەوانەت کوشت؟

موسا وەڵامی نەدانەوە.

کابرای چاودێر پرسی: چی بوو بەهۆی ئەوەی کارێکی وا بکەیت؟

موسا بەدەستی ئاماژەی بۆ کابرای پیری مردوو کرد.

وەك بڵێی کابرای چاودێر سەیرترین وەڵامی تا ئەو کاتە بەرگوێ کەوتبێت، بۆیە وتی: پاسەوانێکت لەپێناوی ئەم کۆیلە هیچ و پوچەدا کوشت؟

لەمکاتەدا"نف"ی تەلارساز کاتێك ئاگاداری ئەم ڕوداوە بوو هاتە شوێنی ڕوداوەکە و پرسی کێ ئەو پاسەوانەی کوشتووە؟ هەمویان بەدەستیان"موسا"یان پێنیشان دا. "نف"تەلارساز بەچاو لایەنگری کرد و موسا بەسەری.

"نف"ی تەلارساز لێی پرسی: بۆچی؟

"موسا"ش ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە و دوای ئەوە وتی: دەمویست لەبارەی شتێکەوە گفتوگۆت لەگەڵدا بکەم.

"نف"ی تەلارساز وتی: دەزانم دەتەوێت لەبارەی چیەوە گفتوگۆم لەگەڵدا بکەیت، لەئێستادا تۆ بڕۆ بۆ پایتەخت تا ئەوکاتەی دەگەڕێمەوە و چاوم پێت دەکەوێت. موسا و نون گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان دوای ماوەیەك دایان لەدەرگا و"نون"دەرگاکەی کردەوە و بەرپرسی میراتی فەرمانڕەوایی لەگەڵ ژمارەیەك چەکداردا بینی کە چواردەوری ماڵەکەیان دابوو.

بەرپرسی میراتی فەرمانڕەوایی وتی: فیرعەون دەیەوێت چاوی بە"موسا"بکەوێت و هەرئێستاش دەبێت بڕوات بۆلای. "ستی موسا"ی بەرپرسی میراتی فەرمانڕەوایی خۆی کرد بەماڵەکەیاندا و داوای لەموسا کرد خۆی ئامادەبکات. "موسا"ش ناچار لەگەڵیاندا ڕێگای کۆشکی گرتەبەر و لەبەردەم فیرعەوندا ڕاوەستا.

فیرعەون هاواری کرد: هەمووتان بڕۆنە دەرەوە. بێ لەمن و موسا هیچ کەسێك لەم ژوورەدا نەبینم.

دوای ئەوە وتی: تۆ یەکێکت لەکەسەکانی ئێمە کوشتووە.

موسا وتی: ئەویش یەکێکی کوشتووە.

فیرعەون وتی: بەڵام ئەوەی ئەو کوشتی کۆیلە بوو، بەڵام ئەم پیاوە میسریە و لەخزمەتکارانی پەرستگا بووە.

موسا وتی: پەرستگایەك کە هێشتا دروست نەکراوە پێویستی بەخزمەتکار نیە.

فیرعەون وتی: مەگەر ئەو لەپەرستگای"ئوزیریس"کاری نەدەکرد، هەرکەسێك لەوێدا کار بکات، لەهەمان ئەو ساتەوە بەخزمەتکاری ئەو پەرستگایە لەقەڵەم دەدرێت. ئیتر ئەو پەرستگایە تەواو کرابێت یان نیوەچڵ بێت، سەرەڕای ئەوەش کوشتنی خزمەتکارێك لەگەڵ کوشتنی کاهینێکدا هیچ جیاوازیەکی نیە و سزاکەشی مەرگە ئیتر بکوژەکەش تۆ بیت کە شازادەیت.

فیرعەون ئەوندە هەڕەشەی لە"موسا"کرد تا ئەوکاتەی کاسەی دانبەخۆداگری موسا لێی ڕژا و وتی: من ئەو پاسەوانەم کوشت لەبەرئەوەی ئەویش یەکێك لەهاونەژادەکانی منی کوشتووە!

فیرعەون پرسی: بەواتا ئەو کۆیلەیەی کە کوژار لەهاونەژادەکانی تۆ بوو؟ چۆن؟

موسا وتی: ئەگەر نازانی ئێستا بزانە، من لەنەژادی ئیسرائیلم، ئەو کۆیلەیەش لەنەژادی ئیسرائیل و لەخێڵی"لاوی" لەهەمان خێڵەکەی منە... دوای ئەوە موسا پێی وت: ئەی فیرعەون من شێت نیم و کوڕی"ئنخاس ئامون"یش نیم، ئەو منی لەڕووباری نیل لەناو سەبەتەیەکدا گرتووەتەوە و کردمی بەکوڕی خۆی! باوکم ناوی"عمران"ە و ئەویش یەکێك بوو لەکۆیلەکانی تۆ و...

فیرعەون بەبیستنی سەرگوزەشتەی موسا کە هەموو شتێکی ئەو گوتانە بەلایەوە تازە بوو"مات" و سەرسورما و بێدەنگ تەنها تەماشای موسا دەکرد.

کاتێك کۆتایی بەقسەکانی موسا هات، فیرعەون وتی: مەبەستت لەم درۆکردنە چیە؟ئەگەر دەتەوێت سزایەکی سوکترت بەسەردا بسەپێنم شێوازی گفتوگۆکانت بگۆڕە، چونکە ئەم داستانەی بۆت باسککردم جێی باوەڕ نیە؟

مواس وتی: من درۆت لەگەڵدا ناکەم.

فیرعەون وتی: بۆچی تا ئەوکاتەی دوچاری تاوانێکی ئاوا نەبویت باسی ئەم نهێنیەت بۆ نەکردم؟

موسا وتی: چونکە تا ئێستا هیچ کەسێك یەکێك لەهاونەژادەکانمی نەکوشتووە بۆئەوەی منیش تۆڵەی لێ بکەمەوە، هۆکاری کوشتنی ئەو پاسەوانەش ئەوەبوو کە هاونەژادیەکی منی بەربەرچاوی خۆمەوە کوشت.

فیرعەون وتی: لەوانەیە بتەوێت بەم قسانەت خۆکوژی بکەیت؟

موسا وتی: نەخێر لەڕاستیدا دەمەوێت بەم ناسنامە ڕاستەقینەمەوە زیندوو بمێنم.

فیرعەون پرسی: ئایا تائێستا باسی نەژادی ڕاستەقینەت بۆ هیچ کەسێکی تر کردووە؟

لەم کاتەدا موسا ڕاوەشا و وتی: هیچ کەسێکم لێ ئاگادار نەکردووەتەوە.

فیرعەون وتی: تۆ نهێنی لەدایك بونی خۆتت بۆ"نف"ی تەلارساز نەگێڕاوەتەوە.

موسا کەمێك ڕاوەستا و وتی: بۆ ئەویشم نەگێڕاوەتەوە.

فیرعەون وتی: تۆ بەئاشکراکردنی ئەم نهێنیە فەرمانی مەرگی خۆتت دەرکردووە، هەروەها دەبێت لەو"نف"ی تەلارسازیش بپرسم..... دوای ئەوە فەرمانی دەستگیرکردن و چاودێری کردنی"موسا"ی دەرکرد.

نون لە موسای پرسی: بۆچی چواردەوری ئەم ماڵەیان داوە؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی سبەی بەیانی دەیانەوێت بمکوژن، تەنها ئەمشەو ڕێیان پێداوم بەزیندوویی بمێنمەوە، لەبەرئەوە لەوانەیە گیانی تۆش لەژێر هەڕەشەی مەرگدا بێت، بۆیە باشتر وایە خشڵ و زێڕ و ئەوەی پێویستت پێیەتی لەگەڵ خۆتتدا ببیە و پاشماوەی ژیانت بەخۆشی و شادی تێپەڕێنیت.

نون وتی: مەحاڵە.

موسا وتی: من نهێنی لەدایك بونم بۆ فیرعەون باسکرد بەدڵنیاییەوە هەرلەبەرئەوەش دەمکوژێت.

لەوکاتەدا هەردوکیان بێدەنگ بون. لەمکاتەدا پاسەوانەکان دەرگای ماڵەکەیان بەپەلە کردەوە و جەستەیەکی خوێنینیان فڕێدایە ناو ماڵەکەوە. نون و موسا ڕۆشتنە پێشەوە و یەکسەر جەستەی"نف"ی تەلارسازیان ناسیەوە.

لەنیوەشەودا موسا بە"نون"ی وت: نامەوێت لەبەرامبەر مەرگدا خۆم بدەم بەدەستەوە، بەڵام کاتێك فیرعەون فەرمان دەربکات دەبێت ئەو فەرمانە جێبەجێ بکرێت.

نون وتی: لەم ساتەدا مەرگ و ژیانت بەدەستی خودی خۆتەوەیە،

موسا وتی: بەچ شێوەیەك؟

نون وتی: ئەگەر لەماڵەدا بمێنیتەوە سبەی دەتکوژن. ئەگەر هەڵبێیت خۆت لەمەرگ ڕزگار دەکەیت.

موسا وتی: تۆ مەبەستت ئەوەیە لێرە هەڵبێین.

نون وتی: بەڵێ، تەنها ڕێگای ڕزگار بون هەڵهاتنە.

موسا وتی: مەبەستت ئەوەیە پاسەوانەکان بکوژین.

نون وتی: ئێمە نامانەوێت هیچ کەسێك بکوژین، بەڵام ئەگەر هێرشیان بۆ بردین، ئەوا ناچار دەبێت بەرگری لەخۆمان بکەین... دوای ئەوە وتی: ئێمە دڵنیاین لەوەی سبەی بەکوشت دەدرێین، لەبەرئەوە بۆ ڕزگاربونمان لەم قەیرانە جگە لەهەڵەشەیی و بوێری هیچ ڕێگەچارەیەکی ترمان لەبەردەستدا نیە.

لەوکاتەدا"موسا"شمشێرەکەی گرت بەدەستەوە و بە"نون"ی وت: ئەوەی بەپێویستی دەزانی لەگەڵ خۆتدا هەڵیگرە، کەمێك خواردنیش بێنە، چونکە ئەگەر لەم هەڵهاتنەماندا سەربکەوین، دەبێت بۆماوەیەك خۆمان بشارینەوە!

دوای ئەوە وتی: بەجوڵەیەکی کتوپڕ و خێرا بێ ئەوەی پاسەوانەکانی ئاگایان لێ بێت لەماڵ دەڕۆینە دەرەوە، پاسەوانەکانی چواردەوری ماڵی موسا لەچوار کەس زیاتر نەبون، دوانیان لەپێش ماڵەکەوە و یەکێکیان لەسەربان و ئەویتریان لەپشتی ماڵەکەوە پاسەوەنی دەکرد. "موسا و نون"بەپێی ئەو بڕیارەی دابویان بەجوڵەیەکی برق ئاسا لەماڵ هەڵهاتن. موسا و نون بەبەردەوامی پشتیان بەیەکتریەوە چەسپاندبوو و بەرەودواوە هەنگاویان دەنا لەوکاتەدا دو پاسەوانەکەی

بەردەمی ماڵەکەیان بریندار کرد، بەڵام هاواری ئەو دوانە دو پاسەوانەکەی تری ئاگادار کردەوە و دوای موسا و نون کەوتن. جەنگی دو بەدوو تا کەناری ڕوباری نیل بەردەوام بوو. تا سەرئەنجام یەکێك لەپاسەوانەکان کوژرا و ئەویتریان گەڕایەوە بۆئەوەی هێزێکی زیاتر بهێنێت. "نون و موسا"گەشتنە کەنار ڕوباری نیل و بەدەم سەوڵ لێدانەوە بەخێرایی خۆیان لەکەنار دور خستەوە، بۆئەوەی پێش هەڵهاتنی خۆر لەشوێنێکدا خۆیان حەشار بدەن. بۆیە"گەمی"کەیان بۆ شوێنێك برد کە زەل و گیایەکی زۆری تێدا ڕوابوو. ئەو دوانە بەهۆی بونی خواردن و ئاوی"نیل"ەوە لەخورد و خۆراکەوە هیچ کێشەیەکیان نەبوو. تەنها مێروله گەزندەکان نەبێ کەمێك ئازاریان دەدان. ئەو دوانە لەنێوەندی شەخەڵی ئەو گیایەدا لەناو"گەمی"کەیاندا تا کاتی خۆرئاوابون خەوتن، بۆئەوەی لەتاریکی شەودا ڕێگای باکور بگرنەبەر. موسا و نون بەڕۆژدا خۆیان دەشاردەوە و بەشەویش ڕێیان دەکرد. لەڕۆژی چوارەمدا خۆراکیان تەواوبوو، بەڵام ڕوباری"نیل"سەرچاوەی جۆرەها خواردن بوو، لەماسیەوە بگرە تا مراوی و باڵندەیەکی زۆری بۆ ڕاوکردن تێدابوو. ئەو دوانە بەوشێوەیە خۆیان گەیاندە وڵاتی"کوش".

موسا وتی: دەبێت وڵاتی کوش بەجێ بهێڵین و خۆمان بگەیەنینە بیابانی"سینا"، بەڵام کاتێك بەلای"کوش"دا تێدەپەڕین دەبێت ئاگامان لەخۆمان بێت. لەبەرئەوەی پیاوەکانی فیرعەون بەهەموو شوێنێکدا بڵاو بونەتەوە و کاتێك چاویان پێمان بکەوێت یەکسەر دەستگیرمان دەکەن. ئێمە دەبێت بەنێو"کوش"دا تێپەڕین تا ئەوکاتەی خۆمان دەگەیەنینە بیابانی"سینا"، بەنێو بیابانی"سینا"شدا تێپدەڕین تا ئەوکاتەی خۆمان دەگەیەنینە وڵاتی"کەنعان". جلوبەرگی موسا و نون هەمان ئەو جلوبەرگانە بوو کە لەکاتی هەڵهاتندا لەبەریاندا بوو و بەجلێکی ئاواشەوە نەیاندەتوانی بەرگەی سەرمای بیابانی"سینا" بگرن. ئەوانە بەهەر شێوەیەك بووە خۆیان گەیاندە سەرتای بیابانی"سینا" و پیاوێکیان بەسوار وڵاخێکەوە بینی کە تەنها چاوێکی هەبوو.

نون سڵاوی لێکرد و لێی پرسی: لێرە چی دەکەیت؟

پیاوی یەك چاویش پێش ئەوەی وەڵامی بداتەوە وتی: تۆ پێم بڵێ لەگەڵ ئەو پیاوەی کە لەشتێك هەڵدێت بۆئەوەی بەشتێکی تر بگات کێیە؟

"موسا و نون"تەماشایەکی یەکتریان کرد و موسا لێی پرسی: بەهەرحاڵ تۆ کێیی؟

ئەو پیاوە وتی: من جادوگەرم. ئەگەر بتەوێت دەتوانم پێشبینی ئایندەت بۆ بکەم، بگرە دەشتوانم مرۆڤەکان بکەم بەئاژەڵ.

موسا پرسی: بەچ شێوەیەکی مرۆڤ دەکەیت بەئاژەڵ؟

کابرای یەك چاو بەسەر وڵاخەکەیەوە وتی: ئەم وڵاخەی کە سواری بوم ڕۆژانێك مرۆڤ بووە! بەو شێوەیە هەوڵیدا کەرەستەی سیحر بە موسا و نون بفرۆشێت بۆئەوەی خۆشبەخت بن.

موسا وتی: باشتر وایە ئەو کەرەستەیە بۆ خۆت بەکار بهێنی بۆئەوەی لەم بیابانەدا سەرگەردان نەبیت!

موسا و نون دوای چەند ڕۆژێك ڕێکردنی بەردەوام گەشتنە ئاواییەك کە لەدورەوە چەند دارخورما و خانوویەکیان بینی، زانیان کە لەئاوی شیرین نزیك بونەتەوە. کاتێك موسا و نون خۆیان کرد بەو ئاواییەدا، خۆر لەحاڵی ئاوابوندا بوو، ئەو دوانە خۆیان گەیاندە لای بیرە ئاوێك، نەریتی ئەو ئاواییە وابوو هەر بیانیەك بڕواتە سەر ئەو بیرە ئاوە دەبێت بانگێشتی ماڵەکەی خۆیان بکەن، کۆچەر بەسەر بیرە ئاوەکەوە ڕادەوەستا بۆئەوەی کەسێك دەربکەوێت و ئەو لەتینویەتی و برسیەتی ڕزگار بکات و شەویش لەو ماڵەدا بخەوێت. کاتێکیش خەڵکەکە دەیانویست کابرای نامۆ ببەنە ماڵەکەی خۆیانەوە، سەرەتا بارودۆخی کابرایان هەڵدەسەنگاند بۆئەوەی بزانن سبەی ئەو شەوە کاتێك ئەو پیاوە ماڵەکەیان بەجێ دەهێڵێت چەنێك زێڕیان پێدەدات! هەندێکیشیان بێئەوەی چاویان بڕیبێتە زێڕ و زیو گەشتیارەکانیان دەبردەوە بۆماڵی خۆیان.

موسا و نون لەسەر یەکەمین بیر کەپێی گەشتن دانیشتن و بینیان ڕانە مەڕێکی بچوك لەگەڵ کچێکی لاودا بەرەوڕویان دێت. کاتێك مەڕەکان گەشتنە سەر قەمی ئاو خواردنەوەکەیان کچ ڕۆشتە سەر بیرە ئاوەکە و ئاوی هەڵکیشایە سەرەوە، کچە

بەوشێوەیە بەخێرایی و بەردەوامی ئاوی هەڵدەکێشا و دەیڕشتە ناو قەمی ئاو خواردنی مەڕەکانەوە. مەڕەکانیش بۆ خواردنەوەی ئاو فشاریان دەخستە سەر یەکتری. لەوکاتەدا موسا هەوڵیدا لەهەڵکێشانی ئاودا هاوکاری ئەو کچە بکات.

هەر بۆ ئەو مەبەستە هەستا و لەو کچە نزیك بویەوە و وتی: دەتەوێت هاوکاریت بکەم؟

کچەش بەدەم ئاوکێشانەوە لێی پرسی: بۆچی دەتەوێت هاوکاریم بکەیت؟

گوتەی زبری کچە وای لەموسا کرد پاشەکشە بکات، کچەش زەردەخەنەیەکی کرد و لێی پرسی: ترسایت؟

موسا وتی: لەچی بترسم؟

کچە وتی: لەمن.

موسا وتی: نەخێر لەتۆ نەترسام.

کچە وتی: کەواتی لەبیرەکە ترسایت کە بووە هۆی ئەوەی بەوشێوەیە پاشەکشە بکەیت؟

موسا وتی: نەخێر لەبیرەکەش نەترسام.

کچەش وتی: کەواتە بۆچی بەترس و تۆقاویەکەوە پاشەکشەت کرد.

نون خۆی خستە ناو گفتوگۆکەوە و وتی: کاتێك گەورەم زانی تۆ پێویستت بەهاوکاری نیە و تۆش بەو لێهاتوییەوە ئاو دەکێشیت، حەزی نەکرد ببێتە مایەی دەردیسەریت.

کچە وتی: هەڵکێشانی ئاو ئەوەندەش پشت بەزۆری باڵ و بازوو نابەستێت، بەڵکو ئەزمون و بەردەوامی هەوڵدان لە زۆر و هێز باشترە. ئێستاش ئەگەر دەتانەوێت تاقی بکەنەوە، فەرموو ئەمە سەتڵ و ئەوە بیرەئاو.

نون بەهۆی ئەوەی ئەویش وەك ئەو پێشتر بەژیانێکی ئاوادا تێپەڕیوە توانای لەکچەی شوان کەمتر نەبوو، بۆیە لەوکاتەدا ویستی بڕوات و ئاو بکێشێت.

بەڵام موسا وتی: سەرەتا من تاقی دەکەمەوە.

سەرەڕای ئەوەی موسا پشتی بەلاویەتی و هێزی بازوی بەستبوو بەڵام نەیتوانی لە دە سەتڵ زیاتر هەڵکێشێت، ئەوکات بۆی دەرکەوت کچەی شوان ڕاست دەکات،

چونکە زۆر ماندوو بوو، لەکاتێکدا ئەو لەو زیاتر ئاوی هەڵکێشا سەرەڕای ئەوەش توانای ئەوەی تێدا بوو ئەوەندەی تر سەتڵە ئاو هەڵکێشێت و هێشتا وەك ئەو ماندو نەبوبو.

کاتێك موسای بەو حاڵەوە بینی وتی: نۆرەی منە ئاو هەڵکێشم.

بەوپەڕی سەرسوڕمانی موسا و کچی شوان بەتوانایەکی تایبەت بەخۆی بەخێراییەکی زۆر ئاوی هەڵدەکێشا و بووە مایەی سەرسوڕمان و سەرنج ڕاکێشانی موسا و کچەی شوان. لەکۆتاییدا بێنەوەی بۆماڵەکەی خۆی میوانداریان بکات یان هیچ نەبیٚ سوپاسیان بکات ڕۆشت و لێیان دور کەوتەوە.

موسا سەری سوڕما و نون وتی: لێرەدا بۆ کارێك کە بۆ کەسانی تر ئەنجامی دەدەیت سوپاست لیٚ ناکرێت، چونکە وەك ئەرکێك لەقەڵەم دەدرێت. ئەو دوانە دوای ماوەیەك کۆمەڵێك لەخەڵکی ئەو ئاواییەیان بینی کە لەبیابانەوە بەرەو ماڵ دەڕۆشتنەوە، بەڵام هیچ یەك لەوانە بانگێشتی ماڵی خۆیانیان نەکردن.

بۆیە موسا بەسەرسوڕمانەوە بەنونی وت: دەبێت ئەمشەویش لەبیاباندا بخەوین، بۆچی هیچ کەسێك میوانداری ماڵەکەی خۆیمان ناکات؟

نون وتی: هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جلوبەرگە بەنرخەکانی تۆ، چونکە خەڵکی ئەم ئاواییە وا لێکی دەدەنەوە کە نۆکەرەکانت خزمەتت دەکەن و ئەوانیش کاتێك میوانداری تۆ بکەن ناچار دەبن جێی نۆکەرەکانیشت لەماڵەکەیاندا بکەنەوە و ئەمەش لەتوانای ئەواندا نیە. بۆیە ئەمشەو دەبێت لەناو باخە خورماکەدا بخەوین. هیچ نەبێت ئاوێکی زۆری شیرین لەبەردەستماندایە.

کاتێك ئەم دوانە ویستیان بیرەکە بەجیٚ بهێڵن و ڕێگا باخە خورماکە بگرنەبەر بۆئەوەی لەژێر داخورماکاندا بخەون، بینیان هەمان ئەو کچە جوانە لەگەڵ کۆمەڵێك کچی تری ئاواییدا بەرەو ڕویان دێن.

کچێك لەموسا نزیك بویەوە وتی: "چژۆ"ی باوکم بەمن و خوشکەکانمی وت بێین بۆ ئێرە و ئێوە بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگێشتی ماڵی خۆمان بکەین.

موسا وتی: "چژۆ"ی باوکت جوتیارە یان شوان؟

کچی لاویش وەڵامی دایەوە: هیچ کامیان.

موسا وتی: ئەگەر باوکت شوان و جوتیار نەبێت، ئەی کەواتە چ کارەیە؟

کچە وتی: باوکم کاهینە.

موسا دوبارە لێی پرسی: ئەمانە خوشکی تۆن؟

کچە وتی: بەڵێ.

موسا لێی پرسی: ناوت چیە؟

کچە وتی: ناوم"سفورە"یە. ئێستاش با بڕۆین چونکە باوکم چاوەڕێمان دەکات.

موسا وتی: بەمەرجێك دێمە ماڵتان، ئەو مەرجەش بەهای ئەو خواردنەی لەماڵتان دەیخۆین پێتان بدەین، هەروەها کرێی شوێنی خەویشمان لێ وەربگرن.

"سفورە"وتی: نازانم و لەو بڕوایدا نیم باوکم دڵی بەم پێشنیارەی تۆ خۆش بێت.

کاتێك بەدەم ڕێوە بەردەوامیان بەگفتوگۆکەیان دەدا"سفورە"وتی: من بەباوکم وت ئێوە دوو کەسن، نۆکەرێك و خاوەندارێك.

موسا وتی: دەبینی کە ئێمە دوو کەسین، بۆیە بەڕوای نازانم خێزانەکەتان بەرگەی ئەرکی هەردووکمان بەخۆڕایی لەئەستۆ بگرێت، بۆیە باوکت چ حەز بکات و چ حەز نەکات من کرێی ئەم میوانداریەتان پێ دەدەم.

کاتێك هەموویان گەشتنە ماڵی کاهین هێشتا هەوا بەتەواوی تاریك نەبوبو و"چڕۆ"لەبەردەم ماڵەکەیدا چاوڕێی دەکردن. پیرەمێرد بەڕیش و ئەبرۆیەکی پان و سپیەوە بەخێرهاتنی"موسا"ی کرد و داوای لێکرد بڕواتە ژورەوە. "سفورە"چرایەکی بۆ ڕوناکی داگیرساند. موسا دانیشت بەڵام نون نەڕۆشتە ژور و لەدەرەوە مایەوە، چونکە نەیدەویست لەگەڵ "موسا"ی خاوەنیدا لەیەك ڕیزدا دانیشێت.

موسا بانگی کرد: نون وەرە ژورەوە.

ئەوکات ڕۆشتە ژورەوە.

موسا وتی: نون برای منە.

نـون وتـی: خاوەنەکـەم لـەمیهرەبانی خـۆی مـن بـەبرای خـۆی بـانگ دەکـات. لەکاتێکـدا مـن نۆکـەری ئـەوم. لـەو ڕۆژەوەی بومەتـە کۆیلـە و خزمـەتکاری، خـۆم بەکەسێکی خۆشبەخت و ئازاد دەزانم.

"چـژو" بـە"موسـا"ی وت: "سـفورە"ی کـچم پێـی وتم تـۆ بۆئـاودانی مـەڕەکان لەهەڵکێشانی ئاودا هاوکاریت کردووە، منیش لەبەرئەوە بانگم کردی بۆ ماڵەکەی خۆم بۆئەوەی لەڕێی ئەم میوانداریەمەوە سوپاسگوزاریت بکەم.

موسا وتـی: ویستم هاوکاری کچەکەت بکەم بەڵام تـەنها خـۆی دەیتـوانی ئـاوی مەڕەکانی بدات و نەیهێڵا هاوکاری بکەم.

"چژو" وتـی: لێرەدا نـەریت نیە پیـاو هاوکاری ژن بکات. ژنـان بـۆ خۆیـان ئـاو هەڵدەکێشن و پیـاوانیش بۆ خۆیـان، تـۆ خـەڵکی کوێیت کە ڕێت لـەم شـوێنە وێڵـە کەوتووە، زۆر بەلامانەوە سەیرە کە تۆ لەم ناوچەیەدا دەبینین، چونکە ئێرە ئەوەندە دور و پێچە کە کەم کەسانێکی وەك تۆ لێرەوە تێدەپەڕن. بەسەروچاوتدا دیارە کە وەجاخزادە بیت.

موسا وتی: بۆچی من بەوەجاخزادە بانگ دەکەیت؟

"چـــژو"وتـــی: تـــەواوی هێماکـــانی وەجـــاخزادەیی چ لـــەڕوی جلوبەرگـــەوە و ڕوخسارتەوە یان لـەڕوی شکۆمەندیتەوە پێـوە دیارە، هەرکەسێك ئـەو پیـاوەی تـۆ دەڵێیـت نۆکـەری منـە ببینێـت وا هەسـت دەکـات تـۆ لەخۆشـگوزەرانیدا دەژیـت، لەوەش گرنگتر توانای تۆ بۆ ئاو هەڵکێشان و هاوکاری کردنی"سفورە"ی کچم.

هـەروەها چـژو وتـی: ئەگـەر بەهەڵـەدا نەچـوبێتم لەمیـسرەوە هاتویـت، بـەڵام لەوباوەڕەدا نیم میسری بیت.

موسا وتی: وایە ئێمە میسری نین.

چژو لێی پرسی: ئەی کەواتە خەڵکی کوێن؟

موسا وتی: خەڵکی وڵاتێکین کە لەوانەیە تۆ نەزانیت دەکەوێتە کوێـوە و هـەرگیز ناویت نەبیستبێت. ئێمە خەڵکی وڵاتی"کوش"ین.

چژو وتی: "کوش" هەمان ئەو وڵاتە نیە کە دەکەوێتە ڕۆژهـەڵاتی ڕوباری نیلـەوە و خێڵی"ئیبراهیم"ی تێدا نیشتەجێیە؟

موسا لێی پرسی: مەگەر تۆ ئیبراهیم دەناسیت؟

کاهین وتی: هەموو خەڵکی ئەم ناوچەیە ئیبراهیم دەناسن. پیاوێکی چاك کە سەرەتا لەگەڵ خێڵەکەیدا دوای ئەوە لەبیابان کۆچیان کرد و ڕۆشتن بۆ وڵاتی "کوش"و ئێشتا لەوێ ماونەتەوە. هەموو خەڵکی ئاگاداری سەرکوزەشتەی"یوت" و برازاکەی"لوت"ن.

لەوکاتەدا کابرای کاهین تەماشایەکی سەرتاپای"موسا"ی کرد و وتی: دیارە لەوڵاتی"کوش"دا خۆشگوزەرانیە.

موسا وتی: بارودۆخی خەڵکی"کوش"زۆر خراپە، چونکە خەڵکی میسر بۆ بێگاری دەیانبەن بۆ وڵاتی خۆیان.

چڕۆ لێی پرسی: کەواتە تۆ ژیانێکی خۆشت هەیە و وەك ئەوان کۆیلە نیت؟

موسا وتی: بارودۆخی ئێمە لەگەڵ خەڵکی"کوش"دا زۆر جیاوازە، خێڵی"ئیبراهیم"یەکێکن لەنەگبەتبارترین خێڵی ئەم سەرزەویە.

کاهین وتی: بۆچی؟

موسا وتی: چونکە هەمویان کۆیلەن. دەبێت بەخۆڕایی بۆ فیرعەون کار بکەن.

چڕۆ لێی پرسی: بۆچی تۆ نەبویت بەکۆیلە؟

موسا وتی: خۆم لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا پەروەردە کراوم و ڕۆژێکیشیان"نون"م وەك نۆکەرێك کڕی، دوای ئەوە باسی هەموو شتێکی بۆ کرد.

کاهین وتی: کەواتە بەپێی ئەم قسانەت چیتر ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ میسر، چونکە بەدڵنیاییەوە دەتکوژن؟

موسا وتی: وایە، ئێمە لەبەرئەوە لەمیسر هەڵهاتوین.

چڕۆ لێی پرسی: ئێستا دەتانەوێت بڕۆن بۆ کوێ؟

موسا وتی: دەمەوێت بڕۆمەوە بۆ"کەنعان"وڵاتی باوباپیرانم.

کاهین لێی پرسی: "کەنعان"لەدوو ناوچە پێك دێت، ناوچەیەکیان ئاواییەکە لەژێردەستی"فەلەستینیەکان"دایە کە هیچ بێگانەیەك ناتوانێت پێ بنێتە ئەو

ناوچـەیەوە. ناوچـەیەکی تریـان شـوێنێکی وشـك و بێئـاو و گیایـە کـە بگـرە گیانەوەریشی تێدا ناژیت، بگرە مشتێك گەنم و قومێك ئاوی تێدا پەیدا نابێت. بۆیە تۆ دەبێت چاوپۆشی لەچونت بۆ"کەنعان" بکەیت، چونکە ئەگەر بڕۆیت بۆ ناوچەی فەلەستینیەکان دەتکوژن. لەبیابانیشدا تینویەتی و برسیەتی لەناوت دەبات. ئەگەر حەز بکەیت دەتوانیت لێرە بمێنیتەوە، چونکە هەم ئاوی تێدا دەست دەکەوێت و هەم دەستی سیخوڕەکانی فیرعەونی پێناگات. من پێشەوای ئەم خێڵەم و حەوت کچ و کوڕێکم هەیە، کوڕەکەم ناوی"هباب"ە، پیاوێکە کە شارەزاییەکی تەواوی لەبواری گیاناسـیدا هەیـە، بـەڵام لەبەرئـەوەی جەسـتەیەکی لاوازی هەیـە بەکـەڵکی سەرکردایەتی و پێشەوایی نایەت، کوڕێکی ترم نیە تا بیکەم بەجێنشینی خۆم. هەروەها سەرەڕای ئەوەی خێزانێکی قورسم لەئەستۆدایە، بەڵام ژیانم دابین کراوە، لەم ناوچەیەدا کاهینی کردن کارێکی زۆر ئاسانە.

موسا وتی: من ناتوانم بەپێچەوانەی بیروباوەڕم بژیم و ببمە کاهین.

کـاهین وتـی: ئێستا کەناتـەوێت ببیتـە کـاهین، کەواتـە بـەچ شێوەیەك دەتـەوێت بژێوی ژیانت دابین بکەیت؟

موسا وتی: من زێڕم هەیە و دەتوانم مەڕی پێ بکڕم و شوانی بکەم.

چڕۆ وتـی: سـەرەڕای ئـەوەی ناتـەوێت ببیتـە کـاهین، مـن ڕێ لەمانـەوەت نـاگرم، بەڵام چی لەژن و منداڵەکانت دەکەیت؟

موسا وتی: من ژن و منداڵم نیە.

چڕۆ لێی پرسی: ئایا ژن و منداڵەکانت مردون؟

موسا وتی: هێشتا ژیانی هاوسەریەتیم پێك نەهێناوە!

کـاهین بەسەرسوڕمانەوە لێـی پرسـی: بگـرە هـەژارترین کەسـی ئـەم ئاواییـە ژن و منـداڵیان هەیـە، تـۆ بـەچ شـێوەیەك لەکۆشـکی فەرمانڕەواییـدا ژیاویـت و ژیـانی هاوسـەریت پێـك نـەهێناوە، بیـستومە هـەر لەسـەردەمی منداڵیـدا هاوسـەرێکتان بـۆ دەستنیشان دەکەن.

موسا وتی: بەڵام خۆم نەمویست ژیانی هاوسەری پێك بهێنم.

لەم کاتەدا نون وتی: لەو ڕۆژەوەی بۆم بەکۆیلە ئەم خاوەنەم لەهیچ ژنێك نزیك نەبووەتەوە!

کاهین تەماشایەکی موسا کرد و وتی: ئەگەر کەموکورتیەکم لەتۆدا ببینیایە دەموت نەخۆشی، بەڵام پرسیارێك ئایا ئارەزوی ژن لەتۆدا بەدی دەکرێت؟

موسا وتی: بەڵێ، بەتایبەت لەو کاتەوەی هاتمە ئەم ئاواییەوە دەمەوێت لەگەڵ ژنێکدا تێکەڵ بم.

چڕو وتی: لەگەڵ کام ژن؟

موسا وتی: لەگەڵ"سفورە"ی کچت!

چڕو وتی: پیرۆزت بێت، ئەگەر تۆ حەزت لە"سفورە"ی کچم کردووە ئەوا من هیچ قسەیەکم نیە بیکەم، هەرکاتێك خۆت بتەوێت دەتوانی ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنیت، بەڵام هیوادارم لەم ئاواییەماندا بمێنیتەوە.

موسا وتی: دڵنیابە لەوەی لێرە دەمێنمەوە.

کاهین وتی: ڕانە مەڕی کچەکەشم پێ دەبەخشم.

موسا وتی: پێویستم بەڕانە مەڕەکەی تۆ نیە، بەڕادەی پێویست زێڕم هەیە کە چەند ئەوەندەی مەڕەکانی تۆی پێ بکڕم.

کاهین لێی پرسی: ناوت چیە؟

موسا وتی: ناوم"موسا"یە.

کاهینیش لەدەوایەوە چەند جارێك ناوەکەی لەبەرخۆیەوە دوبارە کردەوە و لێی پرسی: ناوێکی ترت نیە؟

موسا وتی: تەنها یەك ناوم هەیە ئەویش"موسا"یە.

لەهەمان ئەو کاتەدا کچەکانی کاهین ماست و شیر و نانیان هێنا و هەمویان لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتن و"هباب"ی کوڕی کاهین لەوکاتەدا گەڕایەوە بۆ ماڵ.

کاهین بەکوڕەکەی وت: "هیاب"لەم ساتە بەدواوە کوڕێکی تازەم بۆ پەیدا بوو و ناوی"موسا"یە. دەیەوێت ببێتە هاوسەری"سفورە"، سبەی بۆ ئەم مەراسیمە چەند مەڕێك سەر ببڕە.

موسا وتی: ئەو کارە مەکە، خۆم مەڕ بۆ میوانداری و ئاهەنگی دەستگیران داری دەکڕم، تەنها ئەرکی سەربڕینی ئەو مەڕانە لەئەستۆ بگرن، هەروەها مەڕەکانیش لەخودی"چڕۆ"دەکڕم!کاهینیش بەم پێشنیارە ڕازی بوو و سبە ئەو ڕۆژە موسا مەڕەکانی کڕی و"هیاب"سەری بڕین بۆئەوەی خەڵکی ئاوایی بەشداری لەم ئاهەنگەدا بکەن.

# موسا و ژیانێکی نوێ

موسا زۆر لەماڵی "چژو"دا نەمایەوە، چونکە دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەریەتی لەگەڵ "سفورە"دا بڕیاری دا ماڵێك بۆ خۆی دروست بکات. لەو ناوچەیەدا کە لەدواییدا موسا زانی ناوی "میریان"ە ماڵێکی زۆری تێدا بوو، بەڵام ژیان لەماڵێکی ئاوا بچوك کە "موسا" هێشتا پێی ڕانەهاتبوو و بەوشێوەیەش بەلایەوە ئاسان نەبوو. بۆیە موسا دەستی بەدروستکردنی خانووەکەی کرد و "نون"ی نۆکەریشی ڕاسپارد ئەویش ماڵێك بۆ خۆیی دروست بکات.

نون لێی پرسی: بۆچی ماڵێك بۆ خۆم دروست بکەم؟

موسا وتی: تۆش وەك من دەبێت ژیانی هاوسەری پێك بهێنیت، دوای ژن هێنانیش پێویستت بەماڵ دەبێت، لەبەرئەوە پێشوەخت ماڵەکەت ئامادە بکە.

دوای ئەوە پێی وت: حەز دەکەیت ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچە گەورەکەی "چژو"دا پێك بهێنیت؟ ئەو لە "سفورە" بچوکترە و لەخوشکەکانی تریشی گەورەتر.

نون وتی: ناوێرم پێشنیارێکی ئاوا بکەم.

موسا وتی: بۆچی؟

نون وتی: لەبەرئەوەی کچە گەورەی "چژو" هاوسەری تۆیە و تۆ زاوای "چژو"یت، بۆیە من لەئاستێکدا نیم کە لەگەڵ تۆدا ببمە "ئاوەڵ زاوا".

موسا وتی: چەندجارێك ئەوەم بۆ دوپاتکردیتەوە کە من و تۆ براین. چیتر لەم ساتە بەدەواوە داستانی خاوەندار و نۆکەرەکەی فەرامۆش بکە. خۆم پێشنیاری ئەوەم لێکردی، لەبەرئەوە سەرەتا دەبێت ماڵەکەت دروست بکەیت دوای ئەوە بیر

لەژنهێنانیشت بکەرەوە. خەڵکی "میریان"ئەوپەڕی دڵسۆزیان بۆ"موسا"دەردەبڕی، بەڵام کەمێك دورەپەرێزیان لیّ دەکرد، چونکە نەیاندەتوانی خۆیان لەگەڵ ئەودا بەیەکسان تەماشا بکەن بۆیە هەستیان بەکەمایەتی خۆیان دەکرد، لەبەرئەوەی ئەوان "موسا"یان لەخۆیان بەداناتر و تواناتر دەزانی. "نون"یش باسی"موسا"ی بۆ خەڵکی"میریان"کردبوو. موسا بەیەکێك لە شازادە نایاساییەکانی بارەگای فیرعەون لەقەڵەم دەدرا. "هباب"ی ژن برای"موسا"زیاتر لەگەڵ موسادا دەڕۆشت بۆ ناو بیابان و پێکەوە گفتوگۆیان لەبارەی سەوزایی و گیاکان دەکرد، "موسا"ش بوبە شوان و مەڕی دەچراند٣٦. ڕۆژێکیان هەستی بەوە کرد کە گوێی لەدەنگێك بووە.

بۆیە بە"هباب"ی ژن برای وت: ئایا تۆ گوێت لەو دەنگە بوو؟

"هباب"گوێی گرت و وتی: نەخێر هیچ دەنگێکم بەرگوێ نەکەوتووە، مەگەر تۆ هیچ دەنگێکت بەرگوێ کەوتووە؟

موسا وتی: ئەم درەختە دەڵێت من"یەهود"م و دروستکەری تۆم!

"هباب"وتی: لەوانەیە باری تەندروستیت باش نەبێت و توشی خەیاڵپلاوی بوبێتیت. ڕۆژێکی هەمان پرسیاری لە"سفورە"ی هاوسەری کرد. "سفورە"ش کە لە"هباب"ی برای بیستبوو موسا لەبیاباندا گوێی لەدەنگێك بووە، بەبیستنی ئەو پرسیارە ڕۆچووە ناو هزری خۆیەوە و بیری لێکردەوە، بەڵام زۆر سەری لەم پرسیارە سوڕ نەما، چونکە لەو سەردەمەدا خەڵکی باوەڕێکی لەڕادە بەدەریان بە جادو و جادوگەری هەبوو و زمانی درەخت و کێو و تەپۆڵکەکانیان بەلاوە سەیر نەبوو. دانیشتوانی"میریان"بەبیستنی ئەوەی کێو و درەختەکان لەگەڵ"موسا"دا دەدوێن بەهیچ شێوەیەك بەلایانەوە سەیر نەبوو. ڕۆژێکیان دوای تێپەڕاندنی سێ شەو و ڕۆژ لەبیاباندا موسا گەڕایەوە بۆ ماڵ.

---

[36] چرا: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە بەواتای لەوەڕاندن دێت، کاتێك بزن و مەڕ دەبەیت بۆ لەوەڕاندن هەندێکات بەم کارە دەوترێت"چراندن"بەواتا لەوەڕاند یان کاتێك کارە بزنێکی تازە فێری گیا خواردن دەبێت دەڵێن-ئەم کارە چرا بووە-بەواتا فێری گیاخواردن و لەوەڕاندبووە، سەرەڕای ئەوەی ئێمە بۆ ئەم حاڵەتە زاراوەی لەوەڕاندمان هەیە ، بەڵام"چرا یان چراندن یان دەچرێنن"زمانێکی ڕەچەتە و پاراوی کوردیە و دەبێت لەفەوتان بیپارێزین و وەك مەرادیفی هەر زمانێکی تری ئەم جیهانە بەکاری بهێنین... ... وەرگێڕ

سفور پێی وت: بەدڵنیاییەوە زۆر برسی و ماندویت، خواردنت بۆ بهێنم.

موسا وتی: نەبرسیمە و نەماندوم. ئەمڕۆ بیستم لەبیاباندا درەختەکان دەیانوت: تۆ خوشك و براکانی خۆت کە لەمیسردا مردون فەرامۆش کردووە. دەبێت کارێك بکەم.

سفورە وتی: منیش پشتوانیت دەکەم.

موسا وتی: لەئێستادا نازانم کەی بڕیاری ئەوە بدەم بڕۆم بۆ میسر.

دوای چەند ڕۆژێك"سفورە" کوڕێکی بۆ موسا دەبێت و بەپێی ئەو دەنگەی بیستبوی ناوی"یەهود"ی لێنا، کوڕی دووەمیشی ناوی"گرشوم"ی لێنا، -گرشوم-واتای کەسێك دەگەیەنێت کە دەبێت لەوڵاتی بێگانە بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی.

ڕۆژێکیان موسا لەبیابان گەڕایەوە و پیرێکی کوێری لەماڵەکەی خۆیدا بینی.

سفورە وتی: ئەم پیرەمێردە بیستویەتی کە یەکێك لە نەژادەکانی ئیسرائیل لەم ئاواییەدا نیشتەجێیە، سەردانی کردویت بۆئەوەی هاوکاری بکەیت.

موسا لێی پرسی: ئەی پیاو، تۆ لەکۆیلەکانی وڵاتی"کوش"یت؟

پیرەمێرد وتی: ئایا تۆ"موسا"نیت؟

موسا وتی: بەڵێ من موسام.

پیرەمێرد وتی: من کوێرم و بیستم کە تۆ لە"میریان"نیشتەجێیت، هاتوم بۆ لات بۆئەوەی هاوکاریم بکەیت بۆئەوەی خۆم بگەیەنمە شاری"ئالاس".

موسا وتی: تۆ کە کۆیلە بویت بەچ شێوەیەك ئازاد کراویت.

پیرەمێرد وتی: ئەوان کۆیلەیەکی کوێریان ناوێت، "فیرعەون"یش ئەگەر نازانیت فیرعەون نیە.

موسا وتی: بەچ شێوەیەك فیرعەون نیە؟

پیرەمێرد وتی: توشی نەخۆشی تیراویٚ"جذام"[٣٧]بووە، ئەمە جۆرێك نەخۆشیە کە گۆشتی جەستەی مرۆڤ دەگەنێت و خۆی دەخواتەوە و چارەسەریشی نیە.

---

[37]جذام: خۆرە یان"داء الاسد"ی پێ دەوترێت. بەکتریای نەخۆشی-خورە یان تیراویٚ- زۆر لەبەکتریای نەخۆشی"سیل"دەچێت و لەساڵی ١٨٧٠ لەلایەن"هاسن"دۆزراوەتەوە و لەئاسیا و ئەفریقا و هەندێك شوێنی

موسا وتی: بەو شێوەی تۆ باسی دەکەیت لەوانەیە پزیشکەکانی میسر پێیان ڕاگەیاندبێت ئەم نەخۆشیەت هیچ چارەسەرێکی نیە.

پیرەمێرد وتی: بەڵێ وایان پێ وتووە، تەنها ڕێگەچارەی ئەم نەخۆشیە خوێنی منداڵە تازە لەدایك بووەکانە کە هەموو ڕۆژێك دوو منداڵی بۆ دەکەن بەقوربانی نەخۆشیەکەی و خوێنی ئەو منداڵانە بەسەر جەستەی فیرعەندا دەماڵن. ترس هەموو دایك و باوکێکی گرتوەتەوە چونکە کاربەدەستانی فیرعەون لەهەموو شوێنێك بەدوای منداڵدا دەگەڕێن. تاکە ڕێگایەك کە ڕێ لەم کارە بگرێت بەرتیل دانە بەکاربەدەستانی فیرعەون تا ئەوکاتەی تەمەنی منداڵەکانیان دەگاتە دوو ساڵی دوای ئەوەی هەڕەشەی مەرگیان لەکۆڵ دەبێتەوە. سەیر لەوەدایە ئەم منداڵانە بەئەنقەسەت لەوڵاتی "کوش" لەدایك و باوکیان زەوت دەکەن، هەر لەبەرئەوەش بەم تازەییانە هیچ کەسێك لە"کوش"دا ژیانی هاوسەری پێك ناهێنێت بۆئەوەی منداڵیان نەبێت و لەلایەن کاربەدەستانی فیرعەونەوە بفڕێنرێن و بیکەنە قوربانی خودی فیرعەون. وەچەی ئیسرائیل وردە وردە خەریکە بەتەواوی بنەبڕ دەبێت.

پیاوی نابینا وتی: تۆ کە "موسا"یت و بەهەموو توانایەکت بەرگری لەهاونەژادیەکانت دەکەیت، دەبێت کارێك بکەیت.

موسا وتی: تۆ لەکوێوە دەزانیت کە من ئامادەکاری و قوربانیەکی ئاوام تێدا بەدی دەکرێت.

پیرەمێردی کوێر وتی: ئەو ڕۆژەی لەکارگاکەی "نف"ی تەلارسازدا ئەو پاسەوانەی پیاوێکی ئیسرائیلی کوشت و تۆش بەمشتێك لەناوت برد لەوێ بوم، ئەو سەردەمانە هێشتا کوێر نەبوبوم، دوای ئەوەش پیاوێکی جادوگەر هات بۆ پایتەخت و وتی، تۆی لە فلان بیاباندا بینیوە، بەڵام هیچ کەسێك باوەڕی پێ نەکرد، هەر بەوشێوەیە بەبەردەوامی بەدوای تۆدا دەگەڕێن.

---

ئەورووپا و ئەمریکا بڵاوبووە و دەکرێت بەدوو بەشەوە: یەکێکیان هێماکانی بریتیە لە هەڵئاوسان و دومەڵێك بەڕەنگی "مس" لەسەر پێستی مرۆڤ دەردەکەوێت کە وردە وردە هەمان ئەو دومەڵە دەبێتە کیم و برین. بەشی دووەمی ئەم نەخۆشیە بریتیە لە پەڵەی سپی و بێهەستی هەندێك لەئەندامەکانی جەستە بۆ نمونە لوت و دەست و پێ کە جوانیەکەیان تێك دەدات و دواجاریش لەناوی دەبات. سوڕی شاراوەی زۆر درێژخایەنە لەوانەیە دە یان پانزە ساڵ بخایەنێت... سەرچاوە "فەرهەنگی عەمید"... وەرگێڕ.

موسا وتی: تۆ ڕاستە دەکەیت ئەو کاتە بوو کە من و"نون"لەپایتەخت هەڵهاتین.

پیاوی کوێر وتی: ناوی"نون"یشم بەلاوە نامۆ نیە، لەوانەیە ماوەیەك لەوەوپێش ئەم ناوەم بەرگوێ کەوتووە، ئایا ئەو"نون"ە نۆکەری تۆیە.

موسا وتی: برامە.

پیرەمێرد وتی: ئێستا"نون"لەکوێیە؟

موسا وتی: لەم ئاوایییەدا دەژیت.

پیرەمێرد وتی: ئێستاش کە دڵنیابوم لەوەی تۆ"موسا"یت، ئەوەت پێ ڕادەگەیەنم کە نەڕۆیت بۆ پایتەختی میسر چونکە لەهەموو شوێنێك بەدواتدا دەگەڕێن، ئێستا دەبێت بڕۆم بۆ"ئالاس" و تۆ دەبێت هاوکاریم بکەیت.

موسا وتی: تۆ بەکوێری ناتوانیت بڕۆیت بۆ"ئالاس". دەبێت گەشتیارێك هەبێت بڕوات بۆ"ئالاس" بۆئەوەی بتوانم تۆ پێ ڕاسپێرم لەگەڵ خۆیدا بتبات بۆ ئەوێ.

پیرەمێرد پێشنیاری"موسا"ی لا پەسەند بوو.

موسا دوای ئەوەی ئاگاداری چۆنایەتی بارودۆخی فیرعەون و بێبەزەیییەکانی بوو چیتر ئۆقرەی لێ بڕا و ڕێگای کێوی"سینا"ی گرتەبەر بۆئەوەی بەشکم دوباری ئەو دەنگە ببیستێتەوە.

موسا هەستی بەلەرزینێك کرد و بیستی دەنگێك پێی وت: من خوادای باوباپیرانی تۆم. من خودای "ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب"م

موسا سەری بەجلەکانی بەری داپۆشی و دوبارە بیستی هەمان ئەو دەنگە پێی وت: ئاگاداری بارودۆخی نەوە و خێڵی"ئیبراهیم"م و بڕیارم داوە ڕزگاریان بکەم، تۆ بڕۆ بۆ میسر و نەوەی"ئیبراهیم"لەمیسر دەربکە!

دوبارە هەمان دەنگ هاواری کرد: نەکەی لەفیرعەون بترسیت.

موسا وتی: بیستومە کە ئەگەری ئەوە هەیە مرۆڤ لەکێودا دوچاری خەیاڵپلاوی ببێت، بۆیە لەخۆم دەپرسم ئایا منیش دوچاری هەمان خەیاڵپلاوی بوم؟

هەمان ئەو دەنگە پێی وت: چیت بەدەستەوەیە؟

موسا وتی: گۆچانێك.

هەمان ئەو دەنگە پێی وت: گۆچانەکە فڕێ بدەرە سەر زەوی!

"موسا"ش گۆچانەکەی فڕێدایە سەر زەوی، یەکسەر دوای فڕێدان گۆچانەکە گۆڕا بە مارێکی زۆر مەزن، کە خودی"موسا"ش لەترساندا لێی هەڵهات،

هەمان دەنگ فەرمانی پێدا: کلکی مارەکە بگرە و بەرزی بکەرەوە، "موسا"ش هەمان کاری ئەنجام دا، و مارەکە دوبارە بویەوە بە گۆچان.

هەمان ئەو دەنگە نامۆیە وتی: بەخەڵکی ئیسرائیل بڵێ هاتویت بۆئەوەی ئەوان لەم نەهامەتیە ڕزگار بکەیت. ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی، لەبەرچاویاندا دوربارە گۆچانەکەی دەستت بگۆڕە بەمار بۆئەوەی بزانن کە گاڵتەیان لەگەڵدا ناکەیت.

کاتێك موسا گەڕایەوە بۆ"میریان"شەو لەنیوەش تێپەڕیبوو، بەڵام خەوی لێ نەدەکەوت تا ئەو کاتەی"نون"سەرلەبەیانیەکەی خۆی کرد بەژورەکەیدا.

نون پێی وت: گەورەم...

موسا قسەی پێ بڕی و وتی: ئەوە چەندجارێکە پێت دەڵێم پێم مەڵێ گەورەم، بەڵکو پێم بڵێ براکەم!

نون وتی: براکەم بۆچی وا ڕەنگ لەڕوتدا نەماوە؟ بەدڵنیاییەوە شتێکت بەسەردا هاتووە.

موسا وتی: دەبێت بڕۆم بۆ میسر.

نون وتی: بۆچی دەڕۆیت بۆ میسر؟

موسا وتی: چونکە خودای"ئیبراهیم و یەعقوب"فەرمانی پێداوم هەر ئێستا ڕێگای میسر بگرمەبەر.

لەمکاتەدا"سفورە"ی هاوسەری موسا خۆیی کرد بەژوردا و پرسیاری لێکرد چی ڕویداوە.

"موسا"ش وتی: ئەمڕۆ دەڕۆم بۆ میسر.

سفورە وتی: بۆچی دەڕۆیت بۆ میسر؟

موسا وتی: چونکە خودا فەرمانی پێداوم بڕۆم بۆ ئەوێ، هەر لەبەرئەوەش دەڕۆم.

سفورە وتی: کەواتە منیش لەگەڵ تۆ دێم.

موسا لێی پرسی: کێ سەرپەرشتی منداڵەکان بکات؟

سفورە وتی: منداڵەکانیش لەگەڵ خۆمدا دەهێنم.

نون وتی: منیش دێم و ژن و منداڵەکانیشم لەگەڵ خۆمدا دەهێنم.

# فیرعەون لەترۆپکی خوێنخواریدا

موسا و نون دوای بەجێهێشتنی ئاوایی"میریان" گەشتنە"کوش" و دوای ئەوە یەکسەر دەستیان بەگەڕان بەدوای پیاوەکانی فیرعەوندا کرد بۆئەوەی بزانن ئایا لەوێن یان نە. بۆیان دەرکەوت کە پیاوەکانی فیرعەون لە"کوش"دا نین. موسا و نون خۆیان گەیاندە لای خێڵی"لاوی" و داوایان لێکردن بەبیر و لاویانەوە کۆببنەوە.

دوای ئەوەی کۆ بونەوە نون وتی: ئێمە لە"میریان"بوین و موسا لەو ئاواییەدا ژیانێکی ئاسودەی هەبوو، بەڵام لەپێناو ڕزگارکردنی ئێوەدا ژیانی خۆی خستووەتە هەڕەشەوە.

دوای ئەو موسا وتی: کاتێك لەکێوی"سینا"بوم گوێم لەدەنگێك بوو کە پێی دەوتم دەبێت بێم بۆ ئێرە و خێڵی ئیسرائیل لەبەندایەتی ڕزگار بکەم.

یەکێك لەپیش سپیەکان وتی: دوای بیستنی دەنگی خودا، چ وەڵامێکت دایەوە؟

موسا وتی: بەخودام وت، پادشای میسر بەهێزە و من لاواز و بێ هێزی سەربازیم. ئەو ئەم بانگەشەیەی منی پەسەند نەکرد و وتی: بگرە هیچ کەسێکی تریش ئەمە پەسەند ناکات، بەڵام دەبێت بەشێوەیەك لەشێوەکان بۆیان بسەلمێنی کە لەلایەن خوداوە هاتویت. ئێستاش ئەگەر باوەڕم پێناکەن کارێك دەکەم باوەڕم پێ بکەن!

دوای ئەوە گۆچانەکەی دەستی فڕێ دایە سەر زەوی و گۆڕا بەمارێکی مەزن کە بووە هۆی ئەوەی هەمویان وشك بن و لەترساندا بلەرزن، دوای ئەوە کلکی مارەکەی گرت و بەرزی کردەوە و دوبارە بویەوە بەگۆچانەکەی دەستی.

ڕیش سپیەکان وتیان: زۆرباشە ئێشتا بەتەواوی باوەڕمان پێهێنایت، ئێستا تۆ دەتەوێت چ کارێکت بۆ ئەنجام بدەین.

موسا وتی: دەست لەخودا ساختەکانی هەڵگرن.

لەنێو پیاوە پیرەکاندا پیاوێك کە ناوی"کوراه"بوو سەرپێچی ئەو فەرمانەی کرد و وتی: ئەگەر موسا بانگەشەی ئەوە دەکات بەهەڵدانی گۆچانێك و گۆڕینی بۆ مارێك لەلایەن خوداوە هاتووە، کەواتە جادوگەرانی بارەگای فیرعەونیش کە شارەزای سەدان جادوی ئالەم شێوەیەن، بگرە مردووە مۆمیا کراوەکانیش دەهێننە قسە، یان مس دەگۆڕن بۆ ئاڵتون یان لەنێو ئاودا ئاگر دەردەهێنن، ئەی دەبێت چی بەوان بڵێین. کاری موسا لەچاو کاری ئەم جۆرە جادوگەرانەدا کەمترین بەهای هەیە، ئەوان مارەکەی ئەو لەکلکەوە قوت دەدەن. تۆ ئەی موسا بەم کارەتەوە ناتوانی خێڵی ئێمە لەشەڕی فیرعەون ڕزگار بکەیت. بارودۆخ زۆر لەوە خراپترە کە بیرت لێکردووەتەوە.

موسا وتی: من سورم لەئەندامدای کارەکەم و دەڕۆم بۆ بارەگای فیرعەون.

کوراه وتی: دەتەوێت چی بەفیرعەون بڵێیت؟

موسا وەڵامی دایەوە: بڕیاری خودای"یەعقوب و ئیبراهیم" پێ ڕادەگەیەنم.

کوراه وتی: تۆ بەم بڕیارەت بڕیاری مەرگی هەموومان دەردەکەیت.

موسا وتی: خودای یەعقوب لەگەڵ ئێمەدایە، بۆیە ئەو ناتوانێت بەهیچ شێوەیەك لەناومان ببات.

کوراه وتی: ئەگەر تۆ ئەوەندە دڵنیایت کە خودای"یەعقوب" پشت و پەنای تۆیە، بۆچی دەتەوێت ئێمە ببەیت بۆ میسر و لەوێ بەکوشتمان بدەیت؟

ئەوانی لایەنگری بۆچونی"کوراه"یان کرد و وتیان: ئێوە هەردوکتان بڕۆن، ئەگەر فیرعەون فەرمان کوشتن دەربکات، تەنها دوو کەس بەکوشت دەدرێن، نەك تەواوی خێڵی"لاوی".

موسا وتی: زۆرباشە من و نون دەڕۆین، دوای ئەوەی هەردوکیان خۆیان کرد بەنێو پایتەختی میسردا و ڕاستەوخۆ ڕێگای کۆشکی فەرمانڕەواییان گرتە بەر.

فیرعەونیان ئاگادار کردەوە کە دوو کەس بەنوێنەرایەتی خێڵی ئیسرائیل داوای چاوپێکەوتنی لێ دەکەن.

فیرعەون وتی: کۆیلەن.

دوای پرسیارەکەی بستی وتیان: وا دەردەکەوێت لەکۆیلەکا بن.

دوای ئەوە موسا و "نون"یان بردە لای فیرعەون. موسا و نون کە بەژن و باڵایەکی نامۆیان لەخۆ گرتبوو بۆیە نەیناسینەوە، ڕۆشتنە بەردەمی و سەری ڕێزیان بۆ دانەواند.

فیرعەون ئاماژە بە"موسا"دا و وتی: چیتا دەوێت؟

موسا وتی: ئێمە وەك نوێنەری خێڵی ئیسرائیل هاتوین بۆ لات بۆئەوەی لەوە ئاگادارت بکەینەوە کە بێ بنەما و بێ هیچ بەڵگەیەك بەپێی یاسا ئێمەتان کردووەتە کۆیلە ئەم وڵاتە.

فیرعەون وتی: ئێوە بەهەڵەدا چون، خێڵی"کوش"بەدیلی گیراون و بەپێی یاسای دیلی جەنگ وەك کۆیلەیەك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

نون وتی: ئەی فیرعەون، ئێمە لەخێڵێکین کە یەکێك لەباوباپیرانمان بەناوی"یوسف"نەتەوەی میسری لەبرسیەتی ڕزگار کرد. ئەگەر ئەو نەبوایە کە گەنمی بۆ کۆکردنەوە، ئێستا میسر لەبرساندا مردبوون. ئێمە لەجەنگدا بەدیلی نەگیراوین، بەڵکو ئەوە ئێوە بون لەناکاو هێرشتان کردە سەر وڵاتی"کوش". یاساکانی میسر هیچ کەسێك بەکۆیلە لەقەڵەم نادات، جگە لەو کەسەی کە لەجەنگدا بەدیلی دەگیرێت، یان دەست لەئاینی"ئامون"هەڵگرێت. ئەوە میسریەکانن کە"ئامون"پەرستن، بەڵام ئێمە"ئامون"پەرست نین.

فیرعەون بەبیستنی گوتەکانی"نون"هەڵچو و وتی: ئەگەر خێڵی"کوش" ئامون ناپەرستن، کەواتی چی دەپەرستن؟

دەستی بۆ موسا درێژ کرد و "موسا"ش وتی: خودای یەهود! قسەی لەگەڵدا کردم.

فیرعەون وتی: لەکوێ؟ لەچ کاتێکدا، بەچ زمانێك، هیچ کەسێك گەواهیت بۆ دەدات؟

موسا وتی: ئەو پێی وتم بێم بۆ لات و پێت بڵێم کۆیلەکان ئازاد بکەیت.

فیرعەون وتی: تۆ لەلایەن منەوە برۆ و بەخودای یەهود بڵێ فیرعەون کۆیلەکانی ئیسرائیل ئازاد ناکات. دوای ئەوە یەکسەر فەرمانی دا لەو ڕۆژە بەدواوە کاری کۆیلە ئیسرائیلیەکان زیاتر و قورستر بکات. هەروەها ئاگاداربن نەهێڵن بەهۆی کاری تاقەتبڕیانەوە هەوڵی هەڵهاتن بدەن. دوای ئەوە فەرمانی ئەوەشی دەرکرد، ئەو بڕە پیاوەی کە لەکارگای بەردتاشیندا کاردەکەن"هێرەق"یان لێ ببەستن و زەویان پێ بکێڵن، بۆئەوەی بەتەواوی شەکەت بن. بگرە فەرمانی ئەوەشی دەرکرد ژن و منداڵەکانی"کوش"کە تا ئەو ڕۆژە هیچ کارێکیان پێ نەدەکردن بێگاری بەوانیش بکەن. بارودۆخی کۆیلەکان لەجاران خراپتربوو، کۆیلەکان بەجەستەی نیوە ڕوتیانەوە لەبەیانیەوە تا ئێوارە سەختترین کاریان ئەنجام دەدا، هەندێك لەو کۆیلانەشیان بە"هێرەق"ەوە دەبەستەوە بۆئەوەی زەویان پێ بکێڵن، کاتێکیش لەڕاکێشانی"هێرەق"دا خاو دەبون دەستیان دەکرد بەلێدانیان بۆئەوەی وایان لێبکەن خێراتر"هێرەق"ەکە بەدوای خۆیاندا ڕاکێشن تا ئەو کاتەی گیانیان لەدەست دەدا. کاتێکیش ئەو کەسە گیانی لەدەست دەدا یەکێکی تریان دەخستە جێگەکەی و منداڵ و ژنەکانی خێڵی"کوش"یشیان لەکێڵگەکاندا دەخستە ژێر فشاری کارکردنەوە. بارودۆخی منداڵ و ژنەکان لەجاران خراپتر بوو، چونکە چاودێرەکان لەکاتی خۆرئاوابوندا بەهۆی ئەوەی کەسە پیر و منداڵ و ژنەکان کارێکی کەمیان ئەنجام داوە، دەیانخستنە ژێر باری ئەشکەنجەوە.

دوای ئەوە سێ لەکەسە بەتەمەنەکان بڕیاریان دا بۆگوزارش و سکاڵاکردن بڕۆن بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی فیرعەون، "راتامش و گورە و ئابی رام"ڕێگای کۆشکیان گرتەبەر و سکاڵای خۆیان گەیاندە لای فیرعەون و پێیان وت: ژن و منداڵەکانمان لەو ڕۆژەوەی بۆ کۆکردنەوەی "کا"دەڕۆنە کێڵگەکانەوە، چیتر فریای کاروباری ژیانی تایبەتی خۆیان و منداڵەکانیان ناکەون. هەموو ڕۆژێك لەسپێدەی بەرەبەیانەوە دەڕۆن و کاتێك ئاسمان تاریك دادێت دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ، هەرئەوەی هاتنەوە بۆ ماڵ لەماندویەتیاندا خەویان لێ دەکەوێت.

فیرعەون وتی: من بەئەنقەست ئەو فەرمانەم دەرکردووە، بۆئەوەی خێڵەکەتان ماوەیان نەبێت لەچوار دەوری یەکتری کۆ ببنەوە، هەروەها پێم وتن هەر بیانویەك بهێننەوە ئێوە بەقامچی لێیان بدەن، خۆم بە پاسەوانەکانم وتووە بەزەییان پێتاندا نەیەتەوە.

هەرسێ بەتەمەنەکە بەنائومێدی لەبارەگای فیرعەون ڕۆشتنە دەرەوە، لەوکاتەدا چاویان کەوت بە"موسا و نون" و گلەییان لەموسا کرد کە تۆ ڕۆشتی بۆ لای فیرعەون بۆئەوەی پەیامی"یەعقوب"ی پێ ڕاگەیەنیت بۆئەوەی ئەم خێڵە لەکۆیلایەتی ڕزگار بکەیت، بەڵام دەبینی کە ڕزگاریان نەبووە، بگرە بەو هۆیەوە ئێستا بێگاری بەمنداڵ و ژنەکانیشمان دەکەن. "هێرەق"یش دەبەستن لەهەندێك لەکوڕە لاوەکانمان و زەویان پێ دەکێڵن، بارودۆخ زۆر لەجاران خراپتر بووە. "نون"بەرگەی بیستنی سەرزەنشتی ئەو کەسە بەتەمەنەی نەگرت، بۆیە ویستی دەمەقرەیان لەگەڵدا بکات.

بەڵام موسا وتی: بێدەنگ بە، دوای ئەوە بە"نون"ی وت، ئەوان ڕاست دەکەن.

ڕۆژی دوایی موسا و نون بۆ جاری دووەم چاویان بەو سێ پیاوە بەتەمەنە ئیسرائیلیە کەوتەوە و...

موسا لێی پرسین: ئایا باوەڕ بەوە ناکەن کە خودا منی بۆ تۆقاندنی فیرعەون ناردووە.

ئەو سێ بەتەمەنە زۆر بەتوندی بەموسایان وت: ئێمە باوەڕمان بەشتی وانیە.

موسا وتی: ئەگەر خودا نەیویستایە بێم بۆ میسر ئەو توانایەی پێ نەدەبەخشیم.

ئەوان وتیان: ئادەی چ توانایەکت هەیە پێیان نیشان بدە، دەتەوێت بارەگا بەم مارەت بترسێنی؟ بەیەکەمین هەنگاوت ئێمەی چارەڕەشتر کرد، ئەگەر جارێکی تر سەردانی فیرعەون بکەیت، ئەمجارەیان فیرعەون فەرمانی کوشتنمان بۆ دەردەکات.

بەڵام فیرعەون ئامادە نەبوو بۆ جاری دووەم چاوی بە"موسا"بکەوێت و بەپاسەوانەکانی وت ڕێی پێنەدەن بێتە ژوورەوە.

بەڵام موسا وتی: دەمەوێت شتێك پیشانی فیرعەون بدەم. ئەو پەیامەیان بەگوێ فیرعەوندا چپاند، ئەویش فەرمانی دا ڕێی پێ بدەن بێتە ژورەوە.

دوای ئەوە بە"موسا"ی وت: چ شتێکت پێیە تا بۆ منی بسەلمێنی، تۆ لەلایەن خودای"یەهود"ەوە پەیامت بۆ هێناوم، ئادەی پێم پیشانی بدە.

موسا لەوکاتەدا گۆچانەکەی فڕێدایە سەرزەوی بو بەمارێکی مەزن، بەڵام فیرعەون لەباتی ئەوەی بترسێت دەستی کرد بەپێکەنین و وتی: ئەوە هەمان ئەو بانگەشەیەی تۆ بوو کە دەتویست بۆمنی بسەلمێنی؟

موسا وتی: بەڵێ!

لەوکاتەدا فیرعەون فەرمانی دا بەجادوگەرەکانی خۆی مارەکەی"موسا"قوت بدەن، جادوگەرەکانیش دەیان ماریان لەهەموو گۆشە و کەنارێکی ئەو کۆشکەوە نارد تا مارەکەی موسا بخۆن، بەڵام مارەکەی موسا هەموویانی خوارد.

فیرعەون وتی: ئێستا بۆم دەرکەوت کە تۆ جادوگەرێکی زۆر لێهاتویت و لەهەموو جادوگەرەکانی تریش شارەزاتری، ئایا ئامادەیت لەکۆشکەکەی مندا داتمەزرێنم و بەم تەردەستیانەت کاتی خۆشم بۆ فەراهەم بکەیت؟

لەمکاتەدا سەرۆکی کاهینەکان خۆی کرد بەژوردا و وتی: بەچ شێوەیەك ئەم پیاوە لەبەردەم فیرعەوندا باسی خودای "ئاتون"دەکات و خودای"ئامون"یش ڕەت دەکاتەوە؟

فیرعەون وتی: ئەم پیاوە باسی خودای"ئاتون"ی نەکردووە، بەڵکو باسی خودای"یەهود"ی کردووە.

کاهین وتی: نەوەك خودای"ئاتون"ی گۆڕی بێت بەناوی خودای یەهود.

فیرعەون وتی: تۆ زۆر باش دەزانی کە گۆڕینی ناوی خودا گۆڕانکاری بەسەر ناسنامەکەشیدا دەهێنێت، لەمکاتەدا سەرۆکی کاهینەکان بێدەنگ بوو.

لەمکاتەدا فیرعەون ڕویکردە موسا و وتی: ئێستاش بەڵێنی خۆت بەئامادە بونی کاهین ببەرە سەر.

سەرەڕای ئەوەی موسا بەهەمان ناوی پێشوی سەردانی بارەگای فیرعەونی کردبوو، بەڵام فیرعەون بەهۆی گۆڕانکاریە بێشومارەکانیەوە نەیتوانی"موسا"

بناسێتەوە، چونکە پێشتر جلێکی بەنرخ و ڕیشێکی تاشراوی هەبوو، بەڵام ئێستا گۆڕانکاری بەسەر ڕوخساریدا هاتووە و هیچ کەسێك ناتوانێت موسا بەو حاڵەوە بناسێتەوە.

فیرعەون لە"موسا"ی پرسی: مەبەستی ڕاستەقینەی هاتنت بۆ ئەم بارەگایە چی بوو؟

موسا وتی: ئازادی خێڵی ئیسرائیل و بەجێ هێشتنی میسر.

لەناکاو یەکێك لەکاربەدەستانی بارەگای فیرعەون تەماشایەکی"موسا"ی کرد و وتی: ئایا تۆ هەمان شازادەی میسر نیت؟

موسا کاتێك ئاگاداری ئەوە بوو ناسیویانەتەوە جگە لەلایەنگری کردنی ئەو پرسیارەی هیچ ڕێگەچارەیەکی تری لەبەردەستدا نەبوو.

فیرعەون وتی: تا ئێستا وام دەزانی یەکێکیت لەکەسایەتیە مەزنەکانی خێڵی ئیسرائیلی، بەڵام ئێستا زانیم کە"موسا" فەرماندەی گالیسکەوانی هێزی سەربازی خۆمانە! بۆچی وات لەخۆت کردووە؟

موسا وتی: لەبەرئەوەی شازادە نیم، لەدایك بونی من زۆر نهێنی ئامێزە، دایك و باوکم هەردوکیان ئیسرائیلین. فیرعەون بەبیستنی ئەم هەواڵە بەڕادەیەك خۆشحاڵ بوو کە ویستی داواکاریەکانی جێبەجێ بکات و ڕێی پێبدات ئیسرائیلیەکان ئازاد بکات و میسر بەجێ بهێڵن.

فیرعەون وتی: ئەگەر لەبەردەم کاربەدەستەکانی کۆشکدا ئەم گوتەیە دوبارە بکەیتەوە و هەموویان ئەوە ببیستن بەڕەچەڵەك ئیسرائیلیت، داواکەت جێبەجێ دەکەم.

"موسا"ش ڕازی بوو، فیرعەونیش لەڕێی پاسەوانەکانیەوە هەموو کاربەدەستەکانی بانگ کرد و"موسا"ی پیشانی ئەوانی تر دا و وتی: ئەم لاوە، هەمان"موسا"ی کوڕی"ئنخاس ئامون"ە، بەواتا وا باسیان دەکرد کە لەسکی ئەو بووە، بۆماوەیەکیش بو بە فەرماندەی گالیسکە سەربازیەکان، ئێستاش بەزمانی خۆی نەژاد و ڕەچەتەی خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات.

دوای ئەوە فیرعەون ڕویکردە موسا و وتی: نهێنی لەدایك بونت بۆ ئامادە بوان باس بکە.

"موسا"ش بەدەنگێکی بەرز وتی: من کوڕی"عمران"ی خەڵکی"کوش"م لەخێڵی"ئیسرائیل".

فیرعەون لێی پرسی: دایکت کێیە؟

موسا وتی: "جوشبد" ئەویش لەنەژادی"ئیسرائیل"ە و دانیشتوی وڵاتی "کوش"ە.

فیرعەون لێی پرسی: ئایا دایك و باوکت لەژیاندا ماون؟

موسا وتی: نەخێر کۆچی دواییان کردووە.

فیرعەون لێی پرسی: ئایا ڕوخساری دایك و باوکت دێتەوە یاد.

موسا وتی: من هەرگیز چاوم بەدایك و باوکی خۆم نەکەوتووە، چ بگات بەوەی ڕوخساریان بەبیر خۆم بهێنمەوە.

لەم کاتەدا فیرعەون ڕویکردە ئامادەبوان و وتی: هەمووتان بیستان چی وت؟ بیستتان وتی دایك و باوکی لەنەژادی ئیسرائیلە لەکاتێکدا ئێمە وامان دەزانی لەخانەدانەکانی فیرعەونە.

دوای ئەوە فیرعەون لێی پرسی: بەچ شێوەیەك بویت بەشازادە؟

موسا وتی: لەدایك بونم هاوکات بوو لەگەڵ ئەو سەردەمەی کە کاربەدەستانی فیرعەون منداڵە تازە لەدایك بووەکانی لە خێڵی"کوی"و"برزن"دەفڕاند، کوڕەکانیان دەکوشت و کچەکانیان بۆ خزمەتکردنی ماڵە میسریەکان بەدیل دەگرت، لەبەرئەوەی هیچ منداڵێك نەمابوو کە کاربەدەستەکانی دەستی بەسەردا بگرن، ناچار بون ماڵە داخراوەکانیش بگەڕێن، کار لەوەش تێپەڕی ئەمجارەیان ژنە سك پڕەکانیش کەوتنە ژێر باری هەڕەشەوە بۆئەوەی هیچ منداڵێك لەدایك نەبێت. لەبەرئەوەی دایك و باوکم نەیاندەویست کوڕەکەیان بەشێوەیەکی دڵتەزێن بەکوشت بدرێت، هەر لەبەرئەوەش خستیانە ناو سەبەتەیەکەوە و دایان بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، لەوکاتەدا"ئینخاس ئامون" لەگەشتێکیدا منی دۆزیەوە و بردیەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی و وەك کوڕی خۆی ناساندی بەوانی تر! ئینخاس ئامون نەزۆك

بوو. بۆیە بەبیانوی سوری سك پربونی بەساختەیی ئەو ماوەیەی لەدەرەوەی میسردا تێپەراند، دوای ئەوەی پێی راگەیاندن کە کورێکی بووە.

فیرعەون لێی پرسی: دوای ئەوە چی رویدا؟

موسا وتی: تەنها کەسێك کە ئاگاداری ئەم نهێنیەی من بوو کاهینی مەزن"ئامون تپ"بوو و هەر ئەویش نهێنی لەدایك بونی خۆمی بۆ گێرامەوە.

فیرعەون لێی پرسی: ئایا دەزانی"ئامون تپ"بۆچی ئەم نهێنیەی بۆ گێرایتەوە؟

موسا وتی: ئینخاس ئامون کە من هەمیشە وەك دایکی راستەقینە خۆم خۆشم دەویست لەگەڵ"ئامون تپ"دا دەیانویست ببمە جێنیشنی فیرعەون و ئاینی"ئامون"پەرستی لەناو ببەم و لەباتی ئەو"ئاتون"پەرستی زیندوو بکەمەوە.

هەر ئەوکاتەی ئامادە بوان گوێیان لەناوی"ئاتون"بوو وتیان: بروخێ"ئاتون"، نەفرەت لەئاتون.

فیرعەون وتی: ئێستا بۆتان دەرکەوت کە ئەم پیاوەی لەنەژادی ئیسرائیلە، باوکی ئیسرائیلی"عمران" و دایکی ئیسرائیلی"جوشبد"ە، دەبێت تەواوی ئەم قسانە بنوسرێتەوە و ئێوەش وەك گەواهیدەرێك لایەنگری بکەن. ئێستاش پێش ئەوەی ئەم فەرمانە دەربکەم، ئەگەر کەسێك پرسیارێکی هەیە بیکات.

یەکێك لەکاهینەکان پرسی: ئایا تۆ"ئاتون"دەپەرستی؟

موسا وتی: من یەهود پەرستم.

کاهین وتی: بۆچی بانگەشەی ئەوە دەکەیت؟

موسا وتی: چونکە ئەو توانایەکی پێ بەخشیوم تا بۆتانی بسەلمێنم.

کاهین وتی: ئێستا بۆمان بسەلمێنە.

لەهەمان ئەوکاتەدا موسا گۆچانەکەی فرێدایە سەرزەوی گۆرا بەمارێکی زۆر مەزن.

فیرعەون وتی: سەرەرای ئەو هەموو رووداوانە، مەحاڵە بتوانم خێڵی ئیسرائیل ئازاد بکەم، لەبەرئەوەی خێڵی ئیسرائیل کۆیلە میسرن و خاوەنیان هەیە و مافی خاوەنی کۆیلەکان کە کۆیلەکانیان کریوە پێشێل دەکرێت، کۆیلە بە بەشێك لەسەروەت و میراتی تایبەت لەقەڵەم دەدرێت، بۆیە ئەو مافەم نیە دەست لەسامان و

میراتی کەسانی ترەوە بدەم. گریمان کاربەدەستانی میسر کۆیلەکانیان ئازاد کرد، لەمکاتـەدا چ وەڵامێکـی خـودای ئـامون بدەمـەوە؟ بـەخودای"ئـامون" بڵـێم پیاوێـك خوداکەی داوای لێکرد خێڵی ئیسرائیل ئازاد بکات، ئەوکات منیش بەفەرمانی ئەو پیاوە تۆ کە خودای "ئامون"یت لەباخ و کێڵگە و چرە دارخورماکاندا دەرکرد؟ ئایا بەبۆچـونی تـۆ ئەمـە بـەکارێك دروسـت دەزانـی؟ بـەچ شـێوەیەك بـەئازاد کردنـی کۆیلـەکان، کاروبـاری کێڵگـە و باخـە خورماکـانی ئـوزیریس کـە خـودای مەرگـە پشتگوێ بخـەم، لەوانەیـە بتـوانم وەڵامـی خـودای"ئـامون"بدەمـەوە، بـەڵام نـاتوانم وەڵامی خودای"ئوزیریس"بدەمەوە.

موسـا وتـی: ئـەو خودایانـەی تـۆ باسـیان دەکـەیت، خوداگـەلێکی سـاختە و دەستکردن، خودی تۆ ئەم خودایانەی هێناوەتە بون و خۆدی خۆشت ملکەچیان بویـت و ئێـستاش لێیـان دەترسـیت. پەیکـەرێکت بـۆ خـودا تاشـیوە و قوربـانی پێشکەش دەکـەیت، سوژدەشـی بـۆ دەبـەیت، بـەڵام نـەتوت هـەموو ئـەم خودایانـە دروستکراوی هزری مرۆڤ و تۆیە.

فیرعـەون وتـی: بەڕاسـتی سـەیرە کەواتـە تـۆ بونـەوەرێکی ئاسمانیـت و ئێمـە نەمانزانیوە، بەچ شێوەیەك خوداکانی ئێمە بۆ نمونە خـودای ئامون دورستکراوی بیر و هـزری ئێمـەی مرۆڤـە، بـەڵام خـودای"یـەهود"لەبەرئـەوەی خـودای نـوێ و لاوە، لـەبیری "موسـا"یـەکی ئیسرائیلی کـە دەڵێیـت دروسـت کـراوی دەسـتی مـرۆڤ نیـە و نـازانم لـەکێوە سەرچـاوە دەگرێـت. ئەگـەر دەڵێیـت خـودای"ئـامون"سـاختەیە"ئـەوا خـودای"یـەهود"یـش دروسـتکراوی هـزر و هەندێـشە تۆیـە. تـۆ ئامـاژەت بـەوە دا درەخـت قسەی لەگەڵـدا کردویت. لـەنێو بیروبـاوەڕی ئێمـەدا ئـەوەی تـۆ باسـت کـرد جگـە لەئەفسانە هـیچ شـتێکی ترنیـە، هیـچکاتێك بانگەشـەیەکی ئـاوا مـەزن و دور لەڕاستی لـەنێو ئێمـەدا ڕوینـەداوە، کـە درەخـت قسەی لەگەڵماندا کردبێـت و بڵێـت: مـن خـودای"یـەهود و یـەعقوب"م بـڕۆ بـۆ لای فیرعـەون و پێـی بڵـێ کۆیلـە ئیسرائیلیەکان ئـازاد بکـات. ئەگـەر ڕاسـت دەکـەیت، بۆچـی خـودای یـەهود خـۆی نایەت ئازادیان بکات، ئەگەر ئەوانی خۆشدەوێت بۆچی هەر لەسەرتاوە ڕێیدا ببنە

کۆیلە، بۆئەوەی لەئێستادا ئیسرائیلیەك تكای ئازادبونیان لەمن بکات؟ فەرموو وەڵامم بدەرەوە.

موسا وتی: تۆ لەوباوەڕەدایت"ئامون" خودای خۆر، خودای خوداکانی ترە. ئێوە دەڵێن فیرعەون کوڕی ئەوە و لەبەرئەوەی فیرعەون کوڕی خۆرە، کەواتە فیرعەون خودی خۆرە، دەوای ئەوە دەڵێن ئەم فیرعەونی خۆرە زەوی ڕوناك دەکاتەوە، لەکاتی ئاوابونیشدا دەبێت و فیرعەونیش لەسەر زەوی شەوانە دەبێتە هۆی ئەوەی ژیان دروست ببێت، دەبێتە هۆی ئەوەی ڕوباری نیل هەڵنەچێت، کەواتە ئەم خودا بەهێزە چۆن ناتوانێت ڕێ لەمەرگی خۆی بگرێت؟ کاتێك فیرعەونێك دەمرێت بۆچی بگرە شەپۆلێکیش لەئاودا دروست ناکات؟ دەبینن کە فیرعەونیش وەك خەڵکانی تر وایە، بگرە لەهەندێ کاتدا لەخەڵکی ئاساییش لاوازترە.

ئەم گوتارەی بووە هۆی ئەوەی ئامادەبوان پەلاماری"موسا" بدەن، "موسا"ش پێشبینی ئەوەی کردبوو کە هێرشی بۆ دەبەن، بۆیە گۆچانەکەی فڕێدایە سەرزەوی و پەلاماردەرەکانیش لەترساندا کشانە دواوە. دوای ئەوە بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوچەیەدا کێشا.

موسا دوبارە هاتەوە دەنگ و وتی: هاتوم بۆئەوەی داوات لێبکەم خێڵی ئیسرائیل ئازاد بکەیت و بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان، بەڵام هەموو جارێك بیانویەکم بۆ دەهێنیتەوە و بەڵێنەکەت دەسپێری بەسبەی.

فیرعەون وتی: من چیتر ئامادە نیم لەمبارەیەوە هیچ شتێك ببیستم، تۆش کاتێك لێرە ڕۆشتی جارێکی تر نەگەڕێیتەوە. من تا ئەمرۆ تۆم بەجادوگەرێکی لێهاتو دەزانی، بەڵام لەم ساتە بەدواوە بەپیاوێکی بەدڕەوشتت دەزانم، ئەگەر جارێکی تر بێیتەوە بۆ ئێرە، ئەوا بەدڵنیاییەوە سەری خۆتت لێ زیادەیە.

"نون"لەدەرەوەی کۆشکی فیرعەون بە"موسا"ی وت: لەمیسر کۆچ دەکەین و لەبیاباندا کار دەکەین، کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کارگەلێکی پڕ بەرەکەتە.

نون وتی: دەبێت بۆ ئەم مەبەستەمان بڕۆین بۆ شوێنێکی سەوز و ئاودار.

موسـا وتـی: "کـەنعان"باشـترین شـوێنە، بـەڵام سـەرەتا دەبێـت خێڵەکـەمان لەبەندایەتی ڕزگار بکەین، هەرچەند فیرعەون هەڕەشەی لێکردین و وتی، کۆیلەکان ئـازاد ناکـات، بـەڵام فـەرمانی دا ژن و منداڵـەکان ئـازاد بکـرێن، بۆئـەوەی بەشکم"موسا"میسر بەجێ بهێڵێت و چیتر نەگەڕێتەوە بۆ ئێرە، چونکە بەجۆرێك لەمارەکەی موسا ترساو و تۆقاوە بەڵام لەڕوکاردا وا خۆی نەدەنواند کە ترساوە.

خەڵکی کاتێك ئازادی ژن و منداڵەکانیان بیست، زانیان کە شتێك ڕویداوە و بەو هۆیەوە فیرعەون دەستی لەسوربونەکانی هەڵگرتووە، تا ئەو ساتە خەڵکی میسر ژن و منداڵـە ئیـسرائیلیەکانیان لـەڕیزی ئاژەڵـدا لەقەڵـەم دەدا، ئـەو ئاژەڵانـەی کـە بـۆ قامـچیکار و کـارکردن دروسـت بـوون، بگـرە بیریـشیان لـەوە نـەدەکردەوە کـە ئیـسرائیلیەکان لەبەرامبـەر منداڵەکانیانـدا هەسـت بەدایکایـەتی دەکـەن، چـونکە ئەوانیان بە گیانەوەرێکی دزێو لەقەڵەم دەدا. بەڵام دوای فەرمانی ئازادکردنی ژن و منداڵـەکان بۆچونیان گۆڕا، تـا ئـەو سـاتە خێڵـی ئیسرائیل ناومـاڵی میسریەکانیان بەچاوی خۆیان نەبینیبوو. کۆیلەکان لەناو ئاش و باخ و کێڵگەکاندا کاریان دەکرد، لەبەیانیەوە تا ئێوارە تەنها کارێکیان دەکرد و شـەویش لـەنزیك شـوێنی کارەکـەیان دەخـەوتن. دوای بەدەسـت هێنـانی ئـازادی ژن و منداڵـەکان، موسـا هەوڵیـدا ئـازادی پیاوەکانیش بەدەست بهێنێت.

لەشارە مەزنەکانی میسردا کـەم کـەم ڕێیـان دا بەکۆیلـە ئیسرائیلیەکان بچنە نـاو ماڵەکانیانـەوە. ئـەو کۆیلانـەی بۆیەکـەمین جار ئاشـنای ژیـانی میـسریەکان بـوون و لەگەڵ ژیانە نەگبەتبارەکەی خۆیاندا بەراوردیان دەکرد و بووە هـۆی ئـەوەی زیاتـار پەی بە بەشمەینەتی خۆیـان ببـەن. کۆیلـەکان لـەدوای ئـەم قۆناخـەوە خۆیـان زۆر بـە بەدبـەختر لـەجاران دەزانـی. ڕەوتـی ئـازادی کۆیلـەکان ئـەو مژدەیـەی لەخۆیـدا هـەڵگرتبوو کـە سـەرئەنجام ڕۆژێـك دێـت ئـەوانیش ئـازاد دەبـن، بـەڵام دوای ئـەوەی چاویان بەماڵە میسریەکان کەوت و بینیان ژیانێکی تـەواو جیاوازیـان هەیە، بیریـان لەوە کردەوە کـە بەدەسـتی خـاڵی لەمیسر نەگەڕێنـەوە، ئـەوان دەیـانوت بەشێك لـەم سامانانەیان بەرهەمی دەستڕەنجی ئەرك و ماندوبونی ئەوانە. ئیسرائیلیە کۆیلـەکان لەمیسردا زۆرباش ئاگاداری ئەوەبوون کە توانای ئەوەیان نیە بـەزۆر دەست بەسـەر

سەروەت و سامانی میسریەکاندا بگرن، چونکە یەکەم موسا زۆر لایەنگری ئەم جۆرە ڕەفتارانەی نەدەکرد، دووەم لەبەرئەوەی میسریەکان بەهێزبون و ولاتەکەشیان یاسا و بڕیاری تایبەت بەخۆی هەبوو و میرات و سامانیش بەهەمان شێوە خاوەنی یاسایەکی تایەبەت بەخۆیەتی و هیچ کەسێك ڕێی پێ نەدەدرا بەزۆر دەست بۆ سامان و مافی هیچ کەسێکی تر درێژ بکات. دوای ئەوەی فیرعەون بڕیاری ئازاد کردنی ژن و مندالە ئیسرائیلیەکانی دا، ڕەفتاری پاسەوانەکانیش لەکێلگە و کارگاکاندا لەبەرامبەر کۆیلەکاندا گۆڕا و لەکارگاکاندا پاسەوانەکان نەك تەنها ڕێیان دەدا بەکۆیلە ئیسرائیلەکان دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ کەمێك بحەوێنەوە، بەلکو بۆ خێرا ئەنجامدانی کارەکانیش زۆر فشاریان لێ نەدەکردن. وردە وردە ئەم مامەلە و ئاسانکاریە بوو بەهۆی ئەوەی کۆیلەکان لەدوانیوەڕۆدا هیچ کارێك ئەنجام نەدەن و کاتێکیش پەییان بەوەبرد دەتوانن بەمانگرتن لەکارکردن قسەی خۆیان بەسەر پاسەوانەکاندا بسەپێنن، هەولیاندا لەبەرامبەریاندا بێشەرمیەکی زیاتر بنوێنن. ئەم هەوالەیان بەفیرعەون گەیاند و فیرعەونیش فەرمان دا سەرەڕای ئەوەی کارناکەن بەلام ژەمە خۆراکی خۆیان پێ بدەن. لەو ساتە بەدەواوە پاسەوان و چاودێرەکان دوچاری گرفتێکی زیاتربون، چونکە ئەو کرێکارانەی ئیسرائیلی نەبوون نارەزایی خۆیان دەردەبڕی و دەیانوت کۆیلە ئیسرائیلیەکان سەرەڕای ئەوەی نیوەکار دەکەن بەلام ژەمی خواردنیان بەتەواوی پێدەدەن. چاودێرەکان بۆ ڕێگرتن لەزۆر خۆری ژەمە خۆراکی کویلە ئیسرائیلەکانیان لەدەرەوەی کارگاکە پێدەدان بۆئەوەی ئەوانی تر چاویان پێی نەکەوێت. لەشارە مەزنەکاندا ئەو کۆیلە یەهودیانەی بێکاربون، هەندێجار میسریەکان میوانداریان دەکردن و لەگەڵ خانەخوێدا لەسەر یەك سفرە دادەنیشتن، بەلام لەشارە بچوکەکاندا هیچ کەسێك میوانداری کۆیلە ئیسرائیلیەکانی نەدەکرد، چونکە باری ئابوریان وەك خەلکی شارە مەزنەکان نەبوو، لەبەرئەوە ئەو کۆیلانەی لە شارە بچوکەکاندا نیشتەجێ بون تەنها حکومەت ژەمی خواردنی بۆ فەراهەم دەکردن، سەرەڕای ئەوەی ئەو ژەمە خواردنە بەتەواوی تێری نەدەکردن.

لەشاری"یلوە"ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لەو کۆیلانەی بێکاربون هێرشیان کردە چێشتخانەیەکی ناوبازاڕ و هەموو ئەو خواردنانەی لەو فرۆشگایەدا لێنرابوو خوارد، دوای ئەوە شەڕێکی سەخت لەنێوان ئەوان و خاوەنی فرۆشگا و شاگردەکەیدا ڕویدا و بوبە هۆی برینداربونی شارگرد و کوشتنی خاوەن فرۆشگاکە و بەهۆی ئەم ڕوداوەوە سبەی ئەو بەیانیە خاوەنی هیچ چێشتخانەیە ئامادە نەبوو لەشاری"یلوە"دا فرۆشگاکەی بکاتەوە، دادوەری"یلوە"گوزارشتنی هێرشی ئیسرائیلەکانی ڕەوانەی پایتەخت کرد و ئەوەی تێدا ڕونکردبویەوە کە لەترسی هێرشی ئیسرائیلیەکان هیچ کەسێك ناوێرێت فرۆشگاکەی بکاتەوە. فیرعەونیش لێکۆلەری تایبەتی خۆی ناردە شاری"یلوە"بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی هۆکاری ئەو هێرش بردنە بکات و کەسێکیشی نارد بەدوای"موسا"دا بۆئەوەی سەردانی کۆشکی فەرمانڕەوایی فیرعەون بکات. موسا وتبویی چیتر بەهیچ شێوەیەك سەردانی کۆشکی فەرمانڕەوایی ناکات، بۆیە"نون"ی نۆکەری نارده لای فیرعەون.

فیرعەون وتی: بەموسا بڵێ من بۆ هاوکاری کردنی ئیسرائیلیەکان ژن و منداڵەکانیانم ئازاد کرد و چیتر کاریان پێناکەم و لەگەڵ کۆیلەی کارگا و کێڵگەکانیشدا زۆر سەختگیر نەبن، بەڵام کۆیلەکان لەشارەدا ڕاپەڕیون و بونەتە هۆی نائارامی شار، دەمەوێت فەرمان دەربکەم بارودۆخ بگەڕێتەوە باری جارانی خۆی.

نون وتی: بەپێی گوزارشتی کۆیلەکان لەشاری"یلوە"دا هێرشیان کردووەتە سەر چێشتخانەیەکی ناوبازاڕ و هەموو خواردنەکانیان خواردووە، ئەوانە مەبەستیان ئاژاوە نانەوە نەبووە، بەڵکو برسیەتی فشاری بۆهێناون و دەستەڵاتی خۆیان لەدەستدا نەماوە، لەبەرئەوە تاوانێکی مەزنیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو ویستویانە غەریزەی برسیەتیان تێر بکەن. ئەگەر ئەمانە لەناوچەکانی تردا بۆ دزینی شتومەکی تایبەت پەلاماری فرۆشگاکانی تریان بدایە لەمکاتەدا دەتوانیت بڵێیت بەڕاستی تاوانێکیان ئەنجام داوە و شایستەی سزادانن.

فیرعەون وتی: ئەمانە دەبێت بەیەك شێوە و بەپێی ئەو بڕەی بۆیان دیاری کراوە نان بخۆن.

نون وتی: لەمحاڵەتەدا دەبێت سەرت لەمجۆرە ڕوداوانە سوڕ نەمێنێ، زیادکردنی بڕە ژەمی خۆراکی کۆیلەکان ڕێ لەدوبارە بونەوەی ئەم جۆرە کارانە دەگرێت.

لەمکاتەدا فیرعەون گوتەی"نون"ی بەلۆجیك زانی، بۆیە فەرمانی دا ڕێژەی ژەمی خواردنیان بۆ زیاد بکەن.

بەڵام بەبینینی ماڵی میسریەکان و شێوازی ژیانیان و بە بەراوردکردنی لەگەڵ بەشمەینەتیەکانی خۆیاندا هۆکارێکی زۆر بەهێزبوو بۆ بزواندن و هاندانی ئەوان، بۆیە لەیەکێك لەگەڕەکە دۆڵەمەندەکاندا هێرشیان کردە سەر ماڵێك! ئەم ڕوداوە لەشاری"کوم"ڕویدا. فیرعەونیش دوبارە"موسا"ی بانگ کردەوە و "موسا"ش نونی ناردە لای فیرعەون.

فیرعەون وتی: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە فەرمان دەربکەم هەموو دزەکان لەسێدارە بدەن، بۆئەوەی چیتر هیچ کەسێکی تر نەوێرێت هەوڵی ئەنجامدانی کارێکی ئاوا بدات، هەروەها بڕیاری ئەوەش دەدەم هەموو کۆیلەکان بهێنن بۆ پایتەخت، بۆئەوەی لەژێر چاودێری خۆماندا بن. "نون"یش نەیتوانی نکوڵی لەم بڕیارەی بکات.

لێرەدا ئەم کارەی فیرعەون زیانی بەخۆی گەیاند، چونکە کۆبونەوەی ئەو هەموو کۆیلەیە لەیەك شاردا، دەبێتە هۆی یەکێتی و پەیوەستبونی کۆیلەکان بەیەکتری، ئەوە لەبەرژەوەندی فیرعەوندا بوو کە ڕێی بدایە لەمیسر بڕۆنە دەرەوە، بەڵام دوو ڕێگر بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان لەبەردەم فیرعەوندا بوو، یەکەم: ناڕازی بونی کاهینەکان، دووەم: جێ بەجێکردنی داواکەی موسا. بۆیە فیرعەون یەکسەر کاهینی مەزنی بانگ کردە لای خۆی بۆئەوەی لەمبارەیەوە ڕاوێژی لەگەڵدا بکات.

فیرعەون لەدواییدا فەرمانی دا بە"ممفسد"فەرمانڕەوای پایتەخت: دوای ئەوەی ئیسرائیلیەکانمان لەپایتەختدا کۆکردەوە لەیەك شوێندا نیشتەجێیان بکە بۆئەوەی بەتەواوی لەژێر چاودێری خۆماندا بن، هەروەها بەپێی پێویست ژەمە خۆراکیان بدەرێ، چەند سەربازێکیش بۆ پاسەوانیان دەستنیشان بکە بۆئەوەی نەوەك هەوڵی هەڵهاتن بدەن.

"مەفسد"وتی: لەکۆتاییدا هەر دەبێت داوای ئەم جادوگەر جێبەجێ بکەین بۆئەوەی لەمیسر دەربچن، بۆچی لەخۆڕا خواردنیان پێ بدەین و تواناکانمان لەپێناویاندا بخەینە گەڕ، بۆیە پێم باشە ئازادیان بکەیت بۆئەوەی خۆشت ئازاد بیت یان فەرمانی کوشتنی هەموویان دەربکەن!

فیرعەون وتی: بەبۆچونی من کە فیرعەونم، بەلامەوە زۆر ژیرانەیە کە گوێڕایەڵی لەگوتەکانی ئەم جادوگەرە بکەین .

ئەویش قسەکەی خۆی هێنایە دی و وتی: من کە کوڕی"ئامون"م و پێست و گۆشت و ئێسقانم لە"ئامون"ە، و خوێنی"ئامون"لەخوێنبەرەکانمدا دەخرۆشێت، لەڕاستیشدا من خودی"ئامون"م، کەسێکم کە وای لەنیل کرد بەوشێوەیە بخۆرشێت، هەروەها باڵی بە باڵندەکان بەخشی و گیانەوەر و ماسیەکان لەڕوباری نیلدا مەلە بکەن، من فیرعەونم.

بۆیە ئێستا بەو هەموو توانایەوە بەچ شێوەیەك بەرگەی ئەوە بگرم کەنیزەك زادەیەکی جادوگەر و کۆمەڵێك کۆیلەی بێ نرخ وام لێ بکەن کارێکی ئاوا ئەنجام بدەم کە پێچەوانەی ئارەزووەکانم کارێك ئەنجام بدەم...

لەمکاتەدا ئەم هەواڵەیان بە فیرعەون گەیاند: موسا دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت.

پرسی: نون یان موسا؟

پێیان وت: خودی موسا.

# کۆیلەکان میسر بەجیٚ دەهێڵن

کاهینی مەزن و فەرمانڕەوایانی پایتەخت کە لەچواردەوری فیرعەوندا دانیشتبوون کاتێك بیستیان موسا دەیەوێت چاوپێکەوتن لەگەڵ فیرعەوندا بکات مۆڵەتی دەرچونیان لەفیرعەون وەرگرت.

بەڵام فیرعەون وتی: ئێوەش لەم چاوپێکەوتنەدا ئامادەبن، بۆئەوەی گوێتان لەگوتەکانی فیرعەون بێت.

موسا بەتەنها هات بۆ لای فیرعەون، ئەو ڕۆژە"نون"ی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو.

فیرعەون لێی پرسی: مەگەر نەتوت چیتر پیٚ نانێیتە ئەم بارەگەیەوە؟

موسا وتی: تا دوێنێش نەمویست پیٚ بنێمە ئەم بارەگەیەوە، هەر لەبەرئەوەی لەباتی خۆم"نون"م دەناردە لات، بەڵام ئەمڕۆ خودای یەهود فەرمانی پێدام سەردانی بارەگاکەت بکەم و لێت بپرسم بۆچی هەموو ئیسرائیلیە کۆیلەکان دەگوازیتەوە بۆ پایتەخت؟

فیرعەون بەسەرسوڕمانێکەوە پرسی: تۆ بەچ شێوەیەك ئاگاداری ئەمە بویت؟ تائێستا تەنها فەرمانڕەوای ئەم شارە ئاگاداری ئەم فەرمانەی منە، هەروەها کاهینی مەزنیش دەزانێت.

موسا وتی: ئەم بابەتە خودای یەهود پێی ڕاگەیاندم، هەر لەبەرئەوەش هاتوم پرسیاری هۆکارەکەیت لیٚ بکەم.

فیرعەون وتی: ئەگەر خودای تۆ ئاگاداری ئەوە بێت دەمەوێت کۆیلە ئیسرائیلیەکان بگوازمەوە بۆ پایتەخت، ئەی کەواتە بۆچی هۆکارەکەشی پیٚ ڕانەگەیاندیت، ئەگەر بتویستایە ئەوا لەخودای خۆت دەپرسی بەدڵنیاییەوە ئەویش دەزانێت.

موسا بەگوتەیەی فیرعەون زۆر دڵگرانبوو، چونکە گوتەکەی فیرعەون لۆجیکی بوو و پێویستی بەوە نەدەکرد بێت و هۆکارەکەی لەفیرعەون بپرسێت.

موسا وتی: تەنها فەرمانی خودای خۆم جێبەجێ دەکەم و کارم بەفەلسەفەی کار و پرسیارکردنەوە نیە، خوداکەم وتی: فیرعەون کۆیلە ئیسرائیلیەکانی لەپایتەختدا کۆکردووەتەوە، بڕۆ هۆکارەکەی لێ بپرسە، ئێستاش دەمەوێت وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە، بۆچی؟

فیرعەون وتی: چونکە هاونەژادەکانت جگە لەدەردیسەری هیچ شتێکی تریان نیە پێشکەشی منی بکەن، سەروەت و سامانی خەڵکی تاڵان و پەلاماری چێشتخانەکانی ناوشار دەدەن، لەبەرئەوەش لەپایتەختدا کۆم کردونەتەوە بۆئەوەی بتوانین چاودێریان لێ بکەین.

موسا لێی پرسی: خۆم پرسیارێکت لێدەکەم.

فیرعەون وتی: بپرسە.

موسا وتی: بۆچی ڕێنادەیت ئەم ئاژاوەگێڕانە بڕۆن و تۆش خۆت لەنەهامەتیەکانیان ڕزگار بکەیت. پێم بڵێ بۆچی ئەو کارە ناکەیت؟

فیرعەون وتی: هەر ئەم کۆکردنەوەیە لەپایتەختدا پێشەکی دەرکردنی تۆیە لەمیسر، دان بەخۆتدا بگرە تا نۆرەی قۆناخی دووەمیش دێت.

موسا لێی پرسی: تا کەی دان بەخۆمدا بگرم؟

فیرعەون وتی: هەر دوانزە خێڵەکەی تۆ هەریەکەیان خواستێکی جیاوازیان هەیە، دەبێت ئەم خواستانە دەستنیشان بکرێن، دوای ئەوە میسر بەجێ بهێڵن.

موسا وتی: لەوەیاندا لایەنگریت دەکەم کە هەر دوانزە خێڵەکەی ئیسرائیل خواستێکی جیاوازیان هەیە، بەڵام لەسەروی ئەمانەوە هەمویان ئارەزویەکیان هەیە، ئەویش بەجێ هێشتنی میسرە. ئەگەر تۆ ڕازی بیت بەوەی میسر بەجێ بهێڵن، ئەوا گرفتەکانیشیان لەناو دەچن.

فیرعەون وتی: لەمبارەیەوە ڕاوێژ لەگەڵ سەرۆك خێڵەکاندا دەکەم، ئەگەر هەموویان ڕازی بون بە بەجێ هێشتنی میسر، ئەوا تۆ ڕاست دەکەیت.

بۆ بەیانیەکەی بەفەرمانی فیرعەون لەدەرەوەی پایتەختدا شوێنێکیان بۆ کۆکردنەوەی خێڵی ئیسرائیل لە"کناریش"دەستنیشان کرد، بۆئەوەی هیچ نەبێ بۆماوەیەکی کاتیش بێت تێیدا نیشتەجێ بن.

ڕیش سپییەکانی خێڵی ئیسرائیل دڵگرانی ئەوە بون کە لەپایتەختدا کۆکراونەتەوە بۆیە بەدڵگرانیەوە پەلاماری"موسا"یان دا و بەدەنگێکی بەرز پێیان وت: بارودۆخی ئێمە بەهۆی تۆوە لەشارە بچوکەکان خراپتر بووە! بۆچی بەم داوایەت ئێمەت دوچاری ئەم سەرئێشە و ئاوارەییە کردووە؟

موسا وتی: چ گرفتێکتان هەیە؟

ئیسرائیلیەکانیش وتیان: لەئیسرائیلی خۆمان ئاسودەتر بوین، ئێمە هەموو جرێك خۆراك و دانەوێڵەمان هەبوو، ئێستا دەبێت هەموو ڕۆژێك یەك جۆر خواردن بخۆین"پاقلە و ماسی هەرزان بایی".

موسا وتی: پێم دەڵێن ئێستا چیتان بۆ بکەم؟

ئەوانیش وتیان: زەوی بۆ کشتوکاڵ.

موسا وتی: گواستنەوەتان بۆ پایتەختی میسر ئەوە ناگەیەنێت کە ئێوە میسرین، ئەمە تەنها پێشەکیەکە بۆ دەرچونی ئێوە لەمیسر نەك نیشتەجێ بونتان.

نیشتەجێ بونی ئیسرائیلیەکان لەکەنار ڕوباری نیل بەپێچەوانەی تێڕوانینەکانی موسا زۆری خایاند و ئەوانیش ناچاربون دەست بەکشتوکاڵ کردن بکەن بۆئەوەی بەرهەمێکی زیاتر بەدەست بهێنن، ئەوان لەکەنار ڕوباری نیل نیشتەجێ بون و بارودۆخیان بەڕادەیەك باش بوو کە چیتر ئامادە نەبون پایتەخت بەجێ بهێڵن. کاتێکیش هەموویان کۆ بونەوە و پێیان وتن مەگەر ناتانەوێت میسر بەجێ بهێڵن؟ و چی بووە هۆی ئەوەی لێرە نیشتەجێ بن؟

ئیسرائیلیەکان وتیان: پێشتر حەزمان دەکرد بڕۆین، بەڵام ئێستا بارودۆخمان بەوشێوەیەش خراپ نیە، بۆیە حەز دەکەین لێرە بمێنینەوە.

یەکێك لەکەسە بەتەمەنەکان وتی: ئەی موسا، ئێستا هەلومەرجمان لەڕابردوو جیاوازترە، لەڕابردوودا کۆیلە بوین، بەڵام ئێستا خۆمان خاوەنی خۆمانین و زۆریش بەئاسودەیی دەژین و سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین.

موسا وتی: سەرەڕای ئەو هەموو شتەش دەبێت میسر بەجێ بهێڵن و بڕۆن بۆ وڵاتی"کەنعان"، ئەمە فەرمانی"یەهوە"یە، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت سەرپێچی لەفەرمانەکانی بکات.

ئیسرائیلیەکان وتیان تۆ داوا لە"یهوە"بکە ئێمە لەهەمان ئەم شوێنەدا جێگیر ببین.

موسا وتی: ئەوە فەرمانی خودایە، من ناتوانم بەخودا بڵێم چی بکات.

بەهەرحاڵ "موسا و نون"ڕێگای کێوی ڕوناکی کە زۆر لەوشوێنەوە دور بوو گرتەبەر و لەکۆتاییدا بڕیاردرا خێڵی ئیسرائیل لەمیسر دەربکرێن، دوای دەرچونیان ڕۆشتنە ناوچەیەك بەناوی"ئەریحا"کە دەکەوێت وڵاتی"کەنعان" و لەوێدا نیشتەجێ بون.

شاری بەناوبانگی"ئەریحا"کە لەچاخی بەردیندا دروستکراوە، دەکەوێتە باکوری"دەریای مردوو"ەوە و خێڵی ئیسرائیل بەزۆر دانیشتوانی ئەو ناوچەیەیان دەرکرد و خۆیان لەجێیاندا نیشتەجێ بون. ئەوکاتەی خێڵی ئیسرائیل شاری"ئەریحا"یان لەدانیشتوانی سەرەکی و خاوەنەکانی زەوت کرد، "موسا" چیتر لەژیاندا نەبوو، بەڵکو پیاوێك بەناوی"یوشع" ڕابەرایەتی ئەو خێڵەی گرتە ئەستۆ، ئەم"یوشع"ە بوو فەرمانی دا بەئیسرائیلیەکان هێرش بکەنە سەر شاری"ئەریحا"و داگیری بکەن و تێیدا نیشتەجێ بن.

ئایا "موسا و نون"دوای ئەوەی گەشتنە ئاوایی"مریان" چیان کرد، گەڕانەوە بۆ لای خێزانەکانیان یان نە لەمبارەیەوە هیچ زانیاریەکی ئەوتۆ نیە، ئەوەی باسکراوە ئەوەیە کە"موسا و نون"ڕۆشتون بۆ شاخێك بەناوی"کێوی موسا"، موسا"نون"ی لەبنار ئەو کێوەدا بەجێ هێشت و خۆی ڕۆشتە ناو ئەشکەوتێکەوە و هاواری کرد: ئەی"یەهوە"وەڵامم بدەرەوە بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟

لەوکاتەدا بیستی هەمان ئەو دەنگە پێی وت: هەرکاتێك ویستت گوێت لەدەنگم بێت دەبێت بێیت بۆ ئێرە. بڕۆ خێڵی ئیسرائیل لەژێر هەڕەشەی لەناوچاوندایە و بەمزوانە فیرعەون لەناویان دەبات.

فیرعەون گەڕایەوە بۆ لای کۆیلەکان و پەیامی خودای یەهودی پێڕاگەیاندن.

ڕیش سپیەکانیش سەرپێچیان لەڕۆشتن کرد و داوایانکرد ماوەیان بدات تا ئەوکاتەی بەروبومی کێڵگەکانیان کۆدەکەنەوە، دوای ئەوە لەگەڵ بەروبومەکانیان میسر بەجێ دەهێڵن، بۆئەوەی هیچ نەبێت شتێکیان بۆ خواردن پێ بێت.

خێڵی ئیسرائیل هەر ئەوکاتەی ویستیان میسر بەجێ بهێڵن، ئاگاداری هەڕەشەی هێرشی سەربازەکانی فیرعەون بون، بەڵام زۆر لێیانەوە دور بوون کە نەیاندەتوانی تیرهاوێژیشیان بکەن، سەرەڕای ئەوەش ڕوباری"نیل"یش لەخێرا ڕۆشتندا هاواکاری کردن تا سەرئەنجام لەهەڕەشەی لەناوچون ڕزگاریان بوو و بەوشێوەی پێشتر باسکرا هێرشیان کردە سەر شاری"رایحا" و داگیریان کرد و تێیدا نیشتەجێ بون.

## کۆتایی

ناوم"موتی"یە، هاوڕێی"ست"ی هاوسەری"ست هوس"[1]م کە بەفیرعەون بانگ دەکرێت، "ست"ە لەمیسردا بەو کەسانە دەوترێت کە پیس و نەفرەت لێکراون، بەواتا ئەو کەسەی کوڕ یان نەوەی ئەهریمەنە، بەڵام بۆچی فیرعەونەکان کە هەمیشە ناوی خوداکانیان لەخۆیان ناوە و هەڵگری ناوی خوداکان بون ناوی"ست هوس"یان لێ ناوە؟ چونکە شێوازی ئەم ناو لێنانە لەگەڵ ئەو ڕوداوانەی کە من دەمەوێت لێرەدا باسیان بکەم، هەروەها لەگەڵ پاڵنەر و هۆکاری نوسینی ئەم یادگاریانەدا پەیوەندیەکی زۆر بەهێزیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە کە ناچارم لێرەدا ئاماژەی پێبدەم. بۆ پەیبردن بەڕەگ و ڕیشەی ئەم ڕوداوانە پێویست بەوە دەکات کەمێك بگەڕێمەوە بۆ دواوە و ئەوەی لەزڕ دایکەکەم"موتی"ەوە بیستومە لێرەدا باسی بکەم. سەرەتا ئاماژە بەوە بدەم کە ناوی من لەناوی زڕدایکەکەمەوە سەرچاوە دەگرێت، لەڕاستیدا ئەو منی"بەکیپا"بانگ دەکرد، چونکە لەخۆشی خاوەنەکەیەوە ئەم ناوەی لێ ناوم، هەڵبەت بۆئەوەی بەهەڵەدا نەچن و وا نەزانن کە دایکم کەنیزەك بووە، دەبێت بڵێم ئەو-بەواتا موتی- خزمەتکار و یار و هاوڕێی پزیشکێکی پایەبەرز بووە کە چەندین قۆناخ و سەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکانی بینیوە و ڕۆڵێکی گرنگیشی لە ژیانیاندا گێڕاوە. ئەو کەسەش"سینۆهە"ی زڕباوکی منە. ئەو ناوە بەواتا"سینۆهە" ئەویش زڕ دایکەکەی ئەو ناوەی لێناوە: "کیپا" ناوی دایکی هەمان ئەم"سینۆهە"یە بووە.....

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ ( 7000 ) دینار